جەمال نەبەز

زنجیرەی وتارو توویژ

لەگەڵ دەزگەی راگەیاندنی گشتی

ژمارە (١)



کوردستان ـ سلێمانی
٢٠٠٦

جەمال نەبەز

# کۆبەرهەم

## ژمارە ( ٦ )

زنجیرەی وتارو وتوویژ

لەگەڵ دەزگەی راگەیاندنی گشتی

ژمارە (١)

کوردستان ـ سلێمانی

٢٠٠٦

- ناوی کتێب : کۆبەرهەم ژمارە (٦)
- نووسینی: جەمال نەبەز
- دەرهێنانی هونەریی بەرگ: محەمەد زادە
- تیراژ : ١٠٠٠ دانە
- لە بەڕێوەبەرایەتیی کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارەی سپاردنی ( ٢٤٧ )ی ساڵی (٢٠٠٦ )ی پێدراوە.

# پێرست

## سوپاسێکی زۆر گەرم

نووسەر و خاوەنی ئەم بابەتانەی لەم بەرگەدا کۆکراونەتەوە، (جەمال نەبەز) هەروەها بنکەی چاپەمەنی کوردنامە سوپاسێکی گەرمی هاوبیری هێژا سیروان کاوسی دەکەن کە بە ئەرك و ماندووبوونێکی زۆر ئەم بەرهەمەی خستە سەر کۆمپیوتەر و بوو بە هۆی ئەوەی ڕۆناکی ببینێ.
ئاهورامەزدا بیپارێزێ و هاوتای فرە بکا.

# بانگەوازێکی دڵپاکانە
# بۆ
# هەموو کوردێکی بەتەنگەوەهاتوو

**بەڕێزان!**

ئەم بانگەوازە لە کاتێکدا پێشکێشی ئێوەی بەتەنگەوەهاتوو دەکرێ کە هەلومەرجێکی یەکجار تایبەتی و دەگمەن لە ئەنجامی کشانی لەشکری عێراق بەسەر کوێت دا هاتووەتە کایەوە. بەڵام پێشەکی دەمەوێ ئەوە بە ئێوەی بەڕێز رابگەیەنم کە ئامانجی ئەم بانگەوازە ئەوە نییە لە کێشەی سیاسی و کۆمەڵایەتیی کوێت بکۆڵمەوە. چونکە مێژووی داواکردنی کوێت لەلایەن رژێمە جۆراوجۆرەکانی عێراقەوە بابەتێکی نوێ نییە. هەروەها نیازیش لەم بانگەوازە ئەوە نی یە کە بگوترێ عێراق مافی ئەوەی هەیە خاکی کوێت بنووسێنێ بەخۆیەوە یان نا. چونکە مەسەلەی **"کێ هەقێتی و کێ هەقی نی یە"** ئەوە هەویرێکە ئاوێکی زۆر دەکێشێ و جێی ئێرە نییە. بێجگە لەمەش مەبەستم ئەوە نییە ئەو برینە ناسۆرەی کە پێوەندیی رژێمی کوێت و رژێمی عێراق لەکاتی جەنگی عێراق و ئێراندا کردی یە هەست و گیانی کوردەوە جارێکی دی لێرەدا بهێنمەوە سوێ و بەمە دەماری کۆنە قینی کورد بگرم، نا. مەبەستم ئەوە نی یە. چونکە سیاسەت وەك شەڕەگەڕەك نی یە و بە کۆنەقین ناکرێ. کورت و کرمانجی، مەبەستم لەم چەند دێڕە ئەوەیە کە بەڕاشکاوی ئەو راستینەیە بخەمە بەرچاو کە ئەم هەنگاوەی رژێمی عێراق هەلومەرجێکی نێوچەیی و نێونەتەوەیی وای لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاست و تەواوی جیهاندا هێناوەتە کایە کە ئەگەر بێتو هۆشیارانە و بەرپرسیارانە باوەش بگیرێتەوە بۆی لەوانەیە کورد بتوانێ سووت وەربگرێ لێی. بۆیە دەمەوێ وەك مرۆڤ دۆستیکی بەتەنگەوەهاتوو روو بکەمە هەموو کوردێك، بێ گوێدانە جیاوازیی بیروباوەڕ و بۆچوونی سیاسیی و، داوا بکەم لێی هەوڵی پێکهێنانی کۆبوونەوەیەکی بەرفراوانی کوردانەی گشتگر

بدات کە لەوێ دا باسێکی بابەتانەی زانستانەی قووڵی ئەو شێمانە (احتمالات) و ڕێکارانە (اسالیب) بکرێ کە دەشێ چاوەڕوانیی سووت بکرێ لێیان.

جا وا لێرەشدا چەند سەرنجێك دەخەمە بەرچاو وەك بیروڕای تایبەتیی خۆم و هیچی دی:

١) ـ بەرلە کۆبوونەوەکە و ئاڵوگۆڕ کردنی بیروڕا، واتە بەرلەوەی بڕیارێکی گشتی دەدرێ، نابێ هیچ کوردێك یان هیچ دەستە و کۆمەڵەیەك بەڕەسمی لایەنگیریی هیچ لایەك بکات، نە ڕژێمی عێراق و نە ناحەزەکانی. چۆنکە جارێ هیچ کەس و هیچ لایەك بە تەواوی نازانێ ئەم گوریس کێشەکێ یە چی لێ دەردەچێ. شایانی باسە کە گەلێك لایەن بەتەمان دەستکەوتێکیان دەستگیر ببێ و لەم بارە ئاڵۆزەدا پارچەیەکی "نێچیرەکەیان" پێ ببڕێ. ئێران بەتەمای ئەوەیە پاش شەڕی هەشت ساڵە و ئەو هەمــوو قــوربانی یە، ئەوەی لەدەستی چووە، یان دەستی نەکەوتووە، بە خشکەیی و ئەمجارە بەدەستی ئەوەی نێوی ناوە **"شەیتانی مەزن"** (ئەمریکا) پێی بگات. دەوڵەتی ترك بەتەمایە بە گرتنەوەی سۆراو و سپیاوێکی دێمۆکراتیانە و هەڵوێستی هەڵپەرستانە، خۆی لە ئەورووپای ڕۆژاوا نێزیکتر بکاتەوە، بەهیوای ئەوەی بیخەنە **"کۆمەڵی ئەورووپا"**وە چونکە دەمێکە چاوەڕوانی ئەوەیە، بەڵام دەوڵەتەکانی ئەورووپا بە بیانووی ئەوەی کە مافی مرۆڤ لە ترکیا **"پێشێل"** کراوە، تا ئێستە ڕێیان نەداوە ببێتە ئەندام. هەروەها چاوەڕوانی ئەوەشە کە ئەگەر هاتوو ڕژێمی سەددام کەوت، ئەوا ئەویش بە **"ڕەزامەندی"**ی زلهێزەکان و دەوڵەتانی ئەورووپا **"ویلایەتی مووسڵ"** (کوردستانی بەشی عێراق) بێ هەرا و زەنا بخاتە سەر دەوڵەتەکەی. سووریاش بەتەمایە بەم هۆیەوە لەگەڵ ئینگلیز و ئەمریکا و بەرەی ڕۆژاوا، کە بە ڕژێمێکی تێرۆریستی دادەنێن، ئاشت ببێتەوە و کووزیکی لە **"شووتی"**یەکە پێ ببڕێ. ئەردەنیش کە ساڵانی ساڵ پشتی ڕژێمی سەددامی گرت، عەباکەی پان کردووەتەوە، کێ **"خێرەومەندە"** ئەوا پارەی تێ بکا. یەکێتیی سۆڤێتیش هەرچەندە بەسەرزاری پشتگیریی بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکا لە دژی عێراق، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا دەورێکی هەڵپەرستانە دەنوێنێ و دەیەوێ کارێك بکا بەڵکو بتوانێ سەددام ڕزگار بکا. ئەمریکا و دەوڵەتانی ئەورووپای ڕۆژاوا هەرچەندە

گەلەکۆمەیان لە عێراق کردووە، بەڵام لە ژێرەوە لە نێو خۆیاندا یەك نین و هێندێکیان لە ئەمریکا کەوتوونەتە منجەمنج، شەڕیش هەروا هاسان نی یە لە وڵاتێکی گەرمی دوورەدەستدا، مانەوەشیان بە چاوەڕوانی یەوە لە کەنداودا دەسەڵاتێکی ماڵی زۆری دەوێ. دەمێنێتەوە سەر ئیسرائیل کە لە هەموو لایەك پتر لە مەترسی دایە؛ بۆیە لە هەلێکی وا دەگەڕێ کە بە جەزرەبەیەکی کارا؛ مەسەلەی عێراق و ناسیۆنالیزمی عەرەب بەجارێ جێ بەجێ بکا، بەڵام ئیسرائیل تەنیایە و ناوێرێ دەستێك بوەشێنێ کە پەژیوانی و ماڵوێرانی لە دووا بێ.

**٢)ـ** ئەم شەڕەی عێراق لە دژی ئەمریکا و بەرەی رۆژاوا و دەوڵەتە عەرەبی یە هاوپەیمانەکانیان شەڕی کورد نی یە. وەك چۆن شەڕی عێراق و ئێران شەڕی کورد نەبوو، بەڵام بەداخەوە و بە ناڕەوا کرا بە شەڕی کورد و، کوردیش لە هەردوو لایەنەکە پتر زیانی لێ کەوت. تکایە بەڕێزینە، بەتایبەتی سەرکردەی حیزب و کۆمەڵەکان؛ دەستم داوێنتان، با ئاگری ئەم شەڕەش هەر چڕوچاوی کورد نەگرێتەوە. ئەوەتە وەك خۆتان دەیزانن ئەو دەوڵەتانەی ئەوڕۆ گەلەکۆمە لە رژێمی عێراق دەکەن، هەر ئەو دەوڵەتانەن کە بوونە هۆی ئەوەی سەددام ببێتە ئەو پیاوەی کە **مارگریت تاچەر پێی بێژێ "ملهوڕ" و "زۆردار" و "دەبێ لە سنووری خۆی دا بوەستێنرێ"**. ئەم دەوڵەتانە هەر ئەو دەوڵەتانەش بوون کە پاش کارەساتی هەناوبڕی **هەڵەبجە**، هەرچەند خۆیان هێنا و برد، ئێستەش سزایەکی عێراقیان نەدا، بەڵکو پاش ئەوە بەچەند رۆژێکی کەم بە سەتان ملوێن دۆلار و مارك و فرەنك و رۆبل کرێدیتیان دا بە رژێمی عێراق. لەگەڵ ئەوەشدا وەك گوتم سیاسەت کۆنەقین و تۆڵەسەندنەوەی کورتبینانەی ناکات نی یە، بەڵکو هەوڵدانە بۆ گەیشتنە ئامانج. بەڵام سیاسەتیش ئەوە نی یە سەرکردەکانی کورد بچنە لای ئەم دەوڵەت و ئەو دەوڵەت کە تا دوێنێ بوو، بە **"ئیمپریالیست" و "زایۆنیست" و "سەرمایەدار" و "خوێنمژ"** دایان دەنان و ئەوڕۆ دەستیان لێ پان بکەنەوە و هەریەکە خزمەتی خۆی و چەند هەزار چەکدارێك پێشکێش بکا بەرامبەر **"یارمەتی"**. ئەوانیش بێزیان نەیەت وەرام بدەنەوە، ئەمەش دووای ئەوەی کە هێندێکیان چەندان کەسی وەك هاڤل و ماڤل یان کردبێ بە تکاکار تا سەددام رازی ببێ بە قسەکردن لەگەڵیان. بەڕاستی بەڕێزینە ئەمە سیاسەت نی یە

و پێویستە لە بەرژەوەندیی کوردەوە بۆ مەسەلەکان بچن و گوێ نەدەنە ئەوەی هەڵوێستی ئەم رژێم و ئەو رژێمی دابەشکەری کوردستان چی دەبێ. پێویستە داو و دەزگە و حیزبە کوردی یەکان سەربەخۆییی خۆیان لە هەموو شتێك گرنگتر بێ لە لایان و کارێك بکەن لەم هەلەدا ئەگەر کرا مەسەلەی کورد وەك یەکێك لە مەسەلە چارە نەکراوەکانی رۆژهەلاتی نیوەڕاست بچێتە بەردەمی نەتەوە یەکگرتووەکان.

بەرەو هەوڵدان بۆ پێکهێنانی کۆبوونەوەیەکی فراوان.

جەمال نەبەز
ئەڵمانیا ٢٠/ ٨/ ١٩٩٠

سەرنج!

ئەم بانگەوازە وەك دەبینرێ لە ١٩٩٠/٨/٢٠ دا بڵاوکراوەتەوە. ئەوە بوو پاش ئەوە جەنگی کەنداو لە نێوان کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان و عێراقدا دەستی پێکرد و لەشکری عێراق لە کوێت کرایە دەرەوە و، راپەڕینی بەهاری ١٩٩١ لە باشووری کوردستان روویدا. گەلی کورد لە باشوور توانی هەرێمێکی گەورە رزگار بکا، بەلام دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان و هەڤاڵبەندەکانیان وەك میسر و ئەردەن و عەرەبستانی سعوودی رازی نەبوون کە ئەمریکا کاری سەددام یەکسەرە بکا، نە وەك کورد شتێکی دەست بکەوێ. ئەوە بوو سەددام و لەشکرەکەی مان و پەلاماری کوردستانیان دایەوە و گەلڕەوەکەی بەهاری ١٩٩١ روویدا کە کارەساتێکی مێژوویی بوو. بە بیروبڕوای من ئەگەر سیاسەتکارانی کورد هەروا زوو نەچوونایە لای سەددام و دەست لە ملانی نەبوونایە، کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان، بێجگە لە دامەزراندنی «هەرێمی ئاسایش» بڕیاری دیکەی باشتری دەدا بۆ چارەنووسی کوردی باشوور.

# بانگەوازێك بۆ
# نەتەوەی کورد و هەموو خەڵکی کوردستان
# (( شەڕی چەپەڵی براکوژی بوەستێنن ))

ڕۆژنامەکان و ئەژانسی دەنگوباسەکان لەم دواییەدا وایانراگەیاند کە شەڕی براکوژی جارێکی دیکە لە باشووری کوردستاندا دەستی پێ کردووەتەوە، و ژمارەیەکی زۆر لە هاوولآتانی خوارووی کوردستان لە خوتوخۆڕایی و بە دەستی یەکدی بوونەتە کۆچی قوربانیی تەنگەتیلکەییی حیزب حیزبێنە و بەرچاوتەنگیی سیاسی.

شەڕی براکوژی کە لە بنەڕەتدا بەشێکە لە کولتووری پاشقەڕووی سەردەمی سەرەتاییی کۆمەڵگەی ئادەمزاد، لە مێژووی کوردەواریدا تا ئێستە گەلێك شێوەی جۆرجۆری بەخۆیەوە گرتووە، و هەر لە بەیەکدادانی خێڵەکایەتی و "تەپڵی باز و بەیاخ" و تێکڕژانی کۆچەر و نیشتەجێ (کورد و گۆران) ەوە بگرە تا دەگاتە شەڕە گەڕەك، باو بووە. بەڵآم ئەم شەڕە چەپەڵە لە نیوەی دووەمی ئەم سەتەیەدا؛ بەزۆری؛ خۆی لە شێوەی حیزب حیزبێنەدا خستەڕوو. حیزبەکانی کوردستانی ئەم نیو سەتەیە کە بەدەستی هوردەبۆرژوای خوێندەواری کورد هاتنە کایەوە، و تا دوێنێ بوو هەموویان لافی مارکسیێتییان لێدەدا و، هەر یەکەیان خۆی بە نوێنەری کارکەر و جۆتکار دادەنا و، هەمووش دەورێشی گوێڕایەڵی ڕژێمی تاوانباری سۆڤێت بوون، ئەوە بوو بە نێوی **"چینایەتی"**یەوە و لەسەر **"پێشڕەوێتیی تاقانەی پرۆلیتاریا"** کەوتبوونە گیانی یەکدی و جاری وا هەبوو بۆ لەنێوبردن و تووناکردنی بەرامبەرەکەیان لە هیچ جۆرە هاوکاری یەك لەگەڵ فاشیترین داگیرکەرانی کوردستان نەدەپرنگانەوە... **ئەرێ.. شەڕی براکوژی و حیزب حیزبێنە گەورەترین هۆیەك بوون و هۆیەکن بۆ ڕاگیرکردنی فەرمانڕەواییی ملهوڕانی بێگانەی تۆتالیتێری دژ بە ئازادیی کوردستان.**

پاش هەرەسهێنانی دیکتاتۆرێتیی سەرمایەدارێتیی دەوڵەت بەسەرۆکایەتیی "یەکێتیی سۆڤێت" و یەکلاییبوونی زلهێزێتی لە جیهاندا بۆ ئەمریکا، حیزبە

مارکسییەکانی کوردستان کە ئێدی ئەوەی جاران نەدەلوا بۆیان، ناچار بوون بە بادانەوە و خۆ سازدان لەگەڵ گێژاوی رۆژگار. بێجگە لەوەش پەلاماردانی عێراق بۆ سەر کوێت و هەڵگیرسانی جەنگی کەنداو، شکانی رژێمی سەددام و راپەڕینی خەڵکی خوارووی کوردستان، و ئەوجا سەرکوتکردنی راپەڕینەکە و گەلڕەوە دوو ملیۆنییەکەی کورد، کە بوو بە هۆی قوربانیدانێکی یەکجار زۆر، و راکێشانی سەرنجی بیروڕای گشتیی جیهان ... ئەمانە هەموو هەلومەرجێکی وایان هێنایە پێشەوە کە لە باشووری کوردستاندا **"هەرێمی ئاسایش"** دابمەزرێ، بێ ئەوەی حیزبەکان دەستێکیان لە راپەڕینەکە، یان گەلڕەوەکە، یان لە پێکهێنانی **"هەرێمی ئاسایش"** دا هەبووبێ. هەر هەلومەرجی لەباریش بوو کە کارێکی وایکرد کە دوو حیزبە گەورەکە (پارتی و یەکێتی) بتوانن هەڵبژاردن ببەنەوە و پەرلەمان و حکومەتی کوردستان لە خۆیان پێکبهێنن کە تا ئێستە هیچ دەوڵەتێکی دنیا بەڕەسمی دانی بەبوونیدا نەناوە.

جا ئەم ئازادی یە رێژەیی (نسبی)یەی کە لە خوارووی کوردستاندا هەیە، بەرهەمی تەقوتوقی حیزب حیزبێنە نییە، بەڵکو شتێکە barodۆخی نێودەوڵەتەکان سازیکردووە، و بە دەزوویەك بەندە. هەموو دوژمنانی نەتەوەی کورد و گشت نەیارانی ئازادی و دیمۆکراسی خەریکی کەینو بەینن لە دژی و چاوەڕوانی لەنێوبردنین. خۆ ئەگەر بێتو لەلایەن کورد خۆشی یەوە قەدری نەزانرێ و نەپارێزرێ و بکرێ بە قوربانی حیزب حیزبێنە، ئەوا هەلێکی تاکهەڵکەوتوو (استثنائی)ی دیرۆکی لەدەست دەچێ، و هەر لایەکیش دەستی لەم تاوانەدا هەبێ، ئەوا نەتەوەی کورد لێینابووری.

ئەورۆ نەتەوەی چل ملوێنی کورد بە هەلومەرجێکی ناسك و چارەنووس سازدا تێدەپەرێ. لەوانەیە هەڵەیەکی گچکە یەکجار زۆر بکەوێ لەسەر کورد. لەبەر ئەوە لەسەر هەموو دڵسۆزێکی نەتەوە پێویستە واز لە هەموو جۆرە خۆپەرستی و ناکۆکییەکی نێوخۆیی و هەموو جۆرە دەستکەوتێکی تایبەتیی حیزبایەتی بهێنێ و روو بکاتە بەرژەوەندیی بنچینەیی و پێکهێنانی یەکێتییەکی پتەو لەسەر بناخەی رێزگرتن لەمافی یەکدی بۆ بەهێزکردنی بەرەی نێوخۆ، و خۆ ئامادەکردنی گشتی بۆ

ڕۆژانی تەنگانە كە ڕەنگە بەم زووانە بێتە بەردەم خەڵكی كوردستان.

دەبێ بزانین كـە قـەوارەی سیـاسـیی هەمـوو نەتەوەیەك دیاردەیەكی ژیاری و بەرهەمی بیری نیشتەجێیی و شارستانێتییە. كۆمەڵانی كۆچەر و خێڵەكی ناتوانن قـەوارەی سیـاسی دابمەزرێنن. هەر لەبەر ئەوەشـە كـە بەبیـركـردنەوە و بۆچوونی خێڵەكییانە و حیزب حیزبێنە قەوارەی سیاسی پێكنایە. ئەوانەی بەڕاستی دەیانەوێ قـەوارەیەكی سیـاسی بۆ دوارۆژی نەتـەوەی كـورد پێكەوە بنێن، دەبێ بەر لە هەمـوو شـتێك ئامـادەی پێكەوە ژیان و پێكەوە تێكۆشین و پێكەوە كـاركـردن بن. پێكەوە ژیان و پێكەوە تێكۆشین و پێكەوە كاركردنیش پێویستییـان بە پەیمان بەستن لەگەڵ یەك و ڕێزگرتن لەیەك و لەم پەیمانانە هەیە، كـە ئەمـەیان بەداخەوە لەنێو حیزبەكانی كوردستاندا بە هیچ جۆرێك بەدیناكرێ.

گەلی بەرۆمـەتی كورد لە **"هەرێمی ئاسایش"**دا سەرەڕای هەموو برسێتی و بێ دەرامـەتی و بێ بەرگی و لەسەرمـاندا هەڵلەرزینێك و پەلامـاردانێكی داگیـركـەرانی كـوردسـتان؛ خۆی ڕاگرتـووە و دەبێژێ: "ئازادی و برسێتی: ئا، تێری و سەرشۆڕی نا"، بەڵام خەڵكی برینداری كوردستـان لووتیان لە شەڕی براكوژی و حیزب حیزبێنە پڕ بووە، و ئێدی ڕێ نادەن بە شەڕ هەڵگیرسێنەران كاسپی بە خوێنی كوردەوە بكەن.

حیـزبەكـانیش دەبێ بزانن كـە بەرژەوەندیی هیچ حیـزبێك لە سـەروو بەرژەوەندیی نەتەوەی كـوردەوە نی یە. بەرژەوەندیی نەتەوەی كـورد لە سـەروو هەمـوو بەرژەوەندی یەكی حیـزب و كـۆمـەڵە و تاك و هۆز و تیـرە و شـار و گـوندێكی كوردەوەیە. هەر كـەسێكیش بە نێوی حیزبایەتی، یان بەهەر نێوێكی دیكەوە شەڕی براكوژی خۆش بكا، نەتەوەی كـورد بەچاوی سـووك تێی دەڕوانێ و بە نزمی تەمـاشـای دەكـا، و مێژووش بە نەحلەتی دەكا. هەموو ناكۆكی یەكی حیزبایەتی دەبێ بە ئاشتی و هێمنی و برایەتی و لەیەكگەیشتن و دەستدانە دەستییەك چارەسەر بكرێ.

یەكەمین هەنگاو بەرەو ئەم ئامانجە ئەوەیە حیزبەكان ڕیزەكانی خۆیان لە مرۆڤی شەڕلەتان و مشەخۆر و هەلپەرست و دز و دەسكەلای بێگانە خاوێن بكەنەوە.

بە بیروڕای من باشترین چارەسەر، پاش دەستبەجێ وەستاندنی شەڕی براكوژی ئەوەیە بە زووترین كـات هەڵبـژاردنێكی نـوێ لە **"هەرێمی ئاسایش"** دا ڕێكبـخرێ. ئەوەش بە چاودێریی نوێنەرانی خەڵكی باكـوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای كوردستـان و

نوێنەرانی ئەوروپایی و ئەمریکایی و رۆژهەڵاتیی بێلایەن و رێدان بە هەموو حیزب و کۆمەڵ و تاکەکەسێك کە بە سەربەستی و بێترس خۆی بپاڵێوێ بۆ هەڵبژاردن، و لەو پەرلەمانەی کە هەڵدەبژێردرێ حکوومەتێکی نیشتمانی دابمەزرێ کە رێز لە دێموکراسی و ئازادی و مافی حیزبە گچکەکان و کەمایەتییە سیاسییەکان و رخنەگران بنێ. ئەوجا ئەو حکوومەتە رێ و شوێن دابنێ بۆ سەرژمێرێکی زانستانەی گشتگر لە **"نێوچەی ئاسایش"** دا بە ئامانجی دارشتنی ژێرخانێکی پتەوی ئابووری و ئامادەکردنی گەل بۆ سەندنەوەی ئەو ستانانەی (لواء) کە هێشتا لە ژێر دەستی رژێمی عێراقدان، وەك ستانی کەرکووك و مووسل و دیالە و کووت و هەموو نێوچەکانی دیکەی کوردستان و بەستنی کۆنگرەیەکی نەتەوەییی فراوان بە نیازی دانانی پرۆگرامێك بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەی کورد لەهەر پێنج بەشەکەی نیشتماندا.

ئەورۆ کە ئەم وتارە دەنووسم ئێوارەی ٢٤ی مانگی دوانزەیە و رۆژی بیرەوەریی لەدایکبوونی پەیامبەری ئاشتی و خۆشەویستی، حەزرەتی عیسایە (دروودی خودێ لەسەر وی و لەسەر هەموو پەیامبەران و چاکان بێ). **خۆزگە ئەم رۆژە دەبوو بە رۆژی یەککگرتنی تەواوی خەڵکی کوردستان، هەر لە کەنداوی فارسەوە تا چیاکانی قەفقاس و هەر لەوێشەوە تا زەریای سپی نێوەڕاست. بە سوننی و شیعە و فەلە و جوو و ئێزدی و کاکەیی و عەلەوی و شەبەك و سارەیی و هەقە و زەردەشتی و بەهایی و دێمۆکرات و ناسیۆنالیست و کۆمۆنیست و ئاینخواز و نەتەوەیی و گوندی و شاری و هۆز و تیرە و کۆچەر و نیشتەجێ یەوە.** تاوانی خوێنڕێژی لای ئێزدانی مەزن و لە هەموو ئاین و ئێلێکدا، تاوانێکی فرە گرانە بە تایبەتی لە ئاینی ئیسلامدا. پەیامبەری ئیسلام محەمەد (د) دەفەرمووێ:

الآ انّ هذا الانسانَ بنيانُ الله، ملعون من هَدّم بنيانَهُ.

**ئەوانەی رێ بۆ شەڕی چەپەڵی براکوژی تەختدەکەن و ئاگرەکەی خۆش دەکەن رووبان لەبەردەم ئێزدانی مەزن و نەتەوەی کورد و ویژدانی مرۆڤایەتیدا رەشە. شەڕی چەپەڵی براکوژی بوەستێنن و دەست بکەنە ملی یەك؛ ئەوجا سەردەکەون.**

جەمال نەبەز

ئەلمانیا ١٩٩٣/١٢/٢٤

# دوکتۆر جەمال نەبەز
# لە کۆڕێکی پێنج سەعاتیدا

کۆڕەکە لە دوو بەش پێکهاتبوو، لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بە بارودۆخی نەتەوە و ئێستای کوردستان و بەشی دووەمیشی بۆ پرسیار و وەڵآم تەرخانکرابوو.

مامۆستا نەبەز لە لیکۆڵینەوەکەیدا بە چڕی ئاورێکی وردی لە کێشەی نیشتمانیی نەتەوەکەمان دایەوە و باسێکی پۆختی ئەو گۆڕانکاریانەشی کرد کە لەم چەند ساڵەی دواییدا بەسەر باری نێودەوڵەتان هاتووە. من باسەکەم لەو رووەوە کە ئیشارەتم پێکرد بە دڵ بوو، بەڵآم ئەو بۆچوونەی مامۆستام پێ سەیر بوو کە دەڵێت: یەکێك لە رێگاکانی چارەی کێشەکەمان ئەوەیە کە کورد لە پارچە جیاجیاکانی کوردستان دا خۆی وەك ئەلتەرناتیڤی حکوومەتە مەرکەزییەکان بخاتە روو. دەست بەسەر ئەو دەوڵەتانەدا بگرێ و لەو چوارچێوەیەدا کێشەی کوردستانیش چار بکات. مامۆستا هەندێ دید و بۆچوونیشی بۆ بەهێزکردنی ئەم رایەی خۆی هێنایەوە.

من پێم وایە ئەم رایەی مامۆستا زۆر نامەوزوعیانە و دوور لە واقیعە. رەنگە ئەم کارە یان کارێکی نزیك بەو چەشنە لەکاتی حوکمی پاشایەتی بەغدادا "وەهم" نەبوایە... یان رەنگە لەکاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا بیرکردنەوەیەکی لەو چەشنە لە بەشێك لەو ئیمپراتۆریەدا **"خەیاڵ"** نەبوایە، بەلآم ئێستا کە ئەو دەوڵەتانە بە مانای ووشە بوونەتە دەوڵەتی (قەومی) عەرەب و تورك و فارس کاریکی مەحاڵە مەرزەکانیان بگۆڕدرێ، لە لایەکی تریشەوە رەنگە دەستەیەکی بەرهەڵستکاری عەرەب یان تورك و فارس بتوانن لەم رێگایەوە حوکمێك لابەرن و حوکمێکی تر پێك بێنن و بۆشیان بچێتە سەر. چونکە زەرەری چوارچێوە و بنەما قەومییەکانی ئەوانی تیا نابێ، بەڵآم کورد کە لە هیچ یەکێك لەو وولآتانەدا لە رووی ژمارەوە لە نەتەوە سەردەستەکان زیاتر نییە، گەر پەنا بۆ کاریکی وا بیات، هەم بە کردەوە کارێکی عەمەلی نییە، چونکە کورد ناتوانێ خەڵکی سلیمانی و دهۆك بەرێ بۆ بەغدا و رزگاری بکات. هەم سەرجەمی نەتەوەی سەردەست دژی رادەوەستێ و ٢٢

دەوڵەتی عەرەبیش پەلاماری دەدات ئەوە بێجگە لە ئێران و تورکیاش.

لەلایەکی تریشەوە ئێستا کورد داوای مافە ڕەواکانی لەسەر خاکی نیشتمانی خۆی دەکات، پێی ڕەوا نابینن و ئەو دەوڵەتانە بەو پەڕی بەربەریەتەوە سەرکوت و ئیبادەی دەکەن و بە ئاسانی توانیویانە گەلەکانیان فریو دەن و لە دووری سەتان کیلۆمەترەوە بۆ شەڕی کوردستان تەیاریان بکەن و کورد بە جیاوازخواز لە قەڵەم دەدەن و گوایە خاکی باب و باپیرانی ئەوان دادەبڕن. ئەی دەبێ چ ڕوو بدات گەر کورد بەزاری خۆی هاوار بکات و خۆی وەك ئاڵتەرناتیڤ بۆ دەوڵەتی عێراق و تورکیا و ئێران و سوریا بخاتە ڕوو.

لەلایەکی دیکەشەوە ئەم ڕایەی مامۆستا لە ڕووی حقوقییەوە کارێکی نادیمۆکراتییە. کورد چاوی لەوەیە داگیرکەر وڵاتەکەی جێهێڵێ، نەك خۆی ببێ بە داگیرکەر و ئەڵتەرناتیڤی نەتەوەیەکی دیکە.

بەشی دووەمی کۆڕەکە کە بۆ پرسیار و وەڵام دانرابوو، گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوەیەکی گەرم و گوڕی تیا کرا.

سەرەتا حەز دەکەم بڵێم خودی مامۆستا نەبەز لە وەڵام و گوێگرتن لە ئامادە بووان زۆر نەرم بوو، بەڵام ئەو برادەرەی کە کۆڕەکەی بەڕێوە دەبرد زۆر چیکڵدان تەنگ و کەم حەوسەلە بوو.

کاتێ پاش ئەوەی هەندێ دەنگی ڕەخنە و گلەیی بەرز بوویەوە لە ڕووی مامۆستادا برای کۆڕ ڕێکخەر لولەی میکرۆفۆنەکەی کردە خەڵکەکە و یەك دەست ڕێژی تری پیاهەڵدانی مامۆستا جەمالی کرد بە ناو خەڵکەکەدا، من پێم وابوو خودی مامۆستا جەمال، پیاهەڵدانی جاری دووەمی پێخۆش نەبوو. خاڵێکی تریش کە جێگەی ڕەخنە بوو، ئەوە بوو پرسیارەکان دەبوایە بە نووسراوی بێ و ناوی خاوەن پرسیاریشی لەسەر بێ. تەنانەت لەمەشدا سانسۆرێکی ئاشکرا خرایە سەر پرسیارەکان و چەندان کەس لە هۆڵەکەوە دەنگیان لی بەرزبوویەوە کە پرسیارەکانیان پشت گوێ خراون.

من تێبینیم لەسەر گەلێك لە وەڵامەکانی مامۆستا هەیە، بەڵام تەنیا ئاماژە بەوانەیان دەکەم کە پێم وایە شارەزا و پسپۆڕێکی وەك ئەو نەدەبوو ئەو جۆرە

وەڵامانەی لێ ببیستری.

لە وەڵامی پرسیارێکدا کە هاتە سەر سکرتێری گشتی (ینك) و سەرۆکی (پدك) گوتی "مام جەلال پیاوێکی زیرەك و سیاسی و برادەرمە و ساڵانێکی زۆر لە دانشگا پێکەوە بووین. کاك مەسعودیش نووسینەکانی خوێندووتەوە زیرەك و وورپایە و بە رەحمەت بی رێزم هەبوو بۆ باوکی".

سەیر ئەوە بوو ئەم قسانەی لە وەڵامی پرسیارێکدا بوو سەبارەت بەو شەڕە خیانەتکارانەی کە ئەم دوو برادەرە زیرەکەی مامۆستا نەبەز بەسەر گەلەکەماندا سەپاندوویانە و چارەنووسی باشووری کوردستانیان داوەتە دەست رێکەوت و تاریکایی.

ئەم قسانەی مامۆستا خەڵکەکەی زۆر بێزار کرد و دەنگە دەنگ و مقۆ مقۆ لە کۆڕەکەدا دەستی پێکرد و گفتوگۆکان گەرمتر بوون و مامۆستاش لەسەر رایەکەی خۆی سوورتر بوو. دوو برادەرە زیرەکەکەی لەگەڵ داگیرکەران دا بەراورد دەکرد. گوایە ئەمان هەر چۆنێك بن، پێڵاوەکانیان بە داگیرکەرێکی کوردستان ناگۆڕێتەوە.

من روو لە مامۆستا ئەکەم، دەڵێم داگیرکەر دوژمنە، بەلام سەرکردەی حزبە کوردییەکان کاتیك سیاسەت و رەفتاریان بخرێتە ژێر پرسیارەوە کەی ئەو بەراورد کردنە راستە.

لەو کۆڕەدا مامۆستا هێندە باسی نامەکانی خۆی بۆ ئەو دوو برادەرە زیرەکەی و وەڵامەکانی ئەوانی کرد، گەر "خەڵاتی نۆبێل" بەدەست ئەو بوایە هەر لەوێدا بەوانی دەبەخشی و ئێمەش دەبوو شەکراومان نۆش کردبا.

گەر ئەم دوو سیاسەت مەدارە ئەوەندە زیرەك و سیاسی و لێهاتوو بن، دەبێ نێلسون ماندێلا چبێ؟ خاڵێکی تر کە سەرنج راکێشەر بوو ئەوە بوو، هەر کە باسی کار و سیاسەتە چەوتەکانی (ینك و پدك) دەکرا، مامۆستا دەیگوت دەوڵەتمان نی یە بۆیە وایە. هۆی گیروگرفتەکانی بۆ نەبوونی دەوڵەت دەگێرایەوە.

بێگومان هەر گەلێك دەوڵەتی نەبوو وەك مرۆڤێکی بێ ناسنامە و بێ پاسپۆرتی لێ بەسەر دێ. کەرامەتی نەتەوەیی و بوونی ئینسانیی دەدۆڕێنێ. بوونی دەوڵەت یەکێکە لە ئامانجە هەرە پیرۆزەکانمان.

بەڵام ئەو دووبەرەکی و شەڕ و تالآنی و دیل کوشتن و سووکایەتی یەی بە مافی مرۆڤی کورد لە لایەن ئەو دوو حزبەوە دەکرێ، بۆ نەبوونی دەوڵەت ناگەڕێتەوە. خۆ لە ئەفغانستان و سۆمالیا و یەمەن و شوێنی تریش دا دەوڵەت هەن و شەڕ و کوشتاریان تێدایە.

من پێم وایە سەقەتییەکە هەمووی لە عەقڵییەت و بیرکردنەوەی رابەرانی سیاسی کورد و دەزگاکانیاندایە و بێ ویژدانانە سووت لە دواکەوتوویی کۆمەڵگا وەردەگرن بۆ بەرژەوەندیی خۆیان، تەنانەت نایەڵن کورد بچێتە سەر رێگەی بەرەو دروست کردنی دەوڵەت. پێشم وایە گەر دەوڵەت بووینایە بە هەمان سەرکردە و دەزگەی سیاسیی و عەقڵییەتەوە، ئەوا ئێستا لە جیاتی شەڕە ئار پی جی و کلآشینکۆف ئەو کاتە لە جێگەیدا راکێتی دووراوێژی "ارض، ارض" بەسەر کوردی بەدبەختی دهۆك و سلیمانی و هەولێردا فڕکان فڕکانی دەبوو.

مامۆستا گەلێك جار دەیگوت من گەش بینم و زۆر جار ئەم وشەیەی دووپات دەکردەوە. بێگومان کورد بە شێوەیەکی گشتی خۆڕاگر و بە هیوایە، یەکێك لەو شتانەش کوردی لە کوردستاندا ڕاگرتووە ئەو هیوا و بەرگرییەیە.

بەڵام کاتێ پیاو گوێی لە پسپۆڕێکی وەك مامۆستا دەبێ، دەڵێ گەش بینم دەبوایە ئەو خاڵ و کارانەی دەست نیشان کردبایە کە گەشبینیان کردووە و ئەو بنچینە و زەمینەیەی بۆ ئامادەبووانی کۆڕەکە ڕۆن بکردایەتەوە.

کە باسی دزی و تالآنی و پیاوخراپییەکانی چەکدارەکانی "ینك و پدك" دەکرا مامۆستا دەیگوت ئەم کردەوانە پاشماوەی داگیرکەرانە. من پێم وایە داگیرکەران بە گشتی و بەعس بە تایبەتی خو و رەوشت و گەندەکاریی زۆریان لە کوردستاندا بە جێ هیلآوە، بەڵام نابێ کورد خۆشویستن وامان لێ بکات عەیبەکانی خۆمان نەبینین و ئەمەش بخەینە ئەستۆی داگیرکەر، بۆ نموونە من پێم وایە لە نێوان شەق و تێهەڵدان و قۆناغە تفەنگێکی حوکمڕانێکی خۆماڵی و بێگانەدا جیاوازییەکی ئەوتۆ نەبێ، بە تایبەتی لە رووی فیزیکی و نەفسییەوە بۆ مرۆڤ. لەلایەکی ترەوە لام وایە کاتێك دوژمن ئازارت دەدات و ماڵت فەرهوود دەکات، لە ناخەوە بەهێزتر دەبی تەنانەت شانازیشی پێوە دەکەی بۆ بەرگری داگیرکەر سوورترت دەکا.

بەڵام کاتێك حوکمڕانە خزمەت نەکەرەکەت ئازارت بدات لە ناخەوە دەڕووخێیت و بێ هیوا دەبیت.

لە کۆتاییدا حەز دەکەم ئەوە بڵێم مامۆستا جەمال نەبەز بە یەکێك لە نووسەرانی خاوەن هەڵوێست و فیکری نەتەوەیی دەزانم هەر بۆیەش ئەم تێبینییانەم لەسەر هەندێ لە قسەکانی نووسی.

محمد حسن

ستۆکهۆڵم ۱۹۹٥/۳/۲٥

گۆڤاری **"هەنگاو"** ژمارەی ١٦ ـــ ٥ی مایسی ١٩٩٥

— — — —

**سەرنج!**

ئەم وتارە کە بە نێوی خواستەمەنی "محەمەد حەسەن"ەوە بڵاو کراوەتەوە لێدوانێکە لە "سەمیناری کوردستان" کە بە نێوی **"راپۆرتێك لەسەر بارودۆخی ئێستەی نەتەوەی کورد و وتووێژ لەسەر باری باشووری کوردستان"** کە لە ڕۆژی یەکشەممە ۱۹۹٥/۳/۱۹ دا لە شاری ستۆکهۆڵم لە سوید، لەبەردەم ۲۸۷ کوردی سوێد و شوێنانی دیکەی ئەورووپادا پێشکێشکرا. بڵاوکردنەوەی ئەم لێدوانە لێرەدا هەر بۆ ئەوەیە بیر و بۆچوونێکی پێچەوانەش بخرێتە بەرچاو کە لە هەڤپەیڤینێکدا باری سەرنجی خۆم خستووەتە بەرچاو.

لێرەدا تەنێ بەکورتی دەخوازم ئەوە بێژم بۆچی دەبێ کوردێك لە سوێد کە وڵاتی دێمۆکراتییە کاتێك بیەوێ لە سەمینارێکدا پرسیارێك بکا، بەدزییەوە بیکا و نێوی خۆی نەخاتە پاڵ پرسیارەکەی؟. بۆچی دەبێ ئەگەر داوا لە مرۆڤێك کرا خاوەنی قسەی خۆی و هەڵوێستی خۆی بێ و خۆی نەشارێتەوە، ئەمە «سانسۆر» بێ؟. دوایی کە من گوتوومە «کورد دەوڵەتی نییە» مەبەستم لە دەوڵەت بووە بەمانای

وشە، دەولەتێك کە دەسەلاتی بەسەر خەلکەکەیدا هەبێ، ئەگەر نا ئەوەی لە لوبنان و ئەفغانستان و جەزائیر دا هەیە هەر بەنێو دەولەتە، نەك بەکردەوە. ئەگەر کورد بەراستی دەولەتی ببوایە ئەودەمە هیچ حیزبێك نەیدەتوانی چەکدار و بەندیخانەی هەبێ، ئەودەمە چەك بەدەست پۆلیس و لەشکرەوە دەبوو، بەندیخانەش لە ژێر چاودێریی سیستەمی دادپرسیدا دەبوو.

جەمال نەبەز

# لە وەرامی پرسیارێکی کوردستانی نوێ دا!
# دەستوورێکی بنچینەیی بۆ
# کۆماری فیدەرالی کوردستان پێویستە و،
# نازانم ئێمە چاوەڕێی چین؟

**بەڕێزینە، بەڕێوەبەرانی رۆژنامەی «کوردستانی نوێ»**

سلاوێکی برایانەتان لێبێ و زۆر سوپاس بۆ نامەی رۆژی ٦/١٥ تان کە دەفەرموون بە بۆنەی درێژکردنەوەی ماوەی کارکردن و خستنەوەکار و فراوانکردنی پەرلەمانی کوردستانەوە، تەوەرێکتان کردووەتەوە، لەوێدا رای سیاسەتمەدار و رۆناکبیران بلاو دەکەنەوە و داخوازیی ئەوە دەکەن لێم کە لەم بارەیەوە هاوکاریتان بکەم بە دەربڕینی بیروڕای خۆم. وا لێرەدا هێندێك سەرنج و تێبینیی خۆم دەنووسم بۆتان. تکام وایە هەروەك خۆی چۆنە، ئاوا چاپی بکەن. هیواشم وایە ئەم چەند وشەیە کە بە نیازێکی پاك نووسراون، سووتێکیان هەبێ بۆ هەموو هاوولاتان، بێجیاوازی.

دوور نییە هێندێك هەبن پێیان وابێ کە هەلبژاردنی نوێنەرانی پەرلەمانێك کارێکە، لە هەر کوێیەك بێ، ئاساییە، چونکە شتێکی خۆرسکییە کە لە هەر جێیەك خەلك هەبوون، مافی ئەوەشیان دەبێ دەمڕاستی خۆیان دەستنیشان بکەن. ئەم بۆچوونە کاتێك راست دەردەچێ کە تۆ لە کۆمەلگەیەکی ئازاددا بژیت. ئەو دەمە مافی رادەربڕین بە سەربەستی، دەبێتە مافێکی خۆزایی و چەندو چۆنی لەسەر نابێ، بەلام بۆ نەتەوەیەکی ماف پێشێلکراوی، خاك بەسەر شەش دەولەت دابەشکراوی وەك کورد، ئەوە شتێك بوو خەونی پێوە دەبیندرا. بە رێکەوت خەونەکە هاتە دی. بە بیروڕای من ئەو پەرلەمانەی کە لە بەشێك لە باشووری کوردستاندا لە گولانی ١٩٩٢دا پێکهات، یەکێکە لە رووداوە هەرە گرنگەکانی مێژووی نەتەوەی کورد کە چەپی نییە لە رووداوی دامەزراندنی فەرمانداریتیی باشووری کوردستان پاش جەنگی جیهانیی یەکەم بە **سەرۆکایەتیی شێخ مەحموود**،

چه‌پیشی نییه له رووداوی دووی رێبه‌ندان، رۆژی داخۆیانی (اعلان) کردنی کۆماری کوردستان له رۆژهه‌لاتی نیشتماندا به **سه‌رۆکایه‌تیی پێشه‌وا قازی محه‌مه‌د**. جا ئه‌گه‌ر فه‌رمانداریتیی کوردستان، یه‌که‌مین ده‌وڵه‌تی ناسیۆنال بووبێ له هه‌موو رۆژهه‌لاتی نێوه‌ڕاستدا و ده‌وڵه‌ته ناسیۆناله‌کانی **عه‌ره‌ب و ترك و فارس**، پاش ئه‌وه دروستکرابن؛ ئه‌وا په‌رله‌مانی کوردستانیش که له به‌شێك له باشووری ولاتدا دامه‌زرا، یه‌که‌مین په‌رله‌مان بوو له هه‌موو رۆژهه‌لاتی نێوه‌ڕاستدا (پاش په‌رله‌مانی ئیسرائیل) که به شێوه‌یه‌کی دێمۆکراسی هه‌ڵبژێردرابێ. دیاره له‌کاتی هه‌ڵبژاردندا هێندێك هه‌ڵه و ناته‌واوی و که‌م و کورتی رووی داوه، و هێندێك ناهه‌قیش کراوه، به تایبه‌تی له دانانی رێژه‌ی ٧٪ وه‌ك مه‌رجێك بۆ چوونه په‌رله‌مان. که ئه‌مه شتێکی ناڕاست بوو و ده‌بوو هه‌ر نه‌بووایه، له‌گه‌ڵ ئه‌مانه‌شدا هه‌ڵبژاردن به‌گشتی له هه‌وا و که‌شێکی دێمۆکراسی و سه‌ربه‌ستدا به‌ڕێوه چوو، و ئه‌نجامه‌که‌شی به نێزیکه بیروڕای ئه‌و رۆژه‌ی خه‌ڵکی "هه‌رێمی ئاسایش"ی ده‌دایه‌وه، و ئه‌مه‌شم له‌کاتی خۆیدا له وتووێژێکدا له‌گه‌ڵ رۆژنامه‌ی "کوردنامه" ده‌ربڕی و... هه‌ر له‌و رۆژنامه‌یه‌شدا بلاوکرایه‌وه.

داخی گرانم ئێمه‌ی کورد، چۆن، نرخی فه‌رمانداریتیی باشووری کوردستان و نرخی کۆماری رۆژهه‌لاتی کوردستانمان نه‌زانی، هه‌تا له ده‌ستمان چوون. که ئه‌وه بوو فه‌رمانداریتیی له ئه‌نجامی جه‌نگی جیهانیی یه‌که‌م و کۆماریش له ئه‌نجامی جه‌نگی جیهانیی دووه‌مه‌وه هاتنه بوون. هه‌ر ئاواش، نرخی په‌رله‌مان و هه‌رێمی ئاسایش نازانین. که ئه‌مه‌یان له ئه‌نجامی جه‌نگی جیهانیی سێیه‌مه‌وه (جه‌نگی نێوان عێراق و کۆمه‌ڵی نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کان)ه‌وه هاتووه‌ته بوون. شایانی باسه که نه فه‌رمانداریتی و نه کۆمار و نه په‌رله‌مانیش توانیان ئه‌رکه‌کانی سه‌رشانی خۆیان به‌باشی به‌جێ بێنن. ئاشکرایه ئه‌م وتاره جێی ئه‌وه نییه که‌موکورتییه‌کانی فه‌رمانداریتیی کوردستان وکۆماری کوردستان باس بکه‌م، چۆنکه له شوێنی دیکه‌دا به تێرو ته‌سه‌لی باسمکردوون. له‌به‌ر ئه‌وه لێره‌دا هه‌ر باسی په‌رله‌مان ده‌که‌م، به‌لام زۆر به کورتی.

په‌رله‌مانی کوردستان ده‌بوو هه‌ر له سه‌ره‌تاوه له شێوه‌ی په‌نجا به په‌نجادا

نەبووایە. ئەمەش بەوە پێکدەهات کە ئەو مەرجی ٧٪ە نەبووایە. ئەو حەلە حیزبەکانی دیکەش بێجگە لە پارتی و یەکێتی دەیانتوانی بێنە پەرلەمانەوە. ئەوەش شتێکی زۆر باش دەبوو. چۆنکە بۆ وڵاتێکی وەك کوردستان کە تازە دەکەوێتە سەر پێی دەوڵەتداری، پێکەوە کارکردنی هەموو حیزب و کۆمەڵە کوردستانی یەکان و رێکردنەوە بۆ دەربڕینی بیروڕای هەموو لایەك لەژێر بنمیچی پەرلەماندا کارێکی پێویستە. باشترین رێش ئەوە بوو کە هەموو حیزبەکان پێکەوە حکوومەتێکی کوالیسیۆن دروست بکەن. نەك تەنێ دوو حیزب ، بۆ ئەوەی هەموو لایەك خۆی بە بەرپرسیار بزانێ. خۆ ئەگەر بهاتایە و حیزبێکی گەورە نەچووایە ئەو کوالیسیۆنەوە، ئەوا بێگومان هیچ زیانێکی بۆ ئەو حیزبە تێدا نەدەبوو. چۆنکە لە سیستەمێکی دێمۆکراسیی گشتگر (پلۆرالیستی)دا ، جاری وا هەیە حیزبێکی بەرهەڵستکار دەتوانێ دەوری گەلێك گرنگتر بگێڕێ لە حیزبی دەسەلآتدار و خۆی وا بێنێتە پێشەوە لە جەماوەر؛ کە لە هەڵبژاردنێکی دیکەدا بێتە سەرکار، ئەمە لایەك. لە لایەکی دیکەشەوە ناتەواوی یەکی زەق لە پەرلەماندا دەبینرێ. ئەوەش ئەمەیە کە پەرلەمان پەرلەمانی پیاوانە. لە کاتیکدا نیوەی کۆمەڵگە لە ژنان پێکهاتووە.

پەرلەمانی کوردستان لە سەرەتاوە هەنگاوێکی مەزنی نا ، و لە بڕیارێکی یەك دەنگیدا پێوەندیی خەڵکی باشووری کوردستانی بە خەڵکی عێراقەوە لە شێوەی سیستەمێکی فیدەراڵیدا دەستنیشان کرد. ئەم بڕیارە بڕیارێکی ئازایانە بوو کە هەستی راستینەی دەروونی گەل و داخوازیی رەوای کۆمەڵگەی کوردەواری دەربڕی.

بەلآم مخابن ئەم بڕیارە هەر لەسەر کاغەز مایەوە و نەخرایە مەیدانی کار. هەر چەندە پەرلەمان دەزگەیەکی زاگۆنکاری (تشریعی)یە و دەزگەیەکی جێبەجێ کاری (تنفیذی) نییە؛ لەگەڵ ئەمەشدا دەبوو پەرلەمان هەر پاش ئەوە دەستوورێکی بنچینەیی کاتی بۆ هەموو باشووری کوردستان (نەك تەنێ بۆ هەرێمی ئاسایش.) ئامادە بکردایە و بە پێی ئەوە دەسەلآتی سەرکۆمار و سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتی فیدەراڵی کوردستانی دیاری بکردایە، و کۆمیسیۆنێکی پەرلەمانی بۆ هێنانەدی ئەم کارە پێك بهێنایە کە بە هاوکاریی لەگەڵ حکوومەتی کوردستاندا رۆژێك بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری فیدەراڵی کوردستان دابنرایە. و هەرێمی ئاسایش، نێو

بنرایه کۆماری فیدەراڵی کوردستان و ئالآی کوردستان لەسەر هەموو شوێنە گشتییەکان بشەکایەوە و بە پێی زاگۆنێکی تایبەتی هێزەکانی پێشمەرگە ببوونایە بە سوپای کۆماری فیدەراڵی کوردستان، ئەوسا دەست بکرایە بە هەوڵدان بۆ رزگارکردنی شوێنەکانی دیکەی باشووری کوردستان. وەك مووسڵ و کەرکوك و خانەقین و کووت و نێوچەکانی دیکەی خوارووی ولات. ئەمانە هیچیان تا ئەمڕۆ جێبەجێ نەکراون. نازانم ئێمە چاوەڕوانی چین؟ **ئەگەر چاوەڕوانی ئەوەین کە چەند عێراقییەکی گەجەر و گوجەری بێنێو و بێرابوردوو سووت لە هەل وەر بگرن و جێی سەددام بگرنەوە، و ئەوجا لوتف بفەرموون دان بە "فیدراسیۆن"ی کورددا بنێن، یان رژێمی سەددام دەرزیی دێموکراسی لەخۆی بدا و بەرە بەرە بەڕەسمی بناسرێتەوە و دان بە فیدەراسیۆندا بنێ، ئەوا دڵنیا بن ئەوە خەیاڵ پلآوی یە، چۆنکە وەك کوردەکە دەبێژێ، مانگ هەر سەر لە ئێوارە دیارە.** هەڵوێستی هێزە عێراقی یەکان و زۆربەی دراوسێکانی کوردستان و عێراق دەریخست کە ئەمانە بە فیدەراسیۆن رازی نابن. دوایی فیدەراسیۆن سیستەمێکە دەبێ هەموو ولآتەکە (لێرەدا عێراق وەك دەوڵەتیك) بگرێتەوە. بەشێکی ولآتێك ناتوانێ سیستەمی فیدەراڵی هەبێ و بەشەکەی دی سیستەمی فیدەراڵی نەبێ. ئەوجا ئەو بڕیارەی کە پەرلەمانی کوردستان داوێتی وەك بڕیاری نەتەوەی کوردە و پاشگەز بوونەوە لێی دژایەتییە لەگەڵ ویستەی نەتەوەی کورد. لەبەر ئەوە پێویستە بە زووترین کات پەرلەمان دەستوورێکی بنچینەیی بۆ کۆماری فیدەراڵی دابنێ و کۆماری فیدەراڵی کوردستان لە کۆبوونەوەیەکی گشتیدا داخویانی (اعلان) بکرێ و سەرکۆمار هەڵبژێردرێ. ئەوجا ئەگەر رۆژێ لە رۆژان خەڵکی عێراق بەو سیستەمە رازی نەبوون؛ ئەوا دیارە هەر لە ئێستاوە دەزانین ئەنجامەکەی بە چیدەگات. لەبەر ئەوە دەبێ هەر لە ئێستەوە خۆ ئامادە بکرێ بۆ رێگرتن لە کارەساتی جەرگبڕ کە رەنگە بە پێشبینیکردن و رێبەستن لێی؛ روو نەدا.

پەرلەمان کە ماوەی کارکردنی درێژ کراوەتەوە؛ پێویستە حکوومەتێکی دێموکراسیی کوردستانی دەستنیشان بکات. جا لەبەر ئەوەی بەداخەوە سەرکۆمارێك نییە تا بنێرێ بە شوێن نوێنەرانی حیزبەکاندا و داوایان لێبکا حکوومەت دروست بکەن. دەبێ پەرلەمان ئەم کارە بخاتە ئەستۆی خۆی.

بە بیروڕای من ئەو حکوومەتە ئەگەر زۆربەی وەزیرەکانی ئەندامی ئەو حیزبانە بن کە لە پارلەماندا نین، یان مرۆڤی سەربەخۆ بن، بە مەرجێ هەموو دڵسۆز و کارا بن، ئەوە بۆ پێکهێنانی ئەم حکوومەتە کاتی (وقتي)یە لەم ڕۆژەدا باشترە. ئەو حکوومەتە کاتییەش دەبێ پەلاماری توند و تیژ بۆ سەر برسێتی و بێکاری و بێدادی و ڕاو ڕووت بدات. هاوولاَتانی کوردستان لە هەرێمی ئاسایشدا دەبێ هەست بەوە بکەن کە ڕۆمەت (شرف) و ئازادی و ژیانیان دەپارێزرێ و پاروو نانێکیش هەیە بیخۆن. دەبێ سەر و ماڵ و ئاوڕووی هەموو هاوولاَتیك هێندە پیرۆز و نەتەکێن (مصون) بێ؛ کە کەس نەوێرێ دەستی بۆ بەرێ، و کەسیش ناچار نەبێ لەبەر بێنانی و نەبوونی ئاسایش؛ ولاَتی خۆی بەجێ بهێڵێ. و بچێ لە هەندەران دەست لەم و لەو پان بکاتەوە.

هێندەی کێشەکەش پێوەندیی بە پارتی و یەکێتییەوە هەیە، ئەوا گەورەترین هەڵە کە ئەم دوو حیزبە کردیان، ئەوە بوو کە لە سەرەتای دامەزراندنی **"هەرێمی ئاسایش"** دا هەوڵیان نەدا هەر دوو حیزبەکە بکەن بەیەك. خۆ ئەگەر بهاتایە و ئەوەیان بکردایە، ئەوا بە دامەزراندنی پارتێکی ئاوا جەماوەریی کوردستانیی دیمۆکراسیی نیشتمانی، دەیانتوانی نەك هەر لە سەر ئاستی هەموو کوردستان، بەڵکو لەسەر ئاستی عێراق و ڕۆژهەلاَتی نێوەڕاستیش خۆیان پێشان بدەن. ئەو حیزبە گەورەیە هێز و پێز و ڕێزێکی باشی بۆ خۆشیان و بۆ بزووتنەوەی کوردایەتیش وەدەست دەهێنا. بێجگە لەوەش دەیانتوانی هەتا هەندازەیەکی زۆر خۆیان لە هەلپەرست و کوڕی ڕۆژ و گامەسلەك و خۆ بژێن و ماستاو ساردکەرەوە و ئاژاوەگێڕ و برا لە برا هاندەر و کای کۆن بە با دەر؛ دوور بخەنەوە. چونکە ئەو حەلە دوویەرەکی و ڕکەبەرێتی نەدەما، و ئەوانیش پێویستییان بە زۆرە و بۆرە نەدەبوو، و ژمارەیەکی زۆریش ڕۆشنبیری سەربەخۆ هاوکاری دەکرد لەگەڵیان، و ئەو شەڕ و بەیەکدادان و براکوژی و خۆکوژییەش رووی نەدەدا. کاتی خۆی ئەمەم بەبای گوێی هێندیك لە بەرپرسیارەکانی هەر دوو لادا دا. هەرچەندە لەبەر دەروەستی (التزام)ی حیزبایەتی لەم ڕوودوە هیچیان دەرنەبڕی، بەلاَم لە کاردانەوەیاندا ئاشکرا بوو کە لە دژی شتێکی وا نین. ئێستەش نەچووە بچێ. فەرموو با بیکەن.

**بەرێزینە!**

له ئەنجامی لێکۆڵینەوەی مێژووی رامیاریی و کۆمەڵایەتیی نەتەوەی کورد و دراوسێکانیدا، دەمێکە هاتوومەتە سەر ئەو باوەڕە کە ئێمەی کورد دووچاری نەخۆشی یەکی یەکجار سەخت بووین، و هەر ئەوەشە کە بووەتە هۆکاری بنچینەیی و شارەگی هەموو ماڵوێرانی و بەدبەختییەکانمان لە ژیاندا. ئەوەش دەردی باوەڕ بەخۆ نەکردنە. دەردی باوەڕ بەخۆ نەکردن، هەستی خۆ کەمدیتنی لە ئێمەدا چەسپاندووە و وای لێکردووین خۆمان یەکجار بەکەم و بێدەسەلآت بێتە بەرچاو. لە ئەنجامی ئەمەشەوە هیچ کامێکمان باوەڕ بە ژێهاتێتی ئەوی دیکەمان ناکەین. خۆ ئەگەر کوردێك لێوەشاوەیی خۆی بە کردەوە ئیسپات کرد بۆمان، ئەوا پێمان وایە ئەو کارە بەرهەمی بیر و دەستی خۆی نی یە. بەڵکو بیانی (بێگانە) یەك لە پشتەوە ئەو کارەی ئەنجام داوە. لەبەر ئەوە رێزی لێنانێین و دانی پێدا نانێین. هەر خۆم لەم بارەیەوە لە هەڵسوکەوتی ساڵانی ساڵدا لەگەڵ کوردی هەموو لایەکی کوردستان بە تاقیکردنەوەی تایبەتیی خۆم ... هێندە نموونەم کۆ کردووەتەوە، دەتوانم کتێبێکی گەورە لەمەڕ ئەم بابەتە بنووسمەوە. ئێمە با هیچ دوور نەڕۆین و تەماشایەکی مێژووی نێزیکی خۆمان بکەین. ئەگەر باوەڕمان بە خۆمان هەبووایە، ئەوا ئەو رۆژەی سەددام لەشکر و پۆلیس و کاربەدەستەکانی خۆی لە گەلێك نێوچەی باشووری کوردستان کشاندەوە (٢٠/١٢/١٩٩١) دەمانتوانی سەربەخۆیی ئەو نێوچانە داخۆیانی (اعلان) بکەین. وەکو لە کاتی خۆیدا گوتم، دڵنیام ئەو هەنگاوە لەو رۆژەدا ئەگەر بە تەواویش سەری نەگرتایە، سووتێکی زۆری دەگەیاند بە کورد... ئەگەر باوەڕمان بە خۆمان هەبووایە ئەوا بە دڵ و بە گیان بە پیر ئەو نەخشە هیوا بەخشەوە دەچووین کە سەرکۆماری پێشووی فەرەنسا بەهەشتی **فرانسوا میتران** ژیرانە کێشابووی بۆ مسۆگەرکردنی دوارۆژێکی ئازادانە بۆ هەرێمی ئاسایش و باشووری کوردستان... ئەگەر باوەڕمان بە خۆمان هەبووایە کە ئێمەش شتێکمان لەدەست دێ، ئەوا لەم پێنج ساڵەدا کە سەربەستین، سەرمان دەنا بەیەکەوە و ریزەکانی خۆمان یەکدەخست و هەموو حیزب و کۆمەڵە و رێباز و کەسایەتییەکانمان پێکەوە لە بنمیچی کۆنگرەیەکی نەتەوەییدا، کۆڕێکی بەڕێوەبەرێتیی نەتەوەییمان هەڵدەبژارد و خۆمان وەك جێگرەوە

(ئاڵته‌رناتیڤ)ێکی دێمۆکراتیی گشتگر (تعددی)ی ئاشتیخوازانه له‌جیاتی رژێمه گه‌نده‌ڵه‌کانی نێوچه‌که به جیهان ده‌ناساند. ئه‌وسا دۆست و نه‌یار وه‌کیه‌ك حسێبێکی بایه‌خداریان ده‌کرد بۆمان.

ئێسته ده‌زانم زۆربه‌ی زۆری ئه‌وانه‌ی ئه‌م وشانه ده‌خوێننه‌وه ده‌بێژن، راسته وایه، باشه که راسته وایه، بۆچی به‌کرده‌وه ده‌ستپێناکه‌ین؟ چونکه باوه‌رمان به‌خۆمان نییه. هه‌ر کاتێك باوه‌ڕمان به خۆمان هێنا که ئێمه‌ش له خه‌ڵکی دیکه که‌متر نین؛ ئه‌وجا سه‌رده‌که‌وین. رێز و برایه‌تیم جه‌خت ده‌که‌مه‌وه.

**«به‌رلین ١٩٩٦/٦/٢٥»**

**رۆژنامه‌ی "کوردستانی نوێ"**

**ژماره (١٣٢٤)، ١٩٩٦/٧/٢**

# مەبەستم کۆماری فیدەراڵی کوردستانە نەکەمتر و نە پتر «هەموو ڕێیەکی ڕاست دەبێ بەرەو سەربەخۆیی کوردستان بچێ!»

**بەڕێز پارێزەر (محامی) هەڵۆ محەمەد سەلام** لە شاری لایپزیکەوەنامەیەکی بە هۆی ڕۆژنامەی **«سەکۆ»** وە ناردووە بۆم کە ڕۆژی ١٩٩٧/١/٢٠ ی لەسەر نووسراوە، بەڵام نامەکە لە ١٩٩٧/٣/١٦ دا کەوتە دەست من. هەڵۆ سەلام لە نامەکەیدا دەستخۆشی دەکا لێم بۆ ئەو بیرخەرەوە و نامانەی کە بۆ **بەڕێزان مەسعوود بارزانی و مام جەلال تاڵەبانی** نووسیبووم و، دەقەکانیان لە «سەکۆ» دا بڵاو کرابوونەوە. هەر لەو نامەیەشدا هەوڵی ئەوەی داوە بەپێی شارەزایی خۆی لە قانووندا هێندێك تێبینی لەبارەی زاراوەی «کۆماری فیدەراڵی کوردستان» کە لەلایەن منەوە بەکار هێنراوە، بخاتەڕوو. سەربەستیشی داوە پێم کە بۆچوونەکانی وی، یان لە سەکۆ دا بڵاو بکەمەوە، یان هەروەك نامەیەکی تایبەتی بۆخۆم بیدەمە قەڵەم.

سەرەتا سوپاسی بەڕێز هەڵۆ سەلام دەکەم بۆ خۆخەریککردنی بە کێشەی گرنگی «کۆماری فیدەراڵی کوردستان»ەوە و، هەر لەم ڕووەشەوە وام بە باشزانی کە ئەو ڕستانەی پێوەندییان بە تێبینییەکانییەوە هەیە، هەروەك خۆیان، لە گەڵ کەمێك ڕاستکردنەوەی هەڵەی ڕێنووسانە و ڕێزمانانەدا، بڵاو بکەمەوە، سەرنجی خۆشم لەوبارەیەوە بخەمە بەرچاو خوێنەرانی «سەکۆ».

بەڕێز هەڵۆ سەلام لە سەرەتای نامەکەیدا باسی فیدەراڵیزم دەکا کە چییە و چۆنە. پێدەچێ ئەم هاووڵاتە کە تازە لە کوردستانەوە هاتووەتە ئەڵمانیا، پێی وابێ کە ئەز نەزانم فیدەراڵیزم چییە، بۆیە کەوتبمە ئەو «هەڵە» یەوە کە زاراوەی «کۆماری فیدەراڵی کوردستان» م بەکار هێناوە. لەبەر ئەوە، هەرلە ئێستەوە ئەم بەڕێزە دڵنیا دەکەم لەوەی کە ئەز زۆر دەمێکە لە وڵاتی فیدەراڵیزم (ئەڵمانیا) دا دەژیم و دەزانم

فیدەراڵیزم چییە و مانای چییە. دوور نییە مەبەستی من لە نامە و بیرخەرەوەکانمدا سەبارەت بە «کۆماری فیدەراڵی کوردستان» تەواو ڕوشن نەبێ بۆی ، بۆیە بە پێویستی دەزانم کەمێك ڕوناکی بخەمە سەر مەبەستەکەم، بەلاّم با جارێ ئەو چەند تێبینییەی وی پێشانی خوێنەر بدەم. بەڕێز هەڵۆ دەنووسێ: «ئێستا دێمە سەر نامەکەی بەڕێزت»:

١) ــ ژمارە (١) لاپەڕە (٥): «هومێدی ئەوەش دەکرا کە بەڕاستی هەرێمێك دروست ببێ، ببێتە بنکەیەك بۆ کوردستانێکی سەربەخۆ، یان هیچ نەبێ کوردستانێکی فیدەراڵی».

کاتێك بەڕێزت دەڵێیت: «یان هیچ نەبێ کوردستانێکی فیدەراڵی»، بۆ خوێنەر (ەوە) وادەردەکەوێ کە بەڕێزت کوردستانێکی فیدەراڵی لە کوردستانێکی سەربەخۆ بە نەرمتر و کەمتر دادەنێیت، بەلاّم لەڕووی یاساییەوە کوردستانێکی سەربەخۆ یان کوردستانێکی فیدەراڵی هەردووکیان واتەی دەوڵەتی کوردی دەبەخشێ، بەڵکو کوردستانێکی فیدەراڵ بەرزتر و پێشکەوتووترە. بۆیە پێویست بوو بڵێیت: «ببێتە بنکەیەك بۆ کوردستانێکی سەربەخۆ یان هیچ نەبێ کوردستان وەك هەرێمێکی سەربەخۆ لە چوارچێوەی دەوڵەتی فیدەراڵی، واتە لە چوارچێوەی کۆماری عێراقی فیدەراڵی ئایندەدا.

٢) ــ ژمارە (١) لاپەڕە (٥): «بەکورتی یەکێکتان ببێتە سەرکۆماری عێراق و ئەوی دیکەتان ببێتە سەرکۆماری فیدەراڵی کوردستان». (ئەمە) لەڕووی یاساییەوە دەبێ بەم شێوەیە بێ: «بەکورتی یەکێکتان ببێتە سەرکۆماری عێراقی فیدەراڵ و ئەوی دیکەتان ببێتە سەرۆکی هەرێمی کوردستان»، چۆنکە (ئێمە) خاوەنی کوردستانێکی سەربەخۆ نین، لەشێوەی دەوڵەتێکی فیدەراڵ (دا) تاوەکو سەرۆك کۆمارمان هەبێ، گەر خاوەنیشی بین بەهیچ جۆرێك کوردێك مافی ئەوەی نییە ببێتە سەرۆك کۆماری عێراقی عەرەبی.

٣) ــ ژمارە (٢) لاپەڕە (٥) «پێویستە ئەمریکا دان بەبوونی کۆماری فیدەراڵی کوردستاندا بەڕسمی بنێ، کە کۆماری فیدەراڵی کوردستانیش دەبێ بەزوویەکی زوو داخۆیان (اعلان) بکرێ». ئێمە وەك کورد هیچ دەوڵەتێکمان دانەمەزراندووە تاوەکو داوا بکەین لە حکوومەتی ئەمریکا دان بە بوونیدا بنێ،

یاخود راگەیاندنی هیچ دەوڵەتێك، تاوەکو لە ئەمریکا داوا بکەین بەزوویەکی زوو داخۆیان (اعلان) بکرێ. بە بۆچوونی من مەبەستی جەنابت ئەو بڕیارەیە کە ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان ـــ پەرلەمانی کوردستان دەری کرد، کە تێیدا هاتبوو کە شێوەی پێوەندیی ئێمە وەك کوردلە گەڵ دەسەلاتی ناوەند لەسەر بنچینەی فیدەرالی دەبێ لە عێراقێکی دێمۆکراتی فیدەرالی پەرلەمانی یەکگرتوودا. بۆیە پێویستە لەسەر ئێمە داوا بکەین نەك تەنیا لە حکوومەتی ئەمریکا بەڵکو لە ئەنجومەنی ئاسایش و سەرجەم دەوڵەتانی تر کە دان بەم بڕیارەدا بنێن چۆنکە لە دەزگایەکی دێمۆکراسییەوە دەرچووە کە نوێنەرایەتی دانیشتوانی ئەو بەشە دەکات کە بە نێوچەی ئارام (هەرێمی ئاسایش» نێودەبرێ». بەمە وتەکانی هەڵۆ سەلام کۆتاییان هات، با بێینە سەر لێدوان لە تێبینییەکانی:

فیدەرالیزم، وەك بەڕێز هەڵۆ سەلامیش لە نامەکەیدا باسیکردووە، بریتییە یان لە دەوڵەتێکی یەکگرتوو، یان لە چەند دەوڵەتێکی یەکگرتوو، وێنە بۆ یەکەمیان ئەڵمانیایە و وێنەش بۆ دووەمیان (چەند دەوڵەتێکی یەکگرتوو) دەوڵەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە. بەلاّم ئەلمانیا هەر یەك وێنەیە بۆ یەکەمیان و، ئەمریکاش هەر یەك وێنەیە بۆ دووەمیان. وێنەی دیکەش بۆ هەردووکیان زۆرن. مەبەستم لە وێنە شێوەی فیدەراسیۆنەکەیە کە لە هەموو شوێنێکدا وەکیەك نییە. وشەی **فیدەراسیۆن لە Foederatio** ی لاتینییەوە هاتووە کە بەمانای **«یەکگرتن»** **Buendniss** یان **کۆمەڵە Vereingung** دێ. هێندێك جاریش بەمانای **پەیمان Vertrag** بەستنیش دێ. جا کە فیدەراسیۆن «یەکگرتن» بێ، دیارە یەکگرتن پێویستی بە پەیمانبەستنە و پەیمانبەستنیش (ئەگەر لە هەوا و کەشێکی ئازاد دا روو بدات) دەبێ بە دڵخوازی ئەو لایەنانە بێ کە یەك دەگرن. هەر لەبەر ئەوەشە شێوەی فیدەراسیۆن لە هەموو لایەك وەکیەك نییە. بۆ نموونە کۆمارە یەکگرتووەکانی سۆڤێتی کۆن و کۆمارە یەکگرتووەکانی یۆگسلاڤیای کۆن لە دەوڵەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا جیاواز بوون. کۆماری فیدەرالی چێك و کۆماری فیدەرالی سلۆڤاك، پێش جیابوونەوەیان بە ئاشتی و دامەزراندنی دوو دەوڵەتی سەربەخۆی چێك و سلۆڤاك، لە شێوەی فیدەراسیۆنی هێندێك لەوانەی دی جیاواز بوون. شایانی باسە دوو دەوڵەت بۆیان هەیە یەك بگرن بەشێوەیەکی

فیدەرالی، ئەوجا یەکێکیان دەتوانێ سیستەمی پاشایەتیی هەبێ و ئەوی دیـان سیستەمی کۆماریی هەبێ. بەلام با لێرەدا کەمێك سەرنجی دەولەتی یەکگرتوو (فـیـدەرال) و چەند دەولەتێکی یەکگرتوو (فـیـدەرال) بدەین و لە گەلْ یەك بەراوردیان بکەین:

لە دەولەتی یەکگرتوو (فیدەرال) دا چەند **ستانێك Land**، یان چەند هەرێمێك **Region** لە شێوەی رستەیەکدا یەك دەگرن. ئەلمانیا وێنەیەکی ئەم رستەیەیە، ئەوەتە خۆشی نێو دەنێ **Bundesrepublik Deutschland واتە رستە ستانی کۆماری ئەلمانیا**. وشەی **Bund** لە زمانی ئەلمانیدا بەمانای رست دێ، وەك دەبێژن **رستەکلیل Schluesselbund** بەکورتی ئەلمانیـا هەمـووی یەك کۆمارە و بریتییە لە رستەستانێك کە هەر ستانە پەرلەمانی ستانی و کابینەی وەزارەتی ستانی و سەرۆك وەزیرانی ستانی و پۆلیسی ستانی تایبەتی خۆی هەیە. بەلام هیچ ستانێك سوپای تایبەتی و سەرکۆماری نییە. کۆماری ئەلمانیا یەك سەرکۆماری هەیە و یەك سوپا. هەروەها سەرۆك وەزیرەکانی ستانەکان سەرۆکێکی گەورەیان هەیە کە سەرکردەی حکوومەتی رستەستانەکانە و، بەمەش دەگوترێ: **Bundeskanzler واتە سەرۆکی حکوومەتی رستەستانەکان**. وشەی **Kanzler** یش پێوەندیی بە وشەی **Kanzlei** یەوە هەیە و لە بنەڕەتدا مانای «جێی خزمەت» یان ژووری بەڕێوەبەرێتی» یە و لە زمانی ئەلمانی نێوەڕاستەوە **Mittelhochdeutsch** هاتووە. **عوسمانییەکان و قاجارییەکان** بەم جۆرە سەرۆك حکوومەتەیان دەگوت **«سەدری ئازەم» (صدر اعظم)**. کوردیش لە دەورانی کۆندا بەم سەرکردەیەیان دەگوت **«میری میران»** و بەو هەرێمەش کە خەلکەکەی یەکیان بگرتایە دەگوترا **«کۆمار»** کە وشەی «کۆمار»یش لە **«کۆم هەوار»**ەوە هاتووە. **«هەوار»** و **«وار»** لە زمانی کوردی دا بۆ شوێنی ژیان و جێی مانەوە بەکار هێنراوە. واتە نیشتمان **(سەرنجی وشەی کوردەواری ـــ کوردهەواری بدەن)**. زمانی عەرەبی وشەی **«کۆم هەوار»**ی وەرگرتووە و کردوویەتی بە **«کووم هور»** ئەوجا **«جمهور»** و ترك و فارسیش هەر بەو شێوەیە لە زمانی عەرەبییەوە وەریان گرتووە و بەکاری دەبەن. ئەوجا وشەی **«کۆمەلە»** یش لەزمانی کوردیدا هەر لە وشەی **«کۆمار»** ەوە دێ و، دەنگی ـــ **(ری)** لە کوردیدا کۆنتر و رەسەنترە لە

دەنگی **ڵ/ڵ (لیْ، لیْ)**. شوێنەواری ئەم کۆنێتییەش هەتا ئەوڕۆ لە زاری **کۆیە و هەولێر** و دەوروبەریدا هێشتا ماوە.

ئەم فیدەراسیۆنەی باسمانکرد، بابەتێکە لە ئۆتۆنۆمیی هەرێمی و بەکورتی بێژین: ئەوەیە کە لەنێو کوردی باشووردا بە «ئۆتۆنۆمیی راستەقینە» ناسراوە. ئۆتۆنۆمیش بریتییە لەوەی کە دەوڵەتی نێوەندیی (مرکزی) بەشێك لە دەسەڵاتی دەوڵەتیی خۆی بدا بە هەرێمێك یان چەند هەرێمێك لەو دەوڵەتەدا. ئەوجا مەرج نییە هەموو هەرێمەکانی ئەو دەوڵەتە ئۆتۆنۆمیدار بن. بەڵام کاتێك کە هەموو دەوڵەتەکە سیستەمی ئۆتۆنۆمیی هەرێمی پەسند کرد، ئەو حەلە بە هەرێمە یەکگرتووەکان (بەپێی بەیمان) دەگوترێ فیدەراسیۆن. ئالەم سیستەمەدا دەسەڵاتی نێوەندیی بەهێزتر دەبێ لە دەسەڵاتی تاکە تاکەی هەرێمەکان و، ئەوی شارەزای سیستەمی فیدەرالی ئەڵمانیا بێ ئەمە دەزانێ.

نموونەی دووەم بۆ فیدەراسیۆن، یەکگرتنی دوو دەوڵەت یان چەند دەوڵەتێکە لە گەڵ یەك بەشێوەیەکی فیدەرالی. ئەوجا مەرج نییە ئەو دوو دەوڵەتە یان ئەو چەند دەوڵەتە هەموو یەك جۆرە سیستەمی فەرمانڕەواییان هەبێ. دەشێ یەکێکیان کۆماری بێ و ئەوی دیبان پاشایەتی بێ **(وەك ئەوەی کاتی خۆی کۆماری یەکگرتووی عەرەب — میسر و سووریا لە گەڵ سەڵتەنەتی یەمەن یەکیان گرت)**.
بەڵام بە پێچەوانەی ئەوەوە کە بەڕێز هەڵۆ سەلام دەبێژێ «کاتێك بەڕێزت دەڵێیت: یان هیچ نەبێ کوردستانێکی فیدەرال، بۆ خوێنەرەوە وا دەردەکەوێ کە بەڕێزت کوردستانێکی فیدەرالی لە کوردستانێکی سەربەخۆ بە نەرمتر و کەمتر دادەنێیت، بەڵام لەڕووی یاساییەوە کوردستانێکی سەربەخۆ یان کوردستانێکی فیدەرالی هەردووکیان واتەی دەوڵەتی کوردی دەبەخشن بەڵکو کوردستانێکی فیدەرالی بەرزتر و پێشکەوتووترە ... هتد». لەوەرامدا دەبێژم هیچ کاتێك کۆماری فیدەرالی کوردستان لە کوردستانێکی سەربەخۆ بەرزتر نییە. چۆنکە فیدەراسیۆن یەکگرتنە و یەکگرتنیش لە هەموو بارێکدا لە سەربەخۆیی و ئازادی ئەو لایەنانە کەم دەکاتەوە کە یەك دەگرن. چۆنکە یەکگرتن پێویستی بە پەیمانبەستن و هاوبەشکاری «شراکة» یە، دیارە ئەوی پەیمانی بەستووە و کەوتووەتە هاوبەشکاریکردن، سەربەخۆیی و ئازادی کەمترە لەوەی کە سەربەخۆیە. ئەوجا کە بەڕێز هەڵۆ سەلام

دەبێژێت، پێویست بوو بڵێیت: «ببێت بە بنکەیەك بۆ کوردستانێکی سەربەخۆ یان هیچ نەبێ کوردستان وەك هەرێمێکی سەربەخۆ لە چوارچێوەی دەوڵەتی فیدەرالیدا واتە لە چوارچێوەی کۆماری عێراقی فیدەرالی ئایندەدا»، لە وەرامدا دەبێژم هیچ کاتێك کوردستان نابێتە «هەرێمێکی سەربەخۆ لە چوارچێوەی کۆماری عێراقی فیدەرالی ئاینده دا»، چۆنکە هیچ هەرێمێکی یەك دەوڵەتی فیدەرالی سەربەخۆیی وەرناگرێ، بەڵکومافی خۆبەرێوەبردن شتێکی دیکەیە و ئەو دوو شتە یەك نین. هەر وشە و زاراوەیەك لە زماندا واتە و سنووری خۆی هەیە. لەمەش بترازێ مەبەستی من ئەوە نییە کە باشووری کوردستان وەك هەرێمێکی دەوڵەتی عێراق بمێنێتەوە، چۆنکە ئەو مانەوەیە هەر جۆرە ئۆتۆنۆمییەکە و هیچی دی. لەبەر ئەوە ئەز لە گەڵ ئەمەدا نیم. ئەوجا بێینە سەر باسی کورد و فیدەرالیزم و بزانین مەبەستی من لە کۆماری فیدەرالی کوردستان چییە.

ئێمە دەزانین کە نێزیکەی پەنجاساڵی رەبەق بەشێکی زۆری خەڵکی کوردستان بە سەرکردەیەتیی حیزبە فەریکە «مارکسییە خۆ بە پێشرەو» زانەکانی رۆژهەڵات و باشوور و باکوور و رۆژاوای کوردستان، دەهۆڵ و زورنایان بۆ «ئۆتۆنۆمیی» کوردستان لێدا و، ئێمەمانانیان بە «کۆنەپەرست» و شۆڤێنی» و «جیابوونەوەخواز» و چی و چی دەدایە قەڵەم. چۆنکە بە پێچەوانەی وانەوە باسی سەربەخۆیی کوردستان و دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستانمان دەکرد. راستە کە رۆژگار دەریخست کە «ئۆتۆنۆمی» ــ وەك ئێمە دەمانگوت ــ بیرێکی چەوت و پووچەڵ و خەیاڵە خاوە، تێکۆشینی کوردی پەنجا ساڵ خستە دواوە. ئەوانە کە بۆ ئۆتۆنۆمی کەوتبوونە سەما و ملیۆنێك قوربانییان بە نەتەوەی ماڵوێرانی کورد دا بۆی، ئەوە نەدەچووە مێشکیان کە ئوتۆنۆمی بەرهەمێکی سیستەمی دێمۆکراتییە و تەنێ لە ولاتێکدا چاوەروانی دانی دەکرێ کە پەرلەمانێکی هەبێ و بە شێوەیەکی دێمۆکراتی هەڵبژێردرابێ. ئەو حەلە ئەو پەرلەمانە ئەگەر بیەوێ، ئۆتۆنۆمی دەدا بە هەرێمێکی ئەو دەوڵەتە و هەر لە دەوڵەتێکی لەو بابەتەشدا داوای ئۆتۆنۆمی دەکرێ. **دەوڵەتێك کە سیستەمی دیکتاتۆری هەبێ، ئۆتۆنۆمی نادات بە هیچ هەرێمێك، چۆنکە دیکتاتۆر لە هیچ بەشێکی دەسەڵاتی خۆی چاو ناپۆشێ و واز ناهێنێ. خۆ ئەگەر هاتو لە ئەنجامی زۆر و گوشارەوە ناچار بوو ئەوە بکات، ئەوا ئەو**

**ئۆتۆنۆمییەی کە دەیدات هەر بۆ ماوەیەك دەبێ و پاشان دەیسێنێتەوە.** رژێمی «عێراق» نموونەیەکی باشە بۆ ئەمە. بێجگە لەمەش هەموو جۆرە ئۆتۆنۆمییەك کە رژێمێکی نادێمۆکراتی بیدات، رەوایەتی (شرعیة) نییە و نابێ. کە واتە: **هەوڵدان بۆ ئۆتۆنۆمی لە لایەن حیزبەکانی کوردستانەوە کە لەژێر پێنج رژێمی ملهوڕی دیکتاتۆردا دەناڵێنێ،کارێکی نابەجێ و ناژیرانە و بێ ئەنجامە، وەك بە تاقیکردنەوەش ئیسپات بووە و، رەوایەتی قانوونیشی نییە چۆنکە رژێمی دیکتاتۆر ناڕەوایە و فەرمانەکانیشی ناقانوونییە.**

کێشەی فیدەراسیۆنیش هەروەك ئۆتۆنۆمییە، ئەگەر بە شێوەی یەکەم بێ، واتە کوردستان ببێتە **«هەرێمێکی فیدەڕاڵ»**. بێجگە لەوەش فیدەراسیۆن هەر بەتەنێ بۆ **«هەرێمی کوردستان»** نابێ و، ئەوەش لە حکوومەتی دیکتاتۆری سەددام و هیچ حکوومەتێکی دیکتاتۆری دیکە داوا ناکرێ. **بۆ دامەزراندنی فیدەراسیۆن دەبێ لە سنووری ئەو دەوڵەتەدا کە نێوی بە «عێراق» رۆیوە، رژێمێکی دێمۆکراتی بێتە پێشەوە و خەڵکەکە هەموو بە سەربەستی بڕیار بدەن بۆ ئەوەی، ئایە دەیانەوێ سیستەمی فەرمانڕەوایی لە هەموو عێراقدا ببێتە سیستەمێکی فیدەرالی یان نا، ئەوجا ئەگەر بێتو خەڵکی باشووری کوردستان دان بە رەوایەتیی «عێراق» دا بنێن وەك دەوڵەت و خۆشیان بە عێراقی بزانن، ئەوا ئەو دەمە مافی ئەوەیان نابێ داوای فیدەراسیۆن بکەن، ئەگەر هاتوو لەنیوەی پتری خەڵکی «عێراق» (عەرەب و کورد و ... هتد) واتە نیوە + ١ دەنگیان لە دژی سیستەمی فیدەرالی دا، ئەوساش دەبێ ئەو بڕیارەی کە پەرلەمانی باشووری کوردستان داوێتی بۆ ئەوەی پێوەندیی گەلی کورد بە دەوڵەتی نێوەندیی «عێراق» ەوە لە شێوەی فیدەرالی دا بێ، نرخی نەمێنێ و پووچ بێتەوە، چۆنکە گۆڕینی سیستەمی فەرمانڕەوایی لە عێراقدا لە سیستەمی نێوەندییەوە بۆ سیستەمی فیدەرالی بە دەست هەموو خەڵکی «عێراق» ە نەك تەنێ بەدەست کورد. ئەمە وەك گوتم ئەگەر هاتو کورد «عێراقێتیی» خۆی بەڕەوا زانی.**

ئەمەیان وا. بەڵام ئەز بە چاوێکی زانستانە و بابەتانە و لەڕووی بەرژەوەندیی جەماوەری زەحمەتکێش و بندەستی کوردەوە تەماشای عێراق و کوردستان دەکەم. هەرچی کوردستانە ئەوا ئەوە راستینەیەکی مێژوویی و جۆگرافیایی و ژیاری و فەرهەنگییە. ئەم کوردستانە وەك قارچك لەزەوی هەڵنەتۆقیوە. بەڵکو بەدرێژایی

چەند هەزار ساڵێك دروست بووە. چوارسەت ساڵ لەمەوبەر مێژوونووسی کورد **شەرەفەدینی بتلیسی** لە **«شەرەفنامە»** کەی دا باسی سنووری ناسیۆناڵی کوردستانی کردووە. کە لە تەنگەی هۆرمزەوە **(واتە لەو کەنداوەی کە فارس دەڵێن هی فارسە و عەرەبیش دەڵێن هی عەرەبە) دەستپێکردووە تا دەوروبەری زەریای سپی نێوەڕاست و لەوێشەوە هەتا چیاکانی قەفقاس کشاوە)**. ئەرێ، چوارسەت ساڵ لەمەو پێش، ئەو کاتەی کە هیچ گەلێك باسی سنووری ناسیۆناڵی خۆی نەکردووە و، دەوڵەتی ناسیۆناڵیش لە جیهاندا نەبووە، کورد باسی سنووری ناسیۆناڵی خۆی کردووە. شایانی باسە کە یەکەمین دەوڵەتی ناسیۆناڵیش لە رۆژهەڵاتی ناڤیندا پاشایەتیی باشووری کوردستان بووە بە سەرۆکایەتیی **«شێخ مەحموودی حەفید»**، ئەوەش پاش جەنگی جیهانیی یەکەم. جا لەبەر ئەوەی کورد نەیانتوانیوە دەوری دیرۆکی خۆیان بەباشی بگێڕن، ئەوا فرتوفێڵی چەند ملهوڕێکی وەك **رەزاخان و مستەفا کەمال و فەیسەڵی کوڕی حسەین** و بە پشتگیریی کۆلۆنیالیستە خوێنمژەکانی ولاتە پیشەسازییەکان، ئەم دەوڵەتە دەستکردانەی **«عێراق و ئێران و ترکیا و سووریا»** دروست بوون کە بوونیان هیچ رەوایەتییەکی قانوونی نییە. چۆنکە کورد بە زۆر کراون بە پێوەنددار(تبعة)ی ئەو دەوڵەتانە و خاکی کوردستانیش بە زۆر نووسێنراوە پێیانەوە. سەبارەت بەمە کورد مافی ئەوەی هەیە و پێویستە لەسەری هەموو هەوڵێك بەکار بهێنێ بۆ خۆ جیاکردنەوە لەم ولاتە دەستکردە بەناڕەوا دروستکراوانە. کە واتە رێی راست ئەو رێیەیە کە بەرەو جیابوونەوە و دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستان بچێ نەك خۆنووساندن بە دەوڵەتە داگیرکەرەکانەوە و، دروستکردنی رەوایەتیی ساختە بۆیان.

پەلاماری سەددام بۆ سەر کوێت و شەڕ دۆڕاندنی، هەلێکی باشی رەخساند بۆ بەشێك لە خەڵکی کوردستان کە لە سێ ستاندا **(هەولێر و دهۆك و سلێمانی)** بەوپەڕی سەربەخۆییەوە خۆیان بیەن بەرێوە. ئەو دۆخەی لەو چەند ستانەدا هەیە سەرەڕای هەموو شەڕ و تێکڕژانێکی گەوجانەی حیزبەکانی باشوور، هەروەها هاتنەکایەی پەرلەمانی کوردستان و حکوومەتی کوردستان و پۆلیسی کوردستان و سوپای کوردستان (هەر چەندە بەداخەوە لە شێوەی پێشمەرگەی ئەم حیزب و ئەو حیزبدایە) هەموو نیشانەی سەربەخۆیین. بەڵام سەربەخۆییەکی داخۆیان نەکراو.

لەبەر ئەوە کاتێك حکوومەتی باشووری کوردستان خۆی بە **«حکوومەتی هەرێمی کوردستان»** دەداتە قەڵەم کارێکی هەڵە ئەنجام دەدا، تەنانەت لەڕووی قانوونەوە ـ ئەو قانوونەی **بەڕێز هەڵۆ سەلام** خۆی پێوە گرێ دەدات ـ ـ چۆنکە هەموو حکوومەتێکی هەرێمی دەبێ پێوەندیی بە حکوومەتێکی نێوەندیی **«عێراق»** ەوە هەبێ، واتە دەبێ هەردوولا **«نێوەندیی و هەرێمی»** دان بە ڕەوایەتیی یەکدیدا بنێن. بەڵام لێرەدا نە **«حکوومەتی هەرێمی کوردستان»** دان بە حکوومەتی نێوەندیی عێراقدا دەنێ نە **«حکوومەتی نێوەندیی عێراق»** یش دان بە حکوومەتی هەرێمی کوردستاندا دەنێ. کە واتە **«زاراوەی حکوومەتی هەرێمی کوردستان» ناڕاستە** و، هەرێمی کوردستانیش لە شێوەی حکوومەتێکی سەربەخۆدایە. کەسانێکیش سەربەخۆییان دەستکەوتبێ ناچن خۆیان بکەنەوە بە دیل و بندەست، مەگەر ئەوەی زۆر ساویلکە بن یان مێشکیان لەکار کەوتبێ. جا ئێستە دوو ڕێ هەیەبەدەست خەڵکی **«هەرێمی ئاسایش»** ەوە لە باشووری کوردستاندا، یان ئەوەتە سەربەخۆیی خۆیان داخۆیان دەکەن، کە ئەوەتە ئەمەیان دەسەڵاتدارەکانی کوردستان، لەبەر هەر هۆیەك هەیە بیێ (باوەڕ بەخۆ نەکردن، ترسان، گوشاری دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، نەگونجانی هەلومەرجی نێودەوڵەتان ... هتد) مل نادەن بۆی. لەبەر ئەوە یەك ڕێ ماوەتەوە بۆ ئەوەی ڕەنجی گەلی کورد بە فیڕۆ نەڕوات و بڕیاری پەرلەمانی هەرێمی ئاسایش ـ یش فت نەبێتەوە، ئەو ڕێیە ئەوەیە هەرێمی ئاسایش ببێتە کۆمارێك و ئەو کۆمارە ئامادە بێ خۆی پێشان بدات بۆ یەکگرتن لە گەڵ دەوڵەتی «عێراق» بە شێوەیەکی فیدەرالی. واتە دوو دەوڵەتی کۆماری، بەشێوەی فیدەرالی یەك بگرن. خۆ ئەگەر دەوڵەتی عێراق ئەوەی نەویست، ئەوا دیارە کۆماری کوردستان بێداخۆیانیکردنی جیابوونەوە، جیا بووەتەوە. لەبەر ئەوەیە ئەز **«کۆماری فیدەرالی کوردستان»** م بەکار بردووە. ئەگەر نا مەبەستم ئەوە نییە باشووری کوردستان ببێتە هەرێمێکی فیدەرالی لە سنووری **«عێراق»** دا و ئەم بۆچوونەی خۆشم لە وتووێژێکدا لە گەڵ ڕۆژنامەی **«کوردستانی نوێ»** (ژمارە ١٣٢٤، سێ شەممە ١٩٩٦/٧/٢) بێ پێچوپەنا دەربڕیوە، کاتێك بە ئاشکرا باسی دەوڵەتی فیدەرالی کوردستانم کردووە: «هەر چەندە پەرلەمان دەزگەیەکی زاگۆنکاری (تشریعی) یە و دەزگەیەکی جێبەجێکاری (تنفیذی) نییە.

لە گەڵ ئەمەشدا دەبوو پەرلەمان هەر پاش ئەوە دەستوورێکی بنچینەیی کاتی بۆ هەموو باشووری کوردستان (نەك تەنێ بۆ هەرێمی ئاسایش) ئامادە بکردایە و بەپێی ئەوە دەسەڵاتەکانی سەرکۆمار و سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتی فیدەرالی کوردستانی دیاری بکردایە و، کۆمیسیۆنێکی پەرلەمانی بۆ هێنانەدی ئەم کارە پێك بهێنایە کە بە هاوکاریی لە گەڵ حکوومەتی کوردستاندا رۆژێك بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری فیدەرالی کوردستان دابنرایە و هەرێمی ئاسایش نێوی بنرایە **کۆماری فیدەرالی کوردستان و ئالای کوردستان لسەر هەموو شوێنە گشتییەکان بشەکایەتەوە و، بەپێی زاگۆنێکی تایبەتی، هێزەکانی پێشمەرگە بیوونایە بە سوپای کۆماری فیدەرالی کوردستان، ئەوجا دەست بکرابایە بە هەوڵدان بۆ رزگارکردنی شوێنەکانی دیکەی باشووری کوردستان، وەك مووسڵ و کەرکووك و خانەقین و کووت و نێوچەکانی خوارووی وڵات.** ئەمانە هیچیان تا ئەمڕۆ جێبەجێ نەکراون. **نازانم ئێمە چاوەڕێی چین؟ ئەگەر چاوەڕێی ئەوەین کە چەند عێراقییەکی گەجەر و گوجەری بێنێو و بێرابردوو سووت لە هەل وەربگرن و جێی سەددام بگرنەوە و، لوتف بفەرموون و ئەوجا دان بە «فیدەراسیۆن» ی کورد دا بنێن، یان رژێمی سەددام دەرزیی دێمۆکراتی لە خۆی بدا و بەرە بەرە بەرەسمی بناسرێتەوە و،ئەوجا دان بە «فیدەراسیۆن» دا بنێ، ئەوا دڵنیابن ئەوە خەیاڵ پڵاوییە. چۆنکە کوردەکە دەبێژێ: «مانگ هەر سەر لە ئێوارەوە دیارە». هەڵوێستی هێزە عێراقییەکان و، زۆربەی دراوسێکانی کوردستان و عێراق دەریخست کە ئەمانە بە فیدەراسیۆن رازی نابن. دوایی فیدەراسیۆن سیستەمێکە دەبێ هەموو وڵاتەکە (لێرەدا عێراق وەك دەوڵەتێك) بگرێتەوە. بەشێکی وڵاتێك ناتوانێ سیستەمی فیدەرالی هەبێ و بەشەکەی دی سیستەمی فیدەرالی نەبێ.** ئەوجا ئەو بڕیارەی کە پەرلەمانی کوردستان داوێتی بڕیاری نەتەوەی کوردە و پاشگەزبوونەوە لێی دژایەتییە لە گەڵ ویستەی نەتەوەی کورد. لەبەر ئەوە پێویستە بە زووترین کات پەرلەمان دەستوورێکی بنچینەیی بۆ کۆماری فیدەرال دابنێ و کۆماری فیدەرالی کوردستان لە کۆبوونەوەیەکی گشتی دا داخۆیان (اعلان) بکرێ و سەرکۆمار هەڵبژێردرێ.

ئەوجا ئەگەر رۆژیٚ لە رۆژان خەڵكی عیٚراق بەو سیستەمە رازی نەبوون، ئەوا دیارە لە ئیٚستاوە دەزانین ئەنجامەكەی بەچی دەگات. لەبەر ئەوە دەبیٚ هەر لە ئیٚستەوە خۆ ئامادە بكریٚ بۆ ریٚگرتن لە كارەساتی جەرگبڕ كە رەنگە بە پیٚشبینیكردن و ریٚبەستن لیٚی روو نەدات.

خۆم تا ئەو هەندازەیەی بیرم بڕ بكات پیٚم وایە زۆر زەحمەتە، ئەگەر نەبیٚژم لە نەبووانە، كە دەولەتیٚكی **«عیٚراقی»** دان بەوەدا بنیٚ كە **«عیٚراق»** ببیٚتە دەولەتیٚكی فیدەرالی. **چۆنكە ناسیۆنالیستە عەرەبەكان و شیعە موسڵمانەكان و موسڵمانە سونییە عەرەبەكان هەموو دژی سیستەمی فیدەرالن. تەنانەت تركمانەكان كە بە هۆی خەباتی كوردەوە هەموو جۆرە مافیٚكیان لە هەریٚمی ئاسایشدا هەیە، سەركردەكانیان (واتە ئەوەی نیٚونراوە بەرەی تركمانی عیٚراق) نەك هەر دژی سیستەمی فیدرەرالین، بەڵكو دژی ئەوەشن كە نیٚوی «كوردستانی عیٚراق» لە جیاتی باكووری عیٚراق بەكار بهیٚنریٚ (تەماشای دەربڕینەكانی عیسمەت قوجاق، نویٚنەری «بەرەی تركمانی» عیٚراق»، لە رۆژنامەی «الشرق الاوسط» ژمارەی رۆژی ١٩٩٧/٣/٢٤ دا بكە).**

بەلاٚم ئەگەر هاتو كۆماریٚك لە هەریٚمی ئاسایشدا دامەزرا و داخۆیان كرا و خۆی ئامادە كرد بۆ یەككگرتنیٚكی فیدەرالی لە گەڵ دەولەتی **«عیٚراق»** و هەلومەرجیٚك دروست بوو كە دەولەتی عیٚراق بە شیٚوەیەكی فیدەرال لە گەڵ كۆماری كوردستان یەككگرتنی فیدەرالی ساز بكات، ئەوا دیارە ئەوە هەنگاویٚك دەبیٚ بەرەو سەربەخۆیی، بەلاٚم ئەو دەمەش گەلیٚك كیٚشەی رامیاری و جۆگرافیایی دیٚنە پیٚشەوە. وەك كیٚشەی ئەو ستانانەی كوردستان كە جاریٚ لە ژیٚر دەسەلاٚتی كۆماری فیدەرالی كوردستاندا نین، وەك **كەركووك و مووسڵ و بەشیٚكی گەورە لە ستانەكانی دیالە و كوت و سەلاحەدین و عەمارە**. پاش ئەوەش كیٚشەی نیٚزیكەی ملیۆنیٚك و نیو پتر كورد دیٚتە پیٚشەوە كە لە بەغدا و ئەو شویٚنانەدا دەژین كە بەر «عیٚراق» دەكەون. هەروەها كیٚشەی كوردە فەیلییەكان. ئەو دەمە دیارە دەبیٚ كورد گەرەنتی ئەوەشی هەبیٚ كە سوپای تاوانبار و تیٚرۆریستی «عیٚراق» جاریٚكی دی پەلاماری كوردستان ناداتەوە و كەلی كورد بەر چەكی كیمیایی ناكەویٚ و ئەنفال ناكریٚ و ولاٚتەكەی ناكریٚ بە عەرەبستان.

**بە بیروڕای من تا هەموو کێشەکانی نێو کورد و «عێراق» چارەسەر دەکرێ و عێراق دەبێتە دەوڵەتێکی ئاشتیخواز و دێمۆکرات و مرۆڤدۆست، پێویستە سوپای شەڕخواز و دەستدرێژکەر و تاوانباری «عێراق» بخرێتە ژێر کۆنترۆڵەوە، ئەمەش بەوە دەبێ کە سەرکۆماری عێراق، یان سەرۆکایەتیی سوپای عێراق لە ژێر کۆنترۆڵی کورددا بێ.** ئەمەش داخوازییەکی ناڕەوا نییە و ئەوە ناگەیەنێ کە کورد بێنە فەرمانڕەوای عەرەب. **بەڕێز هەڵۆ سەلام** دەبێژێ: «بە هیچ جۆرێك کوردێك مافی ئەوەی نییە ببێتە سەرۆك کۆماری عێراقێکی عەرەبی!». ئەمە کاتێ راستە کە عێراق هیچ پێوەندییەکی فیدەرالی لە گەڵ کۆماری فیدەرالی کوردستاندا نەبێ و دەوڵەتێکی شەڕ هەڵگیرسێن و پەلاماردەر و جانەوەر نەبێ. **کاکی بەڕێز هەڵۆ سەلام،** قانوون لە هەموو کات و شوێن و هەلومەرجێکدا رەوایەتیی دروست ناکات. قانوون تا ئەو هەندازەیە رەوایەتی هەیە و جێی رێزە کە لە خزمەتی مرۆڤدا بێ. واتە ئازادی و یەکسانیی مرۆڤ بپارێزێ. ئەگەنە ئەگەر بێینە سەر **«قانوون پەرستی»** و رەوایەتی و قانوون وەك یەك تەماشا بکەین دەبینین هەموو ئەو دیکتاتۆر و تێرۆریست و ملهوڕ و هۆڤانەی فەرمانڕەوایی دەکەن و بکوژ و بڕ هەر خۆیانن، بۆ ئەنجامدانی کاری تاوانبارانەی خۆیان پشت بە **«قانوون»** دەبەستن. دیارە ئەو قانوونەی کە خۆیان دروستیان کردووە بەپێی بەرژەوەندیی خۆیان. ئەوانەی پەنجەی خەڵك لەسەر دزینی هێلکەیەك دەپەڕێنن و خۆشیان بە ملیۆن دەدزن، هەر خۆشیان بە دزییەوە هەموو جۆرە کارێك دەکەن کە بۆ خەڵکی دی بە **«ناڕەوا»**ی دادەنێن، کە ژنی بەدبەخت و بێچارەی لەسەر بەردەباران دەکەن، لەوەشدا هەر پشت بە «قانوون» دەبەستن. ئەو قانوونەی کە خۆیان دروستیان کردووە. **ئەگەر هەموو جۆرە قانوونێك پیرۆز بێ، ئەوا هیتلەر و مۆسۆلینی و فرانکۆ و سەددام و ستالین لە هەموو کەس پتر قانوونیان چاپ کردووە. بەعسییەکان بڕیارەکانی حیزبەکەیان بە قانوون دەزانن.**

ئەوجا کە گوتوومە پێویستە هەوڵبدرێ کە ئەمریکا بەڕەسمی دان بە بوونی کۆماری فیدەرالی کوردستاندا بنێ، ئەوا مەبەستی خۆم لە بەشی دووەمی رستەکەدا دەربڕیوە. کاتێك گوتوومە کە «کۆماری فیدەرالی کوردستانیش دەبێ بە زوویەکی زوو داخۆیان بکرێ»، ئاشکرایە مەبەستم ئەوە نییە کە کورد خۆیان هێشتا هیچیان

داخۆیان نەکردبێ، داوا لە ئەمریکا بکرێ، دان بە بوونیدا بنێ. ئەو پێوەندە کە هەردوو پارچەی رستەکە پێکەوە دەنووسێنێ، واتە ئەو دوو شتە پێکەوە روو بدەن. دیارە منداڵێکیش دەزانێ کە تۆ ژنەکەت هێشتا کچێکی نەبووبێ، ناتوانی بانگی بکەیت **«دایکی شیرین»**. مەبەستم ئەوەیە کۆمارێکی کوردستان بەو جۆرەی سەرەوە کە باسم کرد داخۆیان بکرێ و هاوکاتیش داوا لە ئەمریکا بکرێ وەك هێزی پارێزەری **«هەرێمی ئاسایش»** بەرەسمی دانی پێدا بنێ. دوایی من نەمگوتووە «داوا لە ئەمریکا بکەین دەوڵەتێك بە زوویەکی زوو داخۆیان بکرێ» وەك هەڵۆ سەلام تێی گەیشتووە. نە ئەمریکا و نە هیچ بیانییەکی دیکە دەوڵەتی کوردستان داخۆیان ناکات، بەڵکو کورد خۆی دەبێ داخۆیانی بکات. پاش ئەوەش تا دۆزی کورد لە چوارچێوەی **«عێراق»** دا بمێنێتەوە، هیچ دەوڵەتێك دان بە بوونی «ئۆتۆنۆمی» یان «فیدەراسیۆن» دا بەشێوەی یەکەم، نانێ، چونکە هیچ دەوڵەتێك مافی ئەوەی نییە دەست بخاتە کاروباری نێوخۆیی دەوڵەتی «عێراق» ەوە و ئۆتۆنۆمی و فیدەراسیون لە شێوەی یەکەمدا کاروباری نێوخۆن.

لە کۆتایی ئەم چەند دێڕەدا ئەوە جەخت دەکەمەوە کە هەموو جۆرە ئۆتۆنۆمییەك یان هەموو جۆرە فیدەراسیۆنێك کە لە سنووری «عێراق» دا دابمەزرێ، ئەنجامەکەی هەر پووچ دەردەچێ. تاکە رێیەك بۆ پاراستنی مافی کورد ئەو کۆمارە فیدەرالییەیە کە لە سەرەوە باسم کرد. ئەو جۆرە فیدەراسیونەی من باسم کرد لە فیدەراسیۆنی نێوان **«عێراق و ئەردەن»** دەچێ لە ساڵی ١٩٥٧ دا بەسترا. بەکورتی دەبێ کێشەی کورد لە کێشەی نێوخۆیی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە بکرێتە کێشەی نەتەوەیەکی بندەستی وڵات بەزۆر دابەشکراو، کە تەنێ لە سنوورێکی ئینتەرناسیۆناڵیدا چارەسەر دەکرێ. ▣

**«سەکۆ» ژمارە (٧)**

**مایسی ١٩٩٧**

# خاین و خیانەت و خیانەتکار و خیانەتکاری!

وشەی **خاین و خیانەت و خیانەتکار و خیانەتکاری** لەو وشانەن کە زوو زوو لەنێو کۆمەڵگەی کوردەواری و، وڵاتانی رۆژهەڵاتدا بەکار دەبرێن و، بوونەتە بنێشتەخۆشەی بندان. لەبەر ئەوە وام بە باش زانی کەمێك لە زاراوەی وشەی خاین و خیانەت و خیانەتکار و خیانەتکاری لەباری سەرنجی زمانەوانی و کۆمەڵایەتی و رامیاری و زاگۆنی (قانونی) یەوە بدوێم.

**«خیانەت»** کە بەزمانی عەرەبی **«خیانة»** یە و لە چاوگی **«خون» (خەون)** ەوە وەرگیراوە و، بە فارسی «خیانت» و بە ترکی **ئیخانەت ihanet** ە، بەلای خەڵکییەوە وایە کە وشەیەکی عەرەبی بێ و، گەلانی کورد و فارس و ترك لە زمانی عەرەبییەوە وەریانگرتبێ، بەڵام ئەم بۆچوونە بەلای منەوە راست نییە. بەپێی لێکۆڵینەوەی من، وشەی **«خیانەت»** لە بنەڕەتدا لە کوردییەوە خواستراوە و، بەم شێوەیەی خوارەوە:

لە زمانی کوردیدا وشەی خاپاندن **Xapandin** و **خەپاندن Xepandin** هەیە کە ئەورۆ بەزۆری کوردی باکوور بەکاری دەبەن. خاپاندن (خەپاندن) بەمانای تەفرەدان و فریودان و فێڵلێکردن دێ. رەگی خەپاندن دەچێتەوە سەر **«خپ xip»** کە تا ئەورۆش لە کرمانجیی ناڤین **(سۆرانی، موکریانی، ئەردەڵانی)** دا بەکار دەبرێ. بۆوێنە دەگوترێ: **«زللەیەکی لێدا خپی کرد»**، واتە بێ دەنگی کرد، هۆشی لەبەر برِی. **«خپ کردن»** لە زمانی فارسی دا بە شێوەی **«خەفە کەردەن» (خفه کردن)** دەرهاتووە، کە بە مانای **«تاساندن»** و **«خنکاندن»** و **«دەنگلێبڕین»** دێ. هەرچی وشەی **«خەپاندن»** ە ئەوا بووە بە **«خەفاندن»** و ئەوجا **«خەڤاندن»**، کە لە کرمانجیی ناڤیندا شێوەی **«خەواندن»** ی گرتووە، واتە **«نواندن» و خەولێخستن» و «خستنە خەو»**. ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە چاوگی وشەی **«خیانەت»** لە زمانی عەرەبیدا ــ وەك لەسەرەوە باسکرا ــ **«خون»**، **«خەون»** ە. لێرەدا پێویستە ئەوە بێژین کە دەنگی **پێ P** لە وشەی خەپاندندا بووە بە **فێ F** و بە

شێوەی **«خەفاندن»** دەرکەوتووە و، ئەم خۆگۆڕینی **«پیٚ»** یە بۆ **«فیٚ»** لە زمانی کوردی و زمانە ئێرانییەکان و تەنانەت نائێرانییەکانیشدا، هەیە. بۆوێنە وشەی «سپلە» (واتە: پێنەزان)، لەزاری هەولێریدا بووە بە «سفلە». هەروەها وشەی «پەند» بووە بە «فەن» (سەرنجی وشەی فەن و فێلّ بدەن واتە پەند و **فێلّ**). ئەوجا زمانی عەرەبی وشەی **«پەندی»** کوردی کردووە بە **«فن»** و بە مانای **«هونەر»** بەکاری دەبا. هەروەها وشەی **«باپشتیان»** کە ناوی شوێنێکە لە باشووری کوردستان، لە زمانی عەرەبیدا بووە بە **«بافیستان»** و **«پێشخابوور»** بووە بە **«فیشخابوور»**. شایانی باسە کە دەنگی **«پیٚ P»** لە دەنگی **«فیٚ F»** کۆنترە و، زمانی کوردی بە پێچەوانەی فارسییەوە ئەم کۆنینەیەی پێوە دیارە. بۆوێنە وشەی **«پەرپووت»ی کوردی و «فرتووت»** (فرتوت)**ی فارسی و «پاڵە»ی کوردی و «فەعلە»** (فعلە)**ی فارسی و «پیرۆزە»ی کوردی و «فیروزە»ی فارسی و «پلیتە»ی کوردی و «فتیلە»ی فارسی و «پووکان» و «پووکانەوە»ی کوردی و «فرسودن»ی فارسی و «پۆلا»ی کوردی و «فولاد»ی فارسی و عەرەبی، لە گەلّ یەك بەراورد بکەین.** زمانی فارسی تاك و تەرا دەنگی «پیٚ» ی لەبری «فیٚ» بەکار هێناوە، وەك لەم هۆنراوەیەی خوارەوەدا دەردەکەویٚ کە چەند سەت ساڵێك لەمەوبەر گوتراوە:

سرچشمه شاید گرفتن به بیل چو پر شد، نشاید گذشتن به پیل

واتە: سەری کانی لەوانەیە بە بێڵێك بەری بگیریٚ، بەڵام کە پڕ بوو، فیلێکیش خۆی بداتە بەر ناتوانیٚ بیگریٚ.

لێرەدا **«پیل»** لە جیاتی **«فیل»** بەکار هێنراوە.

کە واتە گۆڕانی وشەکە بەم شێوەیەی خوارەوە بووە:

لە «خاپاندن» ەوە بۆ «خەفاندن» و، دوایی بووە بە «خەواندن»، ئەوجا «خەون «خون». لێرەدا دەبیٚ ئەوەش کەبێژم دەنگی **«فیٚ F»** و **«ڤیٚ V»** لە زمانی کوردی دا زۆر جێگۆڕکیٚ دەکەن. بۆوێنە خەڵکی باشوور دەبێژن: **«قسە لە قافی خۆیدا بکە» واتە «قسە لە گاڤی خۆی دا بکە»** (گاف بەمانای کات دیٚ لە زاراوای کوردیی باکووردا). هەروەها دەنگی **«ڤیٚ V»** و **«ویٚ W»** بەزۆری لە باکوور و باشووردا لە جێی یەك بەکار دەبرێن. وەك **«چاو و چاڤ، هەنگوین و هەنگڤین (هنگڤ)»** و ... هتد.

ئێستا زانیمان کە وشەی **خەواندن بنچینەکەی خەپاندن** ە و خەواندنیش بە مانای خستنە خەو و نواندن بەکار دەبرێ. ئەوجا کە تۆ یەکێك بخەوێنیت (بینوێنیت)، واتە بیخەیتە خەو، مانای وایە هۆش لەبەر ئەو کەسە دەبری و، ئەگەر نیازێکی خراپەکاریت هەبێ لە دژی ئەو کەسە، ئەوا لە کاتی خەوتندا هەرچییەك بکەیت لێی، ئاگای لە خۆی نابێ، هەر لەمەشەوە خیانەت و خیانەتکاری سەری هەڵداوە. پێویستە لێرەدا بگوترێت کە بۆ خەواندنی کەسێك واتە بێهۆشکردنی بە مەبەستی خراپەکردن دژی ئەو کەسە لە لایەن تۆوە، جارێ دوو مەرج پێویستن: ١ـ نیازی خراپەکاری بەرامبەر بەو کەسە لە لایەن تۆوە. ٢ـ بوونی هۆشیاریی تەواو، واتە دەبێ تۆ بە تەواوی بزانیت کە ئەو کارەی تۆ بەرامبەر بەو کەسە دەیکەیت، خراپەکارییەکی ناڕەواییە بەرامبەر بەو کەسە. هی وا هەن ئەم خراپەکارییە ناڕەوایە لە هەموو دۆخ و بارێکدا بە **«خیانەت»** دەدەنە قەڵەم.

کە واتە بە پێی ئەم باسەی سەرەوە تا ئێستا ئەوە ڕۆن بووەوە بۆمان کە خیانەت کردن بریتییە لە کردنی کارێکی خراپ، یان هەوڵدان بۆ کردنی ئەو کارە لە لایەن کەسێکەوە، یان کەسانێکەوە، بەرامبەر کەسێکی دیکە، یان کەسانێکی دیکە بە نیازی خراپەکاری و بەوپەڕی هۆشیارییەوە. ڕاستییەکەی زۆر کار هەن کە کردەوەی گوناهبارانە، یان تاوانکارانەن، کە لە هەڵە و نەزانی و بەسەرچوون و کەمتەرخەمی و گوێنەدانەوە ڕوو دەدەن و، بەهیچ جۆرێ خیانەتکاری نین. بۆوێنە ئەگەر تۆ چوویت بۆ لای دوکتۆرێك و گوتت: «زگم دێشێ» و، ئەویش ناچار بوو بێ هۆشت بکا بۆ ئەوەی ئامێرێك (آلـة) لە گەرووتەوە بیاتە نێو **«گەدە»** ت، تاکو هەست بە ئێش و ئازار نەکەیت و، تۆ لە ئەنجامی ئەو بێ هۆشکردنەوە مردیت (با بێژین دوکتۆری بێهۆشکەر هەڵەیەکی کردبوو، سا یان لە کەمتەرخەمی، یان لە مشوور نەخواردن، یان لە کەمزانینەوە)، ئەوا بەو کارە ناگوترێ «خیانەت»، چۆنکە نیازی ئەو دوکتۆرە ئەوە نەبووە بەوپەڕی هۆشیارییەوە و بە مەبەستی خراپەکاری، ئەو کارە بەرامبەر تۆ بکات. دیارە دادگە سزای دوکتۆرەکە دەدات، بەڵام وەك گوناهبارێك نەك وەك خیانەتکارێك و تاوانبارێك.

سەرەڕای ئەمەش، هەموو کارێکی خراپ کە بە نیازی خراپەکاری و، بەوپەڕی هۆشیارییەوە بکرێت، مەرج نییە ببێتە خیانەت. بۆنموونە تۆ بە بیابانێکدا

تێدەپەڕیت و تینووت دەبێ و، ئاویش دیار نییە لێتەوە. لەپڕ کابرایەك دەردەکەوێ و دەزانێ تۆ بەدوای ئاودا دەگەڕێیت، دەبێژێ: فەرموو وەرە با بچین بۆ ماڵی ئێمە کە لێرەوە دوور نییە، لەوێ ئاو بخۆرەوە، تۆش کە لە تەنگانە دایت، بیر لە هیچ ناکەیتەوە، تەنانەت سوێندێکی کابرا بدەیت، یان بەڵێنێك وەرگریت لێی کە هیچت بەسەر نایە، ئەگەر بێتو لە گەڵی بچیت، یەکسەر دەڵێیت باشە. ئەویش دەتباتە ماڵەوە و، لەوێ رووتت دەکاتەوە. ئەو کابرایە ئەگەر بشزانێت ئەو کارەی بەرامبەر تۆ کردوویەتی کارێکی خراپەکارییە و، بەنیازی خراپەکاریش کردوویەتی، هێشتا هیچ جۆرە خیانەتێکی لە تۆ نەکردووە و، کارەکەشی کارێکی خیانەتکارانە نییە، بەڵکو تاوانبارانەیە، چۆنکە هیچ دەروێستی (التزام) یەك لەنێوان تۆ و ئەودا نەبووە کە جۆرە متمانەیەك لە نێوانی تۆ و ئەو کابرایەدا دروست بکات و بتانبەستێ بە یەکەوە.

کە واتە بۆ کارێکی خیانەتکارانە، یان هەڵوێستێکی خیانەتکارانە، بێجگە لە خراپەکاری بە نیازی خراپەکاری و، بەوپەڕی هۆشیارییەوە، مەرجێکی دیکەش پێویستە کە زۆر گرنگە و، ئەوەش بوونی پێوەندییەکە لەنێوان خراپەکەر و خراپەلێکراودا کە لەشێوەی دەروێستییەکدا دەردەکەوێ، واتە بوونی پەیمانێك. شایانی باسە کە مەرج نییە پەیمان هەر بە نووسین و لەسەر کاغەز بێ. **«پەیمان»** بە شێوەی دەمیش دەبێ، لە قاڵبی رێکەوتن، یان بەڵێندا. دووکەس کە هاوڕێیەتییان لە گەڵ یەك بەست، ئەوا دیارە کە پەیمانی هاوڕێیەتی دەکەوێتە نێوانیانەوە. ئەگەر هاتو یەکێکیان لە پشتەوە دزانە و هۆشیارانە لەوی دی سرەواند، ئەوە خیانەتی کردووە بەرامبەری. بەکورتی «پەیمان» هەیە لەشێوەی پێوەندییەکی زاگۆنی (قانونی) دا و، پەیمانیش هەیە لە شێوەی پێوەندییەکی میناکی (اخلاقی، معنوی، مۆرالی) دا. بەڵام شکاندنی پەیمان (چ ماکی و چ میناکی) لە لایەن لایەنێکی پەیمانەکەوە، بی ئەوەی ئەو لایەنە بە لایەنەکە، یان لایەنەکانی دیکەی راگەیاندبێ کە وا لە پەیمانەکە دەرچووە، کارەکەی دەبێتە خیانەتکاری.

**کە واتە بۆ خیانەتکاری سێ مەرج پێویستن: ١ــ بوونی نیازی خراپەکاری. ٢ــ بوونی ئەوپەڕی هۆشیاری. ٣ــ بوونی پێوەندییەك لەنێوان خراپەکەر و خراپەلێکراودا.**

خۆ ئەگەر یەکێك لەو مەرجە نەبوو، ئەوا ئەو کارە خیانەتکاری نییە، بەڵکو جۆرێکە لە گوناهباری، یان تاوانکاری، یان تۆڵەسەندنەوە ... هتد. بۆ وێنە: کرمانجێکی گوندیی نەخوێندەواری هەژار، چەند ساڵێك تفەنگ هەڵدەگرێ بۆ حیزبێك لەم حیزبانەی کوردستان و، دەکەوێتە کەژ و کێو و، ژن وماڵی خۆی بەجێ دێڵێ و، هەرچەند مانگ جارێك شەوێك بەدزییەوە و بە ترسولەرزێکی زۆرەوە دێتەوە بۆ سەردانی ژنەکەی. بەڵام جارێکیان کەدەگەڕێتەوە کۆخەکەی خۆی! دەبینێ ژنەکەی دیار نییە. لە ئەنجامی پرسیار و بەدواگەڕاندا بۆی دەردەکەوێ کە **«هاورێ حیزبییەکانی»** ژنەکەیان هەڵگێڕاوەتەوە لێی و، لە گەڵ خۆیان بردوویانە. کابرا لەوە تووترکەسەر دەبێ و، لەبەر ناهۆشیاری، ئەوە لێك ناداتەوە کە ئەگەر ژنەکەی دڵی گۆڕیبێ لێی و نەخوازێ لەگەڵی بژی، ئەوا پێویست ناکا ئەو چی دی لەسەری بڕوا. دوایی هەر لەبەر ناهۆشیاری، ناچێ ئۆباڵی ئەم کارە ناڕەوایە کە بەرامبەری کراوە بخاتە مل ئەو چەند هاورێ حیزبییانەی کە ئەم کارەیان کردووە، بەڵکو گوناهی هەموو پێشمەرگەیەك و هەموو حیزبییەك دەگرێ و، دەبێتە ئەو کەسەی کە لەنێو خەڵکیدا بە «جاش» نێو دەبرێ. کردەوەی ئەم کابرایە بەرامبەر بە پێشمەرگە و حیزبەکەی خۆی، شکاندنی پەیمانی پێشمەرگایەتی و حیزبایەتییە، بەڵام ئەم کابرایە خیانەتکار نییە، چونکە ئەو کارە بە هۆشیاری ئەنجام نادات. هۆشیاری ئەم کابرایە هەر هێندە بڕ دەکات کە ئاوڕووی تایبەتی خۆی لە ئاوڕووی پێشمەرگایەتی بەرزتر بگرێ و، ئۆباڵەکەشی نەخاتە مل ئەوانەی لەم کارەدا دەستیان هەبووە، بەڵکو بیخاتە مل هەموو پێشمەرگە و هەموو حیزبییەك.

کە شای ئێران لە مانگی مارتی ١٩٧٥ دا و لە پڕ، دوای رێککەوتنی لە گەڵ سەددام هەر لەو مانگەدا لە جەزائیر، یارمەتی لە سەرکردایەتیی شۆرشی کورد بڕی و، شۆرش هەرەسی هێنا، خەڵکی دەیانگوت: **«شا خیانەتی کردووە بەرامبەر کورد»**. راستییەکەی شای ئێران هیچ خیانەتێکی بەرامبەر بە کورد، یان سەرۆك بارزانی نەکردبوو. کورد و شای ئێران دوو نەیاری یەك بوون، هەر لایەنە دەیویست لایەنەکەی دیکە دابدۆشێ و، هیچ جۆرە دەرونێستییەك و پەیمانێك لە نێواندا نەبوو. کاتی خۆشی کە سەرۆك بارزانی لە مارتی ١٩٧٠ دا لە گەڵ بەعسییەکان رێککەوت، هیچ پرسێکی بە شای ئێران نەکرد، چۆنکە خۆی بە

دەروێست (ملتزم) نەدەزانی. ئەوجا کورد ساویلکە بوون و، شای ئێران توانی دەستیان ببڕێ، ئەوە خیانەتی شای ئێران نەبوو، گوناهی سەرکردەکانی کورد بوو کە ئەو کارەساتەیان بەسەر کورد هێنا. ئەو ساویلکەیەتی و نەزانییە ئێستەش لە سەرکردایەتیی کورددا هەرماوە، وێنەکانیشی لە هەڵوێستی سەرکردایەتیی حیزبەکانی کوردستاندا بەرامبەر بە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان بەچاوی خۆمان دەبینین. کورد هیچ سووتێکی لە رابوردووی پڕکارەساتی خۆی وەرنەگرتووە. **ئێمە لە کاتێکدا کە چاو لە دڕندەیی و گیانی دژ بە مرۆڤایەتیی داگیرکەرانی کوردستان و، یارمەتیدەرانیان ناپۆشین، دەبێ هەڵە و ناتەواوی و گەوجی و ژنەهاتێتیی و کردەوەی خراپی تاوانبارانەی خۆشمان وەك کورد بخەینە بەرچاو، ئەگەر نا هەروەك گا لە پێستی خۆماندا دەمێنینەوە.**

جا لەبەر ئەوەی لەنێو کوردەواریدا وشەی خاین و خیانەتکار بەزۆری لە سنوور و کەوشەنی هەڵسوکەوتی نیشتمانیدا بەکار دێ، دەبێ بەرلە هەموو شتێك ئەوە بزانین کە هەموو تاکە کوردێك و هەموو کوردستانییەك، سا ئەو کوردە، یان ئەو کوردستانییە، مرۆڤێکی سەربەخۆ بێ، واتە ناحیزبی بێ، یان لەنێو کۆمەڵێك، یان رێکخراوێکدا کار بکات، پێویستە لەسەری لەڕێی نیشتمانپەروەری لا نەدات. چونکە هەموو کوردێك و هەموو کوردستانییەك دەروێستییەکی ماکی و مینۆکی (مادی و معنوی)، یان بەلایەنی کەمەوە، دەروێستییەکی مینۆکی بە نەتەوەی کورد و نیشتمانی کوردستانەوە هەیە، کە ئەوەش شتێکی خۆڕسکییە و لێدوانی پێناوێ. جا ئەگەر هاتوو تاکە کوردێك، یان حیزبێکی کوردی، یان رێکخراوێکی کوردستانی، هەڵوێستێکی خراپەکارانەی بەرامبەر کورد و کوردستان نواند، بەنیازی خراپەکاری و، بەوپەڕی هۆشیارییەوە، ئەوا ئەو هەڵوێستەی بە هەڵوێستێکی خیانەتکارانە دەژمێردرێ. چونکە هەموو کوردێك و، هەموو حیزبێکی کوردی و، هەموو رێکخراوێکی کوردستانی، دەبێ بەرژەوەندیی نەتەوەی کورد و نیشتمانی کوردستان لە هەموو کاتێك و لە هەموو بارودۆخێکدا، بخاتە سەروو بەرژەوەندیی تاکە تاکەی خەڵك و حیزب و رێکخراو و هۆز و تیرە و بنەماڵە و باژێر و گوند و هەرێمێکی کوردستانەوە. **جا ئەگەر تاکە تاکەی خەڵك هەبن کە هۆشیاری سیاسییان نەگەیشتبێتە هەندازەیەك کە نیشتمانپەروەری و خیانەت لە یەك جیا**

**بکەنەوە، ئەوا کەس ناتوانێ پاکانە بۆ سەرکردەکانی حیزبەکانی کوردستان بکات، ئەگەر کارێکی دژ بە نیشتمانیان کرد، بێژێ هۆشیاری سیاسییان نییە. ئەگەر هاتو سەرکردەی حیزبێك هۆشیاری سیاسی نەبێ، ئەوا مافی سەرکردایەتی نییە.**

شتێکی زۆر رۆنە کە هەموو حیزبێکی کوردی و کوردستانی، رەوایەتی (شرعیة) ی بوونی خۆی تەنێ لە دەروێستیدا بەرامبەر بە بەرژەوەندیی نیشتمان (کوردستان) وەردەگرێ. ئەگەنا لە هەموو جیهاندا ولاتێك نابینیت کە زاگۆنی ئەو ولاتە رێ بدات حیزبێکی بیانی، یان لەشکرێکی بیانی لەو ولاتەدا و، بۆ بەرژەوەندیی ولاتێکی دی کار بکات. جا لەبەر ئەوەی ئەورۆ کوردستان دەولەتێکی سەربەخۆ نییە و، بەسەر پێنج داگیرکەری دڕندەدا دابەشکراوە، دیارە ئەم دەولەتانە لە پالْ دابەشکردنی ناڕەوای کوردستاندا، خیانەتیش لە کورد دەکەن، چۆنکە کورد وەك «هاونیشتمان» ی خۆیان دەدەنە قەلەم و، لە زاگۆنە بنچینەکانیاندا بۆ هاونیشتمانانی خۆیان مافی وەکیەك دەستنیشان دەکەن، کەچی بە پێچەوانەوە، ئەم دەروێستییە زاگۆنییەی خۆیان بەرامبەر بە کورد بەجێ ناهێنن و، بۆ نەمانی کورد بە هەموو رێیەکی ناڕەوا هەولْ دەدەن.

**بەتایبەتی ئەورو کە بەشێك لە باشووری کوردستان بەنێوی «هەرێمی ئاسایش» ەوە،بەسایی هەلومەرجی نێوچەیی و نێونەتەوەییەوە کەوتووەتە دەست دوو حیزبی گەورەی کوردستانی ( پارتی دێمۆکراتی کوردستان ویەکێتیی نیشتمانیی کوردستان) و حیزبێکی گچکە (بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستانی عێراق) و لەشکری داگیرکەری تێدا نەماوە، دەرفەتێکی باش هەلْکەوتووە بۆ سەپاندنی مافی کورد لە باشووردا، لەبەر ئەوە هەموو جۆرە هاوکارییەك لە گەلْ هەر داگیرکەرێك، بە مەبەستی هێنانی لەشکری دەولەتێکی داگیرکەری کوردستان بۆ «هەرێمی ئاسایش»، هەلوێستێکی خیانەتکارانەیە و، تەنانەت ئەگەر حیزبێکی کوردستانی لە لایەن حیزبێکی کوردستانیی دیکەوە بەجۆرێك تەنگاو کرابوو، کە مەترسی نەمانی لا ئاشکرا بوو، ئەو دەمەش ئەو حیزبە مافی ئەوەی نییە لەشکرێکی داگیرکەر کێش بکاتە «هەرێمی ئاسایش»، چۆنکە هێنانی لەشکری بیانی (بەتایبەت داگیرکەر) بۆ کوردستان خیانەتێکی نیشتمانییە.**

لە ١٩٩٦/٨/٣١ دا پارتی لەشکری سەددامی کوردستان داگیرکەری دژی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و، جارێکی دی لە ١٩٩٧/٥/٤ دا لەشکری ترکی کوردستان داگیرکەری کوردکوژی هێنایە سەر **«هەرێمی ئاسایش»** لە دژی پارتی کارکەرانی کوردستان).

ئەز لێرەدا نەبۆ **یەکێتیی** دەپارێمەوە و، نەبۆ **«پی کی کی»** پاکانە دەکەم. بەلاّم هەموو خراپەکاری و ناجسنی و زارۆبازارییەکی ئەم دوو حیزبە، هەر چەندێك قورس و گران بن، هێشتا بایی ئەوە نین کە پارتی پەنا بەرێتە بەر لەشکرێکی داگیرکەری کوردکوژ و بیهێنێتە «هەرێمی ئاسایش» بۆ زالبوون بەسەر ئەم دوو حیزبەدا، کە ئەمە بێجگە لە پێویستیی ئاماژەکردن بۆ هەلوێستی خیانەتکارانە و، راستکردنەوەی پشتی شکاوی سەددام و، بەهێزکردنی هێزی ترك و، زیان گەیاندنێکی گەورە بە دۆزی کورد لە سنوورێکی جیهانیدا، ئەو راستییەش دەبێ بخرێتە بەرچاو کە **«زالبوون»** ی حیزبێکی کوردستانی بەسەر حیزبێکی کوردستانیی دیکەدا بە پشتگیری داگیرکەرێکی کوردستان، **«زالبوون»** و **«سەرکەوتن»** نییە، بەلکو ژێرکەوتن و نابووتی و خۆکوژییەکی لەسەرخۆیە. چونکە داگیرکەرانی کوردستان دوژمنی تاکە حیزبێك نین، بەلکو دوژمنی هەموو نەتەوەی کوردن و، هەولی نەمانی هەموویان دەدەن، بەلاّم بەرێزە و یەك لەدوای یەك.

کە پارتی پەنای بردە بەر سەددام و، لەشکری سەددامی هێنایە کوردستانەوە، بە بیانووی ئەوەی کە **«سەروەرێتیی عێراق»** لە مەترسی رزگار بکات بەرامبەر بە **«مافی بوونی پارتی»**، پارتی بەمە رەوایەتیی خۆی وەك حیزبێکی کوردستانیی خستە بەردەم نیشانەی پرسیارەوە، **چونکە یەکەم: بوونی «سەروەرێتیی عێراق» لە کوردستاندا مانای نەبوونی «سەروەرێتیی کوردە لە نیشتمانەکەی خۆی دا». حیزبێکی کوردستانی کە «سەروەرێتیی عێراق» بپارێزێ، ئەو عێراقەی کە دەستکردی فرۆفێلی ئیمپریالیزمی بەریتانیایە و، لەشکری تیرۆریستی عێراق باراستوویەتی و دەیپارێزێ، خۆیایە کە ئەو حیزبە مافی ئەوەی نامێنێ باسی کوردستان بکات.** دووەم: **«مافی بوون و ژیانی پارتی لە سەددام داوا ناکرێ»، سەددامی ئەنفال و چەکی کیمیایی و تونەرەوەی سەت و هەشتا هەزار کورد و هەشت هەزار بارزانی کە ئەمانە هەموو کەسوکاری برای بەرێز کاك مەسعوود**

**بوون، سەددام تاوانباری دوو جەنگی قڕکەرە.** کاتی خۆی لە نامەی ڕۆژی ١٤/٩/١٩٩٦ دا بـۆ کاك **مەسعوود** نووسیبووم کە **«مـافی مـان و ژیانی حیـزبێکی کوردستانیی لە نەتەوەی کورد داوا دەکرێ نەك لە سەددام. بێگومان ئەو مافە لە ترکە تورانییەکانیش داوا ناکرێ».**

کاتی خۆی کە **بەڕێوەبەری پێشووی دەزگەی هەواڵگوزاری (استخبارات) ی عێراق وەفیق سامەرایی** لە ڕۆژنامەی **«الحیاة»** دا هەڵیکوتابووە سەر **برای بەڕێز کاك مەسعوود** و، لەنێو گەلێك تۆمەتدا کە خستبوویە پاڵ کاك مەسعوود، گوتبووی: کاك مەسعوود «شەڕی ڕژێمی بەعسی نەکردووە و، داوای لە کاك مەسعوود کردبوو بە ئاشکرا بلاوی بکاتەوە کە دژی ڕژێمی سەددام حسەین» ە. (ڕۆژنامەی الحیاة ٥/٨/١٩٩٥)، نامەیەکم نووسی بۆ «الحیاة» (ڕۆژی ١٥/ ٩/١٩٩٥ نامـەی **الدیموقراطیة السامرائیة**) و، بە خەستی لەسەر کاك مەسعوودم کردەوە، نەك لەبەر خاتری کاك مەسعوود، بەڵکو پێم وابوو کە کاك مەسعوود بەڕاستی دژی ڕژێمی سەددامە و، قوڕم دا بەدەمی وەفیق سامەرایی دا. بەلاّم کاك مەسعوود ساڵێك و دوو مانگ دوای ئەوە، تۆمەتەکانی کۆنە دەسکەلای دەستی سەددام، ڕەفیق سامەرایی، هێنایە سەر خۆی، داخی گرانم.

لە هەمووی سەیرتر ئەو بیانووە کرچوکاڵ و زرکەیە کە سەرکردەکانی پارتی دەیهێننە پێشەوە بۆ پاساودانی هێنانی لەشکری ترك بۆ «هەرێمی ئاسایش»، ئەوەش ئەوەیە کە **«پی کێ کێ»** حیزبی باشووری کوردستان نییە و، جێی چالاکیی پی کێ کێ باکووری کوردستانە و، دەبێ لە باشوور بچێتە دەرەوە. **ئەم بیانووە نەك هەر تەنێ نانیشتمانپەروەرانەیە، بەڵکو زۆر سادە و ساویلکانەشە. باشە کە باشووری کوردستان (کە لەو داخۆیانییانەدا کە پارتی لە دەرەوەی کوردستان دەریدەکات، بەتایبەتی لە ئەڵمانیا بەنێوی «بیرۆی کوردەکانی عێراق» ەوە دەنووسێ: «باکووری عێراق» لە جیاتی باشووری کوردستان «جێی پی کێ کێ نییە»، ئەی جێی سەربازە تۆرانییە کوردکوژەکانە؟ ئەوانەی کە دەبێژن «کورد هەر نییە و کوردستان درۆیە!؟. یان جێی لەشکری سەددامی دوژمنی مرۆڤایەتییە؟ کەسێك کە دەمی خۆی لە ڕامیاری (سیاسەت) ەوە وەردەدا، پێویستە هیچ نەبێ بزانێ کە چ دەبێژێ و، مێژووی خۆی لەبیر خۆی نەباتەوە.** ئەوا ئەز مێژووەکەتان

دەهێنمەوە بیرتان:

جارێ باشووری کوردستان وەك هەموو شوێنێکی دیکەی کوردستان، ماڵی هەموو کوردێکە و، هەموو کوردێك مافی ئەوەی هەیە لە هەر جێیەکی کوردستاندا کە بیەوێ، بژی و کار بکا و چالاکیی سیاسی بنوێنێ. خۆ ئەگەر کوردێك رێی لێگرت و دەری پەڕاند، ئەوا ئەو کوردە هاوکاری داگیرکەرانی کوردستانە کە کوردستان بە ماڵی خۆیان دەزانن، نەك بە ماڵی کورد. ئەوجا لەباری ئەم سەرنجە نیشتمانییەوە بوو کاتی خۆی لەسەر **پارتی دیمۆکراتی کوردستان (عێراق)** م کردەوە، کاتێك پاش سەرکەوتنی شۆرشی **خومەینی، کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستان (ئێران) و حیزبی دیمۆکراتی کوردستان (ئێران) و لکی کوردستانی (فدائیانی خەڵکی ئێران) و گشت نوێنەرانی کورد لە رۆژهەڵاتی کوردستاندا، داخۆیانێکی هەشت مادەییان دەرکردبوو و، داوایان لە رژێمی ئیسلامیی ئێران کردبوو کە ئەندامانی پارتی، بە تایبەتی بارزانییەکان، لە رۆژهەڵاتی کوردستان و ئێران بکەنە دەرەوە، بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەمانە «نۆکەری ساواك» بوون.** ئا لەو رۆژانەدا بوو کە پێنووسم گرت بە دەستمەوە و لەسەر پارتیم کردەوە و بە بەڵگەی ئەوە کە رۆژهەڵاتی کوردستان ماڵی هەموو کوردێکە، نەك ماڵی خەڵکی رۆژهەڵاتی کوردستان. بەڵام سەرکردەکانی پارتی کە ئەورۆ دەبێژن، **(باکووری عێراق ـ بە قسەی ئەوان)** جێی پێ کێ کێ نییە و، دەبێ بڕوا، گوێیان لە داخوازیی ئەو حیزبانەی رۆژهەڵات نەدەگرت کە نوێنەرانی ئەو رۆژەی خەڵکی رۆژهەڵاتی کوردستان بوون و، سەری خۆشیان کز نەکرد، بەڵکو چوون خۆیان **خستە خزمەتی رژێمی ئێران** و، بە چەك و پارەی رژێمی ئێران کەوتنە کوشتنی خەڵکی رۆژهەڵات و، رۆژنامەکانی ئەودەمەی کۆماری ئیسلامیی ئێران هەموو رۆژێك باسی هاوکاریی **«افراد قیادە موقت»** یان دەکرد لە گەڵ لەشکری ئێران. ئەو رۆژنامانە ماون و ئەو رۆژانەش لەبیر نەچوونەتەوە. **بۆچی بانێکە و دوو هەوا؟!**

دوایی هەر لەنێو پارتی خۆیدا، کە ئەورۆ بەو شێوەیە کەوتووەتە، **«عێراقچێتی»**، گەلێك ئەندامی سەرکردایەتی و دەستڕۆیشتوو هەبوون و هەن کە خەڵکی **«باکووری عێراق»** یان **«عێراقی»** نەبوون و نین. بۆ وێنە **بەڕێز دوکتۆر حەمە ساڵح جومعە** لە شەستەکانەوە ئەندامی پارتییە و ئێستە بە قسەی خۆی راوێژکەری کاك مەسعوودە.

هەروەها **بەرێز کاك فەوزی ئەسعەد** کە ئەویش ۳۰ساڵێك دەبێ ئەندامی پارتییە و ئێستە یەکێکە لە بەرپرسیارەکانی پارتی لە ئەورووپا. هۆنەری کورد **هەژار** کە خەڵکی **مەهاباد** بوو، ئەویش هەر سەر بە پارتی بوو، بەڵام پارتی رۆژێك بەمانەی نەگوت **«جێی چالاکیی ئێوە سووریا و ئێرانە و راکەن بچن بۆ ئەوێ!!»**.

من هەر لە سەرەتای پەلاماری لەشکری تورانییەوە بۆ سەر باشوور، رامگەیاند کە ئەم پەلامارە نەك هەر پێ کێ کێ لەنێو نابات، بەڵکو بەهێزیشی دەکات. پێشبینییەکەم هاتە دی. پاش خستنە خوارەوەی چوار فرۆکەی لەشکری تورانی لە لایەن پێ کێ کێ وە، لەشکری تورانیان پاشەکشەیان کرد و، بەزم و رەزمەکەیان بۆ پارتی بەجێ هێشت. لە پەلاماری بەعس و تورانییەکاندا بۆ سەرباشوور، هەزاران کورد کوژران و، لەنێو ئەوانەدا ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی پارتی، ئەوی لەرێی نیشتمانی خۆیدا بمرێ، پێی دەڵێن **«شەهید»** بەڵام نێوی ئەوانە چی بێ کە لەرێی پاراستنی سنووری دەوڵەتێکی داگیرکەردا دەکوژرێن؟.

لە هەمووی ناخۆشتر ئەو قسەیەیە کە **برای بەرێز کاك مەسعوود** لە رۆژی ١٦/ ١٩٩٧/٨ دا کردوویەتی بە بۆنەی بیرەوەری پەنجاو یەکەمین ساڵی دامەزراندنی پارتییەوە و گوتوویەتی: **«ئەگەر بەغدا ئارەزووەکان (طموحات) ی کورد بەجێ بهێنێ، ئەوا لە گەڵ بەغدا دۆزی کورد چارەسەر دەکەین»** و گوتوویەتی **«دوارۆژی دۆزی کورد لە عێراقدا بەستراوە بە چارەسەر کردنییەوە لە گەڵ بەغدا»**.

جارێ بێجگە لەوەی کە هیچ کەسێك نییە نەزانێ کە سەددام لە نەهێشتنی کورد بەولاوە هیچ نەخشەیەکی دیکەی بۆ کورد پێنییە، ئەو پرسیارەش دێتە گۆڕێ کە کاك مەسعوود بە چ مافێك دەچێ لە گەڵ سەددام لەسەر شتێك رێك دەکەوێ کە چارەنووسی کوردی پێوەیە و بەوە، دۆزی کورد کە چووەتە چوارچێوەیەکی نێونەتەوەیییەوە، دەیباتەوە نێو سنووری عێراق. هیچ حیزبێکی کورد مافی ئەوەی نییە بەبێ دەنگوەرگرتنی کورد لە ئازادی دا و، بەبێ چاوەدێریی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان، هیچ پەیمانێك لە گەڵ رژێمی بەغدا ببەستێ. خۆ ئەگەر پارتی ئەوە بکات، دیارە کارێکی یەك لایەنە دەکات و نەتەوەی کورد چاویلێناپۆشێ و، بەمەش پارتی تووشی کێشەیەکی گەورەی نێوچەیی و نێونەتەوەیی وا دەبێ کە بەرگەی نەگرێ.

پێویستە سەرکردەکانی حیزبەکانی کوردستان ئەوە بچێتە مێشکیانەوە کە هەلومەرجی نێوچەکە و نێونەتەوەیی، وا پێویست دەکات کە ئەم حیزبانەی ئێستە هەن، بمێنن و لەنێو نەچن، بەلاّم هیچ کامێکیشیان نەبنە هێزێکی زل لە نێوچەکەدا، لەبەر ئەوە کارێکی زۆر نەزانانە و ناشیانەیە ئەگەر بێتو حیزبێك هەولْ بدا حیزبێکی دی لەنێو بیات، بەخەیالی ئەوەی بەتاقی تەنێ دەست بەسەر گۆڕەپانی کوردایەتیدا بگرێ. ڕێی راست ئەوەیە کە هەموو حیزبەکان بەپێی بەرنامەیەکی نەتەوەیی و، لە کۆنگرەیەکی نەتەوەییدا، داخوازییەکانی خۆیان یەك بخەن و ئەوسا دەبینین کە سەرفرازی و سەربەرزی بە نەتەوەی کورد و بە هەر یەکێك لەوانیش دەبڕێ.

لە کۆتایی ئەم باسەدا دەخوازم پەنجە بۆ بابەتێك رابکێشم کە تۆمارکردنی لێرەدا بە گرنگ دێتە بەرچاوم. ئەز لە کاتێکدا کە بە داخ و خەفەتێکی یەکجار زۆرەوە خۆم ناچار دەبینم رۆناکی بخەمە سەر ئەم هەلْوێستە خیانەتکارانەیەی پارتی، مەبەستم ئەوە نییە بێژم کە پارتی وەك حیزب خاینە و هەر بە خیانەتکارییەوە دەمێنێتەوە، نا، مەبەستم ئەوە نییە. پارتی حیزبێکی جەماوەرییە و لەنێو پارتیدا هەزاران مرۆڤی بەرۆمەت و، جوامێر و، خاوێن و، دلْپاك و، نیشتمانپەروەر و، سەر لەرێی کورد و کوردستان هەن، کە ئەمانە دەبێ بە فەرمانی ویژدانی زیندووی خۆیان بکەونە کار و، گیانی سەرۆك بارزانی لە بەهەشتی بەریندا شاد کەن و، بەرەخنە گرتن لە کاربەدەستانی پارتی و، لێپرسینەوەی بەرپرسیارەکانیان، هەولی راستکردنەوەی بارە لاکەوتووەکە بدەن و، رێ نەدەن بە دووپاتبوونەوەی ئەم کارەساتە جەرگبڕە و، شوێنەواری ئەم هەلْوێستە خیانەتکارانەیە بە تەواوی بسڕنەوە و، لەم رێیەشدا سەرکەوتنیان بە ئاوات دەخوازم.

**جەمال نەبەز**

**سەرەتای تەباخی ٢٦٠٩ ك - سەرەتای ئابی ١٩٩٧**

**«سەکۆ» ژمارە ١١ ئەیلوولی ١٩٩٧**

## سەرنج!

ئەم سەرنجەی خوارەوە لە مانگی یەکی ساڵی ٢٠٠١ دا نووسراوە! وەك دەردەکەوێ ئەم وتارە لە سەرەتای مانگی تەباخی ساڵی ١٩٩٧ دا نووسراوە، بەپێی ئەو زانیاریانەی کە ئەو رۆژە لەبەر دەستمدا بوون. بەڵام تاقیکردنەوەکان دەریانخست کە پارتی بەرامبەر بەوەی سەددام یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی لە هەولێر دەرپەڕاند و هەولێر کەوتە دەست پارتی، پارتی لە پاداشتی ئەوەدا هیچ کارێکی وای بۆ سەددام نەکرد کە بۆنی خیانەتی نیشتمانیی لێبێ. ئەوەش راستییەکە کە دەبێ مرۆڤی بەویژدان دانی پێدا بنێ. بێجگە لەوەش لێکۆڵینەوە و سەرنجدانی خۆم لەو ساڵانەی دواییدا ئەوەیان ئاشکرا کرد کە هەڵوێستی ی. ن. ك. و پێ کێ کێ بەرامبەر پ. د. ك. زۆر دوژمنانە و شەڕپێفرۆشانە و دەمارگرانە (استفرازی) و دژ بە بەرژەوەندیی نەتەوەیی بوون. مەبەستم لێرەدا ئەوە نییە پاکانە بۆ هەڵوێستی پارتی بکەم، بەڵکو دەمەوێ قسەیەکی حەق بکەم و بێژم ئەگەر حیزبێکی کوردستانی حیزبێکی کوردستانی دیکەی وا تەنگەتاو کرد کە ناچار بێ لە ترسی نەمان هاوسەنگێتیی خۆی لە دەست بدا و پەنا بیا بۆ داگیرکەرێکی کوردستان، دیارە ئەو دەمە حیزبی ناچارکەر و تەنگەتاوکەر تاوانبارە بەرامبەر بە نیشتمان. ■

## پەیمانی واشنتۆنی ١٩٩٨/٩/١٧
## چۆن هەڵدەسەنگێنن و ئاکامەکانی چۆن دەبینن؟

مۆرکردنی پەیمانی ئاشتی لەنێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و پارتی دێمۆکراتی کوردستان، لە واشنتۆن لە ١٩٩٨/٩/١٧ دا، کە هەردوو سەرکردەی کوردستانی باشوور، بە بەشداریی راستەوخۆی ئەمریکاوە، کە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا خاتوو مادلین ئۆلبرایت نوێنەری بوو بەشداریان تێدا کرد، گەر بێت و رێچکەی جێ بە جێ کردنی بکرێ، دەژمێردرێ بە یەکێ لە دەسکەوتە هەرە گرنگەکانی گەلی کورد لە دوارۆژەکانی سەدەی بیستەم، ئەو پەیمانە دەنگ و سەدایەکی نایەوە لە کوردستان و هەموو لایەنەکان و جەماوەری خەڵکی کوردستان پیرۆزبایی مۆرکردنیان لێکرد و ئاهەنگی ئاشتی و شادیان گێرا. بۆ ئەوەی راوهەڵوێستی کەسایەتییە کوردییەکانی نیشتەجێی هەندەران بزانین و پێشکێشی خوێنەرانی سەکۆی بکەین، بە تەلەفۆن پێوەندیمان کرد بە هەندێ لەو بەرێزانە، ئەوانیش بە سوپاسەوە فەرموویان:

**پێشرەوی سەید برایمی**

## بیروڕای جەمال نەبەز:

ڕاستییەکەی هەمو ڕێککەوتنێك لەنێوان کورد و کورد دا شتێکی باشە، ئەم ڕێکەوتنە پێویست بوو، دەمێك بوایە بکرێ، پێش چەند ساڵێك، پاش ئەوەی ناخۆشییەکە کەوتە نێوان پارتی و یەکێتییەوە پێویست بوو هەردووکیان هەوڵی ئەوە بدەن کە وا لە کوردستاندا بە یارمەتیی حیزب و کۆمەڵە و ڕێکخراوەکانی دیکە و کەسایەتییەکانی کورد و، وەکو کاتی خۆی پێشنیازم کردبوو بۆ **مام جەلال و کاك مەسعوود**، کە بێن بۆ ئەورووپا و ئێمە هەولبدەین ژمارەیەکی زۆر کوردی سەر بە هەموو حیزبەکان و مرۆڤی ڕۆشنبیر و خەڵکی دلسۆز کۆ بکەینەوە و هەوڵبدەین بەرنامەیەکی نەتەوەیی بخەینە بەردەمی هەردووکیان، نەك هەر بۆ ئاشتبوونەوەی هەردوولایان، بەڵکو بۆ ئەوەی بۆ پاشەڕۆژیش بتوانین بەرنامەیەك پێشان بدەین چی بکرێ و چی نەکرێ، هەتا ئەو نێوچانەی **«هەرێمی ئاسایش»** ببێتە بنکەیەك بۆ کوردستانێکی پاشەڕۆژ. بەڵام بەداخەوە ئەوە نەبوو، هەرچۆنێ بێت ئەم پەیمانە شتێکی باشە. یەکێك لەو تایبەتکارانەی ئەوەیە کە لایەنێکی کورد (وەکو یەکێتی و پارتی) لە گەڵ لایەنێکی دیکە کە تەنها زلهێزێکە لە جیهاندا، کە ئەوەش ئەمریکایە، هاتوون ڕێککەوتوون لە سەر شتێك و بە ئیمزای هەردوو لایان، کە ئەمە بۆخۆی بەڵگەنامەیەکی زیندووە، کە ئەو زلهێزە گەورەیە دان بە بوونی گەلێکدا دەدەنێ، کە گەلی کوردە، هەرچەند باسی سەربەخۆیی کوردستان ناکرێ لێرەدا و باسی دەوڵەتی کورد ناکرێ، بەڵام بوونی **ئەمریکا** وەکو لایەنێك، کە لە گەڵ چەند نوێنەرێکی کوردی بێ دەوڵەتدا قسە دەکا، ئەوە خۆی لە خۆیدا دان نانێکە بەوەدا، کە کورد هەیە و، کورد گەلێکە. ئەمە لە لایەك، لە لایەکی دیکەشەوە، ئەم وتووێژەی **مام جەلال و کاك مەسعوود** تایبەتکارێکی دیکەشی هەیە، ئەوەش ئەوەیە، لایەنێکی دیکە بێجگە لە کورد و ئەمریکایی، با بڵێین ترك بۆ وێنە، لەم دانیشتنەدا نەبووە، ئەمەش شتێکی باشە، چونکە هەتا ئێستا هەر کۆبوونەوەیەك بووبێ لەنێوان ذەم دوو حیزبەدا، دەوڵەتی ترك خۆی هێناوەتە پێشەوە و ئەو شتانەی کە ویستوویەتی، واتە بەرژەوەندییەکانی خۆی سەپاندووە بە سەریاندا، کە ئەمەش شتێکی باش نییە. هەر چەند لەنێو ئەو ڕێککەوتنەدا، کە من بە دووروودرێژی نەمدیوە و تا ئێستا نازانم چییە، دەڵێین هەندێ بەرژەوەندیی ترك خراوەتە بەرچاو.

بەڵام وەك كاك مەسعوود و مام جەلال هەردووكیان لە وتووێژەكانیاندا لە گەڵ دەنگی ئەمریكا باسیانكرد، ئەوان ئەو شتە لە سنووری دەوڵەتی عێراقدا داوا دەكەن و دەوڵەتی ترك، یان دەوڵەتێكی دیكە مافی ئەوەی نییە دەست بخاتە ئەوەوە كە كورد لە سنووری ئەم دەوڵەتەی عێراقەدا چی دەكا و چی ناكا، چۆنكە لەو بەینەدا ئەوە هاتبووە پێشەوە، كە دەوڵەتی ترك نایەڵێ حكوومەتێكی كوردستانیی هەتا سەر لەو نێوچەدا هەبێ. ئەوە وەرامی كاك مەسعوود و مام جەلال بوو. هەتا ئێستە ئەم دەوڵەتانە، چ ئێران چ سووریا چ عێراق چ ترك توانیویانە گەلێك شت بكەن لەنێوچەی هەرێمی ئاسایشدا. بۆچی؟ چۆنكە ئەو دوو حیزبە كە حیزبی سەرەكیی ئەو نێوچەیەن لەنێو خۆیاندا رێك نەبوون، بەڵام ئێستا كە كار هاتووەتە سەر ئەوەی ئەوانە لەنێو خۆیاندا رێك بن، پێموانییە ئەو دەوڵەتانەی داگیركەری كوردستانن، بە تایبەتی دەوڵەتی ترك هەروا بە هاسانی بتوانن دەست بكێشنە نێوەوە.

ئەمە لایەنی دووەم. جا شتێكی دیكەش هەیە، كە ئێستا بەراستی نەك هەر ئەو دەوڵەتانە پێیان ناخۆشە كە كورد لە گەڵ كورددا رێككەوتوون، خەڵكانێكی دیكەش هەن، كە ئەز سەرم سوور دەمێنێ لێیان، تا ماوەیەك لەمەوبەر خۆیان بە منیان دەگوت: **«ئەرێ بابە ئەمانە بۆچی وا دەكەن و گلاوار لە عەمریان كەوتووە، هار بوون ئاوا شەڕی یەك دەكەن!»**. كەچی ئالەم رۆژانەدا زۆر كەس تەلەفۆن بۆ من دەكەن، هێندێك لەوانەی كۆن ئەمەیان دەگوت، ئێستە دەبێژن: **«دە باشە بابە ئەم دوو سەركردەیە با بچن گۆشتی قەلی خۆیان بخۆن و گوو بەڕیشی بابی ئەوانەی كە كوژران لەم شەڕەدا!»**. جا لەبەر ئەوە ئەز پێیان دەڵێم: **«ئێوە خۆتان دەتانویست ئاشتی ببێ و شەڕ نەبێ. ئیتر هیچ وەرامێكیان نییە»**.

ئەوەیە لە هەردوولا لەنێو یەكێتی و پارتیشدا كەسانێك هەن كە بەراستی پێیان ناخۆشە ئاشتی ببێ، چۆنكە سووتیان ورگرتووە لەم شەڕ و هەڵلایە. لەبەر ئەوە دەبێ هەردوو حیزبەكە ئاگایان لەوە بێ ئەو كەسانەی كە بەراستی زۆربلێ و درێژدادڕ و شەڕخواز و كینە لە دڵ و رك ئەستوور و لەمانەن، بێ دەنگیان بكەن و پێیان بێژن: ئەگەر بەراستی ئێوە وا دەكەن جێگەتان نابێتەوە، چۆنكە دەبێ بڕیارەكە وابێ، كە بە هیچ جۆرێك ئەم ئاشتییە نەپسێندرێ و نەشكێ و جارێكی دیكە شەڕ

نەبێتەوە، چونکە جارێکی دیکە شەڕ ببێتەوە زۆر خراپە بۆ کورد. ئەمریکا گوتی: **«دەبێ کوردەکان یەکبگرن بۆ ئەوەی بتوانین بیانپارێزین»**. پێموایە ئەوە دوا جاریشە، جارێك ئەوە بوو لە **پاریس**، **ڕەحمەتی میتران** هەوڵی دابوو بۆ ئەوەی کورد ڕێك بخاتەوە و لەوانە بوو زۆر سووتیش بگەیەنێ بە کورد. بەڵام سەری نەگرت، لە چەند شوێنێکی دیکە بۆ نموونە لە **دبلن** کۆبوونەوە، دیسان جارێکی دیکە ئەوەش سەری نەگرت. لە شوێنانی دیکەش کۆبوونەوە، ئەمجارە پێموایە پێویستە سەر بگرێ و پێویستە نەك هەر مام جەلال و کاك مەسعوود، بەڵکو ئەوانەی کە دڵسۆزن لەنێو پارتی و یەکێتیدا پشتیان بگرن و هەوڵبدەن بۆ سەرکەوتنی ئەو کارە و، ئەوەش بزانن هاتنە خوارەوە (تنازل) ی هەر حیزبێکی کوردی بۆ حیزبێکی دیکەی کوردی شتێکی شەرم و شوورەیی نییە. ئەمە بەڕاستی سەربەرزییە، ئەمە بەڕاستی ئەوە پێشان دەدا ئەو حیزبەی کە «تەنازول» دەکا ڕۆشنبیرترە لەوەکەی دیکە و زیاتر بە تەنگ پاشەڕۆژی کورد و کوردستانەوەیە. جا لەبەر ئەوە زۆرم پێخۆشە ئەگەر هەردوو لایان هەوڵبدەن دەستپێشکەری بکەن لەم مەیدانەدا و بۆ یەکتری بێنە خوارەوە.

**جەمال نەبەز**

**«سەکۆ» ژمارەی ٢٤ تشرینی ١٩٩٨**

## له دیداریکدا
## دوکتۆر جەمال نەبەز
## ڕێککەوتننامەی واشنتۆن هەڵدەسەنگێنێ!

ئەم چاوپێکەوتنە، کە لە ئەڵمانیا لە گەڵ نووسەر و سیاسەتمەداری ناسراوی کورد د. جەمال نەبەز دا بەتایبەت بۆ ڕۆژنامەکەمان ئەنجام دراوە، بایەخ و گرنگیی خۆی هەیە، چونکە بیروڕاوبۆچوونی سەربەست و تایبەتی کەسێکی نیشتمانپەروەر و بەشدارێکی هەڵسووڕاوی فیکری و سیاسیی کوردایەتییە. لە هەمان کاتدا هەڵوێستی نووسەرێکە کە بە درێژاییی شەڕی ناوخۆ، دەنگی خۆی خستووەتە پاڵ دەنگە ئاشتیخوازەکان و بەردەوام بە وتار و نامە و ئیمزاناردنی هەوڵیداوەزووتر ئاگری شەڕی ناوخۆ بکوژێتەوە و ئاشتی بگەڕێتەوە بۆ کوردستان و کورد پێکەوە ئەزموونی دوا ڕاپەڕین پەرە پێبدات و کوردایەتی و دێموکراسیەت پێشەنگی خەباتی لایەنە سیاسییەکان بێت.

لێرەدا دەقی ئەو چاوپێکەوتنەی د. نەبەز دەخەینە بەرچاوی خوێنەران.

کوردستانی نوێ
ساڵی حەوتەم
ژمارەی ١٧٥١ (١٩٩٨/١١/٢٩)

**چۆن ڕێککەوتنی واشنتۆنی نێوان یەکێتی و پارتی هەڵدەسەنگێنن؟**

ج ــ ڕێککەوتنی واشنتۆن لەنێوان پارتی و یەکێتیدا ڕووداوێکی گرنگە لە مێژووی ڕامیاریی کورددا، نەك هەر لەبەر ئەوەی دوو حیزبی کوردیی خاوەن جەماوەری دژ بەیەك بڕیاری دەستهەڵگرتن لە خۆکوژی و هەوڵی ئاشتبوونەوە و پێکەوە کارکردن دەدەن، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە ئەمە یەکەمین جارە زلهێزێکی وەك ئەمریکا کوردی بێدەوڵەت بانگهێشتن دەکا و وتووێژی ڕەسمی لە گەڵ دەکا و پەیماننامەیەك مۆر دەکا لە گەڵیان، بێ ئامادەبوونی دەوڵەتێکی داگیرکەری کوردستان و، لە هەمانکاتدا ئەمریکا دەستەبەر دەبێ بە پاراستنی کورد لە پەلاماری سەددام. ئەمەش خۆی لە خۆیدا داننانێکە بەبوونی کورددا وەك هێزێك. ئا لەبەر ئەوە بوو، هەر ئەو ڕۆژەی ڕێککەوتنەکە ئیمزا کرا، بە نامەیەکی تایبەتی پیرۆزباییم لە کاك مەسعوود و مام جەلال کرد و گوتم ئەوڕۆ جەماوەری ڕەشوڕووتی کورد چاوەڕوانی دامەزراندنی حکوومەتێکی نەتەوەیی کوردستانیی بە هێزە کە هەموو حیزب و کۆمەڵە و ڕێباز و ئاینێکی گرتبێتە باوەشی خۆی و ئازادی و نان و کار و ئاسایش و یەکسانیی ژن و پیاو و دادی کۆمەڵایەتی بۆ خەڵکی نێوچەی ژێردەسەڵاتی کورد، لەسای سێبەری دەستوورێکی دێمۆکراتیی پەرلەمانیی کوردستانی و ئاڵای شەکاوەی کوردستاندا مسۆگەر بکا.

دیارە لەم پەیمانەدا هێندێك لایەنی نەرێتی (سلبي) هەن، وەك پێداگرتن لەسەر پاراستنی سنووره دەستکردەکانی عێراق و پاراستنی بەرژەوەندیی دەوڵەتە دراوسێکان، بێ ئەوەی ئەوان دانیان نابێ بە مافی باشووری کوردستاندا کە بە لایەنی کەمەوە کۆمارێکی فیدەرالی هەبێ. بەکورتی دەبێ ئەم ڕێککەوتننامەیە سەرەڕای کەموکورتییەکانی، وەك پەیژەیەك بەکار بهێنرێ بۆ گەیشتنە ئامانجی سەرەکیی کورد کە ئەوەش دامەزراندنی کوردستانێکی ئازاد و یەکسانە.

**زامنی جێبەجێکردنی ئەو ڕێککەوتنە چییە؟**

ج ــ گەرەنتی جێبەجێکردنی ئەم ڕێککەوتنە ئەوەیە کە هەردوو حیزبەکە بەڕاستی بیانەوێ جێبەجێی بکەن بەوپەڕی لێبڕانەوە، واتە (تەنازول) بۆ یەکتری بکەن.

خۆ ئەگەر حیزبێکیان وڕکی گرت و هیچ (تەنازول) ێکی نەکرد، یا حیزبەکەی

دیکە ئەو (تەنازول) ە بکا و بەوە پلەی بەرزی نیشتمانپەروەرێتیی خۆی پێشان بدا. ئەندامان و لایەنگرانی هەردوو حیزبەکە پێویستە دەوری خۆیان بەباشی بنوێنن بەوەی گوشارێکی یەکجار گران بخەنە سەر کاربەدەستانی حیزبەکانیان بۆ گەیشتنە دۆخی هاوئاهەنگیی نەتەوەیی. هەر لەو کاتەشدا رێ لە هەموو هەوڵێکی ناپاکانە بگرن کە کەسانی هەلپەرست و ئاژاوەگێڕ و بازرگانی خوێن و ملیۆنێرانی شەڕ دەیدەن بۆ مسۆگەرکردنی بەرژەوەندیی گڵاوی خۆیان لەسەر حسێبی خوێن و فرمێسکی هەزاران ژن و پیاوی زگ سوتاوی کورد. ئەوجا جەماوەری زەحمەتکێشی کوردیش دەبێ بێوچان و بەوپەڕی هۆشیاری و بەرپرسیارییەوە هەنگاو بە هەنگاو چاودێریی جێبەجێکردنی پەیماننامەکە بکەن، کە بە داخەوە تا ئەورۆ، تا ئەو هەندازەیەی ئەز ئاگام لێیە هیچی ئەوتۆی لێ جێبەجێ نەکراوە.

**چۆن لە هەڵبژاردنی ئایندەی کوردستان دەڕوانن؟ پێویستە چی بکرێ و خۆ لە چی دوور بخرێتەوە؟**

ج ـ دەبێ هەڵبژاردنی ئەمجارەی پەرلەمانی هەرێمی ئاسایش هەڵبژاردنێکی نموونەیی بێ، بۆ ئەوەی کورد پێشانی جیهانی بدەن کە نەتەوەیەکی بارژێروان (مەدەنی) و ئاشتیخواز و لایەنگری دێموکراتی و ژیانی فرەحیزبی و سیستەمی پەرلەمانین. دەبێ هەردوو حیزبە سەرەکییەکە، پارتی و یەکێتی و هەموو حیزب و کۆمەڵەکانی دیکە وەکیەك ئازادیی خۆپالاوتن و دەنگدانیان هەبێ. دەنگدان دەبێ بە سەرپەرشتیی کۆمەڵەیەکی نێونەتەوەیی بێ و، ئەو رێژە (نسبە) یە ٧٪ هەڵبگیرێ. هەروەها پێویستە لەسەر کاغەزی دەنگدان پرسیارێك ئاراستەی دەنگدەر بکرێ، کە ئایا دەیەوێ باشووری کوردستان وەك بەشێك لە دەوڵەتی عێراقدا بمێنێتەوە، یان دەوڵەتێکی سەربەخۆی دەوێ. **ئەم پرسیارە و لابردنی رێژەی ٧٪ و هەوڵدان بۆ خستنەگەڕی فرگە (مطار) ە کانی کوردستان، لە رێزی ئەو بڕیارانەدا بوون کە چوارەمین کۆنگرەی ــ کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان لە لەندەن دای بۆ خستنە بەردەمی کاربەدەستانی (هەرێمی ئاسایش).** هەروەها پێویستە کوردەکانی دەرەوەی هەرێمی ئاسایش و دەرەوەی کوردستان، واتە کوردەکانی هەندەران، مافی دەنگدانیان هەبێ. هەر حیزبێکیش لە هەڵبژاردندا زۆربەی دەنگەکانی نەبردەوە، مانای وانییە فت کراوە. دەورەی پەرلەمان بۆ چوار ساڵە، لەوانەیە جارێکی دی

پلەی یەکەم بۆ خۆی بگرێ.

ئێستا ئەمریکا و ئینگلیز باسی زیندووکردنەوە و گەشەپێکردنی هێزی بەربەرەکانێی عێراقی دەکەن، ئێوە چۆن دەڕواننە ئەم گۆڕانکارییە؟

ج ـ نامەوێ ئەمریکا و بەریتانیا لەبارەی پلەی هونەری رامیارییەوە بە یەك تەرازوو بکێشم، بەڵام ئەوەی راستی بێ، ئەمریکا وا دێتە بەرچاوم کە هیچ نەخشە و بەرنامەیەکی پوختکراو و توێژراوی نەبێ. هەر بۆ نموونە: ئەمریکا سالانی ساڵ بە پارە و چەکی قورس و مەشق پێکردن یارمەتیی پێشمەرگەکانی ئەفغانستانی دا دژی لەشکری سۆڤێت، هەر لەبەر ئەوەی ئەو ئەفغانییانە دژ بە سۆڤێت و کۆمۆنیزم بوون. ئەوجا ئەوەتە ئەورۆ ئەمریکا هاوارێتی لەدەست ئەو ئەفغانییانە و مووشەکیان تێدەگرێ و بە تێرۆریستیان دەداتە قەڵەم.

**ئەمریکا سالانی ساڵ یارمەتی شای ئێرانی دا و کردبووی بە پۆلیسی کەنداو و چاوسوورکەری نێوچەکە، کەچی لەپڕ رووی لێوەرگێڕا و دەستی لێبەردا، بە جۆرێك تەنانەت ڤیزەیەکیشی نەدەدایە بچێتە ئەمریکا بۆ چارسەرکردنی نەخۆشییەکەی. ئەز باسی خۆمان و ئەمریکا ناکەم کە هەڵوێستی چۆن بوو بەرامبەر شۆڕشی ئەیلوول، ئەوە هەموو کەس دەزانێ، بەڵام ئەمریکا هەر خۆی بوو کە لەماوەی هەشت ساڵ جەنگی عێراق و ئێراندا بە هەموو جۆرێك پشتی سەددامی گرت و چاوی لە هەموو تێرۆرێکی سەددام بەرامبەر بە خەڵکی عێراق و نەتەوەی بێ کەسی کورد پۆشی. تەنانەت بە یەك وشەش باسی ئەنفال و چەکی کیمیایی و کۆچپێکردن و بە عەرەبکردنی کوردستانی نەکرد، تا سەددامی کرد بەو مڵۆزمەی پەلاماری کوێتی دا. ئەوجا کە ئەمریکا کەوتە وێزەی سەددام، لەبەر خاتری حوسنی موبارەك و شاحسێن و دەوڵەتی ترك و هەڤاڵبەندەکانی دیکەی کە نەیاندەویست عێراق داگیر بکرێ و کورد بکاتە ئامانجی خۆی و سەددامیان لە کورد پێ باشتر بوو، ئەمریکا وازی لە سەددام هێنا، بەڵام ئەمەیان با بۆ ئەو بێ.**

خۆ ئەو رۆژەی **سەددام** پەلاماری هەولێری دا، دەرفەتێکی باش هەڵکەوت بۆ ئەمریکا، نەك هەر کاری سەددام تەواو بکا، بەڵکو ئەو رێککەوتننامەیەی کە دوو ساڵ لەدوای ئەوە لە واشنتۆن لە گەڵ **کاك مەسعوود** و **مام جەلال** دا ئیمزای کرد لە **هەولێر** لە گەڵیاندا بکا. ئەوجا ئێستە ئەمریکا دەیەوێ پارە و چەك بدا بە

**(بەرهەڵستکەرانی عێراقی)** بۆ خستنی سەددام. بەڕاستی مرۆڤ سەری لەم سیاسەتە دەرناچێ!!! ڕاستە عێراقی هەن کە بەرهەڵستکەرن، واتە دژی ڕژێمی سەددام دەوەستن و هێندێکیشیان لە سەددام خراپترن. ئەوەش ڕاستە ئەمانە وەك تاکە تاکە و گرووپی بچووك لە دەرەوەی عێراق هەن، بەڵام هێزێکی بەرهەڵستکەری جەماوەریی ڕێکخراوی بەهێزی دەستڕۆیشتوو و قاڵبووی خەباتی سەخت لەسەر ئەو خاکەی کە بەدەست سەددامەوەیە، نییە. بەڵێ لە ڕۆژی ١١/٢٣ دا گوایە حیزب لە گەڵ کاربەدەستانی بەریتانیا لە لەندەن کۆبوونەوە بۆ باسی (خستنی سەددام)، بەڵام هەر زوو دەرکەوت کە هەر یەکەیان لە ئاوازێك دەخوێنێ و هەر یەکەش دژ بە هەمووە، هەر کۆمەڵەش بە تەمای پارووی چەورە و، زۆربەی هەرە زۆریان حیزبی چوار پێنج کەسین کە دەیانەوێ لەرێی بلاڤۆکەوە سەددام بخەن. ئاشکرایە سەددام بە شیعر و قسەی نێو ڕۆژنامە و جنێوی ڕادیۆ و هووها لێکێشان ناکەوێ. کێشەکەش کێشەیەکی دێموکراتی نییە تا خەڵکێکی زۆر کۆبکرێتەوە کە لە هەڵبژاردندا دەنگ بۆ سەددام نەدەن. سەددام نە شەڕە شیعر دەکا و نە خۆشی پالاوتووە بۆ هەڵبژاردنێکی دێمۆکراتی، بەڵکو بەهێزی لەشکر و تیرۆر دەنگی دوژمنانی خۆی کپ دەکا. بۆ خستنی سەددام پێویستە هێزێکی سوپایی هەبێ. دیارە ئەو هێزە نییە و دەبێ دروست بکرێ و، ئاشکرایە ئەمریکا و بەریتانیا ئەگەر بیانەوێ، دەتوانن مەشق بە هەزاران عێراقی بکەن کە ڕایان کردووەتە دەرێ و لەشکرێك دروست بکەن لێیان. بەڵام ئەو لەشکرە بە کوێدا دەنێرنەوە عێراق؟ بێگومان هیچ دەوڵەتێکی دراوسێی عێراق، تەنانەت کوێتیش ڕازی نابێ ئەو لەشکرە بە سنوورەکەیدا بەرەو عێراق تێپەڕ بێ. سەیر ئەوەیە چەند ڕۆژێك لەمەوبەر ئەمریکا داوای لە ئێران کرد کە یارمەتی بدا بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی سەددام، بەڵام ئێران دایەوە بە دەمیدا. لەبەر ئەوە «بەرهەڵستکارانی عێراقی» مرخی خۆیان لەوە خۆشکردووە کە بێنە **«هەرێمی ئاسایش»** و لەوێوە هێزی چەکداری کورد بکەن بە گژ سەددام دا. جا ئەگەر سەددام جارێکی دیکە پەلاماری کوردستانی دایەوە و ئەمریکا و بەریتانیا وەك جاری پێشوو فریای کورد نەکەوتن و سەددام کوردستانی کاول کردەوە، ئەوا ئەوان ڕابکەنە ئەوروپا و ئەمریکا و لەوێوە بە شیعر و وتار، باسی هەڵوێستی پاڵەوانانەی خۆیان بکەن و ئۆباڵەکەی بخەنە ملی کورد. خۆ

ئەگەر هێزی چەکداری کورد بە ڕێکەوت توانی سەددام بخا، ئەوا ئەوان ئاغا و ئێمەش مسکێن و دەست بە سنگەوە چاوەڕوانی ئەوە بین «**ئۆتۆنۆمی**» ببەخشن پێمان. لە هەمانکاتدا **کەرکووک و مووسڵ و خانەقین و کوێت کوردستان** نین و (مسئلة فیهانظر). هەر قسەشمان کرد، ئەوا بە تۆمەتی جیابوونەوە خوازی، لە سەددام خراپتر بکەن پێمان. عەرەبی وەك **میشعان جبوری** ئازا و ڕاستگۆ لەنێو بەرهەڵستکەرانی عێراقیدا دەگمەنن. لەبەر ئەوە پێویستە ئاگامان لە خۆمان بێ.

**ئێوە چۆن دەڕواننە پێوەندیی نێوان هێزی کوردی و هێزی بەربەرەکانێی عەرەبی عێراقی؟ پێویستە ئەو پێوەندییە چۆن خۆی بنوێنێ؟**

ج ــ هەڵوێستی ڕاست ئەوەیە کە کورد بە هیچ جۆرێك ڕێ بە «بەرهەڵستکەرانی عێراقی» نەدا کوردستان بکەنە بنکەیەك بۆخۆیان و لەوێوە بکەونە ترساندن و هەڕەشەی درۆ لە سەددام و بیانوودان بە سەددام بۆ پەلاماری کوردستان. چونکە هێزی دەستوەشێنی کورد دەرەقەتی لەشکری سەددام نایە و، هیچ گەرەنتییەکیش نییە بۆ ئەوەی ئەمریکا و بەریتانیا دەکەونە فریای کورد، هەر چەندە بەڵێنی ئەوەشیان داوە، بەڵام ئەگەر ئەمریکا و بەریتانیا ئامادە بن بەو پارەیەی تەرخانیان کردووە بۆ ئەمانە واتە (١٠٠ ملیۆن دۆلار)، لە کوردستاندا لەشکرێکی کوردستانی بەهێز دروست بکەن، بەکورتی پێشمەرگە بکەنە سوپایەکی مۆدێرن، ئەو دەمە ئەوە بابەتێکی دیکەیە. بەڵام لە هەموو بارێکدا کورد نابێ واز لەم (بەرهەڵستکەرە عێراقییانە) بهێنێ کاری خۆ بەسەری بکەن. چونکە لەوانەیە تاقمێك ئەفسەری سەرچڵی هەڵمەتەکاسە پەیدا بن، سا یان لەبەر خاتری پارە، یان بۆ پایە، دەست لە سەددام بوەشێنن و خۆیان بچنە جێگەی و ببنە هەڤاڵبەندی ئەمریکا و بەریتانیا و داگیرکەرانی کوردستان. ئەوجا ئەگەر لە سەددام خراپتر بکەن بە کورد، دەنگمان بە کەسدا ناگا. لەبەر ئەوە دەبێ لە هەموو کار و کردارێکی ئەمانە ئاگادار بین و پێوەندیی لە گەڵیان نەبڕین، بێ ئەوەی ڕێ بدەین داماندۆشن. **خۆ ئەگەر کرا لەسەر ئەم پێتانەی خوارەوە لە گەڵیان و لە گەڵ ئەمریکا و بەریتانیا ڕێك بکەوین:**

**١)** ــ کورد لەڕێی پەرلەمانی خۆیەوە لە سنووری عێراقدا سیستەمی فیدەرالی بۆ خۆی هەڵبژاردووە و لەو بڕیارە نایەتە خوارێ. لە کاتێکدا خەڵکی عێراق دژ بە

سیستەمی فیدەرالی بوەستن، کورد مافی جیابوونەوەی هەیە.

٢) ــ ئەگەر خەڵکی عێراق دەنگیان بۆ سیستەمی فیدەرالی دا، خەڵکی باشووری کوردستان لە شێوەی کۆمارێکی کوردستانیی دێموکراتیدا لە گەڵ پاشماوەی عێراق یەك دەگرن.

**٣) ــ باشووری کوردستان بریتییە لە مووسڵ و کەرکووك و هەولێر و سلێمانی و دهۆك و کووت و خانەقین و دەوریەری. دەست لە هیچ بەشێکی هەڵناگیرێ.**

**٤) ــ کۆماری عێراقی عەرەبی لە ماوەی (٢٥)ساڵدا (٢٥٠) ملیار پاوەندی ئینگلیزی دەبژێرێتەوە بۆ کورد لەبری گەلکوژی و تووناکردنی کەلەپووری کولتووری کورد و کاولکردنی کوردستان.**

٥) ــ کۆماری عێراقی عەرەبی هیچ پەیماننامەیەك لە گەڵ هیچ دەوڵەتێکدا نابەستێ دژی نەتەوەی کورد. ■

***************

********

*****

****

***

*

# پاشنیوەڕۆیەك لە خزمەت شای کوردستان "شێخ مەحموودی نەمر" دا

ئەوڕۆ کە ٩ی مانگی ئۆکتۆبەری "١٩٩٧"ە؛ ٤١ ساڵ تێپەڕی بەسەر کۆچی دوایی **شای کوردستان شێخ مەحموودی بەرزنجی (حەفید) (١٨٨٢ـ ٩/١٠/ ١٩٥٦)دا**. ڕێککەوت وا هەڵکەوت کە چەند مانگێك بەر لە ماڵاوایی هەتا هەتایی شێخی نەمر، لەگەڵ دوو هاوڕێی خۆشەویستدا بچمە خزمەتی. ئەم وتارە ڕێپۆرتاژێکە بۆ ئەو سەردانە کورتە کوتوپڕە.

ساڵ ساڵی ١٩٥٦ بوو، پشووی هاوینەی قوتابخانە و کۆلیجەکانی باشووری کوردستان و عێراق بوو. ئەو سەردەمە نێزیکەی ساڵێك دەبوو کە خوێندنی خۆم لە زانستگەی بەغدا تەواو کردبوو، بووبوومە مامۆستای قوتابخانە نێوەندییەکانی کەرکووك. هاوینان دەچوومە سلێمانی، چونکە کەسوکارم لەوێ دەژیان. هەر لەو کاتەوە کە لە قوتابخانەی نێوەندیی سلێمانی دەمخوێند، هاوڕێیەتییەکی توند و تۆڵم لەگەڵ چەند قوتابییەك هەبوو؛ لەوانە: **شێخ ئەحمەدی نەقیب و عەزیز محەممەد بوون. ئەحمەد کوڕی شێخ ڕەئووفی کوڕی سەی نووری نەقیبە** (١)؛ کە لە بنەماڵەی شێخ مەحموودن. ئەحمەد کوڕێکی بێ فیز، قسەخۆش و سەر لەڕێی خزمەتی خەڵکدا بوو. عەزیزیش (کە ئێستە بووەتە "حاجی عەزیز") بە "عەزەی برای ئەرکان" بەنێوبانگ بوو(٢)؛ کوڕی خێزانێکی هەژار بوو. دایکی بە نانەوایی و جلك شتن بۆ ماڵان بەخێوی دەکرد. عەزیز کوڕێکی هەتا دەم بڕ بکا بە وەفا و زمان شیرین و گاڵتەزان بوو. مرۆڤ هەر حەزی دەکرد لەگەڵی دابنیشێ. دوایی بوو بە مامۆستای وەرزین (ریاضة) لە سلێمانی.

شایانی باسە: پاش ئەوەی لە کۆتاییی چلەکاندا، ڕێبازی کوردستانێتی و ڕێبازی عێراقچێتی کەوتنە نێو قوتابیان و خەڵکەوە لە سلێمانی، چەند کەسێك لە ئێمەی سەر بە ڕێبازی کوردستانێتی، دۆستایەتیمان لەگەڵ یەك زۆر خۆش بوو بوو؛ بە تایبەتی لە پەنجاکاندا. بێجگە لە ئەحمەد نەقیب و عەزیز محەممەد؛ شەهید شێخ شەهابی شێخ نووری و پارێزەر ڕوشدی عەزیز (کە هەردووکیان دراوسێی ماڵ و

هاوڕێی منداڵیم بوون)، **جەلال عەزیز و نەجاتی عەبدە و پارێزەر جەماڵ فەقێ شالی و مەلا عومەری گۆلێ**(٣) **و جەمال حەکیم و دوکتۆر عەلی تۆفیق و مامۆستا فایەق عارف و دوکتۆر ئیحسان فوئاد و مەلا عەبدولی مەلا سەعید و عومەری وەستا سەعید (کە ئەم دووانەی دواییش هاوڕێی منداڵیم بوون) و بابەتایەری شێخ جەلال و ئەحمەد سمێل کاکەیی و حەمەکەریم فەتحوڵلاّ و کامەران موکری و عەبدوڵلاّ میدیا و عەبدوڵلاّ ئەژدەر و سلێمانی مەجی بەگ** و چەند کەسێکی دیکە کە دەبێ ببوورن؛ چونکە جارێ دەستم لە هەویرە و هەر هێندەم لەبیرە؛ هاوڕێی ئەم سەردەمەم بوون. جا هەرچەندە زۆربەی زۆری ئەم برادەرانە، یان ئەندامی پارتی بوون، یان سەر بە پارتی بوون و، ئەز و یەك دوانێکی دیکەمان ناحیزبی و سەربەخۆ بووین، لەگەڵ ئەوەشدا بە زۆری پێکەوە دەگەڕاین و زوو زوو یەکدیمان دەدی و بیروڕامان دەگۆڕییەوە.

کۆتایی ساڵی ١٩٥٥ ئەحمەد نەقیب خوێندنی خۆی لە ئامۆژگەی بەرزی کشتوکاڵ لە **"ئەبو غرێیب"** نێزیك بەغدا تەواو کردبوو. ئەو سەردەمە هەر کەسێك خوێندنی لە زانستگە، یان لە ئامۆژگە بەرزەکانی بەغدا تەواو بکردایە؛ دەبوو جارێ بۆ ماوەی شەش مانگ سەربازی بکا، ئەوجا دەیانکرد بە ئەفسەر. ئەحمەد دەورەی سەربازی بردبووە سەر و، کرابوو بە ئەفسەر لە **"فیرقەی" کەرکوك**. بەو بۆنەیەوە جار و بار دەهاتە قوتابخانەی نێوەندیی **"موسەڵلاّ"** بۆ لام و، زۆر دڵی خۆش دەبوو کە دەیدی لە لابۆر "مختبر"ی فیزیك؛ نێوی ئامێر (آلات)ەکانم بە کوردیی لاتینی نووسیبوو. لە کاتێکدا کە ئەو حەلە لە قوتابخانە نێوەندییەکانی باشووری کوردستاندا؛ زمانی کوردی ڕەسمی نەبوو؛ بە تایبەتی لە کەرکوك، کە سەرەڕای ڕژێمی داگیرکەری عێراق، تورانییەکانیش دژایەتییان دەکرد.

ڕۆژێکیان لە هاوینی ١٩٥٦دا، **ئەحمەد نەقیب** لە سلیمانی بەمن و عەزیزی گوت: **"کوڕینە بۆچی نەچین سەرێکی شێخ بدەین؟"**. دیارە ئێمە هەموومان دەمانزانی کە شێخ مەحموود لە گوندی **"داریکەلی"ی** نێزیك بە **سلێمانی** دەژی. چونکە شێخ لە سەرەتای سییەکانەوە، پاش کوژانەوەی شۆرشەکانی بە فڕۆکە و تۆپ و فرتوفێڵی کاربەدەستە ئینگلیزەکان، ڕەوانەی بەغدا کرابوو و، لەوێ بەزۆر نیشتەجێ کرابوو، بەڵام لە ئاژاوەی **"ڕەشید عەلی گەیلانی"** (لە مایسی ١٩٤١ دا) کە

دەیویست بە یارمەتی **ئەلمانیای نازی؛ ئینگلیزەکان لە عێراق** دەربکا و، حکوومەتێکی عەرەبیی فاشستیی؛ وەك بەعسییەکانی ئەورۆ دابمەزرێنێ، هەلێك بۆ **شێخ مەحموود** هەلکەوتبوو، توانیبووی بگەڕێتەوە کوردستان؛ بە نیازی تازەکردنەوەی شۆڕشەکەی لەو دەرفەتەدا، بەلاّم ڕێکنەکەوتنی شێخ لەگەلّ سەرکردە کوردەکانی دیکەی ئەو سەردەمەدا، وەك "عەلی کەمال بەگ" و **"ئەمین زەکی بەگ" و تۆفیق قەزاز** و، دەستوبردی ئینگلیزەکانیش لە رووخاندنی حکوومەتی رەشید عالی و ناچارکردنی بە هەلاّتن بۆ ئێران (٤)، ماوەی ئەوەیان نەدا بەوەی کورد سووت لەو دەرفەتە وەربگرن. جا لەبەر ئەوەی شێخ مەحموود لەگەلّ حکوومەتی رەشید عالی هاوکاریی نەکردبوو، جەنگی جیهانیی دووەمیش هێشتا کلّپەی دەسەند و، ئەنجامیشی دیار نەبوو، ئینگلیزەکان و حکوومەتی شای عێراق چاویان لەوە پۆشی کە جارێکی دی بیهێننەوە بەغدا، بەلاّم زۆریانلێکرد کە لە گوندی **داریکەلی** دابنیشێ و ئەوێ بەجێنەهێلێ. خەلّکی ئەو رۆژەی کوردستان بەم بەزۆر دانیشتنەیان دەگوت "دەستبەسەری" کە عەرەب پێیدەلّێن «**الاقامة الجبرية**» کەواتە شێخ مەحموود لە گوندی **داریکەلی** دەستبەسەر بوو و، بۆی نەبوو ئەوێ بەجێ بهێلێ و، کەم کەسیش زاتی ئەوەی دەکرد بچێتە خزمەتی؛ لە لایەکەوە لە ترسی حکوومەت (٥) و لە لایەکی دیکەشەوە لە ترسی کۆمۆنیستە عێراقچییەکان، چونکە عێراقچییەکان پرۆپاگەندەی ئەوەیان دەکرد کە گوایە شێخ پیاوی ئینگلیزە و دەرەبەگە و، جۆتکارە هەژارەکان دەچەوسێنێتەوە بۆ گیرفانی خۆی(٦).

لێرەدا حەز دەکەم پەنجە بۆ راستییەك رابکێشم کە مایەی سەربەرزی و ماکی خۆشبەختیمە لە ژیاندا. ئەوەش ئەوەیە، هیچ کاتێك نەمویستووە دلّی رەشە خەلّکی گەوج و رێژگاو بە نرخی شاردنەوەی باوەڕم رابگرم؛ یان بۆ ئەوەی بۆرەپیاو و بەکرێگیراو بە **"کوڕی باش"**م بداتە قەلّەم، واز لە بیروبۆچوونی خۆم بهێنم. هەر ئەم هەلّوێستە بنچینەییی یەش بوو وای لە من کرد کە وەك یەکەمین کورد و تاکە کوردێك؛ هەر لە پەنجاکاندا رژێمی دیکتاتۆر و تۆتالیتێری **سۆڤیت** و ئەورووپای رۆژهەلاّت و، زوڕناژەنە بێفەڕەکانی لە کوردستان و رۆژهەلاّتی نێوەڕاستدا؛ ئازایانە و زانستانە لە بەردەم رای گشتییدا رووت و قووت بکەمەوە و، لەسەر کورسی دادگەی ویژدانی

مێژوو و، مرۆڤی چەوساوە دایانبنێم و، وایانلێبکەم لەباتی پەلاماردان و بوختان بە خەڵك کردن و دەستوەشاندنی جارانیان، ناچار بن بکەونە پاڕانەوە و پاکانە بۆ خۆ کردن و پەژیوان بوونەوە لە کردەوەی تاوانبارانە و ناپەسەندانەیان. لەبەر ئەوە کە شێخ ئەحمەد ئەو پێشنیازەی کرد، بچینە خزمەت شێخ مەحموود، هەر دەسبەجێ گوتم: "باشە". عەزیزیش گوتی: "باشە دەچین". ئەوجا بە ئەحمەدم گوت: "دە کەواتە تۆ تەلەفۆنێك بکە بۆ شێخ، با بزانێ کە دەچینە خزمەتی. "ئەحمەد گوتی: "تەلەفۆنکردنی بۆ چییە؟ خۆ ئێمە ناچینە لای شای ئێران، یان شا فەیسەڵ؟ ئێمە دەچینە لای شێخی کورد".

کە لە نێو برادەراندا باسی چوونە لای شێخمان کرد؛ دوو برادەری دیکە ئامادەیی خۆیان پێشان دا بۆ هاتن لەگەڵمان. یەکێکیان **شەهید شێخ شەهابی شێخ نووری** بوو و، ئەوی دیکەشیان **حەمەی ئەحمەدی تەها (کامەران موکری هۆنەر)** بوو. ئەو شەوەی کە دەبوو بۆ بەیانییەکەی بکەوینە ڕێ؛ شەهاب دەمەو نیوەشەو لە دەرگەی ماڵی ئێمەی دا و، ڕایگەیاند پێم کە سبەینێ ناتوانێ لەگەڵمان بێ، چونکە مامۆستا نەخۆشە و؛ پێویستیی بە دەرمانێکە کە لە سلێمانی دەستناکەوێ و، دەبێ سبەینێ زوو بچێ بۆ کەرکووك بۆ کڕینی. مەبەست لە مامۆستا، مامۆستا هەمزە عەبدوڵا بوو؛ کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی پارتی دیمۆکراتی کوردستان و، ئەو سەردەمە لە نێزیك سلێمانی خۆی شاردبووەوە و، جار و بار شەهاب شەوانە زۆر درەنگ کە کەم کەس بە کۆڵانەوە دەمان، دەیهێنا لەگەڵ خۆی بۆ لام. شەهاب ئەو حەلە مووچەخۆرێکی بچووك بوو لە سلێمانی، لەبەر ئەوە لێمپرسی، پارەت پێیە دەرمانەکە بکڕێت بۆی، گوتی: پارەی پێویست نییە. جارێ لەگەڵ بەهجەت دەچم، ئەو دەزانی بۆچی دەچم، پارە وەرناگرێ، دەرمانەکەش لە کەرکووك لە دەرمانخانەی **"ڕەئووف"** دەهێنم، ئەویش پارە وەرناگرێ لێمان". بەهجەت هاژۆر (سائق)ی ئۆتۆمۆبێل بوو لە نێوان کەرکووك و سلێمانیدا کاری دەکرد. کوڕێکی دیانی خەڵکی سلێمانی بوو؛ وەك زۆربەی زۆری دیانە کوردەکانی سلێمانی، بە تایبەتی ماڵباتی بەهەشتی کەریمی ئەلەکە؛ کوردپەروەر بوو. ڕەئووفیش دەرمانساز "صیدلی" یێکی خەڵکی سلێمانی بوو، خاڵی **بەڕێزان بروسکە و بەختیار ئیبراهیم** بوو. لە کەرکووك

دەرمانخانەیەکی گەورەی هەبوو. بە نێوی دەرمانخانەی رەئووفەوە کە نێزیك کۆنە دوکانەکەی عومەر بێکەسەوە بوو. کە تۆرانییەکانی کەرکووك بە هاوکاریی بەعسییەکان، کەوتنە دامەزراندنی تۆڕی نهێنیی تێرۆریستانە بۆ کوشتنی کورد و کۆمۆنیستە ناسراوەکان، رەئووفیش هاتەوە سلێمانی. هەرچی کامەران موکریشە؛ ئەوا چووینە ماڵەوە بە شوێنیدا، تاکو هەڵیگرین لەگەڵ خۆمان، لە ماڵەوە نەبوو. نێزیکەی دوو سەعات پتر ئەم لاو ئەو لا گەڕاین بە دوایدا وەگیرمان نەکەوت. پاش چەند رۆژێك کە دیمانەوە؛ گوتی: "ببوورن نەمتوانی بێم لەگەڵتان"، هەر هێندە و بەس.

لەبەر ئەوە شێخ ئەحمەد و عەزیز و ئەز؛ هەر سێکمان بە جیبە شڕەکەی شێخ ئەحمەد بەرەو داریکەلی کەوتینە رێ. ئەو سەردەمە رێ و بان زۆر ناخۆش و پڕ لە کۆسپ و نشێو و زرگو هەڵەت و پێچاوپێچ بوو. ئۆتۆمۆبێل بە شەش حەوت سەعات دەگەیشتە کەرکووك. جێبەکەی شێخ ئەحمەدیش وەك **"کەری ماستەکە"** وا بوو، هەر چوارهەنگاو دەڕۆی و دەوەستا. ئۆتۆمبێلەکەمان لە رێ دووجار پەکی کەوت، جارێکیان تایەیەکی پەنچەر بوو، جارێکی دیکەش ئاوی مەکینەکەی دەکولآ. بە نێزیکەی پێنج سەعات بە نێو خوڵ و تەپو تۆزدا گەیشتینە **داریکەلی**. چرووچاو و جلکەکانمان وەك چڕ و چاو و جلکی ئاشەوانی لێهاتبوو. کە دابەزین خۆمان تەکاند و فوومان لە سەروچاوی یەکدی کرد. ئەحمەد گوتی: **"ئەمە داریکەلی یە"** داریکەلی چی؟ نێوی گەورە و دێی وێران. گوندێکی بچووکی ٤٠ ماڵەی پەرپووت. خانووەکانی هەموو قوڕین وەك کونە گورگ بە وێنەی هەموو گوندەکانی دیکەی ئەو سەردەمەی کوردستان، داریکەلیش ئاوی لوولە و وزەی کارەبای نەبوو. خەڵکی گوندەکە لە کانییەکی نێزیك ئاویان دەهێنا، بە شەویش لە بەر قوتیلە نەوت و **"چرای ئینگلیزی"** دادەنیشتن. بەڵام دوایی دیمان کە شێخ "چرایەکی لۆکس"ی هەیە. ئەم جۆرە چرایە تیشکی لە چراکانی دیکە و قوتیلە نەوت بە هێزتر بوو، بە زۆری لە چایخانەکانی سلێمانی دایاندەنا.

ئێمە یەکسەر چووینە بەر ماڵی شێخ، کە راستییەکەی جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو لەگەڵ ماڵی گوندی یەکانی دەوروپشتی. گوندییەکان شێخ ئەحمەدیان

دەناسی. لەبەر ئەوە یەکسەر رایان کردە لای شێخ مەحموود و پێیانراگەیاند کە میوانی هاتووە. شیخی نەمر بە جلکی کوردی و بەو پیری یەوە، ئیمەش بەو گەنجییەی ئەوسامان، هاتە بەر دەرگە بەپیرمانەوە. ئەحمەد یەکسەر چووە پێشەوە لێی و، دەستی ماچ کرد و، پێیگوت کە ئێمە کێین. شێخ بە بزەیەکی باوکانە و بە دەنگێکی نزمەوە فەرمووی: "بە خێرهاتن و سەرچاو" ئەوجا ئێمەش دەستی شێخمان ماچ کرد و، ئەویش نێوچەوانی ئێمەی ماچ کرد و بردینی بۆ ژوورەوە بۆ دیوەخان.

لە نێو کوردەواریدا وشەی "دیوەخان شڕ" هەیە. شێخی نەمر؛ بەڕاستی و بە هەموو مانای وشە "دیوەخان شڕ" بوو. چەند کورسییەکی کۆنی شەقوشڕ دانرابوون؛ گوایە ئەمانە "مۆبیلە" بوون. چەند دۆشەك و پشتییەکی چلکنیش راخرابوون، کە رەنگە هێندێکیان هی سەردەمی عوسمانی بووبن. شایانی باسە؛ کە سالێك دوای ئەوە، جارێکیان لە خزمەت **مامۆستا رەفیق حیلمی** و چەند برادەرێکی دیکەی ئەو کاتەدا بە ئۆتۆمبیل چووینە **هەڵەبجە و مامۆستا رەفیق حیلمی** فەرمووی: با بچین سەرێکی ماڵی **حەسەن بەگی جاف** بدەین، چونکە ئەگەر بیبستێ هاتوومەتە هەڵەبجە و نەچوومەتە سەردانی، دڵگران دەبێ. کە چووین و، دیوەخانی ئاوێنەبەندی بەگزادەی جافمان دی و، بە دیوەخانەکەی کۆنە **شای کوردستان شێخ مەحموود** بەراوردم کرد، جیاوازییەکی یەکجار زۆر لە نێوان شێخ و بەگزادەدا کەوتە بەرچاوم و، هەستم بەوە کرد کە بەگەکان و شێخەکان لە باری ژیانی ئابوورییەوە: دوو چینی تەواو لە یەك جیاوازن و، لەهەمان کاتدا **بەچاوی خۆم دەرکەوت بۆم کە کۆمۆنیستە عیراقچی یەکان چەند درۆزن و بوختانکار و بێویژدانن؛ کە پیاوێکی وەك شێخ مەحموود بە دەرەبەگ دەدەنە قەڵەم.**

لە کورتی بیرمەوە، شێخ فەرمووی "دانیشن" و ئێمەش پاش ئەوەی شێخ خۆی دانیشت، لەسەر دۆشەکەکان دانیشتین. دەمودەست؛ دەستوپێوەند هاتن بۆ بەخێرهاتن کردنمان. "بەخێر هاتن"، "قوربان بە خێر هاتن"، "ئەمجاریش بەخێر هاتن". "یاخوا بەخێر هاتن". هەر وەك رەوشتوخووی خەڵکی گوندەکانی کوردستان، ئەگەر ئەز بێژم سەت جار، ئیوە بێژن هەزار جار و گوێ مەدەنی، بەخێر هاتن کراین و یەك لە دوای یەك چایی شیرین دەهاتن بۆمان.

سەرەتا بە شێخی نەمرم گوت: "زۆر بەختیارم بەوەی کە ئەمڕۆ لە خزمەت شای کوردستاندام". شێخ فەرمووی: "شای کوردستانی چی؟ شای کوردستان، شای کوردستان! کورم؛ ئەگەر شای کوردستان دەبووم، ڕێی ئەوە نەدەگیرا لێم کە بە کوردستاندا بگەڕێم".

شێخ هەرچەندە تەمەنی لە حەفتا تێپەڕی کردبوو، چاویشی کەمێك کز بوو بوو، بەڵام لەشی زۆر تێك نەچوو بوو. مێشکیشی هەر لەسەر خۆی بوو. پیرەمێردیکی بێفیز و رووگەش و قسەخۆش بوو. لە هەموو وتە و هەڵسوکەوتێکی شێخدا نیشانەی سادەیەتی و راستی، بەڵام گلەییەکی زۆر لە رۆژگار و لەخەڵك بەدیدەکرا.

شێخ کە زانی لە کەرکووك کار دەکەم؛ هێندێك پرسیاری کرد لێم لە بارەی بارودۆخی کەرکووك و دەسەڵاتی ئینگلیزەکان لەوێ. چونکە ئەو سەردەمە کۆمپانیای نەوتی کەرکووك کە بە **ipc** ناسرابوو، بەدەست ئینگلیزەکانەوە بوو. لە قسەکانی شێخ دا رۆن بووەوە بۆم کە ئینگلیزەکان و هێندێك لە سەرۆك هۆزە کوردەکان، بەتایبەتی پشدەرییەکان و، هێندێك لە کوردە خوێندەوارەکانی سەردەمی خۆی، لەوانەی کە بووبوونە تورانی و خەڵکی کوردستان نێویان نابوون **"جلخوار"**(٧) بە گوناهباری هەرە گەورە دەزانی لە پووچکردنەوەی هەوڵدانیدا بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ.

کە باس هاتە سەر ئینگلیزەکان، شێخ فەرمووی: "ئینگلیزەکان بە منیان دەگوت: "تۆ بچۆ شەڕی ترك بکە. لیرەش جلخوارەکان دەیانگوت: "ترك موسڵمانن لەگەڵیان رێك بکەوە. لەنێو خەڵکیشدا دەچوون ترسیان بڵاو دەکردەوە، دەیانگوت ئینگلیزەکان ماوەیەك لێرە دەبن و دەڕۆن، ئەوجا ترك دەگەڕێتەوە، تۆڵە لەوانە دەستێنێتەوە کە پشتی ئینگلیزەکانیان گرتووە. منداڵینە: ئێوە نازانن ئەو رۆژە چ رۆژێك بوو."

لێرەدا بە شێخم گوت: "قوربان، رەنگە جەنابت کە لە شەڕی ترك دوودڵ بووبیت؛ هۆی ئەوە بووبێت کە ترکەکان موسڵمان بوون". شێخ فەرمووی: "موسڵمان؟ ترکەکان موسڵمان بوون؟ ترکەکان موسڵمان نەبوون. نە عوسمانییەکان موسڵمان بوون و نە کەمالییەکان. جا ئەگەر ئەوان موسڵمان بوونایە، چۆن

ئینگلیزەکانم دەهێنایە کوردستان! موسڵمان ئەوەیە خوێنی خەڵك بڕێژێ؟ راووڕووت بکا؟ منداڵی نەرمەنی بکا بە نووکی سونگییەوە؟ دەست بۆ نامووسی ژنان درێژ بکا؟ ئەوانە موسڵمان نەبوون. جلخوارەکانی ئێمەش موسڵمان نەبوون. هەموو سەرسەری و ئارەقخۆر و بەنگکێش و مێشك پووت بوون. کە خۆم دوو دڵ بووم لە شەڕی ترك ئەوە بوو، کە ئینگلیزەکان هیچ بەڵێنێکیان نەدەدا و نە دەچوونە ژێر هیچ پەیمانێکی مەردانە. دەمگوت: باشە پێم بڵێن تا کوێ بچم بە شەڕ کە ئێوە رازی بن بچێتە سەر ئەم کوردستانەی ئێستە؟ ئەوان هەر ئەوەیان دەگوت و دەگوتەوە: "تۆ جاری ترکەکان لە کوردستان دەربەرێنە". زۆر هەوڵم دا دڵی ئینگلیزەکان رابگرم، بەڵام ئەوان لە پشتەوە دزانە خەریکی پاشقولگرتن بوون لە من. هێندێك هەتیوچە و ناکەس بەچەیان چراخ کرد و راستیانکردنەوە دژی من. بە کورتی باوەڕم بە ئینگلیزەکان نەمابوو. سەیر ئەوەیە کە **سمکۆ (سمایل خانی سمکۆ)** (٨) هاتە سلێمانی بۆ لام، ئینگلیزەکان زۆر شتیان پێچەوانە تێگەیاندبوو، تەفرەیان دابوو. پێم گوت تۆ قارەمانی کوردستانیت، چۆن دەبێ بە درۆی ئەوان باوەڕ بکەیت و فریو بخۆیت. دواییش هەر بۆ خۆی ئاشکرا بوو کە ئینگلیزەکان دەستیان بڕیبوو، ئەگەنا لە سەرەتاوە هیچ دژی ئینگلیزەکان نەبووم. زۆر حەزم دەکرد لەگەڵیان رێکبکەوم. من هێنابوومنە کوردستان و، بێ شەڕ و هەرا و خوێنڕێژی دەرگەمان کردبووەوە بۆیان. چونکە پێموابوو سەربەستی و خێر و خۆشی دەهێنن بۆمان و، دەمانپارێزن و دەمانکەنە دەوڵەتێکی سەربەخۆ. بەڵام ئەوان بە تەواوی بە پێچەوانەوە جووڵانەوە. میجەر نۆئیلی لێدەرکەیت کە پیاوێکی جوامێر و رەسەن بوو، ئەوانی دیکە هەموو بە چاوی نزم تەماشای ئێمەیان دەکرد، وەك خزمەتکاری خۆیان، بە تایبەتی **"مێجەرسۆن" کابرایەکی لەخۆبایی، قسەتڕن، لووتبەرز بوو؛ دەیویست ئێمە بچین کڕنۆش ببەین بۆی. هەموو جارێك کە قسەمان لە یەك گیر دەبوو، ئەوەم دەدایەوە بەچاویدا کە ئەوان بە شەڕ کوردستانیان داگیر نەکردووە، بەڵام ئەوان زۆر بێوەفا و سپڵە و پێنەزان بوون، هیچ چاکە و دۆستایەتییەکیان لەبەر چاو نەبوو".**

**شێخ مەحموود** باسی دروستکردنی عێراقی کرد و، دەوڵەتی عێراقی بە **"زۆڵەکی ئینگلیزەکان"** دەدایە قەڵەم. هەروەها فەرمووی: «ئەم عێراقە کابرایەکی دوودەرکی

دروستیکرد کە لەگەڵ فەیسەڵە حیز (مەبەستی شا فەیسەڵی عێراق بوو: ج.ن.) سەربەسەرێنەیان دەکرد ».

لێرەدا داوای لێبوردن لە خوێنەرەوەی بەڕێز دەکەم کە قسەکانی شێخم بەم شێوەیە هەروەك خۆی و بێدەستکاریکردن، نووسیوە. چۆنکە سەرڕاستی وا پێویست دەکا کە قسەکانی شێخ هەر وەك خۆی بخەمە بەرچاو. بەڕاستی سالآنیساڵ دوودڵ بووم لەوەی: ئایە ئەم سەردانەی شێخ مەحموود بخەمە سەر کاغەز یان نا. ئەوەش لەبەر ئەم وتە بێ پەردە و ڕەپوڕاستانەی شێخی نەمر. دوایی گوتم: "بۆچی نەء،! شێخ مەحموود مرۆڤێکە وەك هەموو مرۆڤێکی دیکە و، دەتوانێ بیروباوەڕی خۆی بەو شێوەیە دەربیڕێ کە خۆی بەباشی دەزانێ. بێجگە لەوەش خۆم کاتێك کە لە بەغدا دەژیام، لە پەنجاکاندا هێندێك چیرۆکم لە چەند کەسێکی کورد و عەرەبی شارەزای سەردەمی پاش جەنگی جیهانیی یەکەم بیست کە بەڵگەن بۆ ڕاستی و دروستی قسەکانی شێخ. لەوەش بترازێ ئەوەتە هۆنەری بەنێوبانگی کورد؛ مەعرووفی ڕەسافیی (معروف الرصافي) کە هۆنراوەکانی بە زمانی عەرەبی هۆنیوەتەوە، لە بارەی بارەگەی شا فەیسەڵەوە گوتوویەتی:

**"أبلاط، أم ملاط، بالمنائيك مُحاطُ"**

مانا: **"ئایە ئەمە بارەگەی شایە، یانە مارەگەیە کەوا بە حیزان دەورە دراوە؟"** (سەرنج: ملاط لە زمانی عەرەبی دا بە مانای **"قوڕ و قسڵ"** و **"لووس و بی تووك"** یش دێ، **کەواتە ملاط (لووسخانە)** دەگرێتەوە.

پێوەندیی سێکسی **شا فەیسەڵ و سێر پێرسی کۆکس**، کاربەدەستی گەورەی بەریتانیا لە بەغدا؛ لە نێو خەڵکی ئەو سەردەمەی عێراقدا لە هەموو لایەك باس دەکرا. لەمەش بترازێ، ئەو شتە ئەوڕۆ **"مۆدێرنە"** و، وەك کوردەکەش دەبێژێ: «هەرکەس دەچێتە گۆڕی خۆی»، هونەر ئەوەیە پێوەندیی تایبەتی دوو کەس، یان چەند کەسێك نەبێتە هۆیەك بۆ دوژمنایەتیکردنی خەڵکی دیکە.

یەکێك لەو شتانەی کە زۆر حەزمدەکرد بیزانم، بیروباوەڕی شێخ مەحموود بوو بەرامبەر **بەکر سیدقی عەسکەری** (٩). چۆنکە بە هۆی هاتوچۆی دوکانی مامۆستا بەشیر موشیرەوە کە بوو بووە "ماڵی کورد" لە بەغدا، گەلێك چیرۆکم لە بارەی بەکر

سیدقییەوە بیستبوو، بە تایبەتی مامۆستا بەشیر خۆی؛ بەكر سیدقی بە سەركردەیەكی گەورەی كورد دادەنا و؛ ناسیاوەتیی تایبەتیشی لەگەڵیدا هەبوو بوو. شێخ لەم بارەیەوە فەرمووی: "بەكر سیدقی كورد بوو، حەزی بە كوردایەتیش دەكرد، بەڵام كەرپیاو بوو، زۆر سەیرە! گوناهی ئەوەی كە ئینگلیزەكان فەیسەڵە حیزیان كردووە بە سەرگەورەی كورد و عێراق؛ دەخستە ئەستۆی من. كە لە بەغدا دەستبەسەر بووم، جارویار دەهاتە لام (١٠). ئەم كابرایە هەموو جارێك شەڕێكی دەفرۆشت پێم و، بە تووڕەیی منی بەجێدەهێشت... جارێكیان بەكرە شێت میوانم بوو. كاتی نوێژ هاتبوو، هەستام نوێژەكەم بكەم كەچی گوتی: **"تۆ بۆچی نوێژ دەكەیت؟"** گوتم: چۆنكە موسڵمانم و نوێژ كردن پێویستكراوە لەسەرم." گوتی: "ها موسڵمان! موسڵمان لە لایەكەوە نوێژ دەكەن و لە لایەكی دیكەشەوە دزیدەكەن، دەستی خەڵك دەبڕن، جاسووسیدەكەن، خوێنی خەڵك دەڕێژن ..." **گورج قسەكەم پێبڕی و گوتم: "وس بە! تۆ ئەمانە هیچیانت لە من نەدیوە"**. گوتی: «تۆ كە شێخی دەروێشیت و موسڵمانیت، تۆ بوویت ئینگلیزەكانت هێنایە كوردستان بەرامبەر بە هیچ. دوایش دەرتنەكردن، تا ئەوان تۆیاندەركرد، دەبڕۆ بخۆ، تۆ خائینیت". بەكر زۆر دەمشڕ و بێناموس بوو. وایدەزانی دەركردنی ئینگلیزەكان حەلوا خواردنە. هەر بەو كەرێتییە مایەوە تا ئینگلیزەكان سلیان سارد كردەوە».

كە شێخ ئەوەی فەرموو، لێمپرسی: **"بۆچی بەكر سیدقی موسڵمان نەبوو؟"** شێخ فەرمووی: "بەكر سیدقی خەڵكی ئەسكەر بوو، لە هەققەكان بوو. پێی وا بوو هەر ئەوان لەسەر هەقن." لێرەدا شایانی باسە كە كاتی خۆی لە مامۆستا رەفیق حیلمیشم بیستووە كە بەكر سیدقی هەققە بووە، بەڵام لای هەموو كەسێك باسینەكردووە. هەر لە بارەی بەكر سیدقییەوە شێخ فەرمووی: **"بەكرە شێت منی تاوانبار دەكرد كە گوایە رقم لە پشدەرییەكانە. راستییەكەی ئاغاكانی پشدەر رقیان لە من بوو، خیانەتیشیان لە من كرد. دوواییش هێندێكیان بوونە نۆكەری ئینگلیز و نووری سەعید. بەڵام بەكرە شێت پێی وابوو، ئەوانە كوردی باشن، دەچوو پارە و چەكی دابەشدەكرد بەسەریاندا. ئەو كەرە پێیوابوو كە پشدەرییەكان لە تەنگانەدا دەیپارێزن، چاكیان پاراست"**. هەر لەم بارەیەوە شێخ فەرمووی: بەكرە شێت چەند شیتێكی لە بابەتی خۆی كۆ

کردبووەوە، وەك خولەی جەودەت (مەحموود جەودەت: ج. ن.) و کێ و کێ. ئەحمەد نەقیب لەمەدا گوتی: **"بەڵام ئێمە بیستوومانە کە مەحموود جەودەت کوردێکی باش بووە"**. ئەوجا شێخ فەرمووی: **" خولە، خوا هەڵناگری، کوردێکی باش بوو، کە بەکر کوژرا هات بۆ لام و گوتی: "ئەی هاوار! پاشا شەهید کرا، ئای دەستی شکاوم"، دەگریا. گوتم: خولە برۆ خۆت بشارەوە، سەرەش دێتە سەر تۆ. بەڵام خولە شێت بوو، گوتی: ئەوی دەست دەبا بۆ من هێشتا لە دایك نەبووە... ئەوە بوو خولەیان گرت و ملیان کرد بە پەتدا."**

لێرەدا بە پێویستی دەزانم بۆ مێژوو ئەوە رۆن بکەمەوە، کە پاش دامەزراندنی فەرمانداریّتیی کوردستان بە سەرۆکایەتیی شێخ مەحموود؛ چەند ئەفسەریکی کورد کە لە سوپای عوسمانیدا بوون؛ گەڕابوونەوە کوردستان و، چووبوونە سوپای کوردستانەوە، لەوانە **جەمال عارف کەرکووکی و مەحموود جەودەت و کامیلی حەسەنەفەندی** و، وابزانم **قالەی ئایشە خانیش** (لەمەی دوایی یان دڵنیا نیم)، لە خزمەت شێخدا مانەوە تا ئینگلیزەکان عێراقیان کرد بە دەوڵەت و ، باشووری کوردستانیان نووساند بە عێراقەوە، ئەوجا ئەمانە چوونە نێو لەشکری عێراقەوە، جارێکیان مەحموود جەودەت لە بەغدا دەچێ بۆ لای کاربەدەستێکی حکوومەتی عێراق کە نێوی عەبدولقادر سەنەوی (عبدالقادر سنوی)(١١) دەبێ، کە ئەویش هەر کورد دەبێ و، داوای ئەوەی لێدەکات کە خزمەتەکەی لە سوپای کوردستاندا بۆ مووچەی مانگانە و پلەی فەرمانبەریّتی بۆ حسێببکەن. بەڵام ئەو عەبدولقادرە پێیدەڵێ: **"تۆ تا ئێستە جەردە بوویت و، ئێستەش هاتوویتە سەر ئێمە و، دەتەوێ داوای ماف بکەیت لێمان؟"** مەحموود جەودەت پێیدەڵێ: **"ناماقووڵی مەکە، جەردە نەبووم. خزمەتی کوردستانم کردووە، لە خزمەت شای کوردستاندا بووم، ئەوەتا کوردستانیان خستووەتە سەر عێراق و هاتووم داوای مافی خۆم دەکەم"**. عەبدولقادر سەنەوی جنێو دەدا پێی و بە شێخ مەحموودیش. مەحموود جەودەت کابرایەکی توند دەمار دەبێ؛ دەمانچەکەی دەردەهێنێ و دەیداتە بەر گوللە و دەیکوژێ. لەمەوە مەحموود جەودەت دەگیرێ و دادگە فەرمانی لەسێدارەدانی دەدا. بەڵام **بەکر سیدقی** کە ئەمە دەبیستێ دەستبەجێ مەحموود جەودەت بەرەڵا دەکات و، دەبێژێ: "دەستی

خۆش بێ". پاش شەهید کردنی بەکر سیدقی لە مووسڵ بە دەستی ناسیۆنالیستە عەرەبەکان و بە هاوکاریی ئینگلیزەکان، مەحموود جەودەت جارێکی دی دەگیرێتەوە و لە سێدارە دەدرێ. **لە سێدارەدانی مەحموود جەودەت کسپە لە جەرگی نیشتمانپەروەرانی کورد هەڵدەستێنێ و، هۆنەری گەورەی کورد مامۆستا عەبدوڵڵا گۆران (١٩١٤ ـ ١٩٦٢) بە هۆنراوەیەکی زۆر بە سوز شیوەن دەکا بۆی(١٢).** جا ئەز بەر لەوەی بەخزمەت شێخ مەحموود بگەم، باسی مەحموود جەودەتم لە گەلێك کەس بیستبوو، بە تایبەتی لە **ئەفسەر جەمال عارف کەرکووکی و شێخ سەلامی هۆنەر (شاعیر) و مامۆستا رەفیق حیلمی. شێخ سەلام و مامۆستا رەفیق حیلمی** شەوی پێش لە سێدارەدانی **مەحموود جەودەت** چووبوونە بەندیخانە لە بەغدا بۆ لای و، باسی وەرەبەرزی و بێباکی و ئازایەتیی مەحموود جەودەتیان دەگێرایەوە. لێرەدا حەز دەکەم ئەوەش بخەمە بەرچاو کە قسەکانی ئەو عەبدولقادر سەنەوییە بەرامبەر بە مەحموود جەودەت و شێخی نەمر، ناماقوولییەکە تا سەری هەڵدەگرێ. بەلآم کوشتنی عەبدولقادریش لەسەر قسەیەك؛ هەر چەندە ناشیرین و نانیشتمانپەروەرانەش بێ، راست نییە. هەروەها لە سێدارەدانی مەحموود جەودەتیش کە لەسەر رۆمەت (شرف)ی خۆی و سەرۆکی نەتەوەکەی و نیشتمانەکەی؛ ئەو کارە نابەجێیەی لە دەستدەرچووە، ئەوەش هەر نادروستە.

مامۆستا رەفیق حیلمی دەیفەرموو: **"مەحموود جەودەت بۆیە لە سێدارە نەدرا، چونکە عەبدولقادر سەنەوی کوشتبوو. عەرەبە شۆڤێنیستەکان بە ئاشکرا دەیانگوت: "سەگێك سەگێکی دیکەی کوشتووە"**. مەحموود جەودەت بۆیە لە سێدارە درا؛ چونکە کوردێکی نیشتمانپەروەر بوو و، پشتگیریی بەکر سیدقی کردبوو" شایەنی باسە لێرەدا کە مامۆستا رەفیق حیلمی خۆی حەزی لە چارەی بەکر سیدقی نەدەکرد و، دەیگوت: **"بەکر هەر کوردێك لەگەڵی نەبوایە، بە پیاوی ئینگلیزی دەدایە قەڵەم"**.

ئەم رووداوە خۆی لە خۆیدا هەڵوێستی بەکر سیدقی بەرامبەر دەوڵەتی شێخ مەحموود کە عەبدولقادر سەنەوی بە **"جەردەیەتی"** داوەتە قەڵەم، دەخاتە روو، کە بەکر سیدقی دژی شۆرشی شێخ مەحموود نەبووە؛ ئەگەر چی شێخ مەحموودیشی بەوە

گوناهبار کردووە کە بە بیروڕای وی نەیتوانیوە "ئینگلیزەکان لە کوردستان دەربکا."

جا کە ئێستە وا هاتووینەتە سەر باسی **بەکر سیدقی** زۆر بە پێویستی دەزانم بۆ بەربەرچدانەوەی ئەو ناڕاستییانەی کە دوکتۆر کەمال مەزهەر بلاوی کردوونەتەوە بەرامبەر ئەم کوردە مەردە کە ئێستە چووەتە جێی هەقی خۆی و، دەسەلاتی ئەوەی نییە لەسەر خۆی بکاتەوە، بێمە قسە و، هێندێك راستینە بۆ مێژوو تۆمار بکەم. **دوکتۆر کەمال مەزهەر** سالانی سالْ رژێمی تاوانباری سۆڤێتی بە رزگارکەری گەلانی ژێردەستە دادەنا، بەلام ئەم هەلوێستە رێی ئەوەی لێنەدەگرت کە نەبێتە سکرتێری دوژمنێکی ناسراوی سۆڤێت و کۆمۆنیزم **مامۆستا مەسعوود محەممەد** و، ژمارەیەکی زۆری نووسینەکانی دوکتۆر کەمال لە بەرهەمی ئەرمەنی یەکان و رووسەکانەوە وەرگیراون، بێلیکۆلینەوە و توێژینەوە. ئەوڕۆش لەبەر خاتری رژێمی تاوانباری بەعس؛ بە پێی پیلان؛ لە مێژووی کورددا ساختەکارێتی دەکا. لە لایەکەوە کتێب دەردەکا لەسەر **"شۆرشی سالی ١٩٢٠ی عێراق"** و **"شۆڕشی کوردستان بە سەرۆکایەتیی شێخ مەحموود بە بەشێك لە شۆڕشی عێراق"** دەداتە قەلەم". لە کاتێکدا کە هەر کەسێك کە ئەلفوبێی مێژووی کورد بزانێ، دەزانێ شۆرشی شێخ مەحموود پێوەندیی بەراپەڕینی خەلکی عێراقەوە نەبووە. **شێخ مەحموود گۆڕ هەلتەکێنە!** لە لایەکی دیکەوە و، هەر لەبەر خاتری بەعسییەکان دەنووسێ کە بەکر سیدقی پێوەندیی بە کوردایەتییەوە نەبووە. لەم بوارەدا؛ دەپرسم: ئایە ئەگەر ئەوڕۆ لە جیاتی بەعسییەکان بەکر سیدقی لە بەغدا فەرمانڕەوا بووایە، دوکتۆر کەمال گەلێك چیرۆك و داستانی پێکەوە نەدەنا بۆ پەسندان (مدح)ی بەکر سیدقی؟.

بەعسییە تاوانبارەکان هەر لە سەرەتای هاتنە سەرکارەوە لە شوباتی ١٩٦٣دا؛ هەولیان دابە بەکر سیدقی بگەفن. تەنانەت لە دادگەکەیاندا لە پرۆفیسۆر ئیبراهیم کوبەیان پرسی (کە ئەو کاتە بە تۆمەتی کۆمۆنیستی گرتبوویان)، **"مامۆستا بیروڕات چییە بەرامبەر بزووتنەوەی بەکر سیدقی؟" مامۆستا کوبە مەردانە گوتی: "لە بزووتنەوەی بەکر سیدقییم نەکۆلیوتەوە، لەبەر ئەوە ناتوانم لەم بارەیەوە هیچ بێژم"**. ئافەرینی لێبێ و؛ رووی ئەوانەش سپی نەبێ کە بۆ پارە و بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان، راستی دەشارنەوە.

ئێستەش دەمەوێ ئەم چیرۆكەی خوارەوە بۆ مێژوو بگێرمەوە و مەبەستیشم لەمە هەر خزمەتی میژوو و، راستبێژییە:

هۆنەری كۆچكردوو **ئەوڕەحمانی شەرەفكەندی (هەژار)** (١٩٢١ـ ١٩٩٠) كە لە پەنجاكاندا لە بەغدا بە دزییەوە دەژیاو، لەگەڵ من دۆستایەتییەكی توند و تۆڵی هەبوو، دەمێك بوو بە دەست نەخۆشیی سیلەوە دەینالاند. ساڵی ١٩٥٤ نەخۆشییەكەی تەواو زۆری بۆ هێنابوو، بەڵام لە نەخۆشخانەی سیلدارەكان لە "تویثة" وەریاننەدەگرت. لەبەر ئەوە ناچار بووم تكا لە "عەقیدی موتەقاعید ئەمین رەواندزی بكەم كە بمبا بۆ لای پیاوێكی دەستڕۆیشتوو؛ كە ئەو قسە لەگەڵ بەڕێوەبەرێتیی نەخۆشخانەكە بكات. **ئەمین رەواندزی** بردمی بۆ لای **نوورەدین مەحموود** ، كۆنە فەرمانداری گشتیی سوپای عێراق، كە لەو كاتەدا تەقاویت كرا بوو. نوورەدین مەحموود ئەو پیاوە بوو، كە دوو ساڵ لەوەبەر (١٩٥٢) پاش ئاژاوەیەكی یەكجار سەخت لە بەغدا؛ كە بە **"راپەڕینی تشرین"** (انتفاضة تشرین) نێوی رۆیوە، وەسی عەبدولئیلا (الوصي عبدالاله) تكای لێكرد، كە حكوومەت بگرێتە دەست خۆی، بۆ ئەوەی تانج و تەختەكەی رزگار بكا. نوورەدین مەحموود حكوومەتی گرتە دەست و ئاژاوەكەی زوو كوژاندەوە. دوای ئەوە بە ماوەیەكی كەم تەقاویتكرا. كە چووینە لای نوورەدین مەحموود، ئەمین رەواندزی لەبەردەمی نوورەدین مەحموود دا رووبكردە من و گوتی: "پاشا كوردە". گوتم: "دەزانم. چۆنكە عەقیدی تەقاویت كراو محەممەد عەلی كوردی باسی پاشای كردووە بۆم". ئەوجا نوورەدین مەحموود باسی ئەوەی كرد كە **هەوراميیە و لە بەغدا** لە دایكبووە و، كوردی زۆر كەم دەزانێ. جا لەبەر ئەوەی هاوین بوو، هەوا زۆر گەرم بوو، لە حەوشەی ماڵی پاشا دانیشتبووین، نوورەدین مەحموود منی بردە ژوورەوە و، كتێبخانەكەی پێشانمدا كە گەلێك كتێبی كوردی و سەربە كوردی تیدا بوو. نورەدین مەحموود گوتی: ئەز شاگرد و سەربازی شەهید بەكر سیدقی بووم. ئەو منی پێگەیاند. كە زانی كوردم یەكسەر رێی پێشكەوتنی لە سوپادا كردەوە بۆم". ئەوجا گوتی: **"شەهید بەكر كوردێكی زۆر ئازا و چاونەترس بوو. لەو باوەڕەدا بوو كە سوپای عێراق دەبێ بەدەست كوردەوە بێ، تا بتوانن لە هەلێكدا كارێك بۆ كورد بكەن"**. كە ئەوەی گوت

**منیش و ئەمین ڕەواندزیش گوتمان: " پاشا خۆ هەلێکی زۆر باش هەڵکەوت بۆ جەنابتان، بۆچی بەکارتان نەهینا؟".**

نورەدین مەحموود گوتی: "کە وەسی منی بانگ کردە لای خۆی و ڕووی نا لێم حکوومەت بگرمە دەست، هێشتا بەڵێنی تەواوەتیم نەدابوو پێی بیکەم، بەلاّم بەتەمای کردنی بووم، کە فەرمانی جوولآنی فیرقەی کوردستانم دا لە کەرکووکەوە بۆ بەغدا و، دەسبەجێ پێوەندیم بە ئەفسەرە کوردەکانەوە کرد، تەنێ دووانیان ئامادە بوون کە هاوکاریم بکەن. یەکێکیان **مەحەممەد عەلی کوردی** بوو کە تەقاویتە و لە سوپادا نەماوە، بەلاّم ئەفسەرێکی باشە. لەبەر ئەوە سەرینەگرت" لێرەدا گوتم: "پاشا، ئەز لە سەرەتای ژیاندام و رایەم ناکەوێ ئامۆژگاریی یەکێکی وەك جەنابت بکەم، بەلاّم نەدەکرا زووتر لە نێو سوپادا کۆمەڵە ئەفسەرێکی کورد دروستبکەیت و، جۆرە دەروێستیی (التزام)یەك لە نێوانیاندا پێکبهێنیت بۆ رۆژی تەنگانە؟".
نورەدین مەحموود گوتی:" سوپا وەك زانستگە نییە (سەرنج: ئەو دەم هیشتا لە زانستگە خوێندکار بووم. ج. ن.) هەروا بە هاسانی پێوەندییبەیەکەوە بکرێ و کۆمەڵە دروستبکرێ. ئەوی بە سووسەیەك شتێك دەربکەوێ لێی؛ چارەنووسی، یان گرتنە یان مردنە".

قسەکانی **نورەدین مەحموود** ڕاست بوون. چونکە دوایی لە محەممەد عەلی کوردیم پرسی، گوتی« ڕاستە، وابوو، پیوەندیی بە منەوە کرد بە نیازی کودەتا (انقلاب) و، منیش بەڵێنم دا پێی تا مردن لەگەڵی بم». شایانی باسە محەممەد عەلی کوردی گوتی: «نورەدین مەحموود هەر لە سەرەتای هاتنەسەرکارییەوە؛ دەستنێژی بەکر سیدقی بوو، ئێمە هەموومان سوپاسبێژی بەکر سیدقیین، کە توانیمان بێینە سوپای عێراقەوە» بێجگە لەوەش خۆم پاش هاتنە سەرکاری نورەدین مەحموود بە دوو ڕۆژ، لە بەغدا گیرام! و، چەند هەفتەیەك خرامە بەندیخانەی ئەبو غرێبەوە. هەموو ئەو سەربازانەی کە پارێزگاریی بەندیخانەکەیان دەکرد و، هەموو ئەو سەربازانەی لەسەر جادەکانی بەغدا وەستابوون، کورد بوون. بەڕێز جەلال بێتوشیش گیرابوو، ئەویش هەر لە بەندیخانەکەی ئێمە بوو، ئەو دەزانێ کە سەربازەکانی بەر دەرکەی زیندان، سەموون و پیڤاز و مەکینەی تەراشیان دەهێنا

بۆمان. مەبەستم لەو چیرۆكە ئەوە بوو كە بە بەڵگە ساخی بكەمەوە كە بەكر سیدقی كوردێكی نیشتمانپەروەر بووە.

**ئێستە بۆ ئەوەی بەڵگەی كوردبوون و كوردایەتیكردنی بەكر سیدقی باشتر ڕوون بێتەوە؛ ئەوجا لە زمانی دوژمنەكانییەوە، واتە عەرەبە شۆڤێنیستەكان، چەند بڕگەیەك لە كتێبی (العراق الثائر) وەردەگرین، كە حكوومەتی عەرەبی ناسیۆنالیستی سووریە لە ڕۆژانی یەكـەمی كـودەتای قـاسـمدا لە عـێـراق، دەریانكرد و، لە چاپخـانەی حكوومەت لە دیمەشق چاپكرا، تا بزانین ئەوانە لە بارەی بەكرەوە چی دەبێژن:** «فلما اعلن الفريق بكر صدقي تمرده على حكام بغداد و قام بانقلابه العسكري في ١١ اب ١٩٣٦ هلل له الشعب و اعتبره بداية الخلاص من الاستعمار الانكليزي و فاتحة التحرير من الفوضى و التاخر والضائقة والحرمان... الخ (ص٥٨). "... ولكن بكر صدقي كان متهما ايضا بانه عدو للقومية العربية في العراق، وانه على جرائته و اقدامه كان عاجزا عن قيادة الشعب العراقي قيادة سليمة... فهو لم يدرك اهمية الشعور بالقومية العربية في العراق... الخ(ص٥٩)" "... و مع ان بكر صدقي بطل الانقلاب كان يؤمن؛ باستقلال العراق، الا انه لم يتجاوب قط مع القضية العربية و لا آمن بها... الخ (ص٦٠)". "... كان بكر صدقي يريد ان يقلص النفوذ الانكليزي في العراق. و كان يهدف فعلا مهما كانت اتجاهاته و افكاره لانشاء عراق مستقل لا يرتبط بالعروبة ارتباطا وثيقا، و لكنه عراق نظيف بعيد عن تاثير دوائر التجسس البريطانية... الخ (ص٦١)" "... اراد (بكر) تقوية الجيش و تسليحه فعلاً، ففاوض ايطاليا و المانيا بانشانها بشروط سهلة و دعوه لحضور مناورات جيشها. و لماكان (بكر) في الطريق يحمل مسودات الاتفاقيات هذه قتل في مطارالموصل... (ص ٦٢)" "... ولكن خطأ بكر صدقي انه تنكر لكل من يقول بالعروبة في قلب الجيش و ابعد عنه عددا كبيرا من القادة العرب... الخ (ص ٦٢) (العراق الثائر. من منشورات الفرع الثقافي العسكري. مطبعة الحكومة بدمشق ١٩٥٨) (١٣)".

ئەوجا دەبێ بگەڕێینەوە سەر كرۆكی باسەكەمان، بەڵآم چیبكەین قسە قسە دێنێ:

ئێوارێ وەك كوردەكە دەبێژێ؛ نانێكی **"دەروێشی"** (برنج و شلەیەك) خـرایە

بەردەممان و، هەموو پێکەوە لەگەڵ شێخی نەمر شێومان کرد و، ئەوجا پاش چایی خواردنەوە، مالاوایمان لە کۆنە شای کوردستان و **"کۆشك و تەلار"**ە دەربەگانەکەی! کرد و کەوتینە ڕێ بەرەو سلێمانی. سەعاتێك پاش نیوەشەو، بە جێبە شڕ هاتینەوە سلێمانی. لە ڕێ زۆر بێزاریی خۆمان دەربڕی، بەڵام **شێخ ئەحمەد** هیچ قسەی نەکرد، تا گەیشتینەوە سلێمانی، ئەوجا گوتی: **"جارێکی دی کە سەفەرێکمان پێکەوە کرد بە جێبەکەی ئێوە سەفەر دەکەین". ئێمەش گوتمان: "کەی ئێمە جێبمان هەیە؟" ئەحمەد گوتی: "جا ئێوە کە شتێکی لەمە باشترتان نییە، ئەم بۆڵە بۆڵە چییە دەیکەن بە سەرمدا. ئێوە کۆشك و تەلاری شێخی گەورەتان بە چاوی خۆتان دی. هیچ نەبێ شێخی بچووك جێبێکی هەیە. خۆ شێخ مەحموود ئەوەیشی نییە".**

ڕاستییەکەی ئەو ڕۆژە زۆر بەزەییم بە شێخ مەحمووددا هاتەوە؛ خەفەت و پەژارەیەکی خەستوخۆڵ سەرودڵمی داگرتبوو و، گلەییم لە خۆمەدەکرد کە چۆن ڕوومنەهات بە شێخی نەمر بێژم؛ ڕێمبدات مانگێك لە خزمەتیدا بم. ئەو بیرەوەرییەکانی خۆی باس بکات و، منیش بیاننوسمەوە. بڕیارم دا بە هۆی ئەحمەدەوە بەڵێن وەربگرم لێی بۆ ئەم مەبەستە، داخی گرانم ڕۆژگار نەخشەیەکی دی کێشابوو.

هاوین بڕایەوە و پایز هات و، چوومەوە کەرکوك بۆ سەر کارەکەم. ڕۆژ ڕۆژی ٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٦ بوو، پاش نیوەڕۆیەکی زوو بوو کە لە قوتابخانەوە، دەگەڕامەوە بۆ ماڵێ؛ لە پردی خاسە پەڕیمەوە، هەستم بە جووڵە و بزووتنەوەیەکی نائاسایی دەکرد لە نێو شاردا. جادەکان بە درێژایی چەند کیلۆمەترێك بە ئۆتۆمبێل گیرابوون، خەڵك هەموو شپرزە و شڵەژاو، هێندێك دەگریان، هێندێك رایاندەکرد، سەتان دەوریش زیکریاندەکرد، دوکانداران دوکانەکانیان دادەخست. کە گەیشتمە بەر گەراجی سلێمانی، کامەران موکریم دی، بەخێرهاتنمکرد و، لەوم بیست کە شێخ بەیانیی ئەو ڕۆژە لە نەخۆشخانەیەکی بەغدا کۆچیدواییکردووە. هەتا دەهات دنیا دەخرۆشا. سەتان ئۆتۆمبێل لە مووسڵ و، هەولێر و دیالە و، بەغدا و شارەکانی دیکەی عێراقەوە هاتنە کەرکوك و لەگەڵ سەتان ئۆتۆمبێلی دیکەی کەرکووکییەکان

روویان کردە سلێمانی؛ تەرمی پیرۆزی شێخ مەحموود بە کەرکووکدا برایەوە سلێمانی.

رۆژی ناشتنی شێخی نەمر قیامەتیك بوو بۆ خۆی لە مێژووی نەتەوەی کورددا، نێزیکەی ملوێنێك کەس رژابوونە سلێمانی و؛ دەستکرا بە خۆپێشاندان دژی رژێمی داگیرکەری عێراق، کە ئەویش بە گوللە وەرامی جەماوەری بێزار بووی دایەوە، گەلێك کەس بریندار کران، **ئەختەری ژنی رەشۆلی گۆرانیبێژ** کە سەرکردەی کۆرێك خۆپیشاندەری دەکرد، بە گوللەی داگیرکەران شەهید کرا، تەنانەت تەرمەکەی شێخ مەحموودی نەمریش چەند گوللەیەکی بەر کەوت.

**ئەرێ ... شێخ مەحموود بە لەش مرد، بەڵام ئەوەتە بە گیان و بیرەوەری لە نێو خۆماندا زیندووە. شێخی نەمر سەربەرزی بۆ خۆی و، سەرشۆڕی و رووڕەشی بۆ دوژمنان بەجێ هێشت. جێی بەهەشتی بەرین بێ.**

بەرلین ۱۹۹۷/۱۰/۹

" سەکۆ " ژمارەی ۱۳ تشرینی دووەم ۱۹۹۷

گۆڤاری «کۆنگرە» ژمارە ۲۰ جۆزەردانی ۲۰۰۱

# پەراوێزەکان!

**(١) و (٢) و (٣): لەگەڵ شێخ ئەحمەد و حاجی عەزیز و مەلا عومەری گۆڵی** چیرۆکی خۆش و پڕ گاڵتەمان پێکەوە زۆرترە. سەیر ئەوەیە ئەحمەد لە سەرەتای شەستەکانەوە، پاش ئەوەی ماوەیەك لە ڕۆمانیای، **بە قسەی کۆمۆنیستە عێراقییەکان** تێروتەسەل و ( لە راستیدا لە برساندا مردوو) یەك دوو ساڵ خوێندی؛ ئەوجا هاتە ئەلمانیا و لە ئەلمانیا سالانێکی دوور و درێژ لە یەکەوە نێزیك بووین. وا لێرەدا بەزمێکی خۆشی ئەم برادەرانە دەگێڕمەوە بۆ پێکەنین:

لە پاش تەواو کردنی خوێندنی قوتابخانەی نێوەندی، ئەز چوومە بەشی زانستی لە قوتابخانەی دوانێوەندیی سلێمانی و، **ئەحمەد و عەزیز و مەلا عومەریش** چوونە بەشی وێژە (ادب). ژووری هەر دوو پۆلەکە (هی ئێمە و هی ئەوان) لە تەنیشت یەکەوە بوون. بە ڕێکەوت کچێکی دیان (مسیحی) لە بەشی وێژەدا دەیخوێند، چۆنکە لە قوتابخانەی دوانێوەندیی سلێمانی کچان، بەشی وێژە نەبوو. ئەم کچە سرەکەی لە تەنیشت سرەکەی مەلا عومەرەوە بوو. زۆرتریش هەر لەگەڵ مەلا عومەر بەحەوشەی قوتابخانەکەدا دەگەڕا و قسەیدەکرد. ڕۆژێکیان مامۆستای زمانی عەرەبی عەزە هەڵدەستێنێتە سەر تەختە و، ڕستەیەکی پێدەنووسێ و دەبێژێ ئەم ڕستەیە (اعراب) بکە: لە ڕێزمانی عەرەبی دا (جار و مجرور) هەیە کە دەبێ بیەسترێ (متعلق) بە بەشێکی ڕستەکەوە، کە عەزە دێتە سەر (جار و مجرور) مامۆستا لێی دەپرسێ بەستراوە (متعلق) بە چییەوە، عەزە گەلێك شت دەڵێ، بەلام مامۆستاکە هەر دەبێژێ وا نییە. لەوەوە عەزە سەریلێدەشێوێ و هیچی پێنامێنێ، کە تەماشای مەلا عومەر دەکات لە تەنیشت (میلۆ)وە دانیشتووە و دەخنێتەوە، دەڵێ: جا کە ئەمانە هیچیان نەبن، کە واتە (جار و مجرور)ەکە (متعلق) ە بە گوێی مەلا عومەرەوە". هەر ئەوە دەڵێ و مەلا عومەر وەك فیشەکە شێتە ڕاستدەبێتەوە و دەستدەداتە یەخەی. مامۆستاکە کە کوردی تێناگا و نازانێ عەزە چیگوتووە، دەقیرێنێ بەسەریاندا و دەبێژێ: "دەستبەردەن لەیەك". قوتابییەك بە عەرەبی تێی دەگەیەنێ کە عەزە چی گوتووە، ئەو دەمە مامۆستاش دەپچڕێ لەبەر پێکەنین و

قوتابییش هەموو پێدەکەنن. هێندێك هەوڵدەدەن لەیەکیان بکەنەوە. لەمەدا هەرا زل بوو و ئێمەش کە گوێمان لە هەراوهۆریا بوو ژووررو پۆلمان بەجێهێشت، کە تەماشام کرد مەلا عومەر ڕەنگی تێکچووە و هەناسەی سوار بووە و جنێودەدا. گوتم ئەوە چییە؟ گوتی: "ڕاوەستە بزانە ئەوی باسی شتومەکم بکات چۆن لە دارەڕای جسناتی دەبەم" و قوتابخانەی بەجێ هێشت. دوایی هەموومان زانیمان چییە. سەعاتێکی پێ نەچوو ئێمەش لە پشوودا بووین، مەلا عومەر بە قەمەیەکەوە خۆی کرد بە قوتابخانەدا؛ زۆربەی زۆری مامۆستایان و قوتابییان لەبەر پێکەنین نەیاندەتوانی هیچ بکەن، بەڵام دوایی قەمەکەیان لە دەستی مەلا عومەر سەند و دەستمان پێکردنە ملی یەك و بەزمەکە کۆتاییهات. بەڵام ئەم چیرۆکە وەك پەندی پێشینیانی لێهات، هەر کاتێك باسی **"جار و مجرور"** بهاتایە پێشەوە، دەبوو بە پێکەنین و، دەمانگوت بەستراوە بە گونی مەلا عومەرەوە و، تەنانەت مەلا عومەر خۆشی پێدەکەنی.

٤) بزووتنەوەی شۆڤێنیزمی عەرەب و فارس و ترك لە بیستەکانی ئەم سەتەیەوە زۆر پەرەی سەند، بەتایبەتی پاش دروستکردنی دەوڵەتی ناسیۆناڵ بۆ ئەم سێ گەلە. دەوڵەتی ترك بە سەرکردایەتیی مستەفا کەماڵ (ئەتاترك) لە ۱۹۲۳ / ۱۹۲٤دا و دەوڵەتی فارس بە سەرکردەیەتیی ڕەزا خان (پەهلەوی) لە ۱۹۲۵دا و دەوڵەتی عەرەب بە سەرکردەیەتیی بنەماڵەی شا فەیسەڵ لە ۱۹۲۱دا. پاش مردنی فەیسەڵی یەکەم، شا غازی پێوەندییەکی توند و تۆڵی بە ئەڵمانیای نازییەوە بەست و پڕۆپاگەندەی یەکێتیی عەرەبی دەکرد، هەتا لە ۱۹۳۹/٤/٤دا بە ڕووداوی وەرگەڕانی ئۆتۆمبیل مرد (کە دەڵێن دەستی دەزگەی نهێنیی بەریتانیای تێدا بووە). لە ۱۹٤۱دا ڕەشید عالی گەیلانی کە سەرۆك وەزیرانی عێراق بوو، بە تەمای نەهێشتنی دەسەڵاتی بەریتانیا بوو لە عێراق؛ بە پشتیوانیی ئەڵمانیا. بەڵام هێزەکانی بەریتانیا کە لە حەبانییە (حبانية) مۆڵیان بەستبوو، لە ۱۹٤۱/٦/۲دا حکوومەتی گەیلانییان خست و گەیلانی رایکرد بۆ ئێران بۆ لای ڕەزاخانی دۆستی و لەوێ مایەوە تا پاش کودەتای قاسم لە ۱۹۵۸دا. کە گەڕایەوە بەغدا جارێکی دی هەوڵی کودەتای دایەوە، بەڵام گیرا و خرایە زیندانەوە.

٥) پاش کودەتای ژەنەراڵ قاسم لە بەغدا لە ۱۹۵۸/۷/۱٤دا کە بوو بە هۆی

هەڵتەکاندنی ڕژێمی شایەتی و دامەزراندنی ڕژێمی کۆماری لە عێراقدا، گەلێك کەینوبەین و ڕاپۆرتی نهێنیی سەردەمی شایەتی کەوتنە ڕوو. لەوانە نامەیەك بوو کە لە دەزگەی ئاسایشی (دائرة‌الامن)ی کەرکووکەوە نێردرابوو بۆ سلێمانی و، داوای چاوخستنەسەری پتری ئەوانە کرابوو کە خەریکی چالاکی کۆمۆنیستانە و جیابوونەوەخوازانەن. لیستەیەك نێو نووسرابوو، کە یەکەمین نێو، **ئەز (جەمال نەبەز)** بووم، ئەوجا **مامۆستا ڕەفیق حیلمی، فایەق هۆشیار (حاکم)، (دوکتۆر جەمال ڕەشید)** (بژیشك) **حەمە سالح دیلان، ئەحمەد غەفوور بابان (یەکێك بوو لە بەرپرسیارەکانی پارتی کۆمۆنیست لە سلیمانی)، ئیبراهیم ئەحمەد** و، چەند نێویکی دی کە لە بیرم نەماون.

بەتایبەتی باسی **حەمە سالح دیلان** کرابوو، کە لە ڕۆژی ناشتنی مامۆستا **حەسەن تۆفیق** دا بە قسە پەلاماری **"خاوەن مەزنێتی"** (فخامة) **نووری سەعیدی** داوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ڕژێمی دوابڕاوی شایەتیی عێراق: کوردایەتی و کۆمۆنیستی وەکیەك تێدەنواڕی و کوردایەتی لە کۆمۆنیستایەتی بە بقەتر دەزانی.

٦) گۆڤاری **"یەکێتی تێکۆشین"** کە لە ساڵانی ١٩٤٤ / ١٩٤٥دا وەك زمانی حاڵی پارتی کۆمۆنیستی عێراق (لقی کورد) دەرچووە (ژمارە ٢ ساڵی ١) لاپەڕە ٧ دەنووسێ: **"ئەگەر سەیری حەرەکەتی شێخ مەحموود بکەین لەکاتێ کە ئەیەویست لە ژێر نفووزی ئیستیعمار بە دەرەبەگیاتی کوردستان ئیدارە بکا..."**(تەماشای جەمال نەبەز: **گۆڤاری کۆمۆنیستانەی یەکێتی تێکۆشین ١٩٤٤ ـ ١٩٤٥ و ئیدیۆلۆژی هوردە بۆرژوای مارکسیستی کورد**) بلاوکراوەی ئەکادێمیای کوردی بۆ زانست و هونەر، ستۆکهۆلم ٢٦٠٠ / ١٩٨٨ بکە.

٧) وشەی **"جلخوار"** لە "جلی خوار"ەوە نەهاتووە. وشەکە لە بنەڕەتدا **"جر خوارە"** جر Cir لە زمانی کوردیدا بە مانای ڕەوشتوخو، هەڵسوکەوت، دێ. لە کوردی باکووردا دەبێژێ "جرێ وی خراپە Cirê wî xirape واتە ڕەوشتوخووی خراپە. کەواتە **"جلخوار" مانای ڕەوشت نزم**"ە.

٨) **سمایل خانی سمکۆ** لە ١٩٢٣/١٠/٨دا چووەتە سلیمانی بۆ لای شێخ مەحموود، شێخ زۆر ڕێزی لێگرتووە. سمکۆش شێخ مەحموودی بە شای کوردستان

زانیوە، ڕۆژنامەی "**ڕۆژی کوردستان**" لە ١٩٢٣ دا گەلێك نامە و تەلەگرافی نێوان شێخ مەحموود و سمکۆی بڵاوکردووەتەوە.

**٩) بەکر سیدقی** لە ١٩٣٦/١٠/٢٩دا لە ڕێی کودەتای سوپاییەوە حکوومەتی عێراقی خست و حکوومەتێکی نوێی بە سەرۆکایەتیی حیکمەت سلێمانی ڕەواندزی دامەزراند و، چەند وەزیرێکی ناسراوی عەرەبی وەك **کامیل چادرچی و جەعفەر ئەبو تمەن** (جعفر ابولتمن) گرتە خۆی. بەڵام لە ١١/ ١٩٣٧/٨ دا و لە کاتێکدا بە فڕۆکە دەیویست لە ڕێی مووسڵەوە بچێ بۆ ئەڵمانیا، تا پەیمانی یارمەتیی سوپایی لەگەڵ ئەڵمانیا ئیمزا بکا، لە یانەی ئەفسەران لە مووسڵ کوژرا.

**١٠)** ئەم قسەیەم جارێکی دی لە **مۆنیخ** لە ساڵی ١٩٦٥دا لە باوکی **ئەحمەد نەقیب**، واتە **شێخ ڕەئووف** بیست، چونکە لە کاتی دەستبەسەریی شێخ مەحموودا لە بەغدا؛ شیخ ڕەئووف لە خزمەتیدا بووە.

**١١)** بنەماڵەی **عەبدولقادر سنەوی (عبدالقادر سنوی) بە بنەچە و ڕەچەڵەك خەڵکی سنەن و وشەی "سنەیی"یەکەیان لە بەغدا کردووە بە "سنوی"** ئەم بنەماڵەیە خزمی شێخ لەتیفی دانساز بوون لە سلێمانی، کە ئەوانیش هەر سنەیی بوون. **شێخ لەتیف** پیاوێکی زانا و، لە پیشەسازیدا زۆر زیرەك و ژێهاتی بوو، بێجگە لە دانسازی گەلێك پیشەی دیکەشی زۆر بەباشی دەزانی. پیاوێکی بە ڕۆمەت و کوردپەروەر بوو. کوڕەکانی **شێخ عەبدوڵڵا و شێخ بابا عەلی** دۆست و هاوڕێی سەردەمی منداڵیم بوون، باخێکیان هەبوو بەرامبەر **گردی سەیوان** کە بە باخی **شێخ لەتیف** ناسرابوو.

**١٢)-**

لە بەغداوە دەرچوو، سەیوانە ئامانجی
ڕێ چۆڵکەن ئەی برای زازایی و کرمانجی
ئەو مەحموود جەودەتەی کە قیبلەی هیوا بوو
ئەو مەحموود جەودەتەی قەڵا بوو، پەنا بوو
ئەو مەحموود جەودەتەی کە ڕۆژی تەنگانە
تۆڵەی بۆ دەسەندین لە ئۆردووی بێگانە

ئەو مەحموود جەودەتەی سروشتی خاکی بوو
سەرتاپای کردەوەی پاکی بوو، چاکی بوو
ئەو کوردە، ئەو مەردە، ئەو رۆڵەی هەڵکەوتە
ئەو زانا و ئەدیبە، ئەو مەحموود جەودەتە
رێ بەردەن با بڕوا بۆ سەیوان تابووتی
چاو شۆڕکەن لە ئاستی توانج و تانووتی

**(شیوەن و فرمێسك، عەبدوڵڵا گۆران): مامۆستا گۆران لە ساڵی ١٩٥٤ دا فەرمووی: "کورد دەیانتوانی کارێك بکەن کە مەحموود جەودەت لە سێدارە نەدرێ، بەڵام بێغیرەتییان نواند."**

**١٣)** سەفیری ئەڵمانیا لە عێراق لە سەردەمی بەکر سیدقیدا **(دوکتۆر فریتز گرۆبە)** بوو. لە یەکێك لە راپۆرتەکانیدا لەسەر عێراق دەبێژێ: **"کاتێك بەکر سیدقی نەخشەی پاراستنی کوردستانی باسکرد لەگەڵم، بە دزییەوە پێمی گوت کە خۆی کوردە و بەتەمایە دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێنێ، کە کوردی عێراق و ئێران و تورکیا بگرێتەوە، ئەم دەوڵەتە دەبێ ئەوەی لەدەست بێ سەربەخۆیی خۆی لە دەستدرێژیی دراوسێکانی بپارێزێ"**

(تەماشای (نجدت فتحي صفوت، العراق في مذاكرات الدبلوماسيين الاجانب، لبنان ١٩٦٩ ص ١١٧ بکە) . **ئێدی قسە لەمە پاك و پوختەتر دەبێ؛ جەنابی دوکتۆر کەمال مەزهەر؟؟**

— — —

**سەرنج!**

پاش خوێندنەوەی ئەم وتارە لە لایەن هاوڕێی خۆشەویستم شێخ ئەحمەد نەقیبەوە کە نامە و تێبینییەکانی بە تایبەتی بڵاوکراونەتەوە، رووبەڕوو پێمیراگەیاند، کە ئەو هاوڕێ قوتابییەی قەمەکەی هێنا بۆ قوتابخانە، **مەلا عومەر** نەبوو؛ بەڵکو **عەزیز محەممەد** بوو؛ کە عێراقچییەکان بۆ گاڵتەکردن بە کورد و کوردایەتی دەماری عەزیزیان گرتبوو، ئەویش لەتاو گیانی خۆی پەنای بۆ ئەو کارە بردبوو.

شێخ ئەحمەد گوتی "مەلا عومەر پاش ئەوەی لە سەرەتاوە پێی ناخۆش بوو کە

"جار و مجرور"ە کە **"بیەستریێ بە گونییەوە"**، دوایی ڕاهات لەگەڵی". لێرەدا حەزم کرد ئەم چیرۆکە ڕاست بکەمەوە کە وادیارە شێخ ئەحمەد باشتر لە بیری ماوە.

## جەمال نەبەز

## «سەکۆ» ژمارە (١٣) تشرینی دووەمی ١٩٩٧
## گۆڤاری «کۆنگرە» ژمارە ٢٠ مانگی جۆزەردانی ٢٠٠١

# چەند سەرنجێك
# لە بارەی سەردانەکەمانەوە لە
# «شێخ مەحمودی نەمر»

**ئێبینی!**

لە ژمارەی پێشووی **"سەکۆ"**دا (ژمارە ١٣ی نۆڤەمبەری ١٩٩٧) وتاری"پاشنیوەڕۆیەك لە خزمەت شای کوردستان شێخ مەحموودی نەمر دا" بلاَو کرایەوە. هێشتا ئەو ژمارەیە لە ژێر چاپدا بوو، کە برا و هاوڕێی هەمیشە لە یاد ئەحمەد نەقیب بەڕێکەوت بۆ سەردانێکی کورت هاتبووە ئەلمانیا و، لە مۆنیخەوە تەلەفۆنیکرد بۆم. هاتنی ئەحمەد؛ کە هەلْکەوتێکی سەیر بوو لەم کاتەدا، بوو بە هەلێك کە دەقی وتارەکەم بنێرم بۆی و، تکا بکەم لێی بیخوێنێتەوە و، ئەویش چی دیکەی بەبیردا دێ لە بارەی ئەو سەردانەمانەوە لە شێخ مەحموودی نەمر؛ بیخاتە سەر کاغەز، تا ئەوەش لە "سەکۆ"دا بلاَو بکرێتەوە. ئەحمەد لە پاڵ راگەیاندنی هەواڵی جەرگبڕی کۆچیدوایی هاوڕێی هێژامان عەزیز محەممەد کە بەشداری ئەو سەردانەمان بوو، ئەم نامەیەی خوارەوەی نارد بۆم، کەوا منیش نامەکە و سەرجەمی ئەو بەشانەی کە پێوەندییان بەو سەردانە و شێخی نەمرەوە هەیە پێشکێش بە **"سەکۆ"**ی خۆشەویست دەکەم.

جەمال نەبەز
بەرلین ١٩٩٧/١١/١١

**بەناوی خوای گەورە و کوردستانی پیرۆزەوە**

**برای ئازیز و کوردپەروەر و نووسەری بیری کوردایەتی، جەمال نەبەز**

ئەم کاتە و هەموو کاتێکت باش. ئەم لاو و ئەو لاکانت ماچدەکەم... بەخوا زۆر بیرتدەکەم، بەلاّم قەدەر نەیهێشت ئەمجارە لێرە چاومان بەیەکبکەوێ. خوا یار بێ بە زوویەکی زوو یەکدەبینینەوە. ئەگەر هەواڵی برای کوردی لێ قەوماوت دەپرسیت، باشم و ئیشالاّ هەر باش دەبین و خوا لە سوڵتان مەحموود گەورەترە.

ئەوا بە تەپە تەپ و هەنگە شەلێ ئەم شۆرشەی دواییمان ٣٥ ساڵی خایاند. داستانێکی خوێناوی و پڕ لە گاز (ی ژەهراوی) و ئەنفال و ناهەقی بوو، تا گەیشتە راپەڕینی بەهاری ١٩٩١. کورد بۆ جارێکی دی چوونەوە قامووس. ئێستە ئێمەی کورد پاش چەند مانگێکی کە پێدەنێینە ٨ ساڵەوە کەوا باشووری کوردستان بەدەست خۆمانەوەیە. کوڕە جەمال، ئەمە کەم نییە. خەونەکانی من و تۆ و هەزاران کەس هاتوونەتە دی. رۆژی کورد هەڵهات، بەلاّم بەداخەوە کار باش ناڕوا بەڕێوە.

چەچەنستان بە ساڵێك رزگاری بوو. گەورەکەیان کوژرا. بەپەلە گەورەیەکی کەیان دروست کرد و ئەمە یەك و ئەوە دوو. **سلۆڤێنیا، کرواتیا، ئەرمینیا، بۆسنە، ئۆکرانیا، تاجیکستان** ... هتد هەموویان رزگاریان بوو. ئەمڕۆ مۆدە مۆدەی رزگاربوونە. لە بیرتە کاتی خۆی تەلەفۆنت بۆ کردم و گوتت: "**لەشکری ترك ئاڵای لەسەر باکووری قبرس هەڵکرد، بەلاّم ئەمە سەرناگرێ**". من گوتم: "**جەمال کورد دەڵێت: هەر شتێك شەوی بەسەردا رۆیشت، تەواو سەریگرتووە**". ترك بوون بە خاوەنی ملکی هێلینییەکان و براپەوە. مەسەلەکەی ئێمەش شەوی بەسەردا تێپەڕیووە. بە هەموو ناتەواوییەکیشەوە ئیشاللاّ سەریگرتووە و، ئێمەی کوردی خواناس دەستبەنزاوەین بۆی.

وەرە ٥٠ ملوێن خەڵك لەسەر زەوی خۆی بژی، کەچی نەك هەر دەوڵەتی نەبێ، بەڵکو هەموو رۆژێکیش سەگ بە حەسارمان پێبکەن. ئێمە لە سەگیش (دوور لە تۆ و هی وەك تۆ) و کوێلەش خراپترمان پێکراوە. خۆ سەگی ئەورووپا قەدر وڕێزی زیاترە لە ئێمە کە بەدەست بەغدا و تاران و ئەنقەرە و شامەوە دەناڵێنین. یەکێکیان دەڵێت

"سۆسیالیستم"، یەکێکیان دەڵێ "موسڵمانم"، یەکێکیان دەڵێت "دێمۆکراتم". مافی مرۆڤیشیان خستووەتە ناو ئاودەستخانەوە (دوور لە سۆسیالیزم و ئیسلام و دێمۆکراتی). هەی هەزار نەحلەت لە هەموویان.

**رەبی مووی لێبێ زمانی، پەنجەکانی هەڵوەرێ**

**هەرکسێ گوڵشەن بە دەردی گوڵخەنی دۆزەخ بەرێ.**

ئەوا کاتژمێر یەك و نیوی پاش نیوەشەوە، بەیانی دەڕۆمەوە کوردستان و، قەڵەمەکەم هێشتا کۆڵ نەبووە. (ئەحمەد، وا دیارە بەشیرستی تەواویت "قەڵەمەکەت بە قووەتە"! جەمال). بەڵام دووریی تۆ لە منەوە و من لە تۆوە زۆر ناخۆشە. لێرە دێتەوە بیرم کاتی خۆی تۆ لە گەراجێکدا دەخەوتیت (سەرنج: شێخ ئەحمەد باسی ساڵی ١٩٦٧ دەکا، کە لە شاری فیرتزبورگ دەمخوێند و کارمدەکرد و، ئەو پارەیەی دەستمدەکەوت دەمدا بە چاپ و چاپەمەنی و کرێ ی پۆستە و مەسرەفی دیکەی یەکێتیی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا ـ نوکسە و نەمدەتوانی ئەپارتمانێك بەکرێبگرم، بەڵام هەر لە گەراجەکەدا جێی خواردندروستکردن و دووشکردن و تەوالێتی تێدا بوو. ئەحمەد کە نامەی دەنووسی بۆم لە پشتی پاکەتەکەی دەنووسی: in der garage (لە گەراجەکەدا)، تا پۆستەبەر سەری لێنەشێوێ: جەمال نەبەز) زۆرم لا سەیر بوو مرۆڤێك لە گەراجێکدا بخەوێ لە وڵاتێکی وەك ئەڵمانیا. ئەوجا لە بیرتە کە قبوولییەکەمان لێنا و بڵدەرچوو تۆ تۆرایت و لەسەر چەرپاکە خۆت تەخت دا بەزەویدا، ئێمەش نانەکەمان بە رەحەتی خوارد و سوپاسی خوامان کرد. ئەوجا رووم کردە تۆ و گوتم: جەمال، من لە هەموو ژیانمدا نەمدیوە خاوەن ماڵ لە میوان بتۆرێ، بەڵام وا دیاربوو تۆ خۆت بە میوان دانا و منت بە خاوەن ماڵ. هەر بژیت بۆ کورد و کوردستان.

لە بیرتە جارێکیان **کەمال فوئاد و ئەرجومەند** (سەدیق) نامەیان بە عەرەبی نووسیبوو بۆم (ئەو ساڵە پێم وایە سکرتێری کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد بووم)، تۆش هەڵەی رێزمانی عەرەبیت لێدۆزینەوە و نامەکەمان بە راستکراوی ناردەوە بۆیان.

ئەوجا دێمە سەر باسی سەردانەکەمان لە شای کوردستان شێخ مەحموودی نەمر لە داریکەلی:

**١)** یەکێکمان، لەبیرم نەماوە، کامان بوو، داوای شۆرشی لە شێخ کرد، **شێخ** لە وەرامدا فەرمووی: «**کاتی نییە ... پەیمانی سەعدئاباد هێشتا ماوە. ئێستە پەیمانی** بەغدای پێدەڵێن. لێماندەدەن و دەنگمان کپدەکەن. ئەو دەمە هەر کوڕی خەڵك بەکوشت دەدرێن و هیچی کە، چەند کەسێکیش پێیدەبنە پیاوی ڕۆژ».

**٢)** یەکێکمان بە شێخی گوت: "تۆ لەم خانووە قوڕینە بچکۆلەیەدا دانیشتوویت، بێگانە دێنە لاتان، ئەمە بۆ شانی شای کوردستان جوان نییە." (سەرنج: وا بزانم ئەو پرسیارە عەزیزی کۆچکردوو کردی: جەمال نەبەز). شێخ لە وەرامدا فەرمووی: "**من زۆر جار ماڵ و حاڵم پێکەوە ناوە. خانووی جوانم دروستکردووە، بەڵام هەمووی بە فیڕۆ ڕۆیشت. هەتاکو کورد نەبێ بە دەوڵەت، خانوو و ماڵ و سامان دروستناکەم. چۆنکە هەمووی لەناکاو بە تالآندەبرێ!**"

**٣)** شێخ مەحموود رووی کردە هەموومان و فەرمووی: " کەس بە کەڵکی من نایەت، هەتاکو کوڕەکانی خۆشم خزمەتم ناکەن. لەوانەی خزمەتی من دەکەن، حاجی مەلا شەریفی سەعاتچییە، ئەو هێندێك لێفە و دۆشەك و ناوماڵی کڕیوە بۆم و لە سلێمانییەوە کەلوپەل دەنێرێ بۆم. حاجی نامیقی خەراجیانیش یەکێکە لە پێشمەرگە کۆنەکانم کە هیچ کاتێك پشتمی بەرنەداوە. ئەویش و حاجی مستەفاش. شێخ جافەر کاکەلاویش بنکدار (وەکیل) یم دەکا. بەڵام ژێر تاڵی ریشی هەزار هێندەی تێدایە ... هتد" هەروەها شێخ فەرمووی: " **ئەوانەی کە دۆستی هەتا سەرم بوون و، لە شۆرشدا پشتمیانبەرنەدا شێخ حەمە غەریبی قەزانقایە (زاوای شێخ ئەحمەد بوو: ئەحمەد نەقیب). هەروەها سەید نووری شێخ محێدینی کانیکەوە و کەریم بەگی هەمەوەند و داودبەگی جاف (کەلار) و سەی محەممەدی جەباری و جافرسان و شێخ مستەفای کەلبەزە و سەی ئەحمەدی نەقیب (ئەمیان لە حیجاز کۆچیدوایی کردووە: ئەحمەد نەقیب) و شەلی ناکە و کوێخا ئەمینی چوارتایی و حاجی سەی حەسەن و خەلیفە شێخ عیسای بەرزنجی و محەی ساڵە سوور و زۆری دیکە**".

**٤)** شێخ فەرمووی: "کە ئینگلیزەکان من و **شێخ حەمە غەریب** یان لە ئەندامانەوە هێنایە کوێت، میوانی باوکی ئەم شێخانەی ئەمڕۆی کوێت بووین (نازانم شێخ مەحموود سالم الصباح ی گوت، یان یەکێکی دیکە لە بیرم نەماوە: ئەحمەد نەقیب). شێخەکانی کوێت زۆر خزمەتی منیان کرد و هاتن بۆ لام دڵخۆشییان

دەدامەوە و دەیانبردم بۆ راو و شکار. رۆژێکیان ئینگلیزەکان فرۆکەیەکیان ئامادە کرد کە بمبەنەوە بۆ ناسرییە (عێراق). منیش مالآوایيم لە شێخی کوێت کرد و ئەم لاو و ئەو لای یەکمان ماچکرد و شێخی کوێت سەرینایە پەنا گوێم و گوتی: **«یا شێخ. یا ابن عمي. الانکلیز یعطوني آني و الفرسان و الحراس فقط ٨٠٠٠ روپیە و هذا ما یکفي لمصاریفنا. ارجوا ان تعفوا قصورنا اذا ما کنا قائمین بواجبنا». ئامۆزا، ئینگلیزەکان بە من و سوارەکان و پاسەوانەکان ٨٠٠٠ رووپیێ دەدەن. ئەمەش بەشی خەرجیمان ناکا. تکایە لە کەمو کورتیمان ببوورن ئەگەر نەمانتوانیبێ پێویستی سەرشانمان بەرامبەرتان بەجێبهێنین».** ئەوجا شێخ مەحموود فەرمووی: "ئێستە من کوێخای داریکەلیم و ئەوانیش لە خوا بە زیاد بێ و خوا لێیانتێکنەدا پاشای کوێتن..."

جەمال گیان، ئەمانە ئەو شتانە بوون کە شێخ باسیکردن، بەلآم لە وتارەکەی تۆ دا نین. ئەوجا دێمەوە سەر باسی هەلآتنی شێخ لە بەغداوە بۆ کوردستان لە سالی ١٩٤١دا، کە تۆ لە وتارەکەتدا پەنجەت راکێشاوە بۆی. محەی سالەسوور شێخ مەحموودی لە بەغداوە بە ئۆتۆمبیل فراند بۆ گەرمیان و، لەوێوە بە سواری گەیاندیانە داریکەلی و گەیشتە لەشکری کوردی دەور و پشتی سلێمانی و لەشکری پشدەریش هاتن بۆلای. بنەمالەی بابەکراغا و ئاغاکانی هێرۆ و شێخ محیدینی سندۆلان بەشداری ئەم هەلمەتەیان کرد.

منیش تازە سواری هەسپ دەبووم؛ تفەنگێکی شکاوم پێبوو، لە خزمەت شێخ دا بووم. لە سیتەکەوە هاتین بۆ چایخانەکەی ئەزمەڕ. لەوێ **شێخ مستەفا قەراخی (کە متەسەریفی سلێمانی بوو) و بابە عەلی حەفید نوێنەری حکوومەتی بەغدا بوون،** مافی کورد دانی پێدا نەنراو بە شێخیان گوت: **تۆ نابێ بجوولێیتەوە".** ئەویش **(شێخ مەحموودی نەمر) هەلسایە سەرپێ و جنێوێکی خراپی دا بە شێخ مستەفای قەراخی. خەلکەکە هەموو لە پشتی شێخەوە بوون. تەنانەت پۆلیسەکانیش گوتیان: "بە قوربانت بین شێخ مەحموودی شێر".** دانیشتنەکە سەرینەگرت و هاتینەوە سیتەك. لەشکری کورد لەسەر مالی شیخ جەلالی حەفید دەژیا. مالی شیخ جەلال ئەوساکە لە سیتەك بوو. ئەوجا با هەر لەسەر ئەم خالە کەمێك برۆین.

ئەو رۆژە من بەچاوی خۆم دیم کوردیان دەناردنە لای شێخ مەحموود بۆ

پێکهێنانی ئاشتی. **شێخ فەرمووی: "لە جیاتی ئەوەی پیاو ماقووڵێکی عارەب بنێرنە لام، دەچن کورد دەنێرن بۆم. خۆ من شەڕم لەگەڵ کورد نییە؟!"** ئەم بەسەرهاتەی شێخی نەمر، **بارزانی نەمر**م دەخاتەوە یاد، جارێکیان لەگەڵ خوالێخۆشبوو، حاکم حەمە ساڵحی قەراخی، لە ئەورووپاوە چووینە کوردستان بۆ نێو شۆڕش و، لەو سەفەرەدا لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك بە بۆمبای فڕۆکەی هیلۆشین بریندار بووین؛ شەو لە **پێنجوێن** لە خزمەت بارزانیدا دانیشتین لە ماڵی **حەمە ڕەشید خانی دارۆخان. بارزانی** فەرمووی: **"شەڕم لەگەڵ بەغدایە، کەچی لە جیاتی چەند عەرەبێکی ڕێکوپێك دەچن فەتاح شالی دەنێرنە لام. خۆ من شەڕم لەگەڵ کورد نییە، کەچی کورد دەنێرنە لام بۆ ئاشتی".**

جەمال گیان: دیارە ئێمە کە باسی شێخمان دەکەین لە کوردایەتییەوە باسیدەکەین، نەك لە خزمایەتییەوە. بەڵام بۆ زانین دەمەوێ ئەوە رابگەیەنم پێت: ئێمە و بنەماڵەی شێخ مەحموودی حەفید لە باپیرەوە ئامۆزاین و هەمووشمان لە بەرەی **شێخ عیسا و شێخ مووسای بەرزنجەین. باوکم، شێخ ڕەئووف، لەگەڵ شێخ مەحموود دا لە دایکەوە خاڵۆزا و پوورزان. کچی شێخ محەممەدی مفتی دایکی شێخ ڕەئووفە، خوشکی شێخ محەممەدی مفتی دایکی شێخ مەحموودی نەمرە. ئێمە لە بنەماڵەی شێخ حەسەنی گڵە زەردەین،** کە شێخ حەسەنی گڵزەردە لە کتێبە عەرەبییەکاندا بە "شێخ حسن السعدانی" دەناسرێ و، لە کوردەواریدا بە **شێخ حەسەنی قوتب**. شێخ حەسەن، وەك خۆشت دەزانیت؛ هەر نوێژی نەکردووە، بەڵکوو خاوەنی بەرهەمێکی فرە دەوڵەمەند: کە بۆ کوردستان بەجێیهێشتووە. دەستنووسی کتێبی ڕۆژژمێر (التقویم) و ئەستێرەناسی (علم الفلك) و کتێبی کیمیاکەی لە کتێبخانەی گشتیی بەغدادن. کتێبی دکتۆرییەکەی لای منە، بە یارمەتی خوا کە هاتە چاپکردن، دانەیەکی دەنێرم بۆت. جارێکی کە سوپاس بۆ نووسینە دێرینەکەت. بژی بۆ کورد، ئەم لاو ئەو لاکانت ماچ دەکەم.

**ئەحمەد نەقیب مونیخ ٢٥/١٠/١٩٩٧**

**سەکۆ ژمارەی (١٤)**

**کانوونی یەکەمی ١٩٩٧**

**گۆڤاری «کۆنگرە» ژمارە ٢٠ ــ جۆزەردانی ٢٠٠١.**

# وتووێژی تەلەفزیۆنی «کوردسات» لە گەڵ دوکتۆر جەمال نەبەز

**لە درێژەی چاوپێکەوتنەکانی «کوردسات» لە گەڵ رووناکبیر و نیشتمانپەروەرەکانی گەلەکەمان لە ناوەوە و لە دەرەوەی کوردستان، سەبارەت بە بارودۆخی ئەم دووایییەی کوردستان و، پەلاماردانی پیٚ کیٚ کیٚ بۆ سەر هێزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، ئێستا بە تەلەفۆن لە گەڵ بەرێز پرۆفیسۆر د. جەمال نەبەز لە ئاڵمانیا قسە دەکەین تا لەو بارەوە رەئیی خۆیمان پێبڵێ!**

**بەرێز د. جەمال نەبەز ئەم کاتەو باش!**

- کاتی ئێوەش باش، فەرموو!

**زۆر سوپاست دەکەین، ئەگەر دەکرێ رەئیی جەنابت بزانین کە هۆکاری دروستبوونی ئەو شەڕە یا هۆکاری پەلاماردانی هێزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە لایەن پیٚ کیٚ کیٚ وە چۆن دەبینن؟**

باشە! ئەو بارە نالەبارەی کە ماوەیەکە لە نێوچەی سلێمانیدا هەیە، ئەنجامی راستەوخۆ و خۆرسکیی ئەو رۆژە رەشەیە کە «پیٚ کیٚ کیٚ»ی تێکەوتووە. پیٚ کیٚ کیٚ وەك هێزێکی رێکخراو، کە لە گۆرەپانی رامیاریدا، یانی لە گۆرەپانی سیاسەتدا شەڕی دۆڕاندووە و لە هەموو لایەکیشەوە تەنگپێهەڵچنراوە و، سەرەڕای گۆڕینی ستراتیژی خۆی، لە سەربەخۆییی کوردستانەوە بۆ مافی هاووڵاتی لە سنووری کۆماری گوایە دێموکراتی ترکدا، وازهێنانی لە بەربەرەکانێی چەکدارانە و تەنانەت دوورکەوتنەوە لە سنووری دەوڵەتی ترك، دەمەوێ بێژم پاش ئەم هەموو هاتنە خوارەوەش هێشتا دەوڵەتی ترك هەڕەشەی لە نێوبردنی لێدەکا و لە نێوەوە و لە دەرەوە راوەدوو و بەرەدووای دەنێ. ئەمە هەمووتان دەیزانن ئەم شتە. لەبەر ئەوە پیٚ کیٚ کیٚ ناچار بووە بەوەی ئامادە بێ دەست بە چڵەپووشێکیشەوە بگرێ تاکو نوقم نەبێ. ئێمە ئەگەر واز لەمە بێنین، یان بڵێین لەوە بگەڕێین کە بەشێکی باشی ئەم کوێرەوەرییەی کە «پیٚ کیٚ کیٚ»ی تێکەوتووە گوناهی هێندێك لەو ئەندامانەن کە

دەستڕۆیشتوون لە نێو پێ کێ کێ دا (ئێمە ئەگەر واز لەمە بێنین!)، دەبێ ئەوە بزانین کە داگیرکەرانی کوردستان لە بارەی هەوڵدانیانەوە بۆ نەهێشتنی دەسەڵاتی کورد لە باشووری کوردستاندا، هەموو سوێندخۆری یەکن سەرەڕای هەموو دوژمنایەتییەکیان لە گەڵیەك. دەبێ ئەوەش بزانین کە دیارە ئەمانە هەوڵدەدەن سووت لە پێ کێ کێ ی تەنگاوکراو وەربگرن و بیبەن و بیانکەن بە گژ بەڕێوەبەرێتیی هەرێمی ئاسایشدا. لەمەشدا دەرفەتێکی باش دەبینن، چونکە هەتا ئێستا دەسەڵاتدارێتیی پارتی و دەسەڵاتدارێتیی یەکێتی، سەرەڕای چەند جارێك ئیمزای رێککەوتن، هەتا ئێستا ئەو رێککەوتنانەیان نەخستووەتە گەڕەوە. ئەمەش داخ و خەفەتێکی زۆرە و هیوام وایە کە بەزووترین کات جێبەجێبکرێت.بەتایبەتی لەم کاتەدا کە وەزیری دەرەوەی بەریتانیا هەردوو برای بەڕێز مام جەلال و کاك مەسعوودی بانگهێشتکردووەتەوە بۆ لەندەن، هیوام وایە ئەمجارە بەڕاستی بیبڕنەوە و رێککەوتنێکی دۆستانە و برایانە و دێمۆکراتانە بێتە پێشەوە. ئەمە لە لایەك. لە لایەکی دیکەوە ئەم رێکنەکەوتنەی پارتی و یەکێتی کارێکی وایکردووە کە سیاسەتی پارتی و یەکێتی بەرامبەر بە پێ کێ کێ پێچەوانەی یەك بێ. بۆ نموونە لە کاتێکدا کە لە نێوان **پارتی و پێ کێ کێ** دا شەڕێکی هۆ بە هۆ روویدەدا، گێریلا و سەرکردەکانی پێ کێ کێ بەوپەڕی سەربەستییەوە لە نێوچەکانی ژێردەسەڵاتی یەکێتیدا هاتوچۆیاندەکرد و چالاکییان دەنواند و، تەنانەت یەکێتی و هەڤاڵبەندەکانی، وەك ئەوەی کە خۆی نێو ناوە «زەحمەتکێشان» دەچوونە شەڕەوە لە دژی لەشکری ترك و لە سەر پێ کێ کێ بوون و، ئەوە بوو چەند سەت پێشمەرگەیەکی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان شەهید بوون. ئەمەش دیارە هەڵەیەکی گەورە بوو کە دەبوو هەردوو حیزبەکە **(پارتی و یەکێتی)** ئەم هەڵەیە نەکەن. واتە سیاسەتێکی کوردانەی یەکگرتوویان پێشبگرتایە بەرامبەر پێ کێ کێ. مەبەستم ئەوە بوو و، مەبەستم ئەمەیە هەردوو حیزبەکە پاش ئەوەی ئۆجەلان فەرمانی کشاندنەوەی گێریلاکانی لە سنووری ترك دەرکرد، پێ کێ کێ بگرنە ژێر دەست خۆیان. پێ کێ کێ هەرچەندە کردەوەی خراپی بێ، هەرچەندە کردەوەی خراپیشی بێ، هەڵەی ببێ، بەڵام لە هەمانکاتدا پێ کێ کێ هێزێکی کوردییە. ئێمە ئەگەر چاو لەوە بپۆشین کە بەڕاستی هەڵەیان کردووە و کردەوەی خراپیشیان نواندووە، بەڵام

ئەمانە کوردن و هێزێکی کوردین، خۆشك و بران، کوڕ و کچن ، باوك و دایکن، مرۆڤ ناتوانێ دەست لەمانە هەڵگرێ. پێویست بوو پارتی و یەکێتی ئەمانە بگرنە ژێر باڵی خۆیانەوە و، پێویست بوو کارێکی وابکەن کە وا پێ کێ کێ ناچار نەبێ پەنا بەرێ بۆ دوژمن. من کاتی خۆی (ئێوە ئەگەر بیرتان بێت!) لە **«کوردستانی نوێ»** دا وتارێکم نووسی **«پێ کێ کێ بەرەو کوێ؟!»** ئەو وتارەم پاش ئەوە نووسی کە نامەیەکم ناردبوو بۆ برای خۆشەویست و بەڕێزم **کاك مەسعوود بارزانی** و، وێنەی ئەو نامەیەشم دا بە برای خۆشەویست و هاوڕێی دێرینم **مام جەلال** و،کاتی خۆی کە **مام جەلال لە ئەمریکا** بوو بە تەلەفۆن منی ئاگادار کرد کە ئەو پێشنیازەی من کردوومە بۆ چارەسەر کردنی مەسەلەی پێ کێ کێ شتێکی زۆر راستە و زۆری پێخۆشە ئەگەر پێ کێ کێ و پارتیش رازی بن بەوە. ئەمە لە لایەن یەکێتییەوە، هەرچی پارتیشە ئەوە بوو تەلەفزیۆنی **«کوردستان تی ڤی»** چەند جارێك نامەکەی من و پێشنیازەکانی منی خوێندەوە، یانی وادەرکەوت کە هەردوو سەرکردایەتیی حیزبەکان لەوەدا رێکن کە مەسەلەی پێ کێ کێ بەشێوەیەکی کوردانە و بە شێوەیەکی نەتەوەییانە چارەسەر بکرێ.ئەو شێوە کوردانە و نەتەوەییانەش ئەوە بوو کە ئەوگێریلایانەی کە دێنە باشووری کوردستانەوە، چەکەکانیان بدەنە دەست کۆمیتەیەك کە لە پارتی و یەکێتی و هەموو حیزبەکانی کوردستان پێکهاتبێ، رێکبکەون،(مەبەستم هەموو بەشەکانی کوردستانە، ناڵێم بەتەنیا پارچەی باشوور!) بە شەرتێك ئەو چەکانە نەبنە ماڵی حیزبێك بەڵکوو ببنە ماڵی لەشکرێکی کوردستانیی پاشەڕۆژ کە هیوام وایە بە زووترین کات پاش رێککەوتنی پارتی و یەکێتی بیرێتە پێش. ئینجا ئەمانە لە نێوچەی باشووری کوردستان کە وڵاتی خۆیانە وەکو هەموو هاووڵاتییەکی **کەرکووکی، هەولێری، سلێمانی، دهۆکی، زاخۆیی، فەیلی و خانەقینی** و ... هتد بتوانن بژین، هەروەك ماڵی خۆیان. ئەوەشم باسکردووە کە ئەوانەیان کە زۆر شتیان لە سەرە، دەتوانرێ بە شێوەیەکی دیکە پەنابەرێتی وەربگیرێ بۆیان لە وڵاتانی دیکە، هەتا پارتی و یەکێتی بتوانن لە سنوورێکی ئینتەرناسیۆناڵیدا بۆ مەسەلەی پێ کێ کێ زۆر هۆشیارانە و بە شێوەیەکی سیاسەتکارانە ئەنجامێك ببیننەوە. ئەو شتانەم هەموو نووسیوە، بەڵام لە رۆژنامەی **«وڵاتدا»** کە لە سلێمانی دەردەچوو، مشتێ جنێو و درۆ و دەلەسە و قسەی

ناشیرینیان بە من تێدا نووسیبوو، جگە لەوەش لە **«کوردستانی نوێ»** شدا چەند چەقاڵ و بەقاڵێك راستبوونەوە و گەلێك قسەی ناشیرین و ئەوەیان کرد، ئەوە بوو جارێکیان حیزبێك ئالەو سەردەمەدا «حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان» تکای لە من کردبوو بە بۆنەی ساڵیادی دامەزراندنیانەوە پیرۆزباییان بۆ بنووسم و، منیش ئەو پیرۆزباییەم بۆ نووسین، کەچی سەیر دەکەم لە ژمارەیەکی رۆژنامەکەیاندا پیرۆزباییەکەیان لە لایەك بلاّو کردووەتەوە و لە لایەکی دیکەشەوە هەزار جنێو و قسەی ناشیرین بە من، وەك گوایە ئەو قسانەی کە من کردوومە، ورێنەن.

هەروەك باسمکرد من لەو وتارەمدا **«پێ کێ کێ بەرەو کوێ؟!»** نووسیومە ئەگەر یەکێتی و پارتی رازی نەبن بەوەی هێزەکانی پێ کێ کێ بێنە باشوورەوە، بەهیچ جۆرێك هیچ کەسێك ناتوانێت لەوێ جێگایانبکاتەوە، چۆنکە جارێ ئەو ولاّتە دەولەتێکی سەربەخۆ نییە، بەڵکو هەرێمی ئاسایشە و هێشتا دانی پێدا نەنراوە، دوای ئەوە دەسەلاّتی سوپایی پارتی و یەکێتی ئەوە نییە کە بتوانن بچن بەگژ دەولەتێکی داگیرکەری کوردستاندا، ئەمانە شتێکی ئاشکرا بوون. بەلاّم هێندێك کەس کە نەیانەوێ لە شت بگەن، یان بیانەوێ لە بەر بەرژەوەندیی حیزبەکەی خۆیان شت تێکبدەن، ئەوە بابەتێکی دیکەیە. دوێنێ شەو خۆم لە تەلەفزیۆنەکەتاندا دیم کە یەکێك لە سەرکردەکانی زەحمەتکێشان کە جاران لە سەر **«پێ کێ کێ»**ی دەکردەوە ئێستا بە ۱۸۰ پلە لە دژیان دەدوا و قسەکانی بە جۆرێکی دیکە بوو. بەلاّم با ئێمە لەم شتانە بگەڕێین!.

بەڕاستی بۆ ئەوەی کە وا مەسەلەی پێ کێ کێ چارەسەر بکرێ نابێ بهێلّین بەهیچ جۆرێك **«مجاهدین خلق»**ێکی دیکە لە رۆژهەلاّتی نێوەڕاستدا دروستببێ. پێویستە هەردوو حیزبەکە **(پارتی و یەکێتی)** بەزووترین کات بە بێگوێدانە بەرژەوەندیی حیزبایەتیی خۆیان، بە پشتگیریی هەموو دەسەلاّتدارانی دیکەی کوردستان، بە پشتگیریی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان، بە پشتگیریی حیزبی کۆمۆنیستی کوردستان و بە پشتگیریی موسلّمان و ئێزیدی و کاکەیی و هەموو هۆزەکانی کوردستان، بە پشتگیری ژنانی کوردستان، کارێکی وا بکەین کە مەسەلەی پێ کێ کێ چارەسەر ببێ و لەوە زیاتر نەتەنێتەوە، لەوە زیاتر بتەنێتەوە و درێژە بکێشێ بڕوابفەرموون داگیرکەرانی کوردستان زۆر سووتی لێدەبینن. کە ئەم

قسەیە ئەمڕۆ دەکەم، هەر ئەمەشم وتووە لە سالی رابردوودا، بەلام ئەوە بوو بەو شێوەیە لە **«کوردستانی نوێ» و لە رۆژنامەی «زەحمەتکێشان» و لە «ولات»** و لەمانەدا بەو شێوەیە بەربەرەکانێکرام و، وەرامدرایەوە، ئەوەتا ئەورۆ هاتە دی و، وەك دەبینن لە نێوچەی «یەکێتی» یش ئەو شەڕ و هەلاّیە هەلگیرسا ....

**بیوورە دوکتۆر بەلاّم خۆ یەکێتی لە سیاسەتیدا نەبووە شەڕی پی کی کی بکات، ئێستا ئەم شەڕە بەسەریدا سەپێندراوە!**

من نەختێك لەمەوبەر گوتم، یەکێتی لە سەر پی کی کی شەڕی کردووە و شەهیدی داوە، ئەوە راستە ئەو قسەیە، بەلاّم ئێمە دەبێ ئەوە بگرینە بەرچاو، ئێستا بارودۆخێك هەیە لەونێوچەیەدا، بارودۆخێك کە شەڕ هەیە لە نێوان یەکێتی و پی کی کی دا. ئێستا من تەماشای ئەمە ناکەم ئەم شەڕە لە چییەوە دروست بووە، چۆنکە ئەگەر باسی ئەوە بکەین ئەبێ سێ ـ چوار رۆژ قسەیلێبکەین. بەلاّم ئەوەی کە هەیە ئەو شەڕەیە و پێویستە ئەوە نەمێنێ. ئێمە بە شەڕ بە هیچ جۆرێك نابێ پشت ببەستین. دەبێ ئەوانەی سەر بە «پی کی کی»ن تێبگەن کە ئەو نێوچەیە نێوچەی خۆیانە، ولاّتی خۆیانە، بەلاّم لە هیچ ولاّتێکدا تەنانەت، ولاّتێکی سەربەخۆ رێگە نادا بە تاقمێك بێن بەشێوەیەکی چەکداری لەوێدا دابنیشن. پێویستە بەرلە هەمووشتێك گوێڕایەلّی بکەن بۆ ئەو دەستوور و رێسا و یاسایەی کە لەو نێوچەیەدا هەیە. ئەمە خۆ لە هەموو دنیادا هەیە. سالاّنی سالّ فەلەستینییەکان لە **ئەردەن** بوون، فەلەستینییەکان لە **سووریە** بوون، بەلاّم لە ئەردەن و سووریاوە پەلاماری **ئیسرائیل** یان نەدا. خۆ من لە سەر یەکێتی ناکەمەوە، یان لە سەر پارتی ناکەمەوە، بەلاّم پارتی و یەکێتییش ناتوانن رێگەیانبدەن لەو نێوچەوە دەولّەتی ترك پەلامار بدرێ. شتێکی دیکەش هەیە کە دەمەوێ لێرەدا بیلێم ئەوەیە ئەمان (پی کی کی) خۆ ئێستا نایانەوێ لە باشوورەوە پەلاماری هێزەکانی ترك بدەن، ئەمان شەڕیان لەوێ راگرتووە، باشە بۆچی شەڕەکە لە باشووری کوردستاندا دەکەن؟. تۆ باشوور بە مەلّبەندی خۆت دەزانی، بە شوێنی خۆتی دەزانی، قەیناکا، تۆ دەتەوێ ئاشتی بکەی لە گەلّ دەولّەتی ترك، ئەی بۆچی ئاشتی ناکەی لە گەلّ خەلّکی ولاّتی خۆت، بۆچی ئاشتی ناکەی لە گەلّ برای خۆت، ئاشتی ناکەی لە گەلّ خوشکی خۆت. بەلاّم پێویستە بە شێوەیەکی نەرمو نیان لە گەلّ ئەمانە بجوولێنەوە، چۆنکە ئەو

تاقیکردنەوە و ئەزموونەی کە لە باشووری کوردستاندا هەیە بەو شێوەیە لە باکووری کوردستاندا نییە، من تا هەندازەیەکیش حەق دەدەم بەوانەی خەڵکی باکوورن. ئەوی کە لە باشووری کوردستانە ئەزموونێکی نێزیکی پەنجا ساڵ شۆرشی ئەیلوول و شۆرشی دیکەی لە پشتە، ئەوە بەسەر ئەواندا هێشا نەهاتووە. ئەو شێوە پەروەردەکردنی سیاسییەی کە لە باشووری کوردستاندا هەبوو، هەتا ئێستا لە باکووری کوردستاندا نەبووە، ئەوان پێویستە هێندێك لەو ئەزموونانەی کە لە باشوور دا هەن تێبیگەن و بیکەن بەماڵی خۆیان. ئەگەنا باشووری کوردستان ماڵی هەموو کوردێکە.

**بەڵێ دوکتۆر، بەڵام وەك جەنابت وەزعی مەنتقەکە ئەبینی، یانی یەکێتی خۆ زۆر هەوڵیدا کە بە چارەسەری ئاشتییانە کێشەکە چارەسەر بکرێ، بەڵام جەنابت هەست ناکەی ئەمە تەنیا شەڕێکی کاتی نەبێ، سیاسەتێکی لە پشتەوە بێ و بەرنامەی بۆ دارێژرابێ؟**

بەڵێ! من هەست بەوە دەکەم کە ئەمە هەیە، ئەمە هەیە. بەڵام هەموو ئەوانەی کە وا لە سنووری چەکدارەکانی پێ کێ کێ دا کار دەکەن، هەمووشیان ئاگایان لەمە نییە، دڵنیا بە! وەکو چۆن لە نێو یەکێتی، لە نێو پارتی، لە نێو هەموو حیزبێکی دیکەی کوردستانیدا هەزاران مرۆڤی بەشەرەف و بەناموس هەن، لە پاڵ ئەمانەشدا چەقاڵ و بەقاڵ و گەجەر و گوجەر هەن، لە نێو ئەوانیشدا هەن، بگرە لە نێویاندا زۆرتریش هەن. ئەگەر ئەو چەقاڵ و بەقاڵانەیان لە نێو نەبوایە، دڵنیا بە «ئۆجەلان» نەدەگیرا. ئێستا من حەز ناکەم بە دوور و درێژی قسە بکەم، ئەوەی وا بەسەر ئەوان هات بەشێکی باشی گوناهی هێندێك لەوانەی خۆیانە کە لە سەر ئەوان حسێبن، جا بۆچی وادەکەن! ئەمە مەسەلەیەکی دیکەیە، ئەمە راستە، وایە. بەڵام ئێستە چارچییە؟!. چار ئەوەیە بە سیاسەتێکی کوردانە بە نەرمو نیانی ئەم مەسەلەیە چارەسەر بکرێ و، ئەمەش بەتاقی تەنیا بە یەك حیزب ناکرێ، بەڵکو یەکێتی و پارتی و هەموو حیزبەکانی دیکەی باشوور و باکوور و رۆژهەڵات رۆژئاوا پێویستە یەکبگرن بۆ ئەوەی سیاسەتێکی یەکگرتوویان بێ بەرامبەر بە پێ کێ کێ. پێ کێ کێ لە تەنگاویدایە. تەماشای مرۆڤ مەکەن، وەرە پشیلەیەك بخەرە ژوورێکەوە و لە هەموو لایەکەوە دەرگای لە سەر داخە، دیارە پەلامارتدەدا. کاتی خۆی لە وتارەکەمدا

نووسیبووم کە، ترسی ئەوەمان هەیە لە باشوور بیێتەوە بە شەڕ و لە هەمانکاتدا «مجاهدین خلق» یێکی دیکە دروست بیێ. تکاتان لێدەکەم، یانی ئەو تکایەی من هەر بەرەورووی یەکێتی نییە، بەرەورووی پارتییە، بەرەورووی پارتی کۆمۆنیستی کوردستانە، بەرەورووی هەموو ئینسانێکی بەشەرەفە، هەوڵی ئەوە بدەن کە بە شێوەیەکی ئاشتییانە ئەم مەسەلەیە چارەسەر بکەن، چونکە بەڕاستی ئەمە شتێکی زۆر جێگەی مەترسی و خەتەرناکە. لە هەموو لایەکەوە هەوڵی ئەوە دەدەن ئەم دەسەلاتدارێتییە نەمێنێ. ئەم دەسەلاتدارێتیی کوردە نەمێنێ. ئەوانە، داگیرکەرانی کوردستان لە هەموو رووێکەوە لە گەلّ یەکتر ناڕێکن، بەلام لەوەی کە وا ئەم دەسەلاتدارێتییە نەهێڵن، هەموویان یەکن. جا کوردیش دەبێ بۆ ئەوەی ئەم دەسەلاتدارێتییە رابگرێ، هەموو یەکبگرن، چۆنکە ئەم دەسەلاتدارییە بەتەنێ هی خەڵکی باشوور نییە، هی خەڵکی باکووریشە، هی خەڵکی رۆژهەلاتیشە، هی خەڵکی رۆژئاوای کوردستانیشە، هی خەڵکی کوردستانی سۆری قوڕ بەسەرە. پێویستە ئەو دەسەلاتدارییە رابگیرێ و ئەم دەسەلاتدارییەش هەموو کاتێك رائەگیرێ بەوەیکە وا مرۆڤی تێگەیشتوو، مرۆڤی پشوودرێژ، مرۆڤی لە سیاسەتزان بێننە کارەوە. من دڵنیام لەوەی ئەوانەی کە وا لێشیان جیا بوونەتەوە ماوەیەکی زۆری دەوێ کە تۆ تێیانبگەیەنی کە بابە! من برای تۆم، کەسی تۆم، کاکی برام من چاکەی تۆم دەوێ، هەتا دەچێتە مێشکییەوە کاتی زۆر دەبا ....

**یەووره دوکتۆر، ئەوا ئێستا یەکێتی هەوڵدەدا بە ئاشتی مەسەلەکە چارەسەر بکا، لە نێو پێ کێ کێ دا، کادره دڵسۆزەکانی پێ کێ کێ چ دەورێکیان هەیە؟**

بەڵێ، با من یەك شتت پێ بڵێم! ئایە ئەو کادره دڵسۆزانەی ئەوان، شتیان بەدەستە؟ من ئەو پرسیارەت لێدەکەم! بەڕەیی من ئەم شتە بەم شێوەیە نابێ، ئەم شتە بەوە دەبێ کە ئەوانەی بەڕاستی ئینسانی سادەن و لە نێویاندان تیانبگەیەندرێ، ئەگینا بەوەی کە تۆ زەلامێك لە سەرەوە بچی تێیبگەیەنی، یان کابرایەك کە پێوەندیی بە لایەکەوە هەیە، یان مرۆڤێکی دڵسۆزە، بەلام پێی وایە ئەم رێیەی ئەو گرتوویەتی راستە، یان تەنگاو کراوەو سەرلێشێواوە و، نازانێ چی بکا، ئەمە فایدەی نییە. ئەبێ سیاسەتێکی یەککرتووی پارتی و یەکێتی بیێ لە هەردوو نێوچەکەدا، کارێکی وابکەن کە وەکو دەڵێ، بانگەوازێك دەرکەن بۆ

ئەوانەی کە وا لە نێویاندا ئەندامن. من پێموایە زۆر لەوانەی کە لە نێویاندان و ئەندامن ئاشتییان دەوێ، باوەڕ ناکەم شەڕیان بوێ. ئینسانی شەڕخوازیان هەیە لە نێودا، بەڵام کارێکی وا بکرێ ئەو شەڕخوازانەی لە نێویاندان دەسەڵاتیان نەمێنێ. ئەوانەی کە تۆ دەفەرمووی دڵسۆز و واو و وان ... دەوریاننییە و، بەشێوەیەکی زۆر خراپ بێدەنگکراون. بۆخۆت دەزانی، کاتێ کە وا سەرکردەکەیان گیرا، پاش ماوەیەك گەلێك کەس هاتن، گەلێك کەس هاتن و کەوتنە رەخنەگرتن، مرۆڤی زۆر تێگەیشتوو بوون، بەڵام سووتی کەم بوو، بۆچی؟ چۆنکە کەسانی دیکە نەبوون کە وا پشتیانبگرن. ژمارەیەکی زۆر کەم پشتیانگرتن. بەڵام ئەگەر ئێستا پارتی و یەکێتی هەردوولا دەنگی خۆیان بکەن بە یەك و، بە شێوەیەکی کوردانە مەسەلەکە چارەسەر بکەن، رێنەدەن کە دەوڵەتێکی دەر و دراوسێی داگیرکەر بچێ سووتیان لێوەر بگرێ، پێموایە بارودۆخەکە جۆرێکی دیکەی لێدێ. ئەوە رەیی منە. ساڵ و نیوێك لەمەوبەر لە نامەکەمدا ئەو شتانەم نووسیبوو، ئەوا ئەمڕۆ هاتنە دی. ئێستەش من پێت دەڵێم، ئەگەر یەکێتی و پارتی یەکبگرن و سیاسەتێکی یەکگرتوویان ببێ لەم مەسەلەیەدا، ئەم شەڕ و هەڵلایە بەو شێوەیە نامێنێ و، تەنانەت ئەگەر تاقمێك هەبن لە نێویاندا بە دەسیسەی بێگانە و داگیرکەری کوردستان بیانەوێ شتێ بکەن، ئەوە سەرناگرێ، دڵنیا بە لەوەی کە سەرناگرێ. چۆنکە زۆر تاقمی وا هەن لە باکووری کوردستاندا، لەوانە هەڤاڵ خەجێ کە ئەو شتانە زۆر باش دەزانێ کە خەڵکی باکووری کوردستان، دەزگە و رێکخراو و رێبازی دیکە هەن کە لە گەڵ ئەمانەدا بەهیچ شێوەیەك رێك نین و یەك ناگرنەوە. لە بەر ئەوە من پێموایە ئەگەر پارتی و یەکێتی لە سەر ئەم ناکۆکییە برۆن بەرێوە و سیاسەتێکی یەکگرتوویان نەبێ، بڕوا بفەرموون شتەکە زۆر مەترسی لێدەر دەچێ. یانی مەترسییەکی وا کە ترسی ئەوەمان دەبێ ئایا دەسەڵاتدارییەکە دەکەوێتە لەرزینەوە یان ناکەوێتە لەرزینەوە!. ئێستا من ئەوە دەڵێم، هەڵیگرن بۆ پاشەڕۆژ!.

**بە رای جەنابت دوکتۆر، دەوری رۆشنبیران و سیاسەتمەدارانی بێلایەنی نیشتمانپەروەر لە دەرەوەی کوردستان چییە بۆ روونکردنەوەی ئەو مەسەلەیە!**

من بڕوا ناکەم یەکێ خۆی بە سیاسەتمەدار بزانێ بێلایەن بێت، لام وایە جەنابت مەبەستت لە بێلایەن یانی سەربەخۆ بێت. من بۆ خوم مرۆڤێکی سەربەخۆم و لە هیچ

حیزبێکدا نیم، بەڵام بێلایەن نیم. ئەگەر شتێك روویدا دەبێ مرۆڤ هەڵوێستێکی ببێ. بێ هەڵوێستیش مانای لایەندارییە. هەڵوێستی ئەوانەی لە دەرەوەن جیاوازە لە گەڵ یەکتری. هەڵوێستی مرۆڤی تێگەیشتوو، مرۆڤی نەتەوەیی ئەوەیە کە ئەم مەسەلەیە بە شێوەیەکی ئاشتییانە چارەسەر بکرێ و، رێنەدرێ تەشەنە بکات و بە زوویەکی زوو پەلاماردانی چەکداری بوەستێنرێ و، کارێکی وا بکرێ کە وا پاڵ بە هەردوو حیزبەکەوە بنرێ، پارتی و یەکێتی سیاسەتێکی یەکگرتوویان ببێ بەرامبەر بەمانە، ئەوانەی کە لە باکوورەوە هاتوونەتە ئەو نێوە، پاش ئەوەی کە چەکەکانیان دایە دەست دەسەڵاتدارێتیی کوردستان، رێی ئەوەیان بدرێوەکو هەموو هاوولاتییەکی دیکە بەوپەڕی رێز و خۆشەویستییەوە لە باشووردا بژین، ئەمە ئەو بێلایەنییەیە کە تۆ دەفەرمووی، هی ئەو تاقمەیە کە سەربەخۆن کە سیاسەتێکی نەتەوەییان هەیە، یانی نەتەوەیین. بەڵام هێندێکی دیکەش هەن بۆخۆی لە ماڵی خۆی دانیشتووە و هیچ ناکا و هەرچی بقەومێ ئاگای لێنییە، ئیتر بە لای ئەوەوە زستانە، بەهارە، پایزە یان هاوین، بەلایەوە وەکیەکە. ئەوانەی کە تۆ دەفەرمووی سەربەخۆ ئەوانە جیاوازن، ئەوانەی کە نەتەوەیین دیارە لە گەڵ ئەوەدان کە مەسەلەی پێ کێ کێ دەبێ لە لایەن کورد خۆیەوە چارەسەر بکرێت، چونکە ئەمانە کوردن و، پێویستە لە لایەن هێزی کوردەوە چارەسەر بکرێ. ئێستا دوو هێزی دەسەڵاتدار هەیە لە کوردستان، یانی هێزی دیکەش هەن لە کوردستاندا بەڵام ئەم دوو دەسەڵاتدارانە پێویستە لە سەریان پێکەوە دابنیشن و سیاسەتێکی یەکگرتوویان ببێ بۆ چارەسەر کردنی ئەم مەسەلەیە. ئەگەر پێویستیش کرا کۆنفرانسێك بگیرێ بۆ ئەو مەسەلەیە کە بە ئاشکرا و لە هەموو دنیادا بڵاو ببێتەوە کە ئێمە پلان و نەخشەمان بۆ چارەسەر کردنی ئەم مەسەلەیە بەم شێوەی خوارەوەیە. ئێمە رێیاندەدەین بێنە نێوچەکە بژین، بەڵام ئێمە رێنادەین بەوەیکە وا هیچ هێزێك بە شێوەی چەکداری ببێ لە نێوچەکەدا. ئێستا من رەییم لە گەڵ ئەوە نییە کە هیچ ئەندامێکی یەکێتی یان پارتی و چ ئەندامی حیزبێکی دی بێت بە چەکەوە بگەرێت. چەك ماڵی پێشمەرگەیە کە لەشکری کوردستانە، ماڵی پۆلیسە، ماڵی هێزی ئاسایشە، لەبەر ئەوە هیچ دەسەڵاتدارییەك مافی ئەوەی نییە رێ بە تاقمێك بدا بە شێوەی چەکدارانە بجووڵێتەوە، ئەمە راستنییە. بەڵام پێویستیشە لە سەری لە هەمانکاتدا بیانپارێزێ.

پاراستنی گیانی هەموو کەسێك کەوتووەتە سەر دەسەلاّتدارێتیی ئەو شوێنە و، بەرپاستی دەبێ ئەو کارە بکا و، ئەگەر زانی یەکێك زوڵمی لێکراوە یان لە بەردەم هەرِەشەی ئەوەدایە، هەرِەشەی گیانی، یان هەرِەشەی ماڵی، پێویستە دەسەلاّتدارێتیی کوردستان لە سەری بکاتەوە. ئەمە رەیی ئەو کەسانەیە کە سەربەخۆن و، ئەوە رەیی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستانیشە، وەکو من قسەم کردووە لە گەڵ ماموّستا و برای بەرِێز جەواد مەلا، ئەویش بیروڕای خۆی دەربری بەرامبەر بەم حاڵە کە هەیە و، لە رۆژنامەی «کوردستانی نوێ»شدا بیروڕای ئەو بلاّو کرایەوە. هەموو ئەوانەی کە وا رۆشنبیرن و، رۆشنبیری دڵسوزن، رەییان لە سەر ئەمەیە کە ئەم مەسەلەیە بە زووترین کات بە شێوەیەکی دێمۆکراتیانە، برایانە خوشکانە و ئاشتیخوازانە چارەسەر بکرێ. چاوەڕوانیی من لە ئێوە ئەوەیە لە «کوردسات» و لە «کوردستان تی ڤی» کە ئێوە لەمرۆوە کار بکەن و هەوڵبدەن لە خەڵکی بگەیەنن کە ئەمە مەسەلەیەك نییە ببێتە هۆی شەڕ و دوو بەرەکی و ناخۆشی و ئەمانە دروستببێت، ئێمە هەموو کاتێك ئامادەین ئەو کەسانەی کە وا دێنە ئەم نێوچەیە، خەڵکی هەرلایەکی کوردستان بن، یان هەر جورە کوردێك بن، حەز دەکا کوردی جاوە و سۆمەترەش بن، دەتوانن بێن لەو نێوچەیە بژین، بەلاّم وەکو هاوولاّتییەك کە گوێڕایەڵی یاسا و رێسا و ئەو قانوونانە بن کە لەو نێوچەیەدا هەیە. خۆ ئەوە لە هەموو دنیا هەروایە، تۆ بچی بۆ هەر ولاّتێ بژیت، پێویستە رێز لەو رێسا و یاسایە بگری کە لەو شوێنەدا هەیە. ناتوانی خۆت جیا بکەیتەوە لەو دەسەلاّتەی لەوێ هەیە و دەسەلاّتێکی چەکداری پێڕەو بکەی. پێویستە هەوڵبدەی لە رێی سیاسەتەوە پێشبکەوی. ئەوە رەیی منە و رەیی زۆر لەوانەن کە ئینسانی سەربەخۆن.

**بەڵێ، بەلاّم دوکتۆر، ساڵی رابردوو یان ساڵێ لەمەو پێش لە ئەورووپا شتێ دامەزرا بەناوی پەرلەمانی کوردستان لە دەرەوەی ولاّت، یان کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان، بەلاّم دەرکەوت لەم رووداوانە هیچ رۆڵێکیان نەبوو، کە بە حیسابی خۆشیان نەتەوەییانە بیر دەکەنەوە!**

تۆ لە من مەپرسە، لەوانە بپرسە کە هەوڵی ئەوەیان دا ئەو شتە دروستبکەن!. پانزە ساڵ لەمەوبەر لە لایەن بەرِێز جەواد مەلاوە **کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان دروست کرا و، کاك جەواد یەکەمین کەس بوو کە بیریی دامەزرانی پەرلەمانی**

**کوردستان لە دەرەوەی وڵات و کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستانی هێنایە پێش.** ئەو لەسەر بیروباوەڕی نەتەوەیی ئەوەی هێنایە پێش و ئەوە بیری ئەو بوو. ئەمان **(پێ کێ کێ) کاتێکە پەرلەمانی کوردستان لە دەرەوەی وڵاتیان** دامەزراند، ویستیان کە **کاک جەواد** بچێتە نێو ئەو پەرلەمانەوە. **کاک جەواد** نەیویست بچێتە نێو پەرلەمانەکەوە، ئەوان هاتن تکایان لە من کرد، چونکە دەزانن ئێمە برایەتی و هاوبیریتیمان کۆنە، وتیان تکات لێدەکەین داوای لێبکە بێتە نێو پەرلەمانەوە. منیش پاش ئەوەی بیرم لێکردەوە، گوتم باشە ئەگەر ئەکرێ بچۆرە ئەوێ بەڵکو لەو رێگەوە خزمەتێکی رێبازی نەتەوەیی بکەی. وتی باوەڕ ناکەم ئەوان رێبدەن، چونکە ئەوان بە شێوەیەکی دیموکراتیانە نایەنە پێشەوە. گوتم هەوڵبدە تاقی بکەرەوە، کە تاقیکردەوە، پاش ساڵێك ئەوانە وەکو دەڵێ دەردێکی زۆریان دەرخوارد دا و، ناچار بوو لە ئەنجامدا وازبێنێ و بێتە دەرەوە. کاتی خۆی ئەو **(کاک جەواد) بە نێوی نوێنەری کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستانەوە لە نێو ئەو پەرلەمانەدا بوو و، ئەو بۆخۆی دوو ــ سێ کۆبوونەوەی سازکرد، کۆنگرەی یەکەم و کۆنگرەی دووەم. لە کۆنگرەی یەکەم و دووەمدا ئەوان بۆ خۆشیان ئامادە بوون.** بەڵام پاش ئەوەی پەرلەمانەکەیان دروستکرد، ئەم **(کاک جەواد) بوو بە نوێنەری کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان لە نێو پەرلەماندا.** کاتێ کە کۆنگرەی سێهەم لە **فەرانسە** گیرا، **پەرلەمانی فەرانسە** ساڵۆنێکی گەورەی دا بە **کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان** کە کۆبوونەوەکەی لەوێکا و، **مسیۆ پییێر بیرسی** کە یەکێکە لەوانەی **سەرۆکی کۆمەڵەی مافی مرۆڤە لە فەرانسە،** ئەویش هەوڵیدا لە گەڵ کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستاندا هاوکاری بکا بۆ بەرێوەبردنی ئەو کۆنگرەیە. ئەو حەلە دوو حەفتەی مابوو و، خەڵك بانگ کرابوون بۆ کۆنگرە. **یاشار کایا** هات بە کاك جەوادی وت کە تۆ دەبێ ئەو کۆنگرەیە هەڵوەشێنیتەوە!. **کاك جەواد** دەپرسێ بۆچی هەڵیوەشێنینەوە، من لە هەموو دنیاوە خەڵکم بانگهێشت کردووە بۆ کۆنگرە. یاشار کایا دەڵێ مرۆڤی سەگ و سەگباب و مرۆڤی خراپ ئەمانەیان کردووە و ... . کاك جەوادیش پێیدەڵێ وەکو کێ؟ یاشار دەڵێ وەکو **کەندال نەزان!.** کاك جەواد ئەڵێ، بابە کەنداڵ نەزان ئاگای لە مەسەلەکە نییە باوەڕ بکە. یاشار کایا پێ دادەگرێ بۆ هەڵوەشاندنەوەی کۆنگرەکە و وتبووی ئەمە خیانەتە و تەنانەت هەڕەشەی کردبوو.کاك جەوادیش وتبووی پرسم

بە برادەرەکانی خۆم کردووە ئەوان رازین و هەڵیناوەشێنمەوە. بەڵێ بەمجۆرە کۆنگرەی سێهەم گیرا. **کەندال نەزان** چوویوو بە حکوومەتی **فەرانسە**ی وتبوو کە ئەمە کۆنگرەی **پیّ کیّ کیّ** یە، لە بەر ئەمە حکوومەتی **فەرانسە** ساڵۆنەکەی وەرگرتەوە و، پاشار کایاش دەیفەرموو ئەمە **(کەندال نەزان)** ئەمەی دروستکردووە ... . ئیتر پاش ئەمە کاک جەواد ناچار بوو بکشێتەوە لە پەرلەمانەکەیان. دوایی ئەوە بوو پەرلەمانەکەیان بەجاریّ هەڵوەشاندەوە و، هەر بە ئەمرێکی سەرکردەکەیان پەرلەمانەکەیان هەڵوەشاندەوە. پاش ئەوە هاتن پار ئەم کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستانەیان دروستکرد. ئەوە زۆر چاك بزانە کە چەند هێزێکی وەکو **حیزبی زەحمەتکێشان** و چەند کەسانێکی دیکەش هەوڵیاندا کە بێنە نێو کۆنگرەی نەتەوەییەوە و کارێکی وا بکەن وەکو وتم بەرامبەر بە کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان، ئەمە بوو مەسەلەی دامەزراندنی ئەم کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستانە!.

هەروەها ویستیان کارێکی وابکەن کە **بەرێز «ئاپۆ ـ ئۆجەلان)**، وەکو سەرکردەی فەخری وەربیگرن هەتا تۆزیّ وەکو بڵێن حکوومەتی ترك ترسێکی وای بیّ کە لە سێدارەی نەدەن. ئەوە هەموو کەس دەیزانیّ، نەك هەر ئێمە. بەڵام ئەوە هەتا ئێستا کۆنگرەی نەتەوەیی چیکردووە، هیچی نەکردووە. کۆنگرەی نەتەوەیی حیزبێك دروستیناکا. کۆنگرەی نەتەوەیی دەبیّ مرۆڤی سەربەخۆ دروستیبکەن و، حیزبەکان وا لێبکەن بیانخەنە ژێر ئەو چەترەوە. کۆنگرەی نەتەوەیی بریتی یە لەوەی کە حیزبەکانی کوردستان، رێبازەکانی کوردستان و کەسایەتییەکانی کوردستان بێنێتە ژێر ئەو چەترەوە و کارێکی وا بکات هاورێیانە، دۆستانە، هاووڵاتانە و ئاشتیخوازانە لە گەڵ یەك هاوکاریبکەن. **کۆنگرەیەکی نەتەوەیی کە حیزبێك لە حیزبێکی دیکە بەر بدا، ئەمە پێینالێن کۆنگرەی نەتەوەیی، ئەمە پێی دەڵێن کۆنگرەی شەرشەق. کۆنگرەی نەتەوەیی ئەوەیە لە سەر بیروباوەری نەتەوەیی بروا بەرێوە. لە بیروباوەری نەتەوەییدا حیزب حیزبێنە نییە. بۆ مرۆڤێکی نەتەوەیی پارتی و یەکێتی و پیّ کیّ کیّ یی و ئیسلامی و کۆمۆنیست و ژنان و ... هتد ئەمانە و هەموو کەسێك بە کەسی خۆی دەزانیّ، هەموو بە پارچەیەکی نەتەوەکەی خۆی دەزانیّ. ناتوانیّ لایەك بکا بە گژ لایەکی تردا. ئەگەر لایەکی کرد بە گژ لایەکی دیکەدا، پێینالێن مرۆڤی نەتەوەیی، پێیدەڵێن مرۆڤێکی نێوچە پەرست، پێی دەڵێن**

**کابرایەك کە هیچ ڕێبازێکی نەتەوەیی نییە.** جا لە بەر ئەوە ئەم کۆنگرەی نەتەوەییە تا ئێستا نەیتوانیوە کار بکا. بەڵام من سەرم لەوە سوور دەمێنێ هێندێك لەوانەی کە وا خۆیان بە ئینسانی ڕۆشنبیر دەزانن، یەکێکی وەکو **بەڕێز شێرکۆ بێکەس** تازە هاتووەتە سەر ئەو باوەڕە کە ئەوە کۆنگرەی نەتەوەیی نییە، لە کاتێکدا کۆنگرەی نەتەوەیی هەروا بووە. کۆبوونەوەکانی کۆبوونەوەی حیزبی پی کێ کێ لە گەڵ چەند حیزبێکی دیکە بووە. لە بەر ئەوە سەرینەگرت و سەریشناگرێ. لە دوای ئەوە، ئەو کۆنگرەی نەتەوەییە بۆچی دەبێ کاربکا؟ دیارە دەبێ بۆ سەربەخۆیی کوردستان کار بکات. ئەوان کە دێن لە سنووری دەوڵەتی ترکدا دەیانەوێ کۆمارێکی دێموکراتی دروستبکەن و، لەو سنوورەدا بژین، ئیتر ناتوانن باسی هەموو کوردستان بکەن و، باسی نەتەوە، چل ملوێن نەتەوەی کورد لە باشوور لە باکوور لە ڕۆژهەڵات لە ڕۆژاوا و تەنانەت کوردی **خۆراسان** و هێندێك لەو کوردانەی کە لە **بەلووچستانن**، ٤ ملوێن کورد لە ئەستەموڵ، چەند ملوێنێك لە ئەنقەرە، ملوێنێك کورد لە تاران دەژین. کۆنگرەی نەتەوەیی دەبێ بۆ هەموو کورد بێ، ئەگەر هەر بۆ پارچەیەکی بێ پێیناڵێن کۆنگرەی نەتەوەیی. جا لە بەر ئەوە ئەم شتانە هەموو تێکەڵبوون لە گەڵ یەك. یانی زۆرم بەلاوە سەیرە یەکێك ئێستا پاش ئەم هەموو ئەزموون و تاقیکردنەوانە، تازە هاتووەتە سەر ئەو بیرە کە گوایە ئەمە کۆنگرەیەکی نەتەوەیی نییە وئەوە وایە و خیانەتکارە و لەم شتانە دەڵێت. ئەگەر ئەمانە خۆیان بە ڕۆشنبیر دەزانن و نەتەوەیین، ئەشیا هەر لە سەرەتاوە بیانزانیایە حیزبێك ناتوانێ کۆنگرەیەکی نەتەوەیی دروست بکا، ئەوە ئەلف و بێی سیاسەتە!.

**بەڵێ، دوکتۆر جەماڵ نەبەز، ئێمە کاتمان نەما، زۆر زۆر سوپاستان دەکەین و ماندوومان کردی، سوپاس بۆ ئەو گفتوگۆیە.**

منیش زۆر سوپاستان دەکەم و، هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم و، هومێد دەکەم ئێوە کە ئەم تەلەفزیۆنەتان بەدەستەوەیە، دەزگەی ڕاگەیاندنی گشتیی، لە سەر خزمەتی خۆتان برۆن و خزمەتی گەورەتر بکەن بۆ نەتەوەی کورد و، شتێکی خۆشە کە نەتەوەی کورد چەند تەلەفزیۆنێکی سەتەلایتی هەیە، دەوڵەتی وا هەن تەلەفزیۆنێکیان نییە. خۆزگە یەکێتیی نەتەوەیی کورد بە دۆستایەتی و بە یەکگرتنیش هەروەکو ئەمە بێت. یانی بەم شێوەیە دڵی خەڵکی خۆشدەکرد. هەروەك چۆن دەنگوباسی **سلێمانی و هەولێر و دهۆك و خانەقین** و نێوچەکانی ڕۆژهەڵات و باکوور و ئەوانە دەگاتە دەرەوە، خۆزگە هەر ئاوەهاش دەنگی یەکێتیی نەتەوەییی

کوردیش بەو شێوەیە دەگەیشتە دەرەوە. هەر بژین و سەرکەوتوو بن.

**بەڵێ زۆر زۆر سوپاست دەکەین و، هیوای تەمەن درێژی بۆ جەنابت دەخوازین.**

— — —

**سەرنج!**

**ئەم وتووێژە تەلەفزیۆنییە بە تەلەفۆن لە رۆژی ٥/١٠/٢٠٠٠ دا لەگەڵ من کرا. مەرجی من بۆ هەڤپەیڤین لە گەڵ «کوردسات» ئەوە بوو هەرچییەك دەبێژم بێدەستکاری بلاوی بکەنەوە. «کوردسات» بەڵێنی ئەوەی دا و لە ٦/١٠/٢٠٠٠ دا دەقی هەڤپەیڤینەکەی وەك خۆی بلاوکردەوە و بەڵێنی خۆی بەجێهێنا.**

**بەلام رۆژنامەی کوردستانی نوێ کە زمانحاڵی «یەکێتی نیشتمانیی کوردستان»ە و، لە سلێمانی دەردەچێ، قسەکانی منی بە دەستکاریکراوی و گۆڕینی رستەکانی و پڕ لە هەڵەی چاپی و رێزمانی لە ١٠/١٠/٢٠٠٠ دا بلاوکردەوە. جا لەبەر ئەوەی ئەمە یەکەمجار نییە کە کاربەدەستانی رۆژنامەی «کوردستانی نوێ» کردەوەی نەیارانە بەرامبەر بە من دەنوێنن، ناچاربووم رەخنە و گلەیی خۆم بە نامەیەك لە ٣١/١٠/٢٠٠٠ دا بۆ «کوردستانی نوێ» بنووسم، بەلام کوردستانی نوێ نامەکەمی بلاو نەکردەوە. لەبەر ئەوە ناچار بووم نامەکە بنێرم بۆ رۆژنامەی «میدیا» زمانحاڵی یەکێتی نەتەوەیی دێموکراتی کوردستان کە لە هەولێر دەردەچێ. «میدیا» دەقی نامەکەی لەگەڵ لێدوانێکی خۆی لە ژمارە (٨٠)ی «میدیا» دا بلاوکرایەوە. دەقی ئەو نامەیە لە لاپەڕەی پاش ئەم لاپەڕەیەدا چاپکراوە.**

شایانی باسە کە دەقی ئەم هەڤپەیڤینە تەلەفزیۆنی یە تەواوی لە ژمارە (١٨)ی «کۆنگرە» گۆڤاری «کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان» کە لە مانگی ١١ی ٢٠٠٠ دا دەرچووە بلاوکرایەوە.

— — —

# پ‌ی‌ کێ کێ ....... بەرەو کوێ؟؟؟

مەبەست لەم کورتە وتارە ئەوە نییە شوێنی پ‌ی‌ کێ کێ لە بزووتنەوەی کوردایەتیدا و، هۆی پێشکەوتن و، ئەوجا نووچدانی ئەم دوایییەی و، دەوری ئاپۆ خۆی و هاوکارەکانی لەم نەهامەتییەدا بخەمەبەرچاو. چۆنکە ئەوە لێکۆڵینەوەیەکی بابەتانەی خەستوخۆڵی پێویستە کە بەتەمام لە پایزی ئەمساڵدا لەشێوەی سەمینارێکی گەورە و لە کۆبوونەوەیەکی فراواندا، بەزمانی کوردی و بەزمانێکی ئەوروپایی پێشکێش بکەم کە لە ئەنجامی خۆکشاندنەوەی چەکدارەکانی پ‌ی‌ کێ کێ وە روودەدەن.

وەك دەزانین سەرکردەی پ‌ی‌ کێ کێ بەرێز عەبدوڵا ئۆجەلان (ئاپۆ) پاش فڕاندنی لە کینیاوە بۆ ئیمرالی، داوای لە ئەندامانی حیزبەکەی کرد کە شەڕ بوەستێنن و هەتا رۆژی ١ی ئایلوول لە سنووری دەوڵەتی ترکدا نەمێنن. هەرئەو رۆژە سەرکردەیەتیی پ‌ی‌ کێ کێ هەواڵی ئەوەی بڵاوکردەوە کە (فەرمانی سەرۆك ئاپۆ) بەجێدەهێنێ. چەند رۆژێکیش لەمەوبەر بەرێز ئاپۆ لە داخویانییەکی دیکەدا وایڕاگەیاند کە ئەگەرهاتو خۆشی لەسێدارەدرا، ئەوا چەکدارەکانی حیزبەکەی نابێ شەڕ تازەبکەنەوە.

ئێمە لێرەدا نامانەوێ لەوە بدوێین کە ئایە ئەم (فەرمانە) ی ئاپۆ کە لەژووری خڕداخراوی گرتووخانەوە دەینێرێ بۆ چەکدارەکانی، رەوایەتی (شرعیة) هەیە یان نا، بەڵکو تەنێ دەمانەوێ بێژین کە ئەمە یەکەمجارنییە ئاپۆ یەکلایەنە شەڕ دەوەستێنێ و هەوڵی ئاشتی و وتووێژ دەدا و، دەوڵەتی ترکیش گوێ شلناکا بۆی. بەڵام شەڕوەستاندنی ئەمجارە جۆرێکی تایبەتییە و لەشەڕوەستاندنەکانی پێشوو ناچێ، چۆنکە بارودۆخی ئەورۆی پ‌ی‌ کێ کێ و بارودۆخی ئەورۆی رژێمی ترك و نێوچەی رۆژهەڵاتی نێوەڕاستیش لەجاران ناچن.

دەوڵەتی ترك، وەك پاش ئەم بوومەلەرزەیەی دوایی بەڕۆنی دەرکەوت، لەژێرباری گرانی ئابوورییەکی تێکشکاودا دەناڵێنێ، کە هەر ئەوروپایە بتوانێ فریای کەوێ و رزگاری بکا، بەڵام ئەورووپا نەدەیەوێ و نەپێشی دەکرێ ئەو بارە لاسەنگە بەرامبەر بەهیچ دەسکەوتێك راستبکاتەوە بۆی، بەتایبەتی دەوڵەتی ترك بەوهەموو دوژمنەی

دەوروبەرییەوە و، بەوهەمووە کێشەسەختانەی نێوخۆیەوە، بووە بە بەردێکی قورس لەسەر دلی ئەوروپا. راستە دەولەتی ترك ئەندامی پەیمانی ناتۆیە و، ولاتەکەی لەرووی ستراتیژیی سوپاییەوە بۆ ئەوروپا گرنگە، بەلام ئەوروپا ئەندامێکی دەوێ کە ئاسایش لە مالەکەیدا مسۆگەر بێ و، دراوسێکانی دانەجیرێی لێنەکەن. لەبەرئەوە شتێکی سەیر نییە **ڤێرهەمۆیگن** کاریەدەستی بەرپرسیاری وەرگرتنی ئەندامی نوێ بۆ یەکێتیی ئەوروپاله رۆژی ٨/١٦ دا لە برۆکسل گوتی: «ترکیا هەرچەندێ لەباری ستراتیژەوە بۆ ئەوروپا گرنگ بێ، نابێ بەتەمای ئەوە بێ کە ئەوروپا هەلسوکەوتێکی تایبەتی لەگەلدا بکا. ترکیا بەم کەموکورتییەوە کە هەیەتی لەبارەی مافی مرۆڤ و مافی کەمایەتی و پێوەندیی دراوسێکانییەوە، ناتوانێ ببێتە ئەندامی یەکێتیی ئەوروپا».

هەرچی پێ کێ کێ یشە ئەوا بەدلنیاییەوە دەبێژم: تەنانەت ئەگەر پێ کێ کێ وەك حیزبێکیش بمێنێ و نەبێتە چەند پارچە و دەستەیەکی دژبەیەك، ئەوا ئەو پێ کێ کێ یەی جاران نابێ، واتە ئەو پێ کێ کێ یە نابێ کە بتوانێ لە شەوورۆژێکدا سەت هەزار کەس کۆبکاتەوە و لە شەقامەکانی ئەوروپادا خۆپێشاندان سازبکا. ئەو پێ کێ کێ یە نابێ کە بە هەزاران ئەندام و لایەنگری فیداکار و سەرلەپێناوی هەبێ و ئامادەی خۆسووتاندن بن لە پێناوی فەرمانێکی سەرکردەکەیاندا.

ئەو پێ کێ کێ یە نابێ کە خاوەنی سەتان ملیۆن دۆلار بوو ... ئەو پێ کێ کێ یە نەما و دەوری تەواو بوو ... ستراتیژ و تاکتیکی پێ کێ کێ سەرتاخوار گۆڕاوە و بووەتە حیزبێکی ئاوەڕووتکراو.

مانگیش هەر سەرلەئێوارەوە دیارە. ئەوەتا ژمارەیەکی زۆر ئەندامانی چالاك و ئیشکەر وازیان لە پێ کێ کێ هێناوە و ژمارەیەکی زۆرتر پشتیان ساردبووەتەوە. پێ کێ کێ دەبێ دان بەم راستییە تالوتفتەدا بنێ و بزانێ کە سەرچلی و سەرەڕۆیی و سەرکێشی سووتی نییە و نابێ.

ئەوەی ئەورۆ هۆی پەژارە و دلەڕاوکە و جێی پرسیارە ئەوەیە کە چەند رۆژێکی دیکە کاتێك چەکدارەکانی پێ کێ کێ بە فەرمانی ئاپۆ سنووری دەولەتی ترك بەجێدەهێلن، ئایە دەچن بۆکوێ؟ دیارە یان دەبێ بچن بۆ دەولەتێکی دراوسێی ترك، یان رووبکەنە نێوچەی (هەرێمی ئاسایش) لە باشووری کوردستان، چونکە رێیەکی

دیکەیان نییە.

جاریّ (هەریّمی ئاسایش) دەولّەتیّکی سەربەخوّ نییە و، لە لایەن سوپای ئەمریکا و بەریتانیاوە دەپاریّزریّ. ئەمریکا و بەریتانیا لەریّی پەیمانی ناتووە، هەڤالّبەندی دەولّەتی ترکن و پشتگیریی دەکەن. کەواتە رازیبوونی دەولّەتانی ترك و ئەمریکا و بەریتانیا پیّویستە، کە ئەمەش کاریّکی هەروا هاسان نییە. ئەوجا پارتی و یەکیّتی کە دەسەلاّتدارانی هەریّمی ئاسایشن دەبیّ رازی بن بەوەی چەکدارەکانی پیّ کیّ کیّ رووبکەنە هەریّم. ئاشکرایە کە پارتی و یەکیّتی نە رازی دەبن و نە دەشتوانن ریّبدەن بە هەزاران چەکداری پیّ کیّ کیّ بچنە نیّوهەریّم. خوّئەگەر چەکدارەکانی پیّ کیّ کیّ بیّرازیبوونی ئەوانەی سەرەوە رووبکەنە هەریّم، ئەوا دەبیّتە شەریّکی هوّیەهوّ، ئەنجامەکەشی بەتەفروتونابوونی پیّ کیّ کیّ تەواودەبیّ و، لەوانەشە مالّوّچکەکەی کوردیش بکەویّتە بەرمەترسیی نەمان. خوّئەگەر چەکدارەکانی پیّ کیّ کیّ رووبکەنە دەولّەتیّکی دیکەی داگیرکەری کوردستان، بوّنموونە عیّراقی سەددام، ئەوا (مجاهدین خلق) یّکی دیکە دروستدەبیّ، کە ئەنجامەکەشی لەهەموو لایەك روّنە.

ئەز ماوەیەك لەمەوبەر بەنامە رووم لە بەریّزان مەسعوود بارزانی و مام جەلال تالّەبانی نا، کە پیّکەوە چارەسەریّکی کوردانەی ژیرانە بوّ کیّشەی پیّ کیّ کیّ بدوّزنەوە. پیّشنیازی من ئەوەبوو کە کومیتەیەك لە پارتی و یەکیّتی و حیزب و ریّکخراوەکانی دیکەی کوردستان دروست ببیّ بوّ وەرگرتنی ئەو چەکانەی کە بەدەست پیّ کیّ کیّ وەیە، بەمەرجیّ دوارِوّژ ببیّتە مالّی لەشکریّکی کوردستانی نەك مالّی ئەم حیزب و ئەو حیزب و ئەوجا ریّ بە ئەندامە سادەکانیان بدریّ کە لە هەریّمی ئاسایشدا وەك هاوولاّت بژین و سەرکردەکانیشیان لە ولاّتانی دوور لە دەولّەتە داگیرکەرەکانەوە پەنابەریّتی وەربگیریّ بوّیان، چوّنکە ژیانیان لە هەریّمی ئاسایشدا ناپاریّزدریّ.

**گوّڤاری «کوّنگرە» ژمارە ١٣ مانگی ١٩٩٩**

**«کوردستانی نویّ» ژمارە (١٩٣٥) ١٩٩٩/٨/٢٩**

## برای بەڕێز و خۆشەویست کاك مەسعوود بارزانی

سلاوێکی برایانەتان لێبێ وشادی و تەندروستی دەخوازم بۆتان.

ماوەیەك لەمەوبەر کاك دلشادم دی لە بەرلین، سلاووهەوالی ئێوەی گەیاند پێم. زۆرسوپاس. پێمخۆشە کە پەرتۆکی «المستعضعفون الکرد و اخوانهم المسلمون» تان بەدلە. راستییەکەی نێزیکەی سالونیوێك لەمەوبەر ئەو پەرتۆکەم ناردبوو بۆتان، وادیارە زۆر درەنگ گەیشتووەتە دەستان.

کاکە مەسعوودی بەڕێز: ئامانجی ئەم نامەیە ئەوەیە بیروڕای خۆمتان پێڕابگەیەنم لەبارەی کارکردی ئەو تەنگاوییەوە کە پێ کێ کێ تێی کەوتووە. لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە بێمە سەرباسی ئەوەی چۆن و بۆچی وایلێهات. تەنێ دەمەوێ بەکورتی بێژم ئەگەر ئێوە و یەکێتی، بەتایبەتی بەڕێزتان و مام جەلال، پێکەوە هەولی چارەسەرێکی ژیرانەی کوردانەی ئەم بارەنالەبارە نەدەن و، هەلوێستێکی وەکیەکتان نەبێ، ئەوا هەرەسهێنانی داروپەردووی پێ کێ کێ دەبێتە هۆی رووخانی خانۆچکەکەی کورد و ئامانجی داگیرکەرانی کوردستانیش هەر ئەوەیە کە بەتیرێك دوونیشان بشکێنن. داگیرکەرانی کوردستان پێیان وایە، کە پێ کێ کێ نەما، گۆڕەپانی تەراتێنیان سافولووستر دەبێ و، ئیدی بوونی کوردی دیکەش، نەك هەر پێویست نییە، بەلکو مەترسیداریشە بۆیان. ئەوان هەر دژی پێ کێ کێ نین، بەلکو دژی هەموو جۆرە کوردێکن (*).

دوزی پێ کێ کێ دوزی کوردە و دەبێ کورد خۆی چارەسەر بدۆزێتەوە بۆی. جا ئەگەر مەبەستی پێ کێ کێ بەڕاستی ئەوەیە واز لە شەڕی چەکداری بهێنێ، با چەکانیان بدەنە دەست کۆمیتەیەك کە لە پارتی و یەکێتی و حیزب و رێکخراوەکانی دیکەی کوردستان دامەزرابێ، بەمەرجێ ئەو چەکانە دوارۆژ ببنە مالی لەشکری بەرگریی کوردستان. ئێوەش رێ بە هەموو مرۆڤەسادەکانیان بدەن کە لە «هەرێمی ئاسایش» دا وەك هەموو ولاتییەکی دیکەی کوردستان بژین. سەرکردە و کاربەدەستەکانیشیان لە ولاتانی دیکەی دوور لە دەولەتە داگیرکەرەکان پەنابەرێتی وەربگیرێ بۆیان. چۆنکە مان و ژیانی ئەوانە لە «هەرێمی ئاسایش» دا بە ئێوە ناپارێزدرێ. بەلام ئەگەر راستە خەلکەکەیان خۆیان بگەیەننە دەولەتێکی داگیرکەری دیکەی کوردستان، ئەوا بەدلنیاییەوە دەکرێنە دەسکەلا و کوتەکی دەست لەدژی

بزووتنەوەی کوردایەتی و بەتایبەتی «هەرێمی ئاسایش» و ئەم دەوڵەتیش بەکاریان دەهێنێ لەدژی ئەو دەوڵەتە. ئەنجامەکەشی کۆرەوەرییە بۆ کورد. هەڵوێستی شای ئێران و زوڵمی شای ئێرانیش بەرامبەر بە شۆرشی ئەیلوول نابێ لەبیر بچێتەوە، کە کاریان بەکورد نەما، کورد لە شەووڕۆژێکدا بوونەوە بە دوژمنەکەی جاران.

هەرلەم نامەیەشدا تکایەکیشم هەیە، ئەوەش ئەوەیە کە خاوەن سەروەرێتی پاپا بانگێشت (دەعوەت) بکەن بۆ کوردستان. چۆنکە پاپا بەتەمایە بچێ بۆ سەردانی عێراق. پاپا دڵی بۆ کورد بەکوڵە و شایانی ڕێزوخۆشەویستییە و، کوردستانیش مەڵبەندێکی کۆنی ئاینی دیانی (مەسیحێتیی) بووە و تەنانەت حەزرەتی ئیبراهیم لە هاران (حران) ەوە چووە بۆ ڕۆژاوای کوردستان و هەتا ئێستەش نێوی «برایم خەلیل» هەروەك خۆی ماوە. بەبیروڕای براتان باشتر وایە ئەو بانگێشتنە لەلایەن بەڕێزتان و مام جەلالەوە ڕەوانەبکرێ.

هەربژین و بێوەی بن

سەرنج! وێنەیەکی نامەکە دەچێ بۆ برای بەڕێز مام جەلال تاڵەبانی، چۆنکە پێوەندیی بەویشەوە هەیە.

براتان جەمال نەبەز

١٩٩٩/٨/١٥

(*) - ئەم پەراوێزە لە ٢٠٠٢/٩/٥ دا نووسراوە، کاتێك کە ئەم لاپەڕانە بۆ چاپکردن ئامادەکران:

ڕۆژگار دەریانخست کە ئەم پێشبینییە ڕاست دەرچوو. پارتی و یەکێتی کە ماوەیەکی دوورودرێژ لە گەڵ حکوومەتی ترك هاوکارییان دەکرد، ئەوەتا ئێستە ڕژێمی ترك هەڕەشە لە هەردووکیان دەکا و بە توندی دژی ئەوە وەستاوە کە باشووری کوردستان ببێتە کۆمارێکی فیدەراڵی و، لە هەموو سەیرتر ئەوەیە کە داوای «ئۆتۆنۆمی» دەکا بۆ تورکمانەکان لە کەرکووك و مووسڵدا ■

## بۆ بەڕێوەبەرانی ڕۆژنامەی «کوردستانی نوێ» لە سلێمانی
## بابەت: دەستکاریی ڕێپێنەدراوی دەقی وتووێژی تەلەڤیزیۆنی و شێواندنی بەرهەمی بیری خەڵك لە ڕاگەیاندندا

تەلەڤزیۆنی «کوردسات» لەڕۆژی ٢٠٠٠/١٠/٥ دا وتووێژێکی لەبارەی شەڕی نێوان پی کی کی و ی. ن. كەوە لە گەڵ من سازکرد. مەرجی من بۆ ئەنجامدانی ئەو وتووێژە ئەوە بوو هەرچییەك دەبێژم بێ دەستتێوەردان و وەك خۆی پێشکێش بکرێ بە بینەرانی **«کوردسات»**. کاربەدەستانی «کوردسات» کە لە ئێوارێی ١٠/٦ دا وتووێژەکەیان بلاوکردەوە، بەڵێنی خۆیان بەجێهێنا. بەلاّم ڕۆژنامەی «کوردستانی نوێ» لەڕۆژانی ١٠ و ١١ی مانگی ئۆکتۆبەردا بێ پرسوڕای من و، بە دەستکاریکراوی و تێکوپێکدراوی و پڕ لە هەڵەی چاپی و زمانی بلاّویکردبووەوە، بەجۆرێکی وا کە لە هێندێك شوێندا خوێنەرەوە تێناگا مەبەستەکە چییە و، لە هێندێ شوێنیشدا مەبەستەکەی منیان بە تەواوی پێچەوانە خستووەتەڕوو. هەر بۆ نموونە: «..... **کەندالٚ نەزان** چووبوو بە حکوومەتی فەرەنسای گوتبوو، ئەمە کۆنگرەی پی کی کی نییە ... هتد». ڕاستییەکەی ئەوەیە کە کەندالٚ نەزان چووبوو بە حکوومەتی فەرەنسای گوتبوو، ئەوە کۆنگرەی پی کی کی یە، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە حکوومەتی فەرەنسا ئەو ساڵۆنەی دابووی بە کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان وەریگرتەوە. ئەوجا بزانن جیاوازیی قسەکان چەند دوورن لە یەك. ئەم مشتەش لێرەدا نموونەی خەروارێکە، ئەمەش بێجگە لەوەیکە سەرنێوی وتووێژەکە خۆی لەخۆیدا دەستێوەردانی وتووێژەکە و بە هەڵەبردنی خوێنەرەوەیە، چۆنکە نووسراوە: «سەبارەت بە دەستدرێژییەکانی پی کی کی جەمال نەبەز بۆ تەلەڤزیۆنی ئاسمانیی کورد سات دەدوێت». ڕاستییەکەی ئەوەیە من بە هیچ جۆرێك باسی دەستدرێژیی کەسم نەکردووە و، ئەوی گوێی لە قسەکانم بووبێ دەزانێ کە قسەکانم هەموو لەسەر ڕێبازی ئاشتی و ئاشتبوونەوە و چاوپۆشیی لە خراپەی یەکدی و پێکەوە ژیانی نەتەوەییی بوو.

ئەم هەڵوێستەی **«کوردستانی نوێ»** ناپاکییە لە کاروپیشەی ڕۆژنامەگەریی و، یەککگرتنێکی تەنگەبەرانەیە لەسەر درێژەدان بە دوژمنایەتی و خراپەکاری بەرامبەر

بە من.

کاربەدەستانی «کوردستانی نوێ» زۆرباش لەبیریانە کە ئەز لە ١٩٩٩/٨/١٥ دا نامەیەکم نارد بۆ برای بەڕێزم مەسعوود بارزانی و «کوردستانی نوێ» خۆشی لەڕۆژی ١٩٩٩/٨/٢٩ دا وتارێکی منی بلاوکردەوە لەژێرنێوی «پیێ کیێ کیێ بەرەو کوێ!؟». لە نامەکەدا بۆ کاك مەسعوود نووسیبووم:

«لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە بێمە سەرباسی ئەوەی چۆن و بۆچی (پیێ کیێ کیێ) وای بەسەرهات، تەنێ دەمەوێ بەکورتی بێژم ئەگەر ئێوە و یەکێتی، بەتایبەتی بەڕێزتان و مام جلال، پێکەوە هەوڵی چارەسەرێکی ژیرانەی کوردانەی ئەم بارەنالەبارە نەدەن و، هەلوێستێکی وەکیەکتان نەبێ، ئەوا هەرەسهێنانی داروپەردووی پیێ کیێ کیێ دەبێتە هۆی رووخانی خانۆچکەکەی کورد و ئامانجی داگیرکەرانی کوردستانیش هەر ئەوەیە کە بە تیرێك دوو نیشان بشکێنن. داگیرکەرانی کوردستان پێیان وایە کە پیێ کیێ کیێ نەما، گۆرەپانی تەراتێنیان ساف و لووستر دەبێ و، ئیدی بوونی کوردی دیکەش، نەك هەر پێویست نییە، بەلکو مەترسیداریشە بۆیان. ئەوان هەر دژی پیێ کیێ کیێ نین بەلکو دژی هەموو کوردێکن».

لەبارەی چارەسەرکردنی کێشەکەوە نووسیبووم:

«دۆزی پیێ کیێ کیێ دۆزی کوردە و دەبێ کورد خۆی چارەسەر بدۆزێتەوە بۆی. جا ئەگەر مەبەستی پیێ کیێ کیێ بەڕاستی ئەوەیە واز لە شەڕی چەکداری بهێنێ، با چەکەکانیان بدەنە دەست کۆمیتەیەك کە لە پارتی و یەکێتی و حیزب و رێکخراوکانی کوردستان پێکهاتبێ، بە مەرجێ ئەو چەکانە دوارۆژ ببنە مالی لەشکری بەرگریی کوردستان. ئێوەش رێ بە هەموو مرۆڤە سادەکانیان بدەن کە لە «هەرێمی ئاسایش» دا وەك هەموو ولاتییەکی دیکەی کوردستان بژین. سەرکردە و کاربەدەستەکانیشیان لە ولاتانی دیکەی دوور لە دەولەتە داگیرکەرەکان پەنابەرێتی وەربگیرێ بۆیان. چونکە مال و ژیانی ئەوانە لە «هەرێمی ئاسایش» دا بە ئێوە ناپارێزرێ. بەلام ئەگەر راستەخەلکەکەیان خۆیان بگەیەننە دەولەتێکی داگیرکەری دیکەی کوردستان، ئەوا بەدلنیاییەوە دەکرێنە دەسکەلاوکوتەکی دەست لەدژی بزووتنەوەی کوردایەتی و، بەتایبەتی «هەرێمی ئاسایش» و ئەم دەولەتیش بەکاریان دەهێنێ لەدژی ئەو

دەوڵەت. ئەنجامی ئەمەش کوڕەوەرییە بۆ کورد ... هتد».

دیارە ئەم نامەیە و وتارەکەشم «پی کی کی بەرەو کوێ؟» کاتێك نووسیم کە سەرکردەی پی کی کی بەڕێز ئۆجەلان گیرابوو و، بڕیاری وازهێنانی دابوو لە خەباتی چەکداری و، فەرمانی دابوو بە چەکدارەکانی کە لە سنووری دەوڵەتی ترك بکشێنە دەرەوە و بە ئاشتی بۆ دامەزراندنی «کۆماری دیمۆکراتی ترك» هەوڵبدەن. من، بە پێشبینیکردنی ئەو مەترسییانەی کە لەو گۆڕانکارییانەوە دەیانتوانی روو بدەن و زیان بە کێشەی رامیاری کورد بگەیەنن، لە وتارەکەمدا نووسیبووم:

«ئەوەی ئەورۆ هۆی پەژارە و دڵەڕاوکە و جێی پرسیارە ئەوەیە کە چەند رۆژێکی دیکە کاتێك چەکدارەکانی پی کی کی بە فەرمانی ئاپۆ سنووری دەوڵەتی ترك بەجێدەهێڵن، ئایە دەچن بۆکوێ؟ دیارە یان دەبێ بچن بۆ دەوڵەتێکی دراوسێی دەوڵەتی ترك، یان روویکەنە نێوچەی «هەرێمی ئاسایش» لە باشووری کوردستان، چۆنکە رێیەکی دیکەیان نییە. جارێ «هەرێمی ئاسایش» دەوڵەتێکی سەربەخۆ نییە و، لە لایەن سوپای ئەمریکا و بەریتانیاوە دەپارێزرێ. ئەمریکاو بەریتانیا لەرێی پەیمانی ناتۆوە، هەڤاڵبەندی دەوڵەتی ترکن و پشتگیریی لە دەوڵەتی ترك دەکەن. کەواتە رازیبوونی دەوڵەتانی ترك و ئەمریکا و بەریتانیا پێویستە، کە ئەمەش کارێکی هەروا هاسان نییە. ئەوجا پارتی و یەکێتی کە دەسەڵاتدارانی «هەرێمی ئاسایش» ن دەبێ رازیبن بەوەی چەکدارەکانی پی کی کی روویکەنە هەرێم. ئاشکرایە کە پارتی و یەکێتی نەڕازی دەبن و، نەدەشتوانن رێبدەن بە هەزاران چەکداری پی کی کی بچنە نێوهەرێم. خۆئەگەر چەکدارەکانی پی کی کی بێڕازیبوونی ئەوانەی سەرەوە روویکەنە هەرێم، ئەوا دەبێ بەشەڕێکی هۆیەهۆ، ئەنجامەکەشی بەتەفروتونابوونی پی کی کی تەواو دەبێ و، لەوانەشە ماڵۆچکەکەی کوردیش بکەوێتە بەرمەترسیی نەمان. خۆ ئەگەر چەکدارەکانی پی کی کی روویکەنە دەوڵەتێکی دیکەی داگیرکەری کوردستان، بۆنموونە عێراقی سەددام، ئەوا (مجاهدین خلق) ێکی دیکە دروست دەبێ، کە ئەنجامەکەشی لەهەموولایەك روونە». (کوردستانی نوێ ژ ۱۹۳۵، یەکشەممە ۱۹۹۹/۸/۲۹، ل ۷).

ئاشکرایە رۆژگار دەریخست کە ئەم پێشبینییانە راستبوون و، رێی چارەسەریش هەرئەو رێیەیە کە بەوپەڕی ویژدانی لەفرۆشتن نەهاتوو و هوردبینییەوە

پێشانمدابوو، بەلاّم رۆژنامەکەی پێ کێ کێ «ولاّت» کە لە سلێمانی دەردەچوو، لەباتی سوپاس و دەستخۆشانەکردن لێم، کەوتە جنێوپێدانم و، قسەکانی منی بە «دەربڕینی خەون و خەیاڵی خواستەکانی خیانەتکاران و داگیرکەرانی کوردستان» دانابوو. («ولاّت» ژ ٣٦٣، ١٩٩٩/٩/٦). داروودەستەی «زەحمەتکێشان» یش وەك مەنجەڵی لە شۆرباوگەرمتر و لە پێ کێ کێ، پێ کێ کێیتر کەوتنە پەلامار. سەیر ئەوەیە، لەلایەکەوە بەنامە تکایان لەمنکرد کە بەبۆنەی ساڵیادی دامەزراندنیانەوە پیرۆزبایی بکەم لێیان، منیش نامەیەکم نووسی بۆیان کەبەزۆری شتی گشتی بوو. لەلایەکی دیکەوە، هەرلەو ژمارەیەی رۆژنامەکەیاندا کە ئەو نامەیان بلاّوکردبووەوە، گەلێك جنێویان دابووپێم لەژێرنێوی «جەماڵ نەبەز خەون دەبینێ و واقیع نابینێ، نووسینی: لوقمان حەسەن»، بەڕاستی پێکەنینم هات پێیان. وادیارە هێندە زەحمەتیان نەکێشابوو، رۆژنامەکەی خۆیان تەماشابکەن. رەوشتوخووشیان هێندە بەرزە، ئەوەتە ئەورۆ دەچنە سەر تەلەفزیۆن و پاکانە بۆ خۆیان دەکەن و، قسە بە پێ کێ کێ دەڵێن.

ئەمەیان وا. «کوردستانی نوێ» ش هەردەستبەجێ، وەك ئەوەی هەنگی لە هێلاندا دۆزبێتەوە، یان خودێی مەزن قەپاڵێکی چەوری ناردبێ بۆی، کەوتە چالاکی. لەپێشدا بە خەتێکی درشت بلاّویکردەوە «وتارەکەی جەماڵ نەبەز فەرتەنە دەنێتەوە». واتە هەوڵەکەی منی بۆ پاراستنی ئاشتیی نەتەوەیی، دوورخستنەوەی شەڕ لە باشـــوور کـــە بەرژەوەندیی «ی. ن. ك.» یش بوو، بە «فـــەرتەنەنانەوە» دەستنیشانکردبوو و، لە خۆشییاندا هەر پێشەکیی خوێنەرەوەکانی خۆی ئاگادارکردبوو لەوەی کە «گەلێك کەس هەن خۆیان ئامادەکردووە بۆ وەرامدانەوەی قسەکانی جەماڵ نەبەز». ئەمەش ئەوە دەردەخا کە دەستی راستەوخۆی کاربەدەستانی «کوردستانی نوێ»، نەك هەر لەمەدا هەبوو، کە تاقمێك چەقاڵوبەقاڵی سیاسەت لەسەر لاپەڕەکانی «کوردستانی نوێ» ریزێك قسەی ساردوسووکی دیکە بەمن بڵێن، بەڵکو دژی بیری نەتەوەیی و بەتایبەتی رێبازی کاژێك قسەی هەلومەلەق بلاّوبکەنەوە، کە ئەمانە هیچ پێوەندییەکیان بە باسەکەی منەوە نەبوو. (بڕوانە تەماشای «ك. ن.» ژمارەی رۆژی ١٩٩٩/٩/٥ بکە کە بەنێوی یۆسف محەممەدەوە بلاّویکردووەتەوە)، بۆئەوەی دڵی رەشی بەرپرسیارانی

«ی.ن.ك. » ئاو بخواتەوە و، بەنیازی ئەوەشکە دوژمنایەتی بخەنە نێوان من و هێندێك لە سەرکردەکانی ی.ن.ك. ەوە کە سالآنی ساڵە دۆستایەتی هاوڕێیەتی هەیە لە نێوانماندا، تا ئەوانیش لەو گۆمەڵێڵەدا مەلەبکەن. بەڵام بەو ئامانجە نەگەیشتن.

ئەوجا «ك. ن. » هەریەمەوە نەوەستا، بەڵکو پتر کەوتە قۆچەقانی هاویشتن و ئەمجارە بەنێوی وتووێژەوە، یەکێك لە هاوکارە داخلەدڵەکانی کە نێوی «سالار یاسین» ە ناردەلای کاك سەروەت عەلی (کوردۆ) کۆنەنوێنەری پاسۆك لە ئەوروپا و سکرتێری گشتیی کۆمەڵەی خوێندکارانی سۆسیالیت (سۆکسە) کە تەنێ لەبەر هێندێك هۆی کەسیی (شەخصی) و تایبەتی لە ئەورووپاوە گەڕاوەتەوە کوردستان، کە ئەوەش باسێکە بۆخۆی. سالار یاسین بەوێنەی ڕۆژنامەنووسە بەعسییەکان، بەقسەخستنەدەمی کاك کوردۆ عەلی و، بەرتیلی پەسندان (مدح) و تەنانەت گۆڕینی نێوەکەشی لە «سەروەت» ەوە بۆ «سەروەر»، بێبۆنە (مناسبة) باسی من دێنێتە پێشەوە و بیروڕای کاك کوردۆ عەلی بەرامبەر وتارەکەی من «پێ کێ کێ بەرەو کوێ؟» دەپرسێ لێی و پێشەکی دەبێژێ: ئەو وتارە «لە گەڵ هەڵوێستی رابوردووی جەمال نەبەز یەکناگرنەوە کە خۆی بە کەسایەتییەکی قەومی دەزانێ» (ئاوا!) (ك.ن. ژ ١٩٧٢، ١٢/١٠/١٩٩٩). کاك سەروەت عەلی (کوردۆ) ی بێچارە، ناچاردەبێ کەساسانە بکەوێتە «بەرائەت» دان و گەلێك جنێو بەڕابوردووی خۆی بدا و خۆی بە «عەقلْ تەسك» بداتە قەڵەم، واتە بەزاراوەی ماموستا بەشیرموشیر «ناقص العقل» بزانێ. دیارە دەبێ ئێستە بووبێتە «زائدالعقل» پاش ئەوەی پرژی تەکاندنی رابوردووی خۆی بەرمنیش کەوتووە، بەپێی دەستووری «اتق شرّ من احسنت الیه» و دڵی کاربەدەستانی «ك.ن. » ی خۆشکردووە بەوەی فەرموویەتی: «ئێستەش (پێ کێ کێ) ئیسپاتیان کردووە کە زۆر کارامە و لێهاتوونە، بەوەی تا ئێستە گوێڕایەڵی سەرکردەکەیانن کە لە زینداندایە» (ك.ن.ژ ١٩٧٢، ١٢/١٠/١٩٩٩). وادیارە ئەوی بێچەندوچۆن گوێڕایەڵی سەرکردەکەی بێ «کارامە و لێهاتووە». ئافەرین لەم «زائدالعقلی» یە!.

کاربەدەستانی «ك.ن. » دەیانویست ئەم هەموو جنێووڕینانە بە «بیری ئازاد» و «دێموکراسی» بفرۆشن. بەڵام میزڵدانی «بیری ئازاد» و «دێموکراسی» ی «ك. ن. » هەرزوو فش بووەوە، کاتێك هاوبیری بەڕێز هەندازیار بروسکە ئیبراهیم

کە یەکێکە لە دامەزرێنەرانی «سۆکسە» و کاک سەروەت عەلی (کوردۆ) زۆر باشدەناسێ، نامەیەکی نارد بۆ «ك. ن.» و ڕاستینەی ئەو دەربڕینانەی کاك سەروەتی ڕۆنکردەوە، بەلأم کاربەدەستانی «ك. ن.» ی لە دێمۆکراسیدا «کولأو» نامەکەی کاك بروسکەیان بلأونەکردەوە، ئەگەرچی چەند دۆستێکی بەڕێز کە لە «ی. ن. ك.» دا بەرپرسیارن، ڕەئیان وابوو کە ئەو نامەیە دەبێ بلأوبکرێتەوە. وادیارە بەرپرسیارانی «زائدالعقل» ی «ك. ن.» ئەوەیان لە خەیاڵدا نەبوو کە **«ڕۆژان ڕۆژیان لەدوودایە»**.

**جەمال نەبەز**

**بەرلین: ٣١/١٠/٢٠٠٠**

# کوردستان «کوردستان» ی کردە راستی

لە نێوان بنەماڵەی ئێمە و بنەماڵەی **بەهەشتی مامۆستا گیوی موکریانیدا** دۆستایەتی و خۆشەویستی و یەکماڵییەك هەیە کە لە نیوەی سەتەی رابردووەوە دەستیپێکردووە، لە بەر ئەوە دەتوانم بێژم کەم کەس هەن هێندەی من شارەزای بەسەرهات و رەنج و تێکۆشینی بێوچانی ئەم بنەماڵە نیشتمانپەروەر و زەحمەتکێشە بێ.

**مامۆستا گیو** و برای گەورەی، واتە مێژووناس و رۆژنامەوان و هونەروەری کورد، **داماوی موکریانی**، دوو ئەستێرەی گەشن بە ئاسمانی رۆشنبیریی نەتەوەییی کوردەوە کە بە درێژاییی سەتساڵی رابوردوو رێی تاریکونۆتەکی کاروانی کوردایەتییان رۆناك کردووەتەوە و، لەو پێناوەدا برسێتی و دەربەدەری و گرتن و ئازار و گەر و گێچەڵی دوژمنانی نەتەوەی کوردیان سەربەرزانە و یەکرەنگانە گرتووەتە خۆ.

دامەزراندنی **یەکەمین چاپخانەی کوردی لە ١٩١٤ دا لە شاری حەلەب،** بەرهەمێکی خەباتی ئەم بنەماڵەیە بوو. زیندووکردنەوەی مێژووی کورد و کۆکردنەوەی ژیاننامە و وێنە و بەرهەمی بوێژان و نووسەرانی کورد و، دەرهێنانی پتر لە دە رۆژنامە و گۆڤاری کوردی، بەتایبەتی **زاری کرمانجی و رۆناکی و هەتاو،** بەرهەمێکی دیکەی خەباتی ئەم بنەماڵەیە بوو. بەڵام **مامۆستا گیو** بە زۆری بەو فەرهەنگانەوە دەناسرێ کە هەر یەکەیان گەنجینەیەکی بەنرخە بۆ پاراستنی وشەی کوردی. ئەوجا فەرهەنگی کوردستان جێیەکی تایبەتی هەیە لەو گەنجینەیەدا.

کە لە ساڵی ١٩٦٠ دا بوومە مامۆستای قوتابخانەی دوانێوەندیی **هەولێر،** چەند مانگێك لەسەر یەك، هەر هەفتەی شەوێك لە ماڵی یەکێکمان، **لە گەڵ مامۆستا گیو و مامۆستا حسەین رشوانی** کۆ دەبووینەوە بۆ پێداچوونەوەی **فەرهەنگی مەهاباد** کە لە ساڵی ١٩٦١ دا لە **چاپخانەی کوردستان** لە هەولێر چاپکرا. ئەوەی راستی بێ! من پاش ماوەیەك بە هۆی سەرگەرمیمەوە بە چالاکیی رامیارییەوە پێمنەکرا چیدی بەشداریی ئەو کۆبوونەوانە بکەم. هەر چەندە **مامۆستا گیو** لە پێشەکیی **فەرهەنگی مەهاباد** دا بە شێوەیەکی نازك ناخۆشیی خۆی بەرامبەر بە

دوورکەوتنەوەم لەو کارە دەربڕیوە، بەڵام بەهیچ جۆرێك دڵی نەیەشا لێم.

لەو ماوەیەدا کە لە هەولێر بووم، چەند جارێك **فەرهەنگی کوردستانم** لە ماڵی مامۆستا گیو چاوپێکەوت و سەرنجمی زۆر راکێشا. **فەرهەنگی کوردستان** هەزاران و هەزاران وشەی کوردی گرتبووە خۆی کە ماناکانیان زۆر بە هوردی لێکدرابوونەوە و، نێوچەی بەکارهێنانیشیان دەستنیشان کرابوون، بەڵام فەرهەنگەکە پەڕە پەڕە و کۆنە کراوەبوو. هەموو جارێك کە لە مامۆستا گیوم دەپرسی: **"کەینێ سەرە دێتە سەر چاپکردنی فەرهەنگی کوردستان!"** **مامۆستا گیو** هەناسەیەکی ساردی هەڵدەکێشا و کەمێك دەوەستا و ئەوجا دەیفەرموو: **«زۆر حەز دەکەم بە چاوی خۆم بیبینم، بەڵام باوەڕ ناکەم، چونکە یەکجار دژوارە. بەم چاپخانە شڕەی من ئەم کارە ناکرێ. هیچ لایەنێکی دەسەڵاتداریش نییە دەستی یارمەتی درێژ بکا بۆم».**

مامۆستا گیو راستیدەگوت، ئەو سەردەمە سەردەمێك بوو، زمانی کوردی وەك ئەوڕۆ نەبوو بوو بە زمانی نانپەیداکردن. ئەوی خزمەتی زمانی کوردی بکردایە، ئەگەر نانیشی ببوایە، سەرەڕای ئەوەی لە لایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە نانی دەبڕا و تووشی گرتن و دەربەدەری و ماڵوێرانی دەبوو، زۆر لەوانەش کە خۆیان بە رۆشنبیر و پێشکەوتنخواز دەزانی گاڵتەیاندەکرد پێی و دەیانگوت: **«بابە ئەمریکا رایسپاردووە ئەوە بکا.»** وەك ئەمریکا هیچ کاروبارێکی نەبێ و بچێ لە بێتاقەتی خۆی، خەریکی خزمەتی زمانی کوردی بێ.

**ئەوڕۆ رۆژگارێکە کە گەلێك لایەن زمان و فەرهەنگی کۆمەڵگەی کوردەوارییان کردووە بە دەستاوێژێك بۆ خۆژیاندن و نانپەیدا کردن، بە تایبەتی لە دەرەوەی کوردستان.** هی وا هەیە ئەورووپاییە، دەچێ سەفەرێك دەکا بۆ کوردستان و، یەك دوو حەفتە لەوێ دەمێنێتەوە و شارێك و چەند گوندێك دەبینێ و، قسە لە گەڵ چوار پێنج کەس دەکا و، کە دەگەڕێتەوە ئەورووپا نێوی خۆی دەنێ **"کوردستان ناس"** ئەکادێمیایی واش هەن کە نازانن دوو دێڕ بە کوردییەکی راست و دروست بنووسن، کەچی بەخۆیان دەڵێن: **"کوردۆلۆگ" (کوردەوان).** بەڵام کە رۆژنامەیەکی ئەورووپایی باسی زمانی کوردی دەپرسێ لێیان، لە بەر نەزانین و بۆ خۆلادان لە باسەکە، فەرمایشتەکەی بە **"تەرسەقوڵ"** پێ دەبڕن و دەبێژن: **بۆچی کوردی زمانە؟** ئەم قسەیەش دەقی ئەو وەرامەیە کە **مارتین فان برێنسن** ی هۆلەندی لە وەرام

پرسیارێکی رۆژنامەی ئەڵمانی **"تاگەس تسایتۆنگ"** ی بەرلیندا دابوویەوە کە لێپرسی بوو " **تۆ وەك کوردۆلۆگ لە بارەی باری زمانی کوردییەوە چ دەبێژیت؟**" بەرزترین بەرهەمی ئەم کوردۆلۆگ" ەش ئەو کتێبەیە کە نێوی ناوە **"شێخ و ئاغا و دەوڵەت"** وەك ئەوەی کێشەی کورد و کۆمەڵگەی کورد هەمووی کێشەی شێخ و ئاغا بێ. سەیریش ئەوەیە ئەم **"کوردۆلۆگ" ی ئاخرە زەمانە** بە سایی کوردی "رۆشنبیری"ی هاوشانی خۆیەوە لە هەموو کۆڕ و سەمینارێکدا بەشدارە. جا ئەوەش وەنەبێ بەخۆڕایی بێ، چۆنکە کوردی لەو بابەتەش هەن کە دوای ئەوەی ساڵانی ساڵ لە کوردستان خەریکی مارکس و لینین و ماو و ستالین بازی، و سلاّوواتدان لە دیاری یەکێتیی سۆڤێت و جنێودان بە جیهانی سەرمایەداری بوون، پاش هەرەسهێنانی شۆرشی ئەیلوول رایانکردە ئەوروپای سەرمایەداری و، زمان و فەرهەنگی کۆمەڵگەی کوردەوارییان کردە دەسکەلایەکی دەست بۆ بازرگانی کردن و بە ملوێن پارەیان لە دەوڵەتەکانی ئەوروپا کێشایەوە، بە تایبەتی لە **سوێد و فەرەنسا و ئەڵمانیا و بەریتانیا** و ئەوەش بە نێوی خزمەتی کولتووری کوردەوە.

با بگەڕێنەوە سەر باسەکەمان!

ساڵ بوو بە ساڵی ۱۹۷۷، هەموو دوو ساڵێك نەبوو کە **شۆرشی ئەیلوول** هەرەسی هێنا بوو. بەڵام **دەزگەی تاوانباری بەعس** هێشتا نەیتوانیبوو، یان جارێ نەیویستبوو، هەموو رێکخراوە کوردییەکان لە بنهەڵکێشێ، لەوانە **"کۆڕی زانیاری کورد"** کە بوو بوو بە بەشێك لە **"کۆڕی زانیاری عێراق"**، وەك نێو هەر مابوو. شایانی باسە ئەوەیە ئەم کۆڕە گەلێك کەسی جۆراوجۆری لە باش و لە خەراپی تێکەوتبوو. بۆ نموونە، ئەوی سوێندی بە سەری رژێمی سۆڤێت دەخوارد ، لە گەڵ ئەوەی کە رژێمی سۆڤێتی بە دیکتاتۆر و ملهوڕ دەدایە قەڵەم! لە نێو ئەم کۆڕە دا بەرژەوەندیی تایبەتی! یەکیخستبوون. ئێستەش کە ئێستەیە زۆربەی زۆری ئەوانە هەروان لە **بەغدا** و لە پاڵ رژێمی بەعسدان، ئەوەش کە جێی پرسیارێکی بەجێیە ئەوەیە! **مامۆستا مەسعوود محەممەد**ێك کە کاتی خۆی رازی بوو سەرکردەیەتیی کۆڕێك بکا کە لکێك بوو لە کۆڕی زانیاری عێراق و لە ژێرچاودێریی راستەوخۆی بەعسدا بوو، بۆچی ساڵی پار رازی نەبوو سەرکردەیەتیی کۆڕێکی زانیاری کورد بکا لە **هەولێر** کە هیچ نەبێ لە ژێر چاودێریی دەسەڵاتێکی کوردیدایە. وەك

بیستوومە دەڵێن داوای پایەی لە وەزیر گەورەتری کردووە بۆ ئەوەی رازی بێ بە سەرکردەیەتیی کۆڕ، ئەوانیش نەیاندابوو پێی.

مامۆستا گیوی بە ڕاستی داماو، پەنای بردبووە بەر "کۆڕی زانیاری کورد" لە بەغدا کە **فەرهەنگی کوردستان و فەرهەنگی نۆبەرە** چاپیکەن بۆی. کەچی لێژنەی فەرهەنگ دوو ساڵی ڕەبەق تەفرەیان دا و بەنێوی ئەوەوە کە بەو فەرهەنگانەدا دەچنەوە، نانیان پەیدا کرد پێی و فەرهەنگەکانیش کەوتنە بەردەست گەلێك کەس و لە بەریشیان گرتەوە و، دیارە کەڵکی تایبەتیشیان وەرگرتووە لێی بۆ ئەو فەرهەنگانەی لەو کاتەوە دەرچوون. لە ئەنجامیشدا فەرهەنگەکانیان چاپنەکرد بۆ مامۆستا گیو و خەفەتێکی زۆریان کردە دڵی. بەکورتی چارەنووسی فەرهەنگەکانی مامۆستا گیو وەك چارەنووسی گۆڤاری **«زیارە»** و دەستنووسەکانی **حەمە بۆری** لێهات کە لە بارەی **مستەفا بەگی** کوردییەوە نووسیبوونی. مامۆستا گیو لە نامەیەکدا کە ماوەیەکی کورت پێش کۆچیدوایی نووسیوێتی بۆم و پێموایە ئەو نامەیە دووا نامەیەکە لە ژیانیدا نووسیبێتی، باسێکی ئەو کەساسییەی خۆی دەگێڕێتەوە. خوێندنەوەی چیرۆکی ئەم دڵشکاوی و هەستبریندارییەی **مامۆستا گیو** و دەستیدەستیپێکردن و تەفرەدانی لە لایەن **"کۆڕ"ەوە منی ناچار کرد ئەم راستییە لە ژمارە (٢٢) ی ساڵی ١٩٧٨ ی گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیاتی زانستگەی بەغدا"** دا بخەمەڕوو. بەڵام هەر زوو دەستوپێوەند و نانخۆرەکانی **"کۆڕ"** بەوپەڕی بێشەرمییەوە لە پێتەختی بەعسییەکانەوە کەوتنە جنێودان پێم. با هەر خۆیان بە خۆیان بن کە ئێستەش وان لە پاڵ بەعسدا.

ئەرێ. **مامۆستا گیو** کۆچیدوایی کرد و، ئەو ئاواتەی بردە ژێر گڵ. بەڵام مامۆستا گیو زۆرجار دەیگوت **"کوردەی کچم جێمدەگرێتەوە و ڕێنادا ئەو مۆمەی ئەم بنەماڵەیە هەڵیکردووە بکوژێتەوە"**.ڕاستییەکەشی هەروا دەرچوو. **دوکتۆر کوردستان** لە سەر ڕێ و شوێنی باوك و مامی خۆی چوو بەرێوە و بوو بە زانایەکی کوردناس و توانی سەرەڕای هەموو گەڕ و گێچەڵپێکردنێکی بەعس و دەسکەلاکانی لە کوردستان و هەموو مەترسییەکی ڕۆژانی **"ئەنفال" و کوردقڕان، فەرهەنگی کوردستان** بپارێزێ لە نەمان و، پاش ئەوەی دەسەڵاتی کورد لە نێوچەیەکی گچکەی باشووری کوردستاندا دامەزرا، کاربەدەستانی کورد بە تایبەتی **بەڕێز نێچیرڤان**

**بارزانی** سەرۆکوەزیرانی بەڕێوەبەرێتیی هەرێم کە چالاکییەکی بەرچاو و بەرفراوان دەنوێنێ بۆ ژیاندنەوەی کەلەپوری کورد، بەرازیبوونی **دوکتۆر کوردستان** موکریانی، بڕیاری چاپکردنی فەرهەنگی کوردستانی دا. **دوکتۆر کوردستان** بۆ سەرپەرشتیکردنی چاپی فەرهەنگەکە چەند مانگێك گەڕایەوە هەولێر و لە ڕێ ئەو ئوتۆمۆبیلەی بە کرێیگرتبوو هەڵگەڕایەوە و **دوکتۆر کوردستان** برینداربوو و، ماوەیەکیش لە ماڵەوە کەوت، لە گەڵ ئەوەشدا بە ورەیەکی بەرزەوە و بە هاوکاری **بەڕێز بەدران ئەحمەد حەبیب سەرنووسەری دەزگەی چاپ و بڵاو کردنەوەی «ئاراس»** و چەند بەڕێزێکی دیکە کە **دوکتۆر کوردستان** لە پێشەکی فەرهەنگەکەدا بە سوپاسەوە نێوی بردوون، پاش ئەرك و زەحمەتێکی یەکجار زۆر، فەرهەنگی کوردستان بەو چاپە جوانە و بەو شێوە دلگیرە کەوتە بەردەست خەڵك. بە کورتی دوکتۆر کوردستان بە پاراستنی **فەرهەنگی کوردستان** لەنێوچوون و بە هاوکاریکردنی لە گەڵ هەموو ئەو دلسۆزانەی کە لە چاپکردنی فەرهەنگەکەدا ڕەنجیانکێشا، **فەرهەنگی کوردستانی کردە ڕاستییەکی بەرچاو.**

**بێگومان فەرهەنگی کوردستان فراوانترین و زانستانەترین فەرهەنگی کوردی ـ کوردییە کە تا ئێستا دەرچووبێ.** لە گەڵ ئەوەشدا فەرهەنگەکە لە کەموکورتی و ناتەواوی ئاوارتە نییە. بۆیە پێویستی سەرشانی هەموو کوردیزانێك ئەوەیە زۆر بە هوردی فەرهەنگەکە بخوێنێتەوە و هەڵەکانی دەستنیشانبکا و ئەگەر وشەیەکی بەبیردا دێ کە لەو فەرهەنگەدا نەبێ، لای خۆی بینووسێ و ئەنجامی کارەکەی بنێرێ بۆ **دوکتۆر کوردستان** بۆ ئەوەی لە چاپی دووەمدا ئەو سەرنج و تێبینی و وشانە بگیرێنە بەرچاو لە گەڵ سوپاسی خاوەنەکانیان.

گۆڤاری «کۆنگرە» ژمارە ١٧

خەرمانانی ٢٠٠٠ی زاینی

# سەرنجدانێك لە هەڤپەیڤینی «میدیا» لە گەڵ پرۆفیسۆر شاکرێ خدۆدا

هاتنی شاکرێ خدۆ و هاوکارەکانی لە مۆسکۆوە بۆ هەولێر بوو بە هۆی هێنانەوەبیری گەلێك بەسەرهاتی هەناوتەکێنی کوردەکانی ئیمپراتۆرێتیی رووخاوی سۆڤێت و، هەروەها کولاندنەوەی برینی سارێژنەبووی گەلکوژیی رژێمی سۆڤێت لە کوردی بندەستی خۆی و، خراپەکاریی ئەو رژێمە لە گەڵ کوردی دەرەوەی سۆڤێت بە درێژاییی مێژووی رەشی خۆی. هێندێك لەو بەسەرهاتانە لەو وتووێژەدا کەوتنە روو کە **«تەلەفزیۆنی کوردستان»** لە هەولێر لە ئێوارەی رۆژی ٨/١١/ ٢٠٠٠ دا سازی کرد بۆیان، کە ئەزژی یەکێك بووم لە بەشدارانی ئەو وتووێژە.

هەڤپەیڤینی **«میدیا»**ش لە گەڵ شاکرێ خدۆ، رۆناکییەکی دیکەی خستە سەر ئەو باسە.

بەکورتی، قسەکانی شاکرێ خدۆ و هاوکارەکانی بەرەو ئەوە دەچوون کە گوایە رەوشی کورد لە کۆمارەکانی ئیمپراتۆرێتیی سۆڤێتدا گەلێك لایەنی باشەی هەبووە، کە گەلێك پەرتۆك بەزمانی کوردی، یان لە بارەی کوردەوە، بەتایبەتی بەزمانی رووسی و ئەرمەنی دەرچوون، کوردەکان لەوێ شانۆیان هەبووە و، هێندێك کوردیش توانیویانە خوێندنی بەرز تەواو بکەن و پلە و پایەیان پێبدرێ، کە کاك شاکر خۆشی یەکێکە لەوانە.

قسەکانی منیش کە تەلەفزیۆن بلاویکردنەوە، ئەمە بوو:

راستە ئەو شتانە هەبوون، هەرچەندە دەبێ ئەوەش بێژین کە کوردناسی و لێکۆڵینەوە لە کورد و پێوەندیی **رووس** لە گەڵ کورد لەسەرەتاوە لە سەردەمی ئیمپراتۆرێتیی قەیسەریدا دەستپێکردووە، ئەوەش بەئامانجی سوودوەرگرتنی کۆلۆنیالیستانە لە کورد، وەك هێزێکی سوپایی دژ بە **ئیمپراتۆرێتیی عوسمانی و قاجاری**. بۆوێنە: **ڤلیامینۆف زێرنۆف بلاوکەرەوەی شەرەفنامە و ژمارەیەکی زۆر لە کوردناسە نێودارەکانی رووس، وەك پیۆتر لێرخ و ن. یا. مار و فەردیناند یوستی و ئەلەکسەندەر ژابا و مینۆرسکی و نیکیتین، کوردناسی پێش رژێمی کۆمۆنیستی**

بوون، کـە ئەمـانەش بەزوری، یان دیپلۆمـات بوون یان سـوپایی بوون. لە گـەڵ ئەوەشـدا چاپکردنی چەند کـتـێـبـێك، یان خـوێندنی زمـانی کـوردی لە چەند قوتابخانەیەکی سەرەتاییدا، ئەوەیش بە ئەلف و بێی سریالی (کە کوردی دەرەوەی سۆڤێت هیچ سـووتێکیـان وەرنەگرت لێی)، یان دەرهێنانی رۆژنامـەیەك بەزمـانی کوردی بۆ پرۆپاگەندە کردن بۆ ملهوڕانی رژێمی سۆڤێت، یان بوونی بەرنامەیەك لە ئینستیتۆیێکدا بۆ کـوردناسی، ئەوەش لە باری سەرنجی سۆڤێتەوە، ئەمـانە هەمـوو درۆپێك ناو نین بەرامـبـەر ئەو ئاگـری گـەلکوژی چەند جـارەی رژێمی سـۆڤێت لە کوردەکانی بندەستی و، لەنێوبردنی کۆمارە ئۆتۆنۆمیدارەکەی **(کوردستانی سۆر)** و دانی خاکەکەی بە ئازەربایجان و، کۆچپێدانی کورد بە کۆمەڵ لە شوێنی خۆیانەوە بۆ **سیبریا و کازاخستان** و، مردنی هەزارانیـان لە رێ لە برساندا و لە سـەرماندا و، گوللەبارانکردنی هەزارانی دیکەیان. ئەوجا پاش تۆپینی **ستالین** و هەتا داتەپینی ئیمپراتۆرێتیی ترەکەڵەکی سۆڤێتیش، **کۆماری کوردستانی سۆر** دانەمـەزراوەتەوە و، بێـجگە لەمـەش رژێمی سـۆڤێت یەکـەمین دەوڵەت بوو کـە دانی بە **«حکوومەتی ئەنقەرەی ئەتاترك»** دا نـا و لـە ١٩٢١/٣/١٦ دا **پەیمانی «هاوڕێیەتی»** لە گـەڵ بەست، بەرلەوەی هیچ دەوڵەتێکی دیکە دانیـپـێـدا نابێ. هەروەها بێـدەنگیی **«کۆنگرەی گەلانی رۆژهەڵات»** کـە لە ١ ــ ١٩٢١/٩/٨ لە **باکۆ** بەسترا، لە مافی کـورد، ئەگـەرچی هەشت کـورد لەو کـۆنگرەیەدا بەشـداربوون، بەڵام ناسـینی «حکوومەتی ئەنقەرە» وەك «حکوومەتی جۆتکار و هەژار»، و ئەمـەش لە کاتێکدا بوو کە پەیمانی سێڤر هێشتا لەکاردابوو. دوایی فرۆشتنی **کۆماری کوردستان** بە **شای ئێران** لە سەردەمی **ستالیندا** و، بوونە هۆی شەهیدکردنی **پێشەوا قازی محەمەد** و هەزاران کـوردی دیکە، ئەوەش بەرامـبـەر بەڵێنی وەرگـرتنی مـافی گـەڕان بەدوای نەوتدا لە باکووری ئێران. ئەوجا خراپەکاری بەرامبەر شۆرشگێڕی گەورەی کورد **سەرۆك بارزانی و هاوڕێکانی**، کـاتێك کـە پەنایان بردبووە بەر **سۆڤێت**. هەروەها پشتگیری کردنی **گـەلکوژیی رژێمی بەعسی عێراق** لە کـورد و **هەرەسهێنان بە شۆرشی ئەیلوول بە چەك و پشتگیریی دیپلۆماسیی رژێمی بەعس و، پاکانەکردن بۆ کیمیابارانکردنی هەڵەبجە و سەردەشت و بادینان و زەردی ئاوا (قەراخ)**. ئەم کـارەسـاتە جگـەربڕانە و تاوانە زلانە لە لایەن شـاکـرێ خـدۆ و هاوڕێکانییـەوە هیچ

باسنەکران و رەنگە ئەگەر من سەرنجی بینەرانی بەرنامەکەم بۆ دیوە رەشەکانی رژێمی سۆڤێت و زۆرپناژەنە کوردەکانی رانەکێشایە، ئەوا هەر هەمووی دیزە بە دەرخۆنە بکرایە.

ئاشکرایە ئەز لەو کۆرە تەلەفزیۆنییەدا نەبووم کە شاکریێ خدۆ و هاودەنگەکانی تێیدا بوون. ئەز بە تەلەفۆن بەشداریم کرد و بۆ ماوەیەکی کورت. لەبەر ئەوە بواری ئەوەم نەبوو وەرامی ئەو قسانەی ئەوان و تێبینی کەسەکانی دیکە بدەمەوە کە پاش تەلەفۆنەکەی من کردیان. بۆوێنە کاك **مومتاز حەیدەری** بە تەلەفۆن گوتی کە کوردستانی سۆر لە سەر ئازەربایجانە نەك لە سەر ئەرمەنستان. من لە قسەکانمدا ئەوەم گوت کە **ستالین** کاتی خۆی **کوردستانی سۆری** دا بە **ئازەربایجان** و نەمگوت لە سەر ئەرمەنستان بووە. بەڵام پاش **شەڕی ئەرمەن و ئازەری** لە سەر نێوچەی **ئەرزاخ (نەگۆرنی قەرەباخ)** بەشێکی گەورەی کوردستانی سۆر، بەتایبەتی پێتەختەکەی کە **لاچینە** کەوتە دەست ئەرمەنییەکان و ئێستە بەدەست ئەوانەوەیە. دیارە مومتاز حەیدەری هیچ ئاگای لە سەردەمی پاش تلیسانەوەی شێرە بەفرینەی سۆڤێت نییە، کە ئەو سالانی ساڵ بە پیرۆز و نەتەکین (مصون)ی دەزانی. دوایی **مومتاز حەیدەری** بەدەمی خۆی گوتی کە ئەو و برادەرە کۆمۆنیستە عێراقییەکانی لە پاش حەفتاکانەوە ئەو راستییانەیان باش دەزانی کە رژێمی سۆڤێت چی و چی بەکورد کردووە، بەڵام باسیاننەدەکرد. ئەوەش **«لەبەر خاتری سۆسیالیزم!!»** زۆر سەیرە؟! کەسێك خۆی کورد بێ و رژێمێکی تێرۆریستی کوردکوژی دژ بە ئازادی و یەکسانیی مرۆڤ و **هەڤاڵبەندی رژێمی ئەتاترك و رەزاخان و هیتلەر و رژێمی بەعسی عێراقی تێرۆریست، بە رژێمێکی "سۆسیالیستی" بداتە قەڵەم، کە سۆسیالیزم لە ئازادی و یەکسانیی مرۆڤ بەولاوە هیچی دی نییە.** پاشان **مومتاز حەیدەری** گوتی کە هەر **دڵزار** نەبووە کە بە هۆنراوە پەسنی (مدح)ستالینی داوە، **هەژاریش** پەسنیداوە. لەوەدا مومتاز راست دەکا، **هەژاریش وەك دڵزار، ستالین پەرست بووە** و گوتوویەتی:

کوردە، دەتەوێ ببی سەربەخۆ
هەستە، دەی راکە تۆ بەرەو مۆسکۆ
قسەی درۆیە سانفرانسیسکۆ

بژی ستالین، خۆش بیّ چەکوش و داس
لە ژێر ئیستبداد کوردی کرد خەلاس

ئەز مەبەستم لە نێونەهێنانی هەژار ئەوە نەبوو کە هەژار بپارێزم، چۆنکە لەو لێکۆڵینەوەیەدا کە لە بارەی گۆڤاری **«نیشتمان»** زمانی حاڵی **کۆمەڵەی ژێکاف** ەوە نووسیومە و، لە ساڵی ١٩٨٥ دا لە سوێد بەکوردی و ئەڵمانی بڵاو کراوەتەوە، باسی هەژار و هۆنراوەکەیم کردووە (تەماشای ل ٤٧ی بەشە کوردییەکەی بکەن). لێرەدا تەنیّ مەبەستم ئەوە بوو نموونەیەك بهێنمەوە بۆ هوردە بۆرژوازیی مارکسیستی کورد و نەمویست لیستەکە درێژ بکەمەوە، ئەگینا سەرە دەگەیشتە سەر کاك مومتاز خۆشی.

شاکریّ خدۆ لە کۆڕە تەلەفزیۆنییەکەدا گوتی کە گوایە کوردەکانی کۆنە سۆڤێت خەڵکی ئەویّ نەبوون و لە دەرەوە وەك **«کۆچەر»** هاتوونەتە ئەویّ. **بەکورتی دەیویست بێژیّ لەویّ (سۆڤێت) پارچەیەك کوردستان نەبووە.** ئەمەش هەر ئەو قسەیە کە زوڕناژەنەکانی ڕژێمی سۆڤێت ساڵانی ساڵ دەیانکرد بۆ ئەوەی ڕژێمی سۆڤێت بەداگیرکەری بەشێکی کوردستان نەدەنە قەڵەم. شاکریّ خدۆ بە ڕۆژنامەی **"میدیا"** دەبێژیّ:

«هێندێك دەبێژن پێنج کوردستان هەنە. ئەز ئەوە قبوڵ ناکەم. ئەوە ڕاست نییە کە لەویّ لە لاچین، کەلباژار، کوبادلی، زەنگیلان پارچەیەك کوردستان هەبیّ. کورد لە سەردەمی شەدادییەکانەوە لەویّ دەژی بەلام ئەو شوێنانە پارچەیەك نین لە خاکی کوردستان. ئێمە وەکو کورد دەبیّ هەندێك واقعی و ریالیست بین، ئێمە هێشتا چوار پارچەمان ڕزگار نەکردووە، داوای پارچەی پێنجەمیش دەکەین و دایدەنێینە تەنیشت چوار بەشەکەی تر. ئەوە شتێکی هەڵەیە و ئەز ئەوە قبوڵ ناکەم و ڕاست نییە. دەکریّ وەکو نەتەوەیەك کە لەسەر خاکی خۆت نی، لەویّ داوای مافی ئۆتۆنۆمی خۆت بکەی».

جاریّ بەرلە هەموو شتێك دەخوازم بە شاکریّ خدۆ بێژم کە **«پێنج کوردستان نونەیە»**، بەڵکو یەك کوردستان هەیە و، لە سەردەمی سۆڤێتدا پێنج پارچە بوو، ئێستە بووە بە شەش پارچە. چۆنکە **کوردستانی سۆر** بەشێکی کەوتووەتە دەست ئەرمەنییەکان و بەشێکی هەر بەدەست ئازەرییەکانەوەیە. شاکریّ خدۆ کە کوردی

سۆڤێت بە مێوان و کۆچەر و بێ خاك و کرێگرتەی ماڵی ئازەری یەکان دادەنێ، دەبێ ئەوە بزانێ **«کوردستانی سۆر»** کە لە سەردەمی **لێنین** دا بوو بە **کۆمارێکی ئۆتۆنۆمیدار**، وەك قارچك لە زەوی هەڵنەتۆقیبوو، بەڵکو لەوە پێش هەبوو، ئەگەنا ئۆتۆنۆمی وەرنەدەگرت لەنێو زەریایەك ترکزماندا. لە سەردەمی قەیسەردا بەو بەشەی کوردستانیان دەگوت **«کوردستانی سۆر» چۆنکە خاکەکەی سۆر بوو، نەك «سۆر» وەك نیشانەی کۆمۆنیستی**. شاکرێ خدۆ خۆشی دەبێژێ کە **کوردستانی سۆر** لە ١٩٢٣ دامەزرا و شەش ساڵێك ژیا، **تا لە کۆتاییی بیستەکاندا** بەفیتی تورانییە ئازەرییەکان و فەرمانی **ستالین** هەڵوەشێنرایەوە و خرایە سەر ئازەربایجان. ئەو هەرێمە بچووك نەبوو، وەك شاکرێ خدۆ دەیەوێ بێنرخی بکا، بەڵکو هەر بە قسەی خۆشی **نێوچەکانی لاچین و کوبادلی و کەلباژار و زەنگیلان** و گەلێك شوێنی دیکەشی دەگرتەوە و، درێژ دەبووەوە تا سەر سنووری ڕۆژهەڵاتی کوردستان. بەڵگەش بۆ ئەوەی ئەو هەرێمە پێش سەردەمی کۆمۆنیستی هەر نێوی کوردستان بووە، ئەوەیە کە **لێنین** لە تەلگورافێکیدا کە پاش سەرکەوتنی شۆرشی ئۆکتۆبەر بۆ کادرەکانی حیزبەکەی ناردووە بۆ ئازەربایجان، ڕایسپاردوون کە **«جۆتکارە هەژارەکانی کوردستانیان لەبیر نەچێ»**. بێجگە لەوەش ئەگەر وتارەکەی **مینۆرسکی لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلام و نووسینەکانی خالفین بخوێنینەوە، تێدەگەین کە لە وڵاتی سۆڤێت پارچەیەك کوردستان هەبووە لە سەردەمی پێش کۆمۆنیستیدا و، پاش ئەمە بە پێی پەیمانی بریست ـ لیتۆڤیسك کە لە ١٩١٨/٣/٣ لە نێوان سۆڤێت و بەرەی ڕۆژاوادا بەسترا پارچەیەکی دیکەی خاکی کوردستان بە سۆڤێت برا**. لەبەر ئەوە قسەکانی شاکرێ خدۆ نەك هەر زانستانە نین بەڵکو ساختەکارانەن و دژایەتیشن بەرامبەر مافی ڕەوای کورد و خەڵکی کوردستان. دوایی کاك شاکر دەبێژێ کە کورد لەوێ لە سەر خاکی خۆی ناژێ، با داوای ئۆتۆنۆمی بکا! **خۆ کورد ئۆتۆنۆمی هەبوو، بەڵام ترکەکان بەیارمەتیی ستالین ئۆتۆنۆمییەکەیان لرف دا**. لێرەدا کاك شاکر دەیەوێ کورتانەکەی جەجاڵ بەکورد بدوورێتەوە. ئەوجا کە شاکرێ خدۆ دەبێژێ «ئێمە هێشتا چوارپارچەمان ڕزگار نەکردووە، داوای پارچەی پێنجەمیش دەکەین» قسەکەی هۆقەبازانەیە. چۆنکە ئێمە هێشتا نەك چوارپارچە بەڵکو پارچەیەکیشمان بەتەواوی ڕزگار نەکردووە، جا کە وایە نابێ جارێ باسی

هیچ پارچەیەکی دیکە بکەین، چۆنکە جارێ پارچەیەکمان بەتەواوی پێ رزگار نەکراوە.

ئێستە پاش ئەم قسانە چی بۆ جەنابی شاکرێ خدۆ دەمێنێتەوە؟ شاکرێ خدۆ کە کورد بە "کۆچەر" دادەنێ، دەبێ ئەوە بزانێ کە خاکی ئازەربایجان کە ئەورۆ بەشێکی گەورەی بە ترکنشین دەدرێتە قەڵەم، پێش شالاوی مەغۆلەکان و هۆزە ترکەکان کە لە نێوەڕاستی ئاسیا و چیاکانی ئالتایەوە بە کۆچەری و بۆ راووڕووت روویانکردە هەرێمی دەسەلاتی خەلیفەی عەباسی و ئاسیای گچکە، یەك ترکزمان لە ئازەربایجان نەدەژیا. تەماشایەکی سەرپێیی نەخشە کۆنەکان بکەن بزانن ولاتی ترك لە کوێ و ئازەربایجان لە کوێ. تەنانەت سەرنجدانێکی نێوی شوێنەکانی ئازەربایجان، بۆمان دەردەخا کە نێوەکانیان ترکی نین. هەر بۆوێنە وشەی باکۆ و تەورێز (تبریز) خۆیان بۆ خۆیان هاوار دەکەن. ئازەربایجان وشەیەکی کوردی ـ ئێرانی کۆنە و نێوچەیەکی کۆنی کورد بوو. هەر **شەدادییەکان** نەبوون کە لەوێ فەرمانڕەوا بوون کە ئەوەتە شاکرێ خدۆ دەفەرموێ **«دەرکران لەوێ»**، بەڵکو ئەو ولاتە ولاتی کورد بووە و کراوە بە ترکزمان. راستە لە سەتەی ۱۹ و ۲۰ دا هێندێك کوردی دراوسێی ئیمپراتورێتیی قەیسەری و ئەوجا سۆڤێتی رەڤینە نێو ولاتی قەیسەری و سۆڤێتییەوە، بەلام ئەمانە کەمەیەکی کەم بوون. چەند هەزار کۆچەرێکی پەنابەری بێدەسەلات ناتوانن هەرێمێکی گەورە و پان و فراوانی وەك کوردستانی سۆر لە دەست دانیشتووەکانی بستێنن و نێوی بنێن کوردستان، ئەوەش لە سەردەمی سۆڤێت و دەسەلاتی تۆرانییەکانی ئازەربایجاندا.

شاکرێ خدۆ لە دانیشتنە تەلەفزیۆنییەکەدا زۆری پێناخۆش بوو کە گوتم، لە رێی **کەسایەتیی ئەرمەنی دوکتۆر ژیرایەر کۆچەر یانەوە** هەوڵمان داوە کە کاربەدەستانی ئەرمەنستان وا لێبکەین جارێکی دی کوردستانی سۆر دابمەزرێتەوە و، ئەو هەوڵە تا ئێستە سەرینەگرتووە. سەیر ئەوەیە **دوکتۆر مارف خەزنەداریش هەر بە تەلەفۆن گوتی "وا باشە واز لە کوردستانی سۆر بهێنرێ و بخرێتە لاپەڕەی مێژووەوە"**. باشە! جا ئەگەر ئێمە وا بیر بکەینەوە، دەبێ واز لە **کەرکووك و مووسڵ و خانەقین و جلەولا و شارەبان و زەرباتییە و مەندەلی و کووت و شەنگار و شێخان و مەخموور و گەلێك شوێنی دیکەش بهێنین، چۆنکە بەعسییەکانی عێراق کوردەکانی ئەو شوێنانەیان**

**دەر كردووە و لە جێی ئەوان عەرەبیان نیشتەجێكردووە، وەك چۆن تركە تۆرانییە ئازەرییەكان كوردی كوردستانی سۆڤیان بەیارمەتیی ستالین دەركرد و تركیان لەو شوێنانە نیشتەجێكرد و ئێستەش ئازەرییەكان بەیارمەتیی هێندێك ئازەریی تۆرانی كە لە نێو رژێمی ئێراندا دەستیان دەڕوا، دەیانەوێ گەلێك نێوچەی «ئازەربایجانی رۆژئاوا» كە بەشێكە لە خاكی كوردستان بكەنە تركنشین بەدەرپەڕاندنی كوردەكانی ئەو نێوچەیە.**

لێرەدا دەمەوێ پەنجە بۆ هەواڵێك رابكێشم كە چەند رۆژێك پاش ئەم وتووێژە تەلەفزیۆنییە بڵاو كرایەوە. راستییەكەی نازانم ئەوە رێكەوت بوو، یان كاركردی ئەو وتووێژە بوو. رۆژنامەی **«یەنی مساوات» (یەكسانیی نوێ)** كە رۆژنامەیەكی شۆڤێنیستی تۆرانییە و بەزاری تركمانی لە **باكۆ** دەردەچێ، لە رۆژی ١١/١١ دا نووسیبووی كە **كامیلی حەسەنۆف «سەركردەی كوردە ئازەرییەكان»** و سەركردەی مەڵبەندی رۆشنبیریی كورد **(رۆناهی)** لە دژی ئەو پرۆژەیە قسەی كردووە كە بە پێی ئەوە كوردی دەرەوە دەبەن لە نێوچەی **لاچین** دا نیشتەجێیان دەكەن. **حەسەنۆف** گوتوویەتی كە **ئەوە فیتی ئەرمەنییەكانە**. هەروەها گوتوویەتی كە لە ساڵی ١٩٩٣ دا هەوڵێك دراوە بۆ ئەمە، بەڵام لە دژی ئەو پرۆژەیە زۆر كار كراوە تا پەكیخراوە. حەسەنۆف درێژە بە قسەكانیدەدا و دەبێژێ: «چوونە لای دەزگەی سەرۆكایەتیی (ئازەربایجان) و چاومان بە **هیدایەت ئۆریۆف**، راوێژكاری دەوڵەت بۆ كاروباری ئێتنی كەوت. ئەوجا چەند ریش سپییەكمان نارد بۆ لای ئەو كەسانە (كە بە تەمابوون بچن بۆ لاچین). **شێخ عەبدولمە ناف**؟ كە خۆی كوردە، بانگەوازێكی بۆ ئەو كوردانە دەركرد كە دەیانویست بچن بۆ لاچین و داوای لێكردن كە بیری خۆیان بگۆڕن. بەڵام ئەم راپۆرتانەی دوایی كە لە رۆژنامەكاندا بڵاوكرانەوە لە بارەی نیشتەجێكردنی كوردەوە لە لاچین ئێمەی زۆر شپرزە كرد. ئێمەی كوردی ئازەربایجان ئەو هەوڵدانە بە نەحلەتدەكەین كە كورد لە دەرەوە بهێنن بۆ نێو لاچین. ئێمە بەوە رازی نابین. دڵنیاشم لەوەی كە كوردە موسڵمانەكان نایەنە **لاچین. لە ئەرمەنستانیشدا** چەند خێزانێكی (كەم) **ئێزدی** ماون. ئێمە داوا دەكەین كە ئەم پرۆسەیە رابگیرێ. دەمەوێ جارێكی دی بێژم كە ئێمە ئەم كردەوانە ریسوا دەكەین كە لە لایەن كاربەدەستانی ئەرمەنییەوە دەكرێن. ئێمەی كورد دەمانەوێ لە گەڵ

خۆشك و برا ئازەرییەکانمان پێکەوە بگەڕێنەوە نیشتمانی خۆمان».

شایانی باسە کە رادیۆی BBC دووڕۆژ دوای ئەمە، واتە لە ۱۱/۱۳ دا هەر ئەو هەواڵەی بلاو کردەوە.

وەکو کورد دەبێژن **«سەیرە لە کۆیە!!!»** سالانی ساڵە و هەتا ماوەیەك لەمەوبەر، ترکە ئازەرییەکان دەیانگوت: «کورد لە ئازەربایجاندا نین». ئەمەتە شاکرێ خدۆ خۆشی لە هەڤپەیڤینێکدا لە گەڵ **«میدیا» (ئۆرگانی یەکێتیی نەتەوەیی دێمۆکراتی کوردستان)** دان بەوەدا دەنێ کە ئازەرییەکان لە پاش ساڵی ۱۹۷۰وە دەبێژن کە کورد لە ئازەربایجاندا نین. بەلام ئێستە بۆ دوژمنایەتیکردنی کورد، کورد نەك هەر لە ئازەربایجان پەیدابوون، بەلکو سەرکردەشیان هەیە و خۆی کردووە بە دەمڕاستیان و نایەوێ کورد بگەڕێنەوە **لاچین**، بەلکو دەیەوێ **«لە گەڵ ئازەرییەکان بچینە لاچینەوە»** واتە **کوردستانی سۆر** دروستنەبێتەوە. ئەمەش هەر قسەکەی شاکرێ خدۆیە کە نایەوێ لەبارەی ئەو هەوڵدانەوە قسە بکا کە بۆ دامەزراندنەوەی کوردستانی سۆر دەدرێ، چۆنکە کە رۆژنامەی **«میدیا»** لێیدەپرسێ بیروڕات چۆنە لە بارەی هەوڵەکانی **مستەفا وەکیلەوە** کە لە ساڵی ۱۹۹۲ دا دابووی بۆ زیندووکردنەوەی کوردستانی سۆر؟ شاکرێ خدۆ دەفەرموێ: **«ئەز باسی ئەو پرسە ناکەم و حەز ناکەم لەو بارەیەوە بدوێم!»**.

لێرەدا بەدڵنیاییەوە دەبێژم کە کاربەدەستانی ئەرمەنستان هێشتا بڕیاری ئەوەیان نەداوە کە کوردستانی سۆر بدەنەوە بە کورد، چۆنکە هەموویان لەو بارەیەوە بیروبۆچوونیان وەکیەك نییە. بۆ ئەمەش سەرنجی خوێنەرەوەی ئەم وتارە بۆ ئەم هەوالانەی خوارەوە رادەکێشم!

رۆژنامەی Turkish Daily News کە زمانحاڵی دەوڵەتی ترکە لە رۆژی ۲۸/۱۰/ی ئەمساڵدا نووسیبووی کە **«فەلەکناز»** ئەندامی پەرلەمانی ئەورووپا لە گەڵ شاندێکی ئەوەی نێویان ناوە **«کۆنگرەی نەتەوەیی کورد KNK چووە بۆ ئەرمەنستان بۆ پڕۆپاگەندەکردن بۆ پێ کێ کێ و هاندانی ئێزدییەکانی ئەوێ بۆ پشتگیریکردنیKNK»**. ئەز **فەلەکناز** دەمێکە دەناسم و دەزانم کچێکی کوردی رۆشنبیر و ژنهاتییە. ماڵباتی **فەلەکناز**، ماڵباتێکی **کوردی ئێزدی** نیشتمانپەروەری خەڵکی باکووری کوردستانن و ۳۰ ساڵ پترە لە ئەڵمانیا دەژین و

کاردەکەن. **فەلەکناز** وەك خوشك و براکانی لە ئەلمانیا لە دایکبووە، بەلاّم بە کوردییەکی جوان و رەوان قسە دەکا و زۆر لە سەر مافی کورد و بێگانەکان دەکاتەوە. ئێستە **ئەندامی پەرلەمانی ئەورووپایە و لە برۆکسل (بەلجیکا)** دادەنیشێ.
جا لەبەر ئەوەی ئەو هەواڵەی رۆژنامەی نێوبراو بلاّویکردبووەوە، سەرنجی منی زۆر راکێشا، دەمویست بزانم راستییەکەی چییە.بەرێککەوت لە رۆژی ۲/۱۲/ دا چاوم بە فەلەکناز کەوتەوە و ئەوەش لە شاری **ڤینیسیا (ئیتالیا)**، بە بۆنەی گرتنی کۆنفرانسێکەوە لەو شارە لە لایەن شارەوانیی ڤینسیا و جڤات (کۆمۆنیتا)ی کوردەکانی ئیتالیاوە بۆ باسی کورد و باسی پرۆژەیەکی گرنگ بۆ خزمەتی زارۆی کورد کە نێویان ناوە **«پرۆژەی چەمچەماڵ»**. کاربەدەستانی **ڤینسیا، فەلەکناز و دوکتۆر مەحموود عوسمان و منیان بانگیشت کردبوو بۆ بەشداریکردن لەو کۆنفرانسەدا**. دیارە ئەم وتارە جێی ئەوە نییە باسی ئەو کۆنفرانسە بکەم کە لە راستیدا سەرکەوتنێك بوو بۆ کورد و ماڵی جڤاتی کورد لە **ئیتالیا** ئاوابێ کە بە ژمارە کەم و بە کار و کردەوە زۆرن، دەشزانم کە **بەرێز شۆرش سورمێ** کە پەیامنێری رۆژنامەی **«برایەتی»**یە لە ئیتالیا، خۆشی لەو کۆنفرانسەدا ئامادە بوو، وتووێژێکیشی لە گەڵ من تۆمارکرد و خۆیایە کە ریپۆرتاژێك لە سەر ئەو کۆنفرانسە دەنووسێ. مەبەستی من لێرەدا ئەوەیە کە لە فەلەکنازم پرسی کە تۆ چووی بۆ ئەرمەنستان چتکرد و دەبێژی چی بەرامبەر ئەو هەواڵەی لە بارەی تۆوە بلاّو کراوەتەوە؟ گوتی: **«ئاگام لەو هەواڵە نییە»**. گوتم باشە کە گەڕامەوە بەرلین رەوانەی دەکەم بۆت. ئەوجا گوتی: **«دڵنیابە ئەو هەواڵانەی رۆژنامەی دەوڵەتی ترك بلاّوی کردوونەتەوە درۆی رووتن. راستە چووم بۆ ئەرمەنستان بۆ ئەوەی بزانم باری ژیانی ئێزدییەکان و کوردی دیکە چۆنە، بەلاّم نەك بۆ ئەوشتەی کە رۆژنامەکە نووسیوێتی»**. دوایی گوتی: «ئەرمەنییەکان رێیانەدا پێم کە بچم بۆ کوردستانی سوور. رووسەکانیش ڤیزەیانەدا پێم کە بچم بۆ رووسیا و سەرێکی کوردەکانی ئەوێ بدەم. **بەلاّم زۆربەی کاربەدەستە ئەرمەنییەکان کوردستانی سوور بە خاکی خۆیان دەزانن و بەتەمانین بیدەنەوە بە کورد**. تەنانەت گەلێك ئەرمەنی هەن کە باسی کوردیاندەکرد وەك دوژمن باسیاندەکرد». هەروەها گوتی: «چووم بۆ ئەنقەرە بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی **HADEP** دا وەك ئەندامی پەرلەمانی ئەورووپا

و، ویستم بەکوردی قسە بکەم، گوتیان قسەکردن بە کوردی رێبەندە (ممنوع)ە. گوتم باشە بە ئەڵمانی قسە دەکەم، گوتیان، نابێ، دەبێ بەترکی قسە بکەیت، گوتم ترکی نازانم، گوتیان، دەکەواتە مافی قسەکردنت نییە. پەرلەمانی ئەوروپاشم ئاگادار کرد لەوە».

بەمەدا دەردەکەوێ ئەو هەواڵەی تۆرانییەکانی ئازەربایجان لە بارەی گەڕانەوەی کوردەوە بۆ لاچین نووسیویانە و، جاشە کوردەکانیان خستبووە جرتوفرت، جارێ لە راستییەوە دوورە، بەڵام کار دەکرێ بۆی. شایانی باسە بزووتنەوەی تۆرانێتی لە ئازەربایجان و بەتایبەتی لە ئازەربایجانی ئێراندا گەلێك توند و تیژترە لە بزووتنەوەی تۆرانێتی لە سنووری دەوڵەتی ترکدا. ئەمەش مەترسییەکی گەورەیە، نەك هەر بۆ کورد، بەڵکو بۆ هەمووگەلانی ئێران، بەتایبەتی چۆنکە ئازەرییەکانی ئێران، بە ژمارە زۆر و بەدەسەلات و بەهێزن. ئازەرییەکان دەستیانگرتووە بەسەر بەڕێوەبەرێتیی سیاسەتی دەوڵەتی ئێراندا، هەروەها ئابووریی ئێران و بازاڕی ئێران بەدەست ترکەوەیە. **زۆربەی سەرکردەکانی لەشکری ئێرانی ترکن. مەلا حەسەنی کە خوتبەخوێنی رۆژانی هەینی شاری ورمێیە و، دەستی تا بنهەنگلی بە خوێنی کوردی قاڕنا و ورمێ سوورە، رۆڵێکی دیار دەبینێ لە کورد دوژمنی و ژندوژمنیدا (*). دەبێ ئەوەش بزانین کە خامنەیی و زۆربەی ئایەتوڵلا دەستڕۆیشتووەکانی ئێران ترکن. هاوینی ئەمساڵ لە سەردانێکیدا بۆ ئەردەبیل، خامنەیی ماوەیەك بەترکی قسەیکرد و گوتی «ئێران لە چەند گەلێك پێکهاتووە و لە پێش هەموویانەوە ترك و فارس کە هەردووکیان بران، چۆنکە هەردوکیان موسڵمانن».**

شایانی باسە کە شاکرێ خدۆ هەر ناڕاستەوخۆ پشتگیریی رۆڵی ستالینی تێرۆریست و جافەری باقرۆفی تۆرانی، لە چارەنووسی خوێناوی کوردستانی سۆر دا ناکا و بەس، بەڵکو بۆ رژێمی تاوانباری سۆڤێتیش دەپارێتەوە لەو دەستبڕینە بێشەرمانەیەدا کە لە کاتی کۆماری کوردستاندا(١٩٤٦ ــ ١٩٤٧) بەرامبەر بە کورد روویدا، شاکرێ خدۆ دەبێژێ: «چۆنکە کاتێك لە ساڵی ١٩٤١ دا **لەشکری ئێمە** چووە ئەوێ (ئێران) ئەوە بە گوێرەی خاڵێکی پەیمانی ساڵی ١٩٢١ بوو لە نێوان ئێران و رووسیا بەسترابوو، بۆیەش دوای کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانیی دووەم گەرەك بوو رووسیا لەشکری خۆی لە ئێران بکشێنێتەوە، لە بەر ئەوە بە

تێروانینی من رووسیا نەیدەتوانی یارمەتی کوردی مەهاباد بدات».

گوێبگرن خەڵکینە! تا بزانن شاکرێ خدۆ چ دەفەرموێ: «کاتێك لە ساڵی ۱۹٤۱ دا **لەشکری ئێمە** چووە ئەوێ (ئێران) ... هتد»، فەرموون، ئەوەتە کاك شاکر **لەشکری ستالینی تێرۆریست و سۆڤێتی کوردکوژ** کە هەردووکیان بە رووڕەشییەوە گۆڕبەگۆڕ بوون، ئێستەش هەر بە لەشکری خۆی دەزانێ. ئەرێ، **«لەشکری ئێمە!»**. پێموایە لەوەشدا ناحەقی نییە، چۆنکە ئەو ئێستەش هەر خۆی بەنانخۆری وان دەزانێ و بیروهۆشی هەر لەو سەردەمەدا دەخولێتەوە و پاکانە بۆ ئەو سەردەمە دەکا و بەچوار چاو بۆ ئەو رژێمە تاوانبارە دەگری و راستینابێژێ کە ستالین کوردی رۆژهەلاتی بە بەڵێنی مافی گەران بەدوای نەوتدا لە باکووری ئێراندا فرۆشت، کە دەستیشی نەکەوت.

شاکرێ خدۆ لەبارەی پێوەندییەکانی رووسیا بە کوردەوە دەبێژێ: «هەڵوێستی رووسیا بەرامبەر کوردەکان هێندێك بۆنی بێلایەنی لێدێت، ئەویش گرێدایی پێوەندییەکانی رووسیایە. چۆنکە پێوەندییەکانی **رووسیا لە گەڵ ئێران و عێراق و سووریا** خۆشن.

ئەمە نەك هەر شاردنەوەی راستییە، بەڵکو ساختەکارێتی و گۆڕینی راستییە. چۆنکە هەڵوێستی رووسیا بەرامبەر کورد هەڵوێستێکی بێلایەنانە نییە، هەڵوێستێکی دژایەتی تەواوە. حکوومەت و پەرلەمانی رووسیا بە کۆمۆنیست و ناسیۆنالیست و لیبەرالەوە پشتی **سەددام** دەگرن و هەوڵدەدەن بۆ **نەهێشتنی «نێوچەی نەفڕین» و لابردنی «هەرێمی ئاسایش»** و گێڕانەوەی سەددام بۆ نێوچەی ژێردەسەلاتی کورد. حکوومەتی رووسیا **ئۆجەلانی** نەگرتە خۆی و پەنابەرێتی نەدایە و دەریکرد و، هێشتا ئۆجەلان بە فرۆکە نەگەیشتبووە رۆما کە **پریماکۆف** سەرۆك وەزیرانی رووسیا، دەوڵەتی ترك و هەموو جیهانی لە سەفەری ئۆجەلان ئاگادار کردبوو. **حکوومەتی رووسیا یارمەتی تێکنۆلۆژیی رژێمی ئێران و عێراق دەدا بۆ دروستکردنی چەکی ئەتۆمی و تۆپی دوورهاوێژ.** رووسیا نەك هەر بێلایەن نییە، بەڵکو دوژمنە. بێ لایەن ئەوەیە نە یارمەتیی کورد بدا و نە یارمەتیی دوژمنەکانی. شاکرێ خدۆ ئەم راستینە زەقانە وەردەگێڕێ و پێیوایە دەتوانێ رووی خۆری رۆناك بە کەلەبێژنگ بگرێ.

شاکریێ خدۆ لە هەڤپەیڤینەکەیدا لە گەڵ **«میدیا»** هێندێك شت باسدەکا کە ئامانجی هاتنی خۆی و هاودەنگەکانی بۆ هەولێر ناڕاستەوخۆ دەخاتە روو. شاکریێ خدۆ باسی پەرتۆکێك دەکا کە دەبێژیێ بریتییە لە مێژووی کوردستان و دەبێژیێ: «جاری یەکەمینە نەك تەنیا لە رووسیا، بەڵکو لە کوردستان و هەموو جیهاندا کارێکی وا زانستی بۆ مێژووی کوردستان بکریێ. ئەو پەرتۆکە لە لایەن پێنج پرۆفیسۆران و بە سەرۆکایەتیی من نووسراوە. ئێستا من ئەو پەرتۆکەم لە گەڵ خۆم هێناوە بۆ ئەوەی بیدەمە برادەرانی ئێرە کە بیگۆڕنە زاراوەی سۆرانی و لە زانکۆ و قوتابخانەکاندا بخوێندریێ». شاکریێ خدۆ درێژە بە قسەکانی دەدا و دەبێژیێ: «دیارە کاتی خۆی رەحمەتی **محەمەد ئەمین زەکی مێژووی کوردستانی** نووسیبوو، هەروەها مێژووی پارچەکانی کوردستانیش هەیە کە بەجیا و تایبەتی نووسراوەتەوە. بەڵام ئەوەی ئێمە لەوەدا جیاوازە کە بەشێوەیەکی گشتگر و زانستی نووسراوەتەوە».

جاریێ بەرلە هەموو شتێك دەبیێ بزانین پاش ئەوەی گوێمان لە قسەکانی شاکریێ خدۆ بوو لە بارەی **کوردستانی سۆر و کۆماری کوردستان** و سیاسەتی رژێمی تیرۆریستی سۆڤیێت و بەتایبەتی **ستالین** بەرامبەر بە کورد هەرلە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی سۆڤیێتەوە تا لەنێوچوونی، پێویستمان بە زەحمەتدان بەخۆ نابیێ تا بزانین شاکریێ خدۆ ئێستەش هەر گرێدایی رەوشی سۆڤیێتە و خەون بەو سەردەمەوە دەبینیێ و قسەکانی بەلای حەقدا ناچن. لەبەر ئەوە زۆر گومانم لەوە هەیە کە پەرتۆکێك بە سەرپەرشتی وی نووسرابیێ ئاوێنەی راستینەی مێژووی کوردستان بیێ. کاربەدەستانی باشووری کوردستان پێویستە لە سەریان بەهیچ جۆرێك بڕیاری ئەوە نەدەن کە ئەو پەرتۆکە لە هیچ خوێندنگە و زانستگەیەکدا بەکار بهێنریێ هەتا چەند زانایەکی کوردی بەتەنگەوەهاتوو و لە پێش هەمووانەوە کەسانێکی وەك **دوکتۆر جەمال رەشید ئەحمەد، مامۆستا جەمیل رۆژبەیانی و مامۆستا عەبدولرەقیب یۆسف** بەهوردی و لەسەرخۆ تەماشایدەکەن و گیاکەڵەکانی دەسکەنە دەکەن. باشتریش ئەوەیە پارچەپارچە بکریێ و بەشە بەکەڵکەکانی بکرێنە کەرەسە بۆ سەرچاوەیەکی زانستانەی خۆمانە.

سەیر ئەوەیە شاکریێ خدۆ هێندەی بەرەکەی خۆی پێراناکێشیێ و رووقایمانە دەیەویێ وامان تێبگەیەنیێ کە بەرهەمەکەی بەهەشتی **محەمەد ئەمین زەکی** و هەموو

ئەو بەرهەمانەی تا ئێستە پێشکێش کراون زانستانە نین. شاکریٚ خدۆ پێویستە بزانیٚ کە مێژوونووس بێجگە لە زانایی لە بابەتەکەی خۆیدا، دەبیٚ دوو تایبەتکاری دیکەشی تێدا بیٚ: یەکەمیان ئازایەتی، واتە نەترسان لە قسەی خەڵك و رەخنە و پرتە و بۆڵەی ئەم و ئەو و، نەترسان لە لەدەستچوونی بەرژەوەندیی تایبەتی. دووەمیان: دوورکەوتنەوە لە لایەنگریی نابابەتانە. هەر کەسێك بەرهەمەکەی بەهەشتی **محەمەد ئەمین زەکی** بخوێنێتەوە دەبینیٚ ئەم پیاوە زانستانە کاریکردووە، واتە لە باسەکەیدا پشتی بە ژمارەیەکی زۆر سەرچاوەی رۆژهەڵاتی و رۆژئاوایی جیاجیا بەستووە و، وشەفرکێی نەکردووە. بێجگە لەوەش باسی ئەو سەردەمەی مێژووی کوردی کردووە کە پێوەندیی نەبووە بەو رۆژانەوە کە تێیدا ژیاوە. لەبەر ئەوە ناچار نەبووە خاتری کەسی دی بگریٚ. ئەمەشی لە پەرتۆکەکەیدا باسکردووە. دوایی شاکریٚ خدۆیەك کە نەیەویٚ باسی کوردستانی سۆر و مێژووە خوێناوییەکەی و هەوڵدان بۆ دامەزراندنەوەی بکا و نەیەویٚ هەڵوێستی **ستالین** و سۆڤێت بەرامبەر **کۆماری کوردستان و شۆرشی ئەیلوول** تاوانبار بکا و هەڵوێستی ئێستەی رووسیا بەرامبەر بە کورد بە **«بیٚ لایەن»** بداتە قەڵەم، چۆن کارەکەی **«زانستانە و گشتگیر»** دەبیٚ، بێگومان نابیٚ!.

مەبەستی سەرەکیی سەردانەکەی شاکریٚ خدۆ بۆ هەولێر پتر لە وەرامی ئەو پرسیارەدا دەردەکەویٚ کە **«میدیا»** لێیکردووە و گوتوویەتی: «ئێوە لە سەمیناری ١٣/١١/١٩٨٨ی سوێد و ژمارە (٢٢)ی گۆڤاری **«رۆژا نوو»** دا مژدەی ئەوەتان دابوو کە مژۆڵی کارکردنن لەسەر **ئینسکلۆپیدیای کورد**. ئایە ئەو پرۆژەیە چی بەسەرهات؟». شاکریٚ خدۆ دەبێژیٚ: « ئێمە لێرە دەمانەویٚ بە ئاگاداریی حکوومەتی کوردستان پێوەندیی لە گەڵ برادەرانی زانکۆ بکەین و گفتوگۆی لەسەر بکەین، بۆ ئەوەی دەست بەو کارە بکەین، چونکە بەڕاستی ئەوە کارێکی گرانە و، ئێمە بەتەنیا ناتوانین ئەو کارە بکەین، ئەوجا ئەوە هەزار و یەك گرفتیشی هەیە.ئەگەر ئێمە بگەینە بڕیارێك لێرە، کە ئەز باوەڕمەندم پێیدەگەین، ئەوکا ت ئێمە دەست بەو کارەی خۆمان دەکەین. بەڵام ئەوە کارێکی دووردرێژە و دەبیٚ بەیەك بەرگ بنووسریٚ و پێویستی بە زەمانی دوانزە تا پانزە ساڵ هەیە ... هتد».

ئەریٚ ... ئەوەی شاکریٚ خدۆ لە ساڵی ١٩٨٨ دا، واتە دوانزە ساڵ لەمەوبەر

باسی کردووە و گوایە ئەو سەردەمە خەریکی بووە، واتە **ئینسکلۆپیدیای کورد**، تازە دەیەوێ ئەو کارە بکا، ئەوەش ئەگەر هاتو **لە گەڵ حکوومەتی کوردستاندا** بگاتە بڕیارێك لە هەولێر. ئەوجا دەبێ ئەو بڕیارە چی بێ بۆ کردنی کارێك کە بەقسەی وی ١٢ــ١٥ساڵی بوێ، بێجگە لەوەیکە **حکوومەتی کوردستان چەند ملوێنێك دۆلار بۆ شاکرێ خدۆ** و هاوڕێکانی تەرخان بکا و بۆ ئەنجامدانی کارێك کە ١٢ ــ ١٥ ساڵی بوێ. ئەوەیە **"شیردا بۆ داپیردا!!!"**.

جا وەنەبێ ئەز ئاگام لەم چیرۆکی **«ئینسکلۆپیدیای کورد»**ە نەبێ. ڕاستییەکەی چەند ساڵێك لەمەوبەر بە بانگهێشتی **«ئینستیتۆی کورد لە بەرلین»** کۆبوونەوەیەك **لە برۆکسل** کرا لە خانووی **«پەرلەمانی کوردستان لە دەرەوەی وڵات»** بۆ باسی ئینسکلۆپیدیای کورد. لەوکۆبوونەوەیەدا **بەڕێزان دوکتۆر کوردستان موکریانی، دوکتۆر جەمال ڕەشید ئەحمەد، دوکتۆر عیسمەت شەریف وانلی، دوکتۆر جەمشید حەیدەری، دوکتۆر جەبار قادر، دوکتۆر میهرداد ئیزەدی، دوکتۆر لازارێف، دوکتۆر ژیگالینا** و چەند بەڕێزێکی دیکەش بەشداربوون. ڕۆژێك بە دووروودرێژی لە سەر بابەتەکانی ئینسکلۆپیدیایەکی کورد دووایەن. بڕیاردرا کە **ئینسکلۆپیدیایەکە ئینسکلۆپیدیای کورد بێ نەك کوردستان.** چۆنکە ئینسکلۆپیدیای کوردستان زۆر کاری دەوێ و کاتێکی فراوانی پێویستە. بۆ ڕۆژی دوایی **عیسمەت شەریف** گۆتی بڕیارەکەیان گۆڕیوە و کردوویانە بە **ئینسکلۆپیدیای کوردستان.** جا لە بەر ئەوە، ئەو بڕیارە دێمۆکراتانە و زانستانە نەبوو، بەڵکو ڕامیارانە و نازانستانە بوو، ئەز خۆم کێشایەوە لێی، پاش ئەوەش چەند هەڤاڵی دیکەش خۆیان کێشایەوە و کارەکە سەرینەگرت.

**ئینسکلۆپیدیای کورد** گاڵتەی منداڵان نییە و کاری یەك کەس و دوو کەس نییە. دەبێ نەخشەیەکی ڕێکوپێك دابنرێ بۆی و بابەتەکان بە پێی پسپۆڕی دابەشبکرێ بەسەر سەتان زانستکاردا. سەرجەمی کارەکەش دەبێ بەچاودێری و سەرکردەییی کۆمیتەیەك بێ کە لە چەند زانایەکی کوردی پسپۆڕ کە ئامانجیان خزمەتی ڕاستی و نەتەوەی کورد بێ، پێکهاتبێ.

— — — —

**(*) ــ مەلا حەسەنی** کە بە **«ژەنەراڵ حەسەنی»** نێوی ڕۆیوە، کابرایەکی

دەوڵەمـەند و خـاوەنی زەوی و زارێکی زۆرە لە رۆژهەڵاتی کـوردسـتـان و نوێنەری **«خامنەیی»** یە لە ورمێ. جا لەبەر ئەوەی لەو وڵاتە سینەما و جێی رابواردن نییە، خەڵکەکە بەزۆری بۆ پێکەنین و کاتبردنەسەر، رۆژانی هەینی دەچنە مزگەوتەکەی مەلاحەسەنی و گوێ لە قسە نەستەقەکانی دەگرن. رۆژێکیان لە کاتی باسکردنی **ژنـدا** دەبێـژێ: «ژن دەکـرێن بە سێ بەشـەوە. بەشـێکیـان سـەریانداناپۆشن و دەموچاویشیـان داناپۆشن، ئەمانە وەك ئۆتۆبووس (پاس) وانە، هەمـوو کـەسێك دەتوانێ سـواریان بێ. بەشـێکی دیکەشیـان سـەریاندادەپۆشن بەڵام دەمـوچاویان رووتدەکـەن، ئەمـانە وەك تاکسی وانە، هەر چەند کـەسێك دەتوانێ سـواریان بێ. بەشێکی دیکەش هەن کـە سەریشیـان و دەموچاویشیـان دادەپۆشن، وەکو ژنەکـەی بەندە، ئەمانە هێسترن، هەر یەك کەس دەتوانێ سواریان بێ». کە خەڵکەکە گوێیان لەم فەلسەفەیە دەبێ هەموو بەجارێك هاوار دەکەن «الله اکبر» «الله اکبر».

**جا وەرن بزانن قورپەسەریی ئەم کوردە گەیشتووەتە کوێ، لە لایەکەوە تووشمان بووە بە تووشی مەلاحسنی و لە لایەکی دیکەشەوە شاکرێ خدۆ!!.**

## رۆژنامەی «میدیا» ژمارە (٧٩)

## گۆڤاری «کۆنگرە» ژمارە (١٩)ساڵی ٢٠٠١

# پەیامی مامۆستا جەمال نەبەز
# بۆ کۆنگرەی پێنجەمی
# یەکێتیی نەتەوەییی دێمۆکراتی کوردستان!

بەڕێزینە! کارگێڕانی کۆنگرەی پێنجەمی **یەکێتیی نەتەوەییی دێمۆکراتی کوردستان لە هەولێر!**

پیرۆزبایی جێژنی نەورۆز و بانگێشتنەکەتان بە بۆنەی ئاهەنگی پێنجەمین ساڵڕۆژی دامەزراندنی یەکێتییەکەتانەوە، گەیشتە دەستم، زۆر سوپاستان دەکەم. هیوام وایە سەرکەوتووبن لە پێناوی خزمەت و هێنانەدی ئامانجەکانی بیری نەتەوەییی کوردی دا.

بەڕێزینە! بیری نەتەوەییی کوردی نێوی خۆی بە خۆیەوەیە، واتە بیرێکە کە بەرژەوەندیی نەتەوەی کورد و خەڵکی کوردستان دەگرێتە خۆ، بە هەموو حیزب و کۆمەڵ و ڕێباز و هۆز و نێوچە و هەرێم و باژێڕ و گوند و هەموو تاکێکی نەتەوەی کورد و هەموو کوردستانییەك. ئەوەش لە سەر بنچینەی ئازادی و یەکسانیی کۆمەڵگەی کوردستان و هەنگاونان بەرەو دامەزراندنی قەوارەیەکی رامیاریی سەربەخۆیە. ئەوجا ئەو قەوارە سەربەخۆیە لە چ شێوە و چارچێوەیەکدا دەبێ، ئەوە جێی لێدوان و وتووێژە و، گرنگ یەکسانیی کورد و گەلانی دیکەیە لە دەسەڵاتدا. ئەم یەکسانییەش لە دەسەڵاتدا هەر بۆ نەتەوە جۆربەجۆرەکان نییە، بەڵکو بۆ بەشەکانی کۆمەڵگەشە و بە تایبەتی بۆ ژن و پیاو، کە بەداخەوە دەسدرێژی پیاو بۆ سەر مافی ژن لە لایەن پیاوی تەنگەتیلکە و خۆپەرست و مێشکودەروونەخۆشەوە زوو زوو لە کوردستانی رزگاربوودا روودەدا، کە ئەمەش بەڵگەیەکی بەرچاوە بۆ ئەوەی کە فەرهەنگی کۆن و رزیو و گەنیوی داگیرکەرانی کوردستان خەریکە جێ بۆ خۆی دەکاتەوە لە نێو کۆمەڵگەی کوردەواری دا، کە نموونەیەکی ئەوەش لە دەستوور و نەرێتەکانی رژێمی فاشستی بەعسی دا دەردەکەوێ کە هەتا ئێستەش لە کوردستانی رزگاربوودا بەکار دەهێنرێن. مەبەستم لێرەدا زاگۆن (قانون)ی دۆخە تایبەتییەکانە (قانون الاحوال الشخصیة)ی بەعسییەکان کە ژن وەك کۆیلەیەك تەماشا دەکا. لە بەر ئەوە چاوەڕوانیی هەموو کوردێکی نەتەوەیی لە کاربەدەستانی

کوردستـان و لە پێش هەمـوویانەوە، لە **بەڕێز و خۆشـەویست نێـچیرڤـان بارزانی** ئەوەیە، ئەم دەستـوور و نەرێتانەی بەعسی فـاشیست بخرێنە گۆفـەکی مێژووەوە و، دەسـتـوور و نەرێتی دێمـۆکـراتیـانە بێنە جـێـیـان کـە لە گـەڵ فـەرهەنگی پێشکەوتنخوازانەی کورد بگونجێن و، پەنجەی ئەو پیاوە کەللە ڕەقە بشکێنرێ کە بە نیازی خراپەکاری بۆ ژنێك درێژ دەکرێ.

**بەڕێزینە! فەرهەنگی کورد، فەرهەنگی چەنگیزخان و هۆلاکۆ و تەیمووری لەنگ و حەجاجی کوڕی یۆسف و یەزیدی کوڕی معاویە و میشێل عەفلەق و ڕەزاخان نییە. فەرهەنگی کورد فەرهەنگی ئەناهیتا و زەردەشت و پاپەکی خورەمدین و فەیلەسووفی مەزن سوهرە وردی و سوڵتان سەهاکی کاکەیی و شێخ هادی ئێزدی و پیری عەلەوی یە. فەرهەنگی کورد فەرهەنگێکی مرۆڤدۆستانەیە، و دژ بە هەموو جۆرە زۆرداری و ستەم و هۆڤێنی یەکە.** شەرەفی پیاو لەم فەرهەنگەدا لە کەنەفتکردن و بندەستکردنی ژندا نییە، بەڵکو چەوساندنەوەی ژن بەوپەڕی بێ شەرەفی دادەنێ. ئەو پیاوانەش کە پیاوەتیی خۆیان لە ژنکوژی دا دەبینن، با دڵنیابن ئەگەر بچنە سەر پەیژەش هێشتا ناگەنە ئەژنۆی ژنانی وەك **قەدەم خێر و خانزاد و قەرە فاتمە و ماهشەرەف خانم و حەپسەخانی نەقیب و عادلەی جاف و ڕەوشەن بەدرخان و میناخانم و لەیلا قاسم و هەڤاڵ خەجۆ و کوردستان موکریانی و دایکی جوان ....**

**سەرکەوتن هەر بۆ ڕێبازی نەتەوەیی کوردە، ڕێبازی ئازادی و یەکسانی و سەربەخۆیی!**

جەمال نەبەز

بەرلین ٢٦/٣/٢٠٠٠

**برای خۆشەویست و بەڕێز مام جەلال**

پەلاماری دەستدرێژیکەرانەی ئەوانەی خۆیان نێوناوە «**جندالاسلام**» بۆ سەر خەڵکی بێ تاوانی هەڵەبجە و دەوروپشتی و رشتنی خوێنی پێشمەرگە و لەتوپەتکردنیان بە تەور و قەمە و سووتاندنی لاشەکانیان، وێنەی فەرهەنگی دڕندانەی **جەنگیزخان و هۆلاکۆ و حەجاج و یەزید و داگیرکەرانی کوردستان** دێنێتە بەرچاومان. دیارە ئەمانەش هەر میراتگری ئەوانن. دەسا تف لە چارەیان و روویان رەش بێ و پێستی سەریشیان بەنەحلەت بێ بۆ خۆیان و کاروکردەوەیان.

ئەم دارودەستە چەند سەت کەسییە کە بەپارە و چەکی قورسی بێگانەوە هێنراونەتە سەرسنووری هەرێمی باشووری کوردستان، دەبێ باش بزانن کە نەتەوەی چل ملیۆنیی کورد کە بە قوربانییەکی زۆر بەنرخ توانیویێتی بەشێکی گچکە لە نیشتمانەکەی رزگار بکا، هیچ کاتێك ئامادە نییە رێبدا بە دەستەیەك جەردە و بازرگانی ئاین، پیاوەکانی دیل و ژنەکانی کەنفت بکا و وەك کالاّ بیانکڕێ و بیانفرۆشێ. چونکە ئەوە فەرهەنگی کورد نییە و هیچ کاتێکیش نابێتە فەرهەنگی کورد. لەبەر ئەوە نابێ هیچ جۆرە رێککەوتنێك لەلایەن کاربەدەستانی کورد و تێرۆریستانەوە هەبێ. دەبێ چەك دانێن و داوای لێبووردن بکەن لەبەردەم نەتەوەی کورد دا. هەموو حیزب و کۆمەڵە و رێبازە رامیاری و ئاینییەکانی کوردستانیش پێویستە لەسەریان هەڵوێستی خۆیان بەئاشکرا و بێگرێوگۆڵ بخەنەڕوو. لێرەدا هیچ جۆرە «بێلایەنییەك» لەکەس پەسندناکرێ. هەر نێویژییەکیش کە بەلای نارەواییدا دایتاشی، دەبێ بدرێتە دواوە. ئەز نە لەسەر یەکێتی دەکەمەوە و نە لەسەر هیچ حیزب و کەسێکی دیکە. چونکە خۆشم گلەییم لە **یەکێتی و پارتی** هەیە. ئەوەتە تا ئێستە **کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان بە سەرۆکایەتیی خەباتکاری ناسراوی نەتەوەکەمان جەوادی مەلا** کە بۆ یەکگرتنی هەموو حیزبەکان و ئاشتیی نەتەوەیی هەوڵدەدا، رێی پێنەدراوە لە **هەولێر و لە سلێمانی و دهۆك** بیرۆیەکی هەبێ، یان رۆژنامەیەك دەربکا. بەڵام ئەم شەڕە شەڕی یەکێتی و «جندالاسلام» نییە، بەڵکو شەڕی رێبازی شارستانێتی و بیری ئازادی و رۆناکی لەلایەك و رێبازی کۆنەپەرستی و

مێشکهیشکی و تاریکییە. هەولوتەقەلای دزێوی ئەوانەیە کە سالانی سالْ شەڕی براکوژیی دوو حیزبە گەورەکەی باشووری کوردستانیان قۆزتووەتەوە بۆ تەیارکردنی خۆیان و کاتێك دییان کە پارتی و یەکێتی لەیەك نێزیکبوونەتەوە، ئەوجا کەوتنە کوشتنی سیاسەتکارە حیزبییەکانی کورد بۆ ئەوەی ئاگری ناکۆکیی نێوان یەکێتی و پارتی جارێکی دی هەلگیرسێننەوە کە ئەوەش نەچووە سەر بۆیان، ئا ئەم بەزمەیان داگیرساند بەنێوی «جندالاسلام»ەوە. ئەمە لەباتی ئەوەی بچن یەخەی داگیرکەرانی کوردستان بگرن.

کوردستان دیارە مالی هەموو کوردستانییەکە، سەر بە هەر ئاین و ڕەگەزێ بێ. ئەوی دەیەوێ فەرمانڕەوایی بگرێتە دەست، دەبێ لە شەڕی هەلبژاردندا بیباتەوە، نەك لە خوێنڕێژی و ژندوژمنیدا.

زۆرم پێخۆشە کە برای بەڕێز و خۆشەویست مەسعوود بارزانی پشتگیریی خۆی بۆ ئێوە دەربڕی. تێکەلبوونی پێشمەرگەی پارتی و یەکێتی بۆ بەربەرەکانێی تیرۆریستان، هەنگاوێکە بەرەو دامەزراندنی لەشکری بەرگریی کوردستان و یادێکی سەردەمی سەرۆك بارزانییە. چونکە پێشمەرگە سەر بە هەر حیزبێك بن، هەموو پێشمەرگەی کوردستانن.

دوا تکام لێت برای بەڕێز ئەوەیە ئەوانەی لەلایەن پێشمەرگەوە دەگیرێن، یان خۆیان دەدەن بەدەستەوە، دەستبەجێ بدرێنە دەستی پۆلیس و دوزگری گشتی و ئەوجا دادگە و بەشێوەیەکی دێمۆکراتانە هەلسوکەوت بکرێ لە گەلیان. بڕیار بەدەست دادگەی کوردستانە، فەرهەنگی ئێمەش فەرهەنگی زەردەشت و سەلاحەدینی ئەیوویی یە، نەك فەرهەنگی هۆلاکۆ و حەجاج و یەزید.

براوهاویری دێرینت

جەمال نەبەز

بەرلین ٤/١٠/٢٠٠١

بۆ بەڕێوەبەرانی ڕۆژنامەی «پەیام»

# «فەتیانە» کەی شێخ مەحموود بوو بە «دەستەسڕە»

لە دواژمارەی سالّی رابردووی رۆژنامەکەتاندا و، لەژێر سەردێڕی «دەستەسڕەکەی مەلیکی کوردستان» دا، کورتە وتارێکتان بلاّو کردبووەوە. جا لەبەر ئەوەی وتارەکە نێوی هیچ کەسێکی پێوە نەبوو، دیارە بەڕێوەبەرانی رۆژنامەکە راستەوخۆ بەرپرسیاری ئەو نووسینەن و ناتوانن خۆیان لەژێر باری بەرپرسیاریی رۆژنامەگەریی رابسکێنن و بێژن «هەرکەس بەرپرسیاری نووسینی خۆیەتی»، ئەگەرچی رۆژنامە وەك گۆڤەك و سەرەنوێلك نییە هەرکەسێك هەستا و چلکاوی کنج (جلك) و بەرماوەکەی خۆی تێفرێبدا.

**«پەیام»** لەو نووسینەدا پەسنێکی زۆری بەیانی ۱۹۹۹/۱۱/۱۹ی ئەستەموولٚ دەدا، کە لە لایەن دەولّەتەکانی سەر بە بەرەی osce وە ئیمزاکراوە و، بە «خالّێکی وەرچەرخانی گرنگ» ی دادەنێ لە «سیاسەتی نێودەولّەتیدا». بەپێی رۆژنامەی «پەیام» خالّێکی ئاشکرای ئەو دۆکومێنتە «گرنگییەکی زۆری بۆ ئەو کەمایەتییە نەتەوانە هەیە کە لە چوارچێوەی دەولّەتانی خاوەن قەوارەی سیاسی دانپێانراودا گیروگرفتی سیاسی، یان ئەتنیکیان هەیە». مەبەستم لێرەدا ئەوە نییە کە بە کارگێڕانی **«پەیام»** بسەلمێنم کە ئەم بۆچوونە لە بنەڕەتەوە چەوتوچەوێلٚ و نادروستە، چۆنکە شتێکی بەلّگەنەویستە کە کێشەی گەلانی ژێردەستەی ئەو دەولّەتانەی کە هەڤالّبەندی زلهێزەکانن، بەتایبەتی ئەمریکا و ئەورووپا، تەنێ لە گۆشەی بەرژەوەندیی هەڤالّبەندیی خاوەن دەولّەتەوە لێیدەڕوانرێ، نەك لە گۆشەی بەرژەوەندیی گەلی بندەستی بێدەولّەت و کۆمەلّگەی بەشخوراو و بێدەسەلاّتەوە. وەرن بەراوردێکی کۆزۆڤۆی یوگسلاڤیای بێلایەن و، کوردستانی داگیرکراو لەلایەن دەولّەتی ترکی ئەندامی ناتۆوە بکەن. بەلاّم با واز لەمە بهێنین.

**«پەیام»** داوا لە کورد دەکا «لەجیاتی چاویلکەی رەشی مافیایانە بەچاوی وردبینی بەرژەوەندیی نەتەوەییەوە نەخشە سیاسییەکانی دنیا بخوێنینەوە». هەروەها دەبێژێ: **«زۆر گرنگە سیاسەتمەدارانی کورد کە تەوقە لە گەلٚ گۆڕانکارییە**

**سیاسییە نوێیەکانی جیهاندا دەکەن نە کەلەبچەی درواسێ و براگەورەکانیان لە دەستدا بێت و نە دەستەسرەکەی شێخ مەحموودی مەلیکی کوردستان».**

بەرلەوەی بچمە نێو باسەکەوە دەمەوێ ئەوە بێژم کە مەبەستم لەم بەدواداچوونە لەسەر کردنەوەی شێخ مەحموودی نەمر نییە کە خۆم لە پاڵ ڕێزی زۆرمدا بۆی، هێندێك گلەیی و ڕەخنەشم لە هەڵسوکەوتی رامیاریی وی هەبووە، بەڵکو مەبەستم خزمەتی راستی و راستکردنەوەی مێژووی دەستکاریکراوی کوردە. ئەو مێژووەی کە لە سەتەی رابوردوودا بەدەستی تاوانبارانەی چینی هوردەبۆرژوای خوێندەواری کوردگەلێك ساختەکارێتی تێدا کرا. ئەوە نەبوو پەنجا ساڵی رەبەق وانەی دەروێشێتیی رژێمی تێرۆریستی دژ بە ئازادیی سۆڤێتیان فێری کورد دەکرد و، هەرکەسێك پێچەوانە بوەستایە، دەستبەجێ مۆری نۆکەرێتیی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم و رەگەزپەرستی و شۆڤێنێتی و فاشێتی و چی و چیان لێدەنا. ئێستەش بێچووە ئاغا و دەرەبەگە کۆنە توودەیی و بەگداشییەکانی ئەو سەردەمە کە دەرچووی زانستگەکانی «ئیمپریالیزمی رۆژئاوان»، لەباتی ئەوەی تۆبە لە رابردووی چەپەڵی خۆیان و بنەماڵە خوێنمژەکانیان بکەن، ئەمجارە بەنێوی **«کوردۆلۆژی»** یەوە کەوتوونەتە بازرگانیکردن و، ئەم شار و ئەو شار دەگەڕێن و، بێشەرمانە دژی ئاڵاهەڵگری بیری ئازادی و یەکسانیی مرۆڤ و رێبازی نەتەوەییی کورد **«کاژیك»** بوختان و درۆ و دەلەسە بڵاو دەکەنەوە. چۆنکە هەر کاژیك بوو دەستی دزانەیانی خستەڕوو. بەڵام زورناژەنەکانی رژێمی سۆڤێت کە دوێنێ بە **«دیکتاتۆرێتیی پرۆلیتاریا»** وە بازرگانییان دەکرد، ئەوا ئەورۆ بە **«دیالۆگ»**ەوە بازرگانی دەکەن. ئەی کوری رۆژ مانای چی؟.

بۆ تێگەیشتن لە کێشەی ئەم **«دەستەسرە»**، دەمەوێ بێژم کە چەند ساڵێکە قسەیەك کەوتووەتە نێو کوردەکانی ئەوروپاوە، گوایە شێخ مەحموود کاتێك تەوقەی لە گەڵ ئینگلیزەکان کردووە، جارێ بە «فەقیانە»کەی دەستی خۆی پێچاوەتەوە ، ئەوجا دەستی داوەتە دەست ئینگلیزەکان، چۆنکە ئینگلیزەکان دیان (مەسیحی) بوون و، دەستیانی بە گڵاو زانیوە. ئەز خۆم یەکەمجار ئەم قسەیەم دوو ساڵێك لەمەوبەر لە برادەرێك بیست کە لە لەندەن دادەنیشێ. کە لێمپرسی لە کێی بیستووە!، گوتی لە **جەرجیس فەتحولاَ**. ئەو سەردەمە جەرجیس فەتحولاَ لە سوێد

پەنابەر بوو، ئێستە گەڕاوەتەوە کوردستان و لە هەولێر دەژی. شایانی باسە، لە پاییزی ساڵی ١٩٩٩ دا بەڕێز شاهێن بەکرسۆرەکلی بەڕێوەبەری رادیۆی کوردیی شاری سیدنی (ئوستراليا) وتووێژێکی دوورودرێژی لە گەڵ من ئەنجامدا لەژێر نێوی **«کێشەی کورد لە سەتەی نۆزدەدا»** و لەو ماوەیەدا باسی «فەقیانە» کەی شێخ مەحموودیشی لێم پرسی. ئەزژی بیروڕای خۆم لەوبارەیەوە دەربڕی. دەقی وتووێژەکە بە رادیۆ و، دوایی بە ئینتەرنێت بە هەموو جیهاندا بڵاو کرایەوە.

راستییەکەی، دەمێکە ئەوە دەزانم کە یەکێك لەو چەکە ژەهراوییانەی کە بەرەی تاریکی دزانە و دزێوانە لە دژی بەرەی رۆناکی بەکاری هێناوە و دەیهێنێ، درۆودەلەسە و بوختان و قسەهەڵبەستنە بۆ مرۆڤی ئازا و لێهاتوو و سەربەرز، بەتایبەتی لەنێو کۆمەڵگەی سەرلێشێواودا، وەك کۆمەڵگەی کورد، کە قسەو قسەلۆکی بێبەڵگە و توێژینەوە یەکسەر دەقوزرێتەوە و، وەك تووتی دەگوترێت و دەگوترێتەوە و، لە گەڵ تێپەڕبوونی کات و بەپێی پێویست ترش و خوێدەکرێ و، سەروبۆری بۆ دادەنرێ و، دێتە گۆڕان و دەبێتە بنێشتەخۆشەی بندان و، وێردی سەرزمان. ئەوەتە «فەقیانە»کەی جەرجیس فەتحولاَ، لەلای بەڕێوەبەرانی «پەیام» بووە بە «دەستەسرە». وادیارە لەبەر ئەوەیە کە ئەو سەردەمەی شێخ مەحموود «تێمپۆ» و «دەستکێشی نایلۆن» لە کوردستاندا باو نەبوون، تا شێخ لەجیاتی «فەقیانە» و «دەستەسرە» بەکاریانبهێنێ.

ئێستە دەمەوێ لە دوولاوە لەم باسە بکۆڵمەوە: لەلایەکەوە وەك زانستکارێك بە پێویستیی سەرشانی خۆم هەڵسم و، بابەتانە، نەك دەروێشانە، یان دوژمنانە، تەماشای کێشەکە بکەم. لەلایەکی دیکەوە، وەك کەسێك کە لە سەردەمێکدا ژیاوە کە هێشتا شێخ مەحموود ماوە و، گوێی لە قسەی ئەوانە بووە کە پێوەندییان بە شێخەوە بووە و، خۆشی جارێك شێخی دیوە و قسەی کردووە لە گەڵی، بەشکو بتوانم بەوکارە ئەرکی سەرشانی خۆم وەك مرۆڤێکی خاوەنویژدان لە خستنەرووی کەسایەتییەکدا بەجێبهێنم، کە ژیانی خۆی لە پێناوی چەسپاندنی مافی گەلێکی بندەستدا بەختکردووە و، بۆ گەیشتن بەوە، بێترس و لەرز و بێپاڕانەوە و کڕنۆشبردن و داواکردنی لێبوردن، لەبەردەم دادگەی بێدادی ئیمپریالیستەکانی بەریتانیادا لەسەر مافی نەتەوەی کوردی کردووەتەوە و، فەرمانی لەسێدارەدانی داوەتە بەر

گاڵتە و، ئەوانی بە تاوانبار داوەتە قەڵەم، نەك خۆی. راستە، شێخ مەحموود کەموکورتی و ناتەواوی هەبووە، بەڵام کێ تەواوە، فەرموو بێتە پێشێ، ئایە ئەوانەی کە چیرۆکی **«فەقیانە»** و **«دەستەسرە»** ەکەی شێخ مەحموودیان هەڵبەستووە، سەتیەکێکی شێخ مەحموودیان پێکراوە و پێدەکرێ؟.

شێخ مەحموود سەرکردەیەکی کلاسیکی کورد بوو بەهەموو مانای وشە. سەرکردەی کلاسیکی کورد تایبەتکاری خۆی هەیە. تایبەتکارەکانی ئەم سەرکردەیەتییەم لەو لێکۆڵینەوەیەدا خستووەتە بەرچاو کە لە ساڵی ١٩٨٣ دا لەبارەی گۆڤاری **«نیشتمان» (زمانی کۆمەڵەی ژێکاف)** کردبووم، بەبۆنەی تێپەڕبوونی چل ساڵ بەسەر دەرچوونی گۆڤاری نیشتماندا و، لە ١٩٨٥ دا بە کوردی و ئەڵمانی لە ولاتی سوێد بلاوکرایەوە. هێندێك تایبەتکارەکانی سەرکردەی کلاسیکی کورد ئەمانەن: خۆبەستن بە نەرێتی کۆمەڵگەی کوردەوارییەوە. قسەکردن بە کوردی و گرنگی دان بەخووڕەوشتی کوردانە. خۆ بەبچووکدانان بەرامبەر بە خۆ و خۆ بەقورسگرتن بەرامبەر داگیرکەر و دوژمن. هەوڵدان بۆ سەربەخۆیی هەموو کوردستان، دوور لە هەستی نێوچەپەرستی. خۆنەبەستن بە هیچ جۆرە حیزبایەتی و ئیدیۆلۆژییەکەوە و گرتنی دۆستایەتی و بەستنی هەڤاڵبەندی لە گەڵ هەموو لایەکدا، بێگوێدانە ئیدیۆلۆژیا و سیستەم و نەتەوەی ئەو لایەنە. رێزگرتن لە ئاینی ئیسلام وەك فەرهەنگێك نەك وەك دۆگمایەکی رامیاری بە مەبەستی فەرمانڕەوایی ئاینی. تەماشاکردنی کورد بەیەك چاو، بێگوێدانە پێوەندارێتیی بنەماڵەیی و چینایەتی و ئاینی، واتە گێڕانی رۆلی «باوکێك» نەك سەرکردەیەکی رامیاری (سیاسی) بەمانای وشە.

ئەمانەم هەموو بە بەڵگە و نموونە پێشانداوە لە گەڵ بەراوردکردنیان بە سەرکردەیەتیی هوردەبۆرژوای کورد. خوێنەرەوە دەتوانێ تەماشای سەرچاوەی نێوبراو بکات. بۆ شارەزابوونی پتر لەبارەی سەردەمی شێخ مەحموودەوە، خوێنەرەوەی ئەم وتارە دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ ئەو زنجیرە وتارەی کە لە ساڵی ١٩٧١ دا لە بەرلین بە زمانی ئەڵمانی بۆ کورد و بۆ دۆستانی کوردم پێشکێشکردووە، لە چوارچێوەی ئەو سەمینارانەی کە **«یەکێتیی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا»** (نوکسە) کە حەفتانە سازی دەکردن و، لە ساڵی

١٩٧٢ دا لەلایەن نوکسەوە چاپ و بلاوکرایەوە بەنێوی «کوردستان و شۆرشەکەی» یەوە. وەرگێرانی کوردی ئەم بەرهەمە لە سوێد لە سالی ١٩٨٥ دا بلاوکرایەوە. ئەوجا ئێستە دەچمە نێو جەرگەی باسەکەوە:

بەرلە هەموو شتێك خۆم وەك منداڵێك لە شاری سلێمانی باسی شێخ مەحموودم لە گەلێك خەلك دەبیست، بەتایبەتی لە پیرەکانی ئەو سەردەمەکە پێوەندیی راستەوخۆ، یان ناراستەوخۆیان بە شێخ مەحموودەوە هەبوو. لەوانە باوکم و برادەرەکانی وەکو: **مامۆستا رەفیق حیلمی (کە باوەرپێکراوی شێخ مەحموود بوو)، ئەحەی تەقی (خاوەنی بیرەوەرینامە)، ئیسحاق میر (پارێزەرێکی زۆر شارەزای خەلکی سلێمانی و سەربە ئاینی جوو)، کەریمی ئەلەکە (وەزیری دارایی حکوومەتی شێخ مەحموود»، شێخ ئەولکەریمی شەدەلە (یەکێك لە سەرکردە هەقەکان)، حەماغای برایماغای خویلە (سەرکردەی کاکەییەکان و باوکی ئەحمەد سمێلْ کە هاورێی قوتابخانەم بوو)**. لەم بەرێزانەم دەبیست کە لە سەردەمی شێخ مەحموود دا زۆربەی هەرەزۆری خوێندەوارانی کورد، بەپێچەوانەی راستە خەلکە سادەکەوە، دژی شێخ مەحموود بوون و، وەك ئاگری بنکا دەیانویست شێخ مەحموود بچێ بە گژ ئینگلیزەکاندا و حکوومەتی ترکانی سەر بە مستەفا کەمال بهێننەوە کوردستان. ئەم **«خوێندەوارانە»** لە نێو خەلکدا بە **«جل خوار»** ناسرابوون. شایانی باسە کە وشەی جلخوار لە جلی خوارەوە نەهاتووە، بەلکو لە جرخوارەوە هاتووە. **«جر»** لە زمانی کوردیدا کە ئێستەش لە هێندێ شوێنی باکوری کوردستاندا بەکار دێ، بەمانای **«هەلسوکەوت و رەوشت»** ە، لەبەر ئەوە جلخوار مانای «رەوشت خوار» و «رەوشت نزم» ە. تەنانەت وشەی «جر» لەگەلْ وشەی «جرتوفرت» و «جموجۆلْ» و «جرت» یشدا پێوەندییەکی ئێتمولۆژیانەی هەیە. جلخوارەکان کاتێك کەوتنە چالاکیی تەواو، کە شێخ مەحموود لە **دەربەندی بازیان** بریندار کرابوو و گیرابوو و درابوو بە دادگەی سوپایی هێزی چەکداری بەریتانیا لە بەغدا و فەرمانی لەسێدارەدانی درابوو، بەلام دوایی رەهەندەی هێندستانی کۆلۆنی ئەوکاتی بەریتانیا کرابوو. پاشان لەژێر گۆشاری خەلکی کوردستاندا هێنرایەوە سلێمانی. هۆنەرێکی کورد لەرۆژی هاتنەوەی شێخ مەحموودا بۆ سلێمانی، هۆنراوەیەکی خوێندووەتەوە کە خۆشیی خۆی پێدەربریوە و تانووتی لە

«جلخوارەکان» داوە!

ئەو شەمعی جەمعی عالەمە، دوێنێ کوژایەوە،
ئەمڕۆ بە لوتفی حەزرەتی حەق هەڵکرایەوە.

.........

هەی بەزمە، هەی شادمانییە، هەی تەربە،
سنجاقی فەتح و نوسرەتی کورد دانرایەوە.

.........

ئەی مونکیران خەجاڵەتی دیوانی حەق دەبن،
ئەم «گێلمە گێلم» و «کەشاکەشە» بەسیە، بڕایەوە.

— — —

**سەرنج!** ئەم هۆنراوەیەم لە پەنجاکاندا لە خودێ لێخۆشبوو شاکیر موجریم بیست کە وەزیری پۆستە و تەلگورافی حکوومەتی کوردستان بوو لە دەوڵەتی شێخ مەحموود دا. شاکیر موجریم خەڵکی سلێمانی بوو، بەڵام لە ڕەواندز دەژیا. کە لە بەغدا بوایە بۆ سەردان، پێی لە دوکانەکەی **مامۆستا بەشیر موشیر** نەدەبڕی و لەوێ گەلێك کوردی دیکەم دی لەوانەی کە لە نێزیکەوە ئاگایان لەسەردەمی شێخ مەحموود بوو. مەبەست لە «گێلمە گێلم» زاری ترکی و «کەشاکەش» زاری فارسییە.

— — —

لەساڵی ١٩٤٨ ەوە و، پاش «قەڵەمباز» (الوثبتیی)ی کانوون لە بەغدا، بزووتنەوەی کۆمۆنیزمی سۆڤێتی و عێراقچێتی و «برایەتی درۆزنانەی کورد و عەرەب» و سڵاواتدان لە دیاری **مارکس و لێنین و ستالین**، کەوتنە نێو چینی خوێندەواری کوردەوە، ئێدی بزووتنەوەی کوردایەتی بە بزووتنەوەیەکی دەرەبەگانە و کۆنەپەرستانە درایە قەڵەم و، ئەوی کوردایەتیکردبوو و دەکرد، بە دەرەبەگ و کاسەلێسی ئیمپریالیستەکان دادەنرا و، یەکێتیی سۆڤێتیش بە «قەڵای ئاشتی» و «رزگارکەری گەلان» و «دۆستی کورد» و، هەرلەم تێڕوانینەشەوە، شێخ مەحمودیش بە «دەرەبەگ» و «خوێنمژ» و پیاوی ئیمپریالیزمی بەریتانیا مۆردەکرا. تەنانەت گۆڤاری «یەکێتیی تێکۆشین» زمانی حاڵی پارتی

کۆمۆنیستی عێراق، دەستەی «وحدة النضال» لکی باشووری کوردستان لە ژمارە (٢)ی سالی یەك (لاپەرە ٧) دا نووسیبووی: **«ئەگەر سەیری حەرەکەتی شێخ مەحموود بکەین لە کاتێ کە ئەیەویست لەژێر نفووزی ئیستیعمار بە دەرەبەگیاتی کوردستان ئیدارە بکا ... هتد». (جەمال نەبەز: گۆڤاری کۆمۆنیستانەی «یەکێتیی تێکۆشین» ١٩٤٤ ـ ١٩٤٥ و ئیدیۆلۆژی هوردەبۆرژوای مارکسیستی کورد، ستوکهۆلم ١٩٨٨).**

سەیر ئەوەیە کاتێك کە ئەم مارکسییە پێشکەوتنخوازانە لێیاندەقەوما، پەنایان دەبرە بەرمالی ئەو «دەرەبەگە خوێنمژانە» وەك **هەباسی مامەند ئاغا و کاکە زیادی کۆیی و شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحموود و سەی ئەحمەدی خانەقای کەرکوك** و، لە دیوەخان و تەکیەکانی ئەواندا دەیانخوارد و دەخەوتن و دەپارێزران. لەمەش سەیرتر ئەوە بوو کە شێخ مەحموودی «دەرەبەگ و پیاوی ئیمپریالیزم» ئالەم کاتەدا بەفەرمانی حکوومەتی عێراقی دەسەکەلای ئیمپریالیزم، لە گوندی داریکەلی دەستبەسەر کرابوو، و بۆی نەبوو گوندەکە بەجێبهێلێ. لەبەر ئەوە واقم وڕمابوو لەم «ئیمپریالیستە گەوجە» کە وەك مامۆستا بەشیر موشیر دەیفەرموو هێندە «ناقص العقل» بێ، بچێ پیاوەکانی خۆی کەنەفت و دەستبەسەر بکا. کە لە کۆمۆنیستە «کارزانەکان»م دەپرسی، بۆچی دەبێ ئیمپریالیزمی ئینگلیز پیاوێکی گوێڕایەلی خۆی وا تەنگاو بکا کە نەتوانێ بستێك لە گوندەکەی بەولاوە دوور بکەوێتەوە، زەردەیەك دەیگرتن و دەیانگوت: «ئەوە سیاسەتە». بەکورتی، کەم کەس دەیوێرا بچێ بۆ سەردانی شێخ مەحموود، لەلایەکەوە لەترسی سیخوڕ و کاربەدەستانی حکوومەتی عێراقی سەربە ئیمپریالیستەکانی بەریتانیا و، لەلایەکی دیکەوە لەترسی زمان و ئەو تۆمەت و تیرونەتۆرانەی کە کۆمۆنیستە عێراقچییە سۆڤێتپەرستەکان بە خەلکیانەوە دەنووساند.

سەرتاننەیەشێنم ... لە هاوینی سالی ١٩٥٦ دا هەمووی چەند مانگێك بوو کە خوێندنی خۆم لە زانستگەی بەغدا تەواو کردبوو، و بووبوومە مامۆستای فیزیك و ماتماتیك لە قوتابخانە نێوەندییەکانی شاری کەرکوك و، بۆ پشووی هاوین چووبوومە سلێمانی، چونکە کەسوکارم لەوێ دەژیان. لەو هاوینەدا بەخت فریامکەوت کە بە خزمەتی شێخ مەحموود بگەم، ئەوەش چەند مانگێکی کەم

بەرلەوەی کۆچیدوایی بکا لە نەخۆشخانەیەکی بەغدا لەرۆژی ١٥٩٦/١٠/٩ دا.

نامەوێ لێرەدا ئەو وتووێژە بگێرمەوە کە بە سێقۆلی لە گەڵ هاورێی مندالی و قوتابخانەم **شێخ ئەحمەدی شێخ رەئوفی سەی نووری نەقیب و مامۆستا عەزیز محەمەد (عەزەی برای ئەرکان)** ئەو رۆژە لە گەڵ شێخ مەحموودی نەمردا کردمان، چۆنکە پاش ئەوەی چل ساڵ بلاوکردنەوەیم راوەستاند، هەر لەبەر ئەوەی شێخ مەحموود لە قسەکانیدا هێندێك جنێوی توندی دا کە بلاوکردنەوەیانم پێباشنەبوو. دوایی هاتمە سەر ئەو باوەرەی کە بلاوکردنەوەی ئەو سەردانە خزمەتێکە بۆ مێژووی کورد و، رۆناکییەکە دەخرێتە سەر رابردووی دەولەتانی **عێراق و ترك و بەریتانیا** و، ئەوە بوو لە ژمارە (١٣)ی تشرینی دووەمی ١٩٩٧ ی رۆژنامەی **«سەکۆ»** دا کە لە بەرلین دەردەچێ، لەژێر سەرنێوی «پاشنیوەرۆیەك لە خزمەتی شای کوردستان شێخ مەحموودی نەمردا» بلاوم کردەوە. هاورێم **شێخ ئەحمەدی نەقیب** کە لەو کاتەدا بەرێکەوت هاتبوو بۆ **مۆنیخ** بۆ سەردانی نووری کورى، وتارەکەمی خوێندەوە و، لە نامەیەکی برایانەدا بۆ من، هێندێك شتی هێنایەوە بیرم لەبارەی ئەو سەردانەوە کە ئەز لەبیرم چووبووەوە. لەبەر ئەوە تەواوی نامەکەی شێخ ئەحمەد، هەروەك خۆی لە ژمارە (١٤)ی «سەکۆ» دا بلاوکرایەوە.

**شێخ مەحموود لەو بەیەکگەیشتنەدا فەرمووی کە ئەو «بە ئارەزووی دڵی خۆی ئینگلیزەکانی هێناوەتە کوردستان، پێیوابووە کە پشتی کوردستانێکی سەربەخۆ دەگرن. لەبەر ئەوە زۆر رێزی گرتوون. بەلام ئەوان لە پشتەوە پاشقولیان گرتووە لێی و هەتیوچە و ناکەسبەچەیان راست کردووەتەوە لێی».شێخ دەیفەرموو: «ئینگلیزەکان نەدەچوونە ژێرباری هیچ پەیمان و بەلێنێك بۆ دوارۆژی کوردستان. دەمویست بزانم ئەو کوردستانەی ئەوان بەرەسمی دانیپێدا دەنێن سنووری دەگاتە کوێ، بەلام ئەوان هیچیانندەگوت. هەر دەیانگوت تۆ جارێ بچۆ شەری ترك بکە، لەبەر ئەوە بوو شەری ترکم نەدەکرد، نەك لەبەر ئەوەی ترك موسلمانبوون. ترکەکان موسلماننەبوون. موسلمان ئەوەیە خوێنی خەلك برێژێ؟ راورووت بکا؟ مندالی ئەرمەنی بکا بە نووکی سۆنگییەوە؟ دەست بۆ نامووسی ژنان درێژبکا؟ ئەوانە موسلماننەبوون. جلخوارەکانی ئێمەش موسلماننەبوون. هەموو سەرسەری و ئارەقخۆر و بەنگ کێش و ... بوون».**

جا وەرن خەڵکینە ...! شێخ مەحموودێك کە ئاوا لە موسڵمانی گەیشتبێ، دژی خەڵك کوشتن و خوێنڕشتن و راوڕووت و دەستدرێژکردن بۆ ناموسی ژنان بووبێ و، بەکامی دڵی خۆی ئینگلیزەکانی هێنابێ بۆ کوردستان و ڕێزیگرتبن ... **شێخ مەحموودێك کە کەریمی ئەلەکەی دیان (مەسیحی) و ئیسحاق میری جوولەکە و شێخ ئەولکەریمی شەدەڵەی هەققە و حەماغای کاکەیی، هاوڕێ و دۆستی نێزیکی بووبن و پێکەوە سیاسەتیانکردبێ و نانیان لەسەر سینییەك خواردبێ ... شێخ مەحموودێك کە ژنێکی هەژاری وەك رەحمە کانێسکانی کردبێ بە سکرتێری خۆی و قوتابخانەی بۆ کچانی کورد کردبێتەوە** و، تەنانەت هوردەبورژوایەکی هەڵپەرستی وەك حەمدی ساحێبقران بە شیعر تانووتی لە شێخ مەحموود دابێ کە ڕێی داوە بە هەڵپەرکێی رەشبەڵەك و گوتوویەتی: « باجی رەحمە بێقەزا بێ نایەڵێ قنجەهەڵپەڕین ...! ». شێخ مەحموودێك کە لەلای ئێمە زۆر بە باشی باسی **میجەر نۆئێلی** دەکرد و پەسنی دەدا ... **شێخ مەحموودێك کەلە سەردەمی دەسەڵاتی پێنج ساڵەی خۆیدا، چ بە فەرمانداریتیی و چ بە شایەتی، کەسێك لەسەر دزی دەستینەبڕدرابێ و، هیچ کەسێك لەسەر سەرخۆشی دارکارینەکرابێ و، هیچ ژن و پیاوێك لەسەر پێوەندیی سێکسی بەردەبارانەکرابن تا مردن ... ئەمانەش هەمووی هەشتاساڵ پێش ئەوڕۆ** ... ئەوجا وەرن ئەگەر ویژدانتان سەگ نەیخواردووە، **بەراوردێکی سەردەمی فەرمانڕەوایی شێخی کوردی موسڵمان بکەن لە گەڵ رژێمی ئەوڕۆی ئێران و سۆدان و عەرەبستانی سعوودی و ئەفغانستان و پاکستان کە خۆیان بە رژێمی ئیسلامی دەدەنە قەڵەم و، ئەوجا بزانن جیاوازییان لە چ رادەیەکدایە. شێخ مەحموودێك ئەوە قسە و کردەوەی بووبێ، دەچێ بە «فەقیانە» و دەستەسڕە» دەستی خۆی دەپێچێتەوە، ئەوجا دەست دەداتە دەستی ناموسڵمانێك؟.** ئەمە بێجگە لەوەیکە ئێمە بە چاوی خۆمان «کۆشك و تەلار»ەکەی «دەرەبەگ و خوێنمژی کورد» شێخ مەحموودمان دی، کە کۆڵیتەیەك بوو، ئەوانەی کە تا دوێنێ «مارکسی و لینینی و رەنجدەران و زەحمەتکێشان» بوون و، باسی «دیکتاتۆرێتیی پرۆلیتاریا» یان دەکرد بۆمان و، ئێستەش بۆ سڕینەوەی رابردووی خۆیان خەریکن «شیعر و میعر» ی منداڵانەیان بەنرخی «عیرفان» و «فەلسەفە» دەفرۆشن پێمان، رازینابن یەك شەو لەو کۆڵیتەیەی شێخ

مەحموود دا رۆژ بکەنەوە.

**کاکینە! دەردی گەلی کورد دەردی چیرۆکی هەڵبەستراوی «دەستەسرِ» و «فەقیانەکە»ی شێخ مەحموود نییە. دەردی گەلی کورد دەردی چینە خوێندەوارەکەیەتی کە تووشی نەخۆشی هەڵپەرستی و راڕایی و خۆبڕێنی بەنرخی رۆژ و بێباری و دزێوی و درۆزنی و ترسنۆکی و بێشەرمی بووە ... .**

**شێخ مەحموود**، سەرەڕای هەموو هەڵە و ناتەواوی و کەموکورتییەکی، مرۆڤێکی سادە و پاکژ و بێفرتوفێڵ و بێفیز بوو ... . شێخ مەحموود ئازا و بەجەرگ و شێری مەیدان بوو ... . خۆزگە سەتی یەکێکی ئەو بەخت و شانسەی بۆ **ئۆجەلان** هاتە پێشەوە، بۆ شێخ مەحموود دەهاتە پێشێ ... ئا ئێستە کوردستانێکی سەربەخۆمان هەبوو ... **بەلآم رووی رۆژگار رەش بێ ... لەو جێیەی ئاو هەیە زەوی نییە و، لەو جێیەی زەوی هەیە ئاو نییە.**

## گۆڤاری «کۆنگرە» ژمارە ۲۱
## گەلاوێژی ۲۰۰۱

**سەرنج!**

**ئەم وتارە نێردرا بۆ رۆژنامەی «پەیام» لە لەندەن، بەلآم بلاّوینەکردەوە، لەبەر ئەوە درا بە گۆڤاری «کۆنگرە» و کۆنگرەش بلاّوی کردەوە.**

# ئەمریکا و

# تیرۆر و

# کورد!

ئەگەر تیرۆر، زۆر بە سادەیی، بە دەستدرێژیی نارەوای کەسێك یان کۆمەڵێك بۆ سەر گیان و ماڵ و ئاورووی کەسێك یان کۆمەڵێکی دیکە بدەینە قەڵەم، دیارە ئەم جۆرە تیرۆرە لە سەرەتای بوونی ئادەمزادەوە هەربووە.ئەوەتە تەورات چیرۆکی کاین و هابیل **(قابیل و هابیل)** دەگێڕێتەوە بۆمان. تیرۆر بەشێوەی دەستوەشاندنی نهێنی، یان پەلاماردانی ئاشکرا، هەر لە ژەهرکردنە خواردن و خواردنەوەوە بگرە تا چوونە مەکۆوە و، تا بەکارهێنانی دەزگەی مودێرن بۆ کوشتن لەڕێی شکەنجەدانەوە، کە ئەورۆ لە لایەن دەوڵەتە تیرۆریستەکانەوە بەرامبەر بەرهەڵستکاران بەکار دێ، شتێکی شاراوە نەبووە و نییە، ئەگەرچی بێدەنگی لێکراوە و لێدەکرێ.

تیرۆریزم لەم چل پەنجاساڵەی دواییدا سەرنجی دەوڵەتەکانی ئەورووپای بۆلای خۆی راکێشا، ئەمەش هەر لەبەر ئەوەی چەند کۆمەڵێکی گچکەی دەستوەشێن لە ئەورووپا، بەتایبەتی لە **ئەڵمانیا (بۆ نموونە دەستەی بادەر ماینهۆف)** کەوتنە فڕاندنی سیاسەتکاران و کوشتنی هێندێکیان. ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی گەلێك وتاری رۆژنامە و رادیۆ و وتوویژی تەلەفزیۆن و لێکۆڵینەوەی نێو گۆڤار و پەرتۆك بەزمانە ئەورووپاییەکان لەبارەی تیرۆرەوە بلاوبکرێتەوە. بەڵام ئەوەی کە شایانی باسە ئەوەیە هەتا ئێستە تاریفێکی یەکگرتوو و گشتگری وا بۆ تیرۆر کە هەموو لایەك پێیرازی بن، هێشتا نییە و زەحمەتیشە ببێ، چۆنکە سیستەمە جیاوازەکان و دەوڵەتەکان هەر یەکەیان خەریکن تاریفی تایبەت بە بەرژەوەندیی ناسیۆناڵی خۆیان بۆ تیرۆریزم بێننە پێشەوە. سەیر ئەوەیە ئەو رژێمانەی کە لە جیهاندا بە رژێمی تیرۆریست نێویانرۆیوە، ئەوانیش هەر هاواریانە لە دژی ئەوەی نێویانناوە **«تیرۆر»**. ئەوە بوو

**ئەریێل شارۆن** کە تاوانی تیرۆری **سەبرا و شەتیلا** دەخرێتە ملی، ماوەیەك لەمەوبەر لە **ئەنقەرە** باسی **«تیرۆریزمی کورد»**ی بۆ هەڤاڵبەندە **ترکەکانی** دەکرد و، لە رۆژنامەی «الشرق الاوسط» (ژ ... وەرامیدایەوە).

هەرچەندە رژێمی تیـرۆریست و دەوڵەتی تیـرۆریست هەر لە کـۆنەوە بووە و، ژمارەشیان کەمنەبووە، بەلاّم باسی رژێمی تیرۆریست و دەوڵەتی تیرۆریست دەخرایە پشتگوێ، بەبیانووی ئەوەی کە هەموو دەوڵەتێك مافی سەروەرێتی هەیە بەسەر ئەو گەل و خاکەدا کە فەرمانڕەوایی دەکا و کەس مافی دەستێوەردانی نییە. بەلاّم پاش ئەوەی هێندەك لە دەوڵەتە تیرۆریستەکان کەوتنە هەڕەشەکردن لە بەرژەوەندیی دەوڵەتە پیشەسازە گەورەکان و زلهێزەکان، ئەودەمە دۆزەکە جۆرێکی دی لێهات. شایانی باسە هەرچەندە دەوڵەتە ئەوروپایی یەکان و رۆژئاواییـیەکان لەنێوخۆدا لیبراڵ و دێمـۆکـراتن، بەلاّم لە سیـاسـەتی دەرەوەیاندا زۆر نادێمـۆکـرات و خـۆپەرستن. سەرنجێکی مێژوو بدەین دەبینین کە هەر ئەم دەوڵەتە ئەوروپاییانە بوون کە گەلێك دەوڵەتی دەستکردیان لە رۆژهەلاّتدا بنیاتنا کـە رژێمەکانیان رژێمی تیرۆریستـانە بوون، وەك ئەو رژێمانەی کـە کـوردستـان بەزۆر دابەشکرا بەسـەریاندا. بۆوێنە: دەوڵەتی **بەریتانیا** بوو کە دەوڵەتی عێراقی داتاشی و باشووری کوردستانی بەزۆر نووساند پێیەوە. هەر بەریتانیا بوو کە پشتی چەند جەردە و چەتەیەکی بەعسی گرت بۆ رووخاندنی رژێمی **قاسم** و رشتنی خوێنی هەزاران کۆمـۆنیست و کورد. دوای ئەوە ئەمـریکا و ئەوروپا بوون کە پشتی رژێمی بەعـسییـان گرت لە شـەڕی هەشت سـاڵەیدا دژی ئێران کـە ملیـۆنێك کـەسی تێدا کـوژرا، ئەگـەرچی هەر **ئەمـریکا و ئەوروپاییەکان** بوون کـە لەسـاڵی ١٩٧٩ دا پشـتی **خومەینییان** گـرتبـوو بۆ رووخـاندنی رژێمی **حەمەڕەزاشای کۆنەدۆستیان**. رژێـمی **سۆڤێت** بوو کـە ساڵانی ساڵ یارمەتیی رژێمەکانی **ترك و سووریا و ئێران و عێراقی** دا و لە حەفتاکاندا بە چەك و دیپلۆماسی و تەکنۆلۆژی پشتی رژێمی عـێراقی گرت بۆ هەرەسهێنان بە شۆرشی مەزنی ئەیلوول لە ١٩٧٥ دا. هەر دەوڵەتەکانی ئەوروپا بوون کە یارمـەتی رژێمی سەددامیـان دا بۆ دروستکردنی چەکی کـیمیـایی و میـکرۆبی کـە ئەوە بوو کاتێك دژی کورد بەکاری هێنا، هەموویان قوڕوقەپیان لەو تاوانە گەورەیە کرد، تا ئەوە بوو **سەددام** کەوتە پەلاماری **کوێت** و مەترسی پەیداکردن بۆ بەرژەوەندییەکانی

كۆنە هەڤاڵبەندەكانی رۆژاوای.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بكەین كە لەسەردەمی **«جەنگی سارد»** دا لەنێوان رۆژاوا و بەرەی سۆڤێتدا، بەرەی رۆژاوا، ئاینی ئیسلامی وەك چەكێك دەهاتە بەرچاو دژی ئیدیۆلۆژیی كۆمۆنیزم. هەر لەبەر ئەوە بوو كە رۆژاوا، بەتایبەتی **ئەمریكا**، پشتگیری بێچەندوچۆنی رژێمی بنەماڵەی **سعوودی** كرد دژی دەوڵەتە عەرەبەكانی هاوپەیمانی سۆڤێت وەك **میسری سەردەمی ناسر و سووریا و یەمەن.** هەروەها پشتگیریی موجاهیدەكانی ئەفغانی كرد بۆ دەرپەڕاندنی لەشكری سۆڤێت لە **ئەفغانستان** و دامەزراندنی ئەم رژێمە **تالیبان** ەی ئەورۆ. ئەوەش دەبێ بێژین كە **فەرەنسا و ئەمریكا و بەریتانیا** بوون كە پشتگیریی **خومەینی** یان كرد بۆ هاتنە سەر كار وەك بەربەستێك لەبەر دەم كۆمۆنیزمی سۆڤێتیدا، چۆنكە پێیان وابوو خومەینی، بە پێچەوانەی شاوە، هێزێكی جەماوەریی لەگەڵە و دوژمنی كۆمۆنیزمە.

پاش دامەزرانی كۆماری ئیسلامیی ئێران و، رووخانی سۆڤێت و دەرچوونی لەشكری سۆڤێت لە **ئەفغانستان** و هاتنە سەركاری موسڵمانە بنچینەگرەكان لە **ئێران و ئەفغانستان و سۆدان** و، ئاشكرابوونی دوژمنایەتیی رژێمی **خومەینی** بەرامبەر **ئەمریكا** كە بە گرتن و ریسواكردنی كاربەدەستانی باڵوێزخانەی ئەمریكا لە تاران بۆ ٤٤٤ رۆژی تەواو دەستیپێكرد، **ئەمریكا** كەوتە ناسینی **«هەڤاڵبەندە موسڵمانەكانی»** و ئەمجارە لەباتی ئەوەی بە هەڵوێستی خۆیدا بچێتەوە و لە هەڵەكانی سووت وەربگرێ، چوو بە هەڵەیەكی دیكە هەڵەكەی پێشووی خۆی راستبكاتەوە. ئەوەش بە پشتگیریی رژێمی **سەددام** كە گوایە **«سێكۆلاریست»**ە و دژی رژێمی ئێرانە كە رژێمێكی **«موسڵمانی فوندەمێنتالیستە»**. ئەمەش درێژەیكێشا هەتا ئەو كاتەی ــ وەك باسكرا ــ سەددامیش كەوتە دوژمنایەتیی ئەمریكا. خۆ ئەگەر ئەم رژێمانە رۆژی هەزار كەسیان لە گەلەكەی خۆیان بكوشتایە و دەستیان بۆ بەرژەوەندییەكانی ئەمریكا و بەرەی رۆژاوا نەبردایە، ئەوا هەر باسیان بەخەونیش نەدەكرا. پاش پەلاماری تیرۆریستانەی ١١ی ئەیلوول بۆ سەر **مەڵبەندی بازرگانیی جیهان و پێنتاگۆن** لە ئەمریكا كە بوو بە هۆی كوشتنی هەزاران كەس، كاردانەوەی ئەمریكا بۆ تۆڵەسەندنەوە، بەبیروڕای من، بەرەو ئەوە دەچێ كە ئەمجارەش سووتی لە هەڵەكانی خۆی وەرنەگرتبێ. دیارە ئەمریكا مافی تەواوی

خۆیەتی لەسەر خۆی بکاتەوە بەرامبەر بەو کردەوە تیرۆریستانەیەی کە تووشی بووە و، لەمەشدا دەبێ هەموو مرۆڤێکی خاوەنویژدان ماف بدا بە ئەمریکا. بەلاّم بۆ بەربەرەکانێی تیرۆریزم پێویستە چەند خالێك بخرێتە بەرچاو کە ئەمریکا بەداخەوە نەیخستوونەتە بەرچاو:

(١) ــ دەبێ تیرۆریزم لە مافی رەوای بەرخۆدان و لەسەر خۆکردنەوەی چەوساوان و بەشخوراوان و گەلانی ژێردەستە دژی زۆرداری و ملهوری جیا بکرێتەوە. راپەرینی بەشخوراوان دژی بەشخوران و راپەرینی نەتەوەیەکی ولاّت داگیرکراو بەرووی داگیرکەرانی نیشتمانەکەیدا، بەهیچ جۆرێك ناتوانرێ نێوبنرێ تیرۆریزم. بۆیە دەبێ **ئەمریکا و ئەوروپا** بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی **کورد و فەلەستین و بەربەرەکان و تامیلەکان و بەلووجەکان** و ... هتد دژ بە تیرۆریزمی دەولەتی، لە تیرۆر جیا بکەنەوە، کە مخابن تا ئێستا جیایان نەکردووەتەوە. ئەوەتە وەزیری دەرەوەی **بەریتانیا** لە **ئەنقەرە** دەفەرموێ: **«بەریتانیا یارمەتی رژێمی ترك دەدا بۆ بەربەرەکانێی کوردە سەرهەلّداوەکان»**. واتە دژی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد. هەروەها نوێنەری ئەمریکاش لە **ئەنقەرە** بەلێن بە دەولەتی ترك دەدا کە **«دژی هەولّدانی کورد بۆ دامەزراندنی دەولەتێکی سەربەخۆ، بوەستن». بەلاّم باسی تیرۆریزمی هەشتاسالەی دەولەتی ترك لەدژی نەتەوەی کورد ناکا.** ئەمریکا لەم رۆژانەی دواییدا باسی دەولەتی فەلەستین دەکا، بەلاّم ئەوەش هەر بە قسە نەك بەکردەوە، بۆ ئەوەی دلّی هەڤالبەندە عەرەبەکانی رابگرێ کە گوایە بەتەمایە پێکەوە بچن بەگژ **«تیرۆر»** دا!!!

(٢) ــ ئەگەر کەسێك، یان کومەلێك، یان دەولەتێك، ویستی بەراستی دژایەتیی تیرۆرکار بکا، دەبێ دەست نەداتە دەستی تیرۆریستێك دژی تیرۆریستێکی دیکە، وەك ئەمریکا و بەریتانیا تائێستا کردوویانە و دەیکەن. بەلّکو هەموو تیرۆریستێك بەیەك چاو تەماشا بکا. ئەوەتە **ئەمریکا و بەریتانیا** لەو رژێمانەی کە خۆیان بە پێشێلکەری مافی مرۆڤ دایاناناون، وەك **چین و ئێران**، خۆیان نێزیکدەکەنەوە و باسی هاوکاری دەکەن لە گەلّیان دژی تیرۆر و قورقەپدەکەن لەباسی مافی مرۆڤ لەو ولاّتانەدا.

**جا لەبەر ئەو دوو هۆیەی سەرەوە شەری ئەمریکا و بەرەی رۆژاوا دژی تیرۆر**

**سەرکەوتوو نابێ. چونکە تیرۆر میکرۆبێکە لە چلکاوی بێدادی و زۆرداری و کەڵەگایدا دەژی و گەشە دەکا. تیرۆر وەك قارچك لە زەوی هەڵناتۆقێ، بەڵکو لە ئەنجامی ساڵانی ساڵ بندەستی و بەشخوراوی و سەرشۆڕی و پیشخواردنەوە و بەزەیی بەخۆدا هاتنەوە و ناهومێدییەوە سەر هەڵدەدا. خۆ ئەگەر ئیدیۆلۆژییەك هەبێ بتوانێ بیقۆزێتەوە، ئەوا بەجۆرێ دەتەقێ کە خۆشی و دەوروپشتیشی بەجارێ تەفروتوونا بکا. تیرۆریزم هەر بە گوللە و تۆپ و فڕۆکەی بۆمباهاوێژ و سەربازی پڕچەك کۆتایی نایێ. نەمانی تیرۆریزم بەندە بە گۆڕینی سیستەمی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییەوە، لە سیستەمێکی زۆرداری و دیلی و بێدادییەوە بۆ سیستەمێکی ئازادی و یەکسانی و دادپەروەری.**

ئەوەی ئەورۆ ئەمریکا و بەریتانیا لە ئەفغانستان دەیکەن لەوانەیە ببێتە هۆی هاتنە سەرکاری چەند حیزبێکی دیکەی دژ بە تالیبان کە ساڵانی ساڵە لە باکووری ئەفغانستاندا گیرماون و هەر یەکەشیان پاشکۆیەکی **«ئیسلامی»**یان بەخۆیانەوە ناوە، و هەر یەکەشیان سەربە کەمەگەلێکی ئەفغانستانن، وەك **هەزارەکان و تاجیکەکان و ئۆزبەکەکان** و دوژمنایەتیی **پەشتوونەکان** دەکەن و هەر یارمەتیی ئێرانە کە جارێ بەیەکیەوە بەستوون. هێندێکیشیان یارمەتی لە **ئۆزبەکستان و تاجیسکتان** و رووسیا وەردەگرن. خۆ ئەگەر هاتوو هاتنە سەرکار، ئەوا جارێکی دی دەکەونە گیانی یەك و ئەو دەم تیرۆر کۆتایی نایێ. چونکە ئەم کۆمەڵانە هیچیان پەروەردەیەکی دێمۆکراتی و ئازادیخوازانەیان نییە. هەرکە هاتنە سەرکار بەرلە هەموو شتێك بیر لە تۆڵە سەندنەوە و خوێنڕشتن دەکەنەوە.

**ئەمریکا و بەریتانیا**، چۆن لە **عێراق** کاری خۆیان تەواو نەکرد و، لەبەر خاتری **حوسنی موبارەك و شاحسەین** کە گوایە **«هەڤالبەندی»** ئەمریکا بوون، سەددامیان لەجێی خۆی هێشتەوە بۆ گیانی کورد و شیعە و هەموو عێراقییەکی ئاشتیخواز، بێگومان لە ئەفغانستانیشدا هەر وا دەکەن. ئەمریکا و بەریتانیا دەستیانبەدەستی دەوڵەتی نادێمۆکراتی و زۆرداردوەیە و ئەمانەش نایانەوێ دەوڵەتێکی دێمۆکراتی لە تەنیشتیانەوە هەبێ و، ئەمریکا و بەریتانیاش بە قسەیاندەکەن، چونکە نێزیکبینانە و کورتخایەنانە بیر دەکەنەوە لە بەرژەوەندیی خۆیان، نەك دووربینانە و درێژخایەنانە. ئەوەتا دەوڵەتی **ترك** کە **«هەڤالبەندی ئەمریکا و بەریتانیا»**یە لە دژی

تیرۆر، لە ئەمریکا و بەریتانیا دەپارێتەوە رژێمی **سەددام** بپارێزن و پەلاماری نەدەن. ئەوجا ئێدی کێ بێ باوەڕ بکا کە ئەمانە بەراستی دژی تیرۆرن.

هێندەی کێشەکە پێوەندیی بەکوردەوە هەیە، ئەوەتا دیپلۆماسێتیی کورد لەم هەلومەرجە نازکەدا سەرسام و دۆشداماوە. هەر هێندەی لەدەستدێ سوێند بخوا کە ئامانجی دامەزراندنی دەوڵەتی کورد نییە، وەك ئەوەی کە داگیرکەرانی کوردستان نەزانن کە دەسەلاتدارانی کورد، نە ئەوەیان لەبار دایە و، نە دەشیانەوێ دەوڵەتی کورد دابمەزرێنن. تاکە شتێك کە دیپلۆماسێتیی کورد دەبوو بیکردایە و چۆکی دابدایە لەسەری ئەوە بوو بە ئەمریکا و ئەوروپای بسەلماندایە کە بە هەڤالبەندێتیی ئەو رژێمانەی دژ بە دێمۆکراسی و مافی مرۆڤن و بەزۆری لەشکر خۆیان دەسەپێنن بەسەر گەلەکەیاندا، شەڕ دژی تیرۆریزم ناکرێ و بشکرێ سەرناگرێ و، هەڤالبەندێتیی ئەم رژێمانە لەگەڵ ئەمریکا بۆ دەستکەوتنی پارووی چەور و پاراستنی کورسییەکەی ژێریانە. بۆوێنە رژێمی **ترك** بەنێوی **«هەڤالبەندێتیی»** ئەمریکاوە دەیەوێ زۆر لە ئەمریکا بکا پەلاماری عێراق نەدا، نەبا کورد شتێکی دەستبکەوێ. واتە دەیەوێ تیرۆر لەسەر کورد هەر درێژە بکێشێ و ئەمەش بە ئاشکرا دەبێژێ. رژێمی ئێران دەیەوێ بەنێوی **«بەربەرەکانێی تیرۆر»**ەوە رژێمی تالیبان کە دەوڵەتی پەشتوونەکانە و دژ بە فارسەکانە بڕووخێنێ و دەوڵەتێکی سەر بە فارسزمانەکان لە ئەفغانستان دامەزرێنێ کە فارسزمانەکان لە ئەفغانستان کەمایەتین. خۆش ئەوەیە کە وەزیری دەرەوەی ئێران **ئاغای خەرازی** لە سەفەرەکەیدا بۆ **تاجیکستان** رۆژی ۲۰۰۱/۱۰/۱۹ بە **رادیۆی ئەوروپای ئازاد** (بەشی فارسی) گوت: «رازی نییە بەمانی رژێمی **تالیبان**، بەلام پەشتوونەکان وەك کەمایەتییەك مافی خۆیان هەیە». بەراستی مرۆڤ دەبێ چەند رووقایم بێ کە وا زۆربەیەکی زۆر بە «کەمایەتی» بداتە قەڵەم. خەرازی دەیەوێ کەمایەتیی فارسزمانەکان لە ئەفغانستانیشدا وەك ئێران فەرمانڕەوا بن. چونکە فارسەکان لە ئێراندا کەمایەتین لە چاو **«کورد و ترك و بلووج وعەرەب و ... هتد»** دا، بەلام بە ملهوڕی و بە زۆردارەکی، فەرمانڕەوایی خۆیان سەپاندووە بەسەر گەلانی ئێراندا، ئەوەش بەنێوی شیعەگەرێتییەوە.

راستییەکەی، **چ رژێمی ئەفغانستان، چ رژێمی ئێران، چ رژێمی سعوود، چ**

**رژێمی سۆدان و چ رژێمی پاکستان**، کە بەنێوی ئیسلامەتییەوە هاتوونەتە کایە و خۆیانکردووە بەمیری سەربڕ، هەریەکەیان نوێنەری ناسیۆنالیتەیەکی تایبەتین و خۆیان لە پاڵ ئیسلامەتیدا شاردووەتەوە. رژێمی ئەفغانستان نوێنەری پەشتوونەکانە و، بەنێوی سوننییەتییەوە شەڕی رژێمی ئێرانی فارسی شیعە دەکا. رژێمی ئێران رژێمی فارس و ترکی ئازەرییە و بەنێوی شیعەیەتییەوە بەربەرەکانێی کوردی سوننی و بلووجی سوننی و پەشتوونی سوننی و عەرەبی سوننی و وەهابی دەکا. رژێمی سعوود رژێمێکی عەرەبی وەهابی یە و بەربەرەکانێی ئێرانی شیعە دەکا و پشتی رژێمی ئەفغانستان دەگرێ دژی ئێران. رژێمی سۆدان رژێمێکی عەرەبییە و بەربەرەکانێی دیانەکانی خوارووی سۆدان دەکا کە دەیانەوێ دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان هەبێ. رژێمی پاکستان رژێمی ئوردووزمانە سوننییەکانی پاکستانە و بەنێوی سوننی یەتییەوە دژی شیعەی پاکستان و شیعەی ئێرانە و پشتی رژێمی پەشتوونەکانی ئەفغانستان دەگرێ و هەروەها.

کە واتە کێشەکە لێرەدا کێشەی ئیسلامەتی و نائیسلامەتی نییە، کورد دەبێ باش لەمە بگەن و بزانن کێ وڵاتەکەیانی داگیر کردووە و سەرەڕای ئەوەش بەنێوی ئیسلامەتییەوە دەیانچەوسێنێتەوە. خۆیایە کە دیان و جوولەکە ئەورۆ کوردستانیان داگیر نەکردووە، بەڵکو موسڵمانە عەرەب و ترك و فارسەکانن کە کوردستانیان داگیرکردووە. خۆ ئەگەر ئەوانە بەڕاستی موسڵمان بوونایە و موسڵمانەتیش ـــ وەك خۆیان دەبێژن ـــ مانای وەکیەکی بوایە، دەبوو زوڵموزۆر و چەوساندنەوەی ناسیۆنال لەسەر کورد هەڵگیرایە. لەبەر ئەوە ئەوانەی بەنێوی ئیسلامەتییەوە لە کوردستاندا کار دەکەن، دەبوو ئەمەیان باش بزانیبایە، ئەگەر کوردێك بەڕاستی موسڵمان بێ و بیەوێ بۆ ئیسلامەتی کاربکا و بەخەیاڵی خۆی دەست بە **«فتوحات»** بکا، دیارە لە **بیارە و تەوێڵە**وە دەست پێناکا و بەنێوی **«جندالاسلام»**ەوە پێشمەرگەی کورد ناکوژێ، بەڵکو جارێ دەچێتە وێزەی داگیرکەرانی کوردستان. کە ئەم قسەیە دەکەم مەبەستم ئەوە نییە لە سەر **«یەکێتی»** یان حیزبێکی دیکە بکەمەوە، چۆنکە خۆم گەلێك رەخنەم هەیە لەم حیزبە و لە حیزبایەتی بەشێوەیەکی گشتی. ئاشکراشە کە گوناهی «یەکێتی» و حیزب حیزبێنەی «یەکێتی» و پێوەندییەکانی دەرەوەی «یەکێتی» و، ئەوجا شەڕی چەند ساڵەی

براکوژیی نێوان **یەکێتی و پارتی** و حیزبەکانی دیکەی کوردستان و شەڕفرۆشتن بە نەتەوەییەکانی کورد و هەڵبەستنی بوختان و درۆدەلەسەی گەوجانە و بەعسییانە بۆ نەتەوەییەکانی کورد، بەتایبەتی بۆ ڕێبازی خۆنەفرۆشتووی **کاژیك** لەسەر لاپەڕەکانی **«کوردستانی نوێ»** و نووسینی هێندێك لەسەرکردەکانی یەکێتی بەنێوی گوایە «بیرەوەرینامە»وە بەنیازی خراپکردنی نێوی «کاژیك». هەروەها بڵاوکردنەوەی درۆودەلەسە بە مەبەستی چاوبەست و شاردنەوەی دەستی ئەوانەی کە خوێنی سیاسەتکارە نەتەوەییەکانی کوردیان ڕژاند، بەتایبەتی **شەهیدان سەعیدی یەزدانپەنا و سەریەست مەحموود**. ئەوجا پشتگیریکردنی **پێ کێ کێ** و بەکوشتدانی سەتان پێشمەرگە لە پێناویاندا بەدەستی لەشکری **ترك** و دروستکردنی دەزگەیەکی ساختە بۆ **پێ کێ کێ** بەنێوی **«کۆنگرەی نەتەوەیی»**یەوە لەدژی **کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان**، ئەمانە هەموو زەویخۆشکەر بوون بۆ خۆتەیارکردنی ئەوانەی خۆیان نێوناوە **«ئیسلامی»**. ئەگەنا لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستاندا ئیسلامییەکان ٥٪ی دەنگیان نەهێنا، بەڵام ئەو هەلومەرجە نالەبارانەی کە لەسەرەوە پەنجەمان خستە سەریان، بوون بەهۆی بەهێزبوونی ئیسلامییەکان تا گەیشتە ئەوەی بەزۆری چەك پەلاماری **«یەکێتی»** یان دا، ئەو «یەکێتی»یەی کە خۆی هۆیەك بوو بۆ دەسەڵاتپەیداکردنی ئیسلامییەکان.

لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە کە هەموو ئیسلامییەکی کورد بەخراپەکار و دەستوەشێن و دەسکەلای دەستی داگیرکەرانی کوردستان بدەمە قەڵەم. نەخێر. کاتێك کە سەمینارەکەم «المستضعفون الکرد و اخوانهم المسلمون» لە ساڵی ١٩٩٧ دا بەشێوەی نامیلکە بڵاوکرایەوە، هێندەك چڵکاوخۆر و بەکرێگیراوی داگیرکەرانی کوردستان کە بەنێوی ئیسلامەتییەوە بازرگانیدەکەن، کەوتنە جنێوپێدانم و هێندێکیش لە ئیسلامییەکان، بەتایبەتی زانای گەورەی کورد **مامۆستا شێخ عومەر غەریب** کە یەکێکە لە سەرکردەکانی **پارتی ئیسلامیی کوردستان** پشتی منیان گرت.

ئیسلام باوەڕێکە وەك هەموو باوەڕێکی دیکە و تا ئەو هەندازەیەی کە بەزۆر نەسەپێندرێ بەسەر خەڵکدا، دەبێ ڕێز بنرێ لێی وەك هەموو بیروباوەڕێکی دیکە. باوەڕ خۆشەویستییە و لەسەر خۆشەویستیی وتووێژ ناکرێ و داوای بەڵگەهێنانەوە بۆ ڕاستی وناڕاستی ناکرێ. هەموو خاوەن باوەڕێك خۆی بەڕاست دەزانێ. لێرەدا

حەزدەکەم بەکورتی چیرۆکێك بۆنموونە بێنمەوە!

جارێکیان لە زانستگەیەکی وڵاتی **نەمسا** سەمینارێك رێکخرابوو بۆم کە لە سنووری ئەو سەمینارەدا باسی میتۆلۆژیای کوردم کرد و لەنێو ئەوانەدا رامانی ئێزدییەکان کە خودێ هەموو ساڵێك سەری ئێزدییەکان دەدا لە **چیای جوودی** و بەکوردی قسەدەکا لەگەڵیان لەبارەی ساڵی نوێوە و پەیمانێك دەبەستێ لەگەڵیان. پاش ئەوەی لە سەمینارەکە بوومەوە، کوردێکی خەڵکی باکوور کەوتە قسە لەگەڵم و بە ئۆتۆمۆبیل منی برد بۆ وێستگەی شەمەندەفەر. لەرێ گوتی: پێم خۆشبوو کە باسی چیای جوودیت کرد، بەڵام چیرۆکەکەی بەوجۆرە نییە، حەز دەکەم چیرۆکە راستەکە بگێرمەوە بۆت، گوتم فەرموو: گوتی: «خودێ پێیەکی لەسەر **چیای جوودی** داگرتووە و پێیەکی دی بەهەموو گەردووندا دەسوورێتەوە و بەمجۆرەسەرنجی هەموو جیهان دەدا و هەر کەسێك خراپ بجووڵێتەوە، یان کارێکی خراپ بکا، بەردێکی تێدەگرێ». راستییەکەی کەمێك پێکەنین گرتمی، بەڵام گوتم: باشە، بەردەکە گچکەیە، یان گەورەیە؟ گوتی: «بەردەکە بەپێی گوناهە، ئەوی گوناهێکی گەورە بکا بەردی گەورەی تێدەگرێ و ئەوی گوناهەکەی گچکە بێ بەردێکی گچکەی تێدەگرێ». گوتم: باشە، ئەم هەموو بەردە چۆن کۆدەبێتەوە؟ گوتی: «ئەوە هاسانە. دە دوانزە فریشتە هەن کە شەووڕۆژ بە لۆریی گەورە بەرد دەگوێزنەوە بۆ چیای جوودی». قسەکانی برادەرەکە لەمەدا بوو کە زۆر پێکەنینم هات، بەڵام شەرمیشم بەخۆم دەهات، هەرچی چۆنێك بێ گەیشتینە وێستگەی شەمەندەفەر و برادەرەکەش پەست بیوو لێم، چۆنکە گوتی: «پێمەکەنە، خۆت کافر نەکە». کاتێك کە دەرگەی ئۆتۆمۆبیلەکەم کردەوە بۆ دابەزین، تەپلی سەرم بەر لاشیپانی سەرەوەی دەرگەکە کەوت و زۆر یەشا. دەستبەجێ برادەرەکە گوتی: «ها.... ئەوە بەردەکە بوو. پێنەکەنە». کاتێك دابەزیم ویستم ماڵاوایی بکەم لێی، ئۆتۆمۆبیلێك وا بەخێرایی بەلامدا نێزیك تێپەری، زۆری نەمابوو راپێچم بکا لە گەڵ خۆی. برادەرەکە گوتی: «تکایە تۆبە بکە، ئەگەنا بەردێکی دیکەشت تێدەگرێ، بەڵام ئەمجارە لە جۆرێکی دیکە».

ئێستە تۆ ناتوانیت بێژیت کە ئەم برادەرە درۆ دەکا. ئەو برادەرە درۆی نەکردووە چۆنکە باوەڕی بەو چیرۆکە هەبوو، هیچ خاوەن باوەڕێکیش درۆ ناکا. چۆنکە درۆ

ئەمەیە تۆ بابەتێك بگێڕیتەوە بە کەموکورتکراوی، یان بەهەڵە، و بەوپەڕی هۆشیارییەوە. لەمەشدا هیچ زیانێك نییە. زیانەکە لەوەدایە ئەو برادەرە باوەڕ نەکردنی من بەخودێیەك کە بەردەفڕکێ بکا، بەکافرێتی دەداتە قەڵەم. کە سەری من لە پەلەکردن، یان لەبێئاگایی یەوە بەر لاشیپانی سەرەوەی دەرگەی ئۆتۆمۆبیلەکە کەوت، بە شتێکی سادە ناداتە قەڵەم، بەڵکو بە بەڵگەیەکی دادەنێ بۆ ئەوەی لە چیای جوودی یەوە بەردێك ئاڕاستەی سەرم کراوە بۆ وریاکردنەوەم کە نابێ بە قسەکانی ئەو برادەرە پێبکەنم. ئا مەترسییەکە لەمەدایە. **بەڵێ مەترسی گەورە لەوەدایە کە تاقمێك هەبن لەسەر باوەڕێك بن و پێیان وابێ ئەوی وەك ئەوان ئەو باوەڕەی هەڵنەگرتبێ کافرە. هەر ئەم جۆرە ڕێبازەیە کە وا لە «جندالاسلام» دەکا «یەکێتی» بە کافر بدەنە قەڵەم. چۆنکە پێیان وایە ئەوی لە گەڵ ئەوان نەبێ «کافرە». لەمەش سەیرتر ئەوەیە کە یەکێکی وەك جۆرج دەبلیو بوش دەبێژێ: «ئەوی لەگەڵ ئەمریکا نەبێ، ئەوا لە گەڵ تیرۆرە»، کە ئەم قسەیەش ئەگەر هوردی بکەیتەوە هەر لە قسەی «جندالاسلام» دەکا. جیاوازییەکەش لەوەدایە کە ئەویان بە فڕۆکەی بۆمباهاوێژی مۆدێرن هەڕەشە دەکا و، ئەمیشیان بە «تەوراسی ژەنگاوی».**

**بەرلین ٢٠٠١/١٠/٢٠**

سەرنج!

ئەم وتارە لە ژمارە (١٠٩)ی ڕۆژی ٢٠٠١/١١/١ی ڕۆژنامەی «میدیا» دا کە لە هەولێر دەردەچێ بڵاوکرایەوە.

هەروەها لە ژمارە ٢٢ی گۆڤاری «کۆنگرە» زمانحاڵی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان لە مانگی خەزەڵوەری ٢٠٠١ دا بڵاوکرایەوە.

# کورد لە ڕۆژانی
# پەلامارذانی ئەفغانستاندا

لە وتاری **«تیرۆر و ئەمریکا و کورد»** دا (**میدیا ١٠٩، ساڵی شەشەم ٢٠٠١/١١/١**) و (**کۆنگرە ژمارە ٢٢ بەفرانباری ٢٠٠١**)، هێندەك لایەنی ئەم باسەم ڕۆنکردەوە و گوتم ئەوانەی لە باکووری **ئەفغانستان** دا چەند ساڵێکە گیریان خواردووە و، بە خۆیان دەڵێن **«تحالف شمال»** ئەگەر هاتو توانییان بەیارمەتیی هێزی سوپاییی ئەمریکا بینە فەرمانڕەوا، ئەوا دەستدەکەن بە کوشتنی نەیارەکانیان، چۆنکە ئەوانیش هەروەك **«تالیبان»** پەروەردەیەکی دێمۆکراتانە و ئازادیخوازانەیان نییە. ئەمە بەئاشکرا دەرکەوت، کاتێك کە چەکدارەکانی **«تحالف شمال»** کە بریتین لە ئەندامانی کەمایەتیی **ئۆزبەك و تاجیك و هەزارە و ....**، ڕژانە **مەزاری شەریف و کابلەوە** و کەوتنە کوشتنی هەزاران ژن و پیاو لە **پەشتوونەکان** کە لە ٤٠٪ی خەڵکی ئەفغانستانن و بەژمارە لە هەموو گەلەکانی دیکە زێترن.

ئەوڕۆ، کە ئەم وتارە دەنووسم ڕۆژی ٢٠٠١/١١/٢٥ ە و نازانم ڕۆژی سێ شەممەی ١١/٢٧ کۆبوونەوەی **بۆن (ئەلمانیا)** چ بڕیارێك دەدا لەبارەی دوارۆژی ئەفغانستانەوە، بەڵام بەدڵنیاییەوە دەبێژم، هەر حکوومەتێکی ئەفغانی کە پەشتوونەکانی تێدا نەبن، سەر ناگرێ. **رووسەکان دژی پەشتوونەکانن، چۆنکە پەشتوونەکان پشتگیریی جیابوونەوەخوازانی چەچەنستان دەکەن. هێندستانیش هەر دژی پەشتوونەکانە، چۆنکە پاکستان لەبەر هێندەك هۆی جوگرافیایی و ئاینی و رامیاری پشتی پەشتوونەکان دەگرێ.** جا لەبەر ئەوە ئەگەر **ئەمریکا و ئەورووپا و کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان** چارەسەرێکی ژیرانە بۆ کێشەی ئەفغانستان نەدۆزنەوە، ئەفغانستان وەك لوبنانی حەفتاکان و هەشتاکانی لێ دێ و بگرە خراپتریش. ڕژێمی ترك و ڕژێمی رووسیە لە هەموو ڕژێمەکانی دیکە پتر کەوتوونەتە بازرگانی بەخوێنی گەلی ڕەشڕووتی بەر بۆمباکەوتووی ئەفغانستانەوە. **ڕژێمی ترك پاش ئەوەی ساڵانی ساڵ پشتی دەستوەشاندنی ترکە ڕاپەڕیوەکانی چەچەنستانی گرت، ئێستە وا خەریکە دەیانفرۆشێ بە کەڵەسەری کورد.** سەرکردەی

**سوپای ترك حسەین قوریق ئۆغلو چەند رۆژێك لەمەوبەر بە رۆژنامەی «ئایدن لق»ی گوت کە «یاخی بووە چەچەنەکان رێکخراوێکی تیرۆریستین»**، بەرامبەر بەوە **رژێمی مۆسکۆ** بەڵێنی داوە بە دەوڵەتی ترکان کە ئێدی **«پەنا نادا بە ئەندامانی پێ کێ کێ لە رووسیا بمێنەوە»**. هەروەها **رژێمی مۆسکۆ رژێمی ترکی «دڵنیا کردووە کە دژی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کورد دەوەستێ لە باکووری عێراقدا»**. بەپێی رۆژنامەکە **حکوومەتی ترك پێی وایە کە ئەمریکا دەیەوێ دەوڵەتێکی کوردی لەو نێوچەیەدا دروست بێ**.

بەڵام با بزانین کورد لەم بازارە پڕ لە ئاژاوەیەی بازرگانیی رامیاریدا چی دەستکەوتووە. ئەمە لە کاتێکدا کە هەوڵ و تەقەلای **ئێران و دەوڵەتی ترك و سووریا** بۆ نەهێشتنی **هەرێمی ئاسایش** رۆژ بە رۆژ پتر جۆش دەستێنێ و «پاکتاوکردنی رەگەزی» بۆ نەهێشتنی کورد لە کوردستانی ژێردەستی **سەددام دا** و هەڕەشەکردن لە کورد رۆژ لەدوای رۆژ شێتگیرانەتر دەبێ.

ئەگەر کەسێك رۆژنامەکانی **یەکێتی و پارتی** بخوێنێتەوە، بەتایبەتی دەزگەی راگەیاندنی یەکێتی، پێی وادەبێ «دەوڵەتێکی کوردیی» بەهێز و بە دەسەڵات هاتووەتە کایە کە هەموو جیهان رێز دەنێ لێی. نوێنەرانی ئەم حیزبانە زوو زوو سەر لە کاربەدەستانی دەوڵەتە گەورەکان دەدەن و بەوپەڕی خۆشییەوە بەخێرهاتن دەکرێن و بەڵێن دەدرێ پێیان کە مافی کورد بپارێزرێ و ... هتد. خۆ ئەگەر ئەمە هورد بکرێتەوە، ئەوا دەزانین ئەوە دەساڵ پترە هەرێمێکی نێوچەی باشووری کوردستان بەدەست ئەم دوو حیزبەوەیە و تا ئەورۆش هیچ دەوڵەتێکی ئەم جیهانە، تەنانەت «جزرالقمر» یش بەرەسمی هەرێمی نەناسیوە. ئەمەش جێی سەرسوورمان نییە، چۆنکە بۆ گەیشتنە ئەو پلەیە دەبێ جارێ نوێنەرایەتییەکی کوردی هەبێ کە لەلایەن پەرلەمانێکی یەکگرتووی هەڵبژێردراوەوە دەستنیشان کرابێ، نەك هەر یەکە خۆی بە نوێنەری کورد بزانێ، بەڵام بەنێوی حیزبی خۆیەوە قسە بکا و حیزبەکەی دیکە دانی پێدا نەنێ. لەبەر ئەوە قسەیەکی خۆشی کاربەدەستێکی ئەورووپایی، یان ئەمریکایی لەمبارەدا هیچ جۆرە دەروێستی (التزام) یەك دروست ناکا. ئالەم گێژاوە رامیارییەدا ئامۆژگاریکەرانی کورد یەکجار زۆر بوون. تەنانەت یەکێکی وەك **مەکرەم تاڵەبانی** بەخۆی و کۆمەڵێك رابردوو و ئێستەی پرشنگدارییەوە لێمان بووە بە

مامۆستا و، دەیەوێ حیزبەکان فێر بکا چۆن خۆ جیاکردنەوە لە یەك و خۆ دوورخستنەوە لە یەك باشتر بچەسپێنن. کەچی ئەوەتە لەلایەن یەکێتییەوە بەوپەڕی رێزەوە بەخێرهاتن دەکرێ و «وتارەکەی» لە رۆژنامەی نێوەندیی یەکێتی **«الاتحاد»** دا بلاو دەکرێتەوە. ئێمەش هەر ئەوەمان لە دەست دێ بێژین: **«لە بەرە بەرەی پڕدەرێ، هۆمان کەوتووەتە قرپنەی دایکی هاژەرێ»**.

بەڕاستی چارەڕەشییەکی سەختە بۆ کورد کاتێك دەبیستم ئەو تۆرانییانەی کە لە هەولێر سەرەڕای هەموو سەربەستییەك کە هەیانە، دان بەبوونی وشەی کوردستان و دەسەلاتدارێتیی کوردستاندا نانێن و، دەیانەوێ رێکخراوە خوێندکارانەکەیان کە بێزی نایە داوای «ئیجازە» بکا لە کاربەدەستانی هەولێر، بچێتە هەلبژاردنەوە و، لەبەر ئەوە لەلایەن کاربەدەستانەوە رێ نادرێ پێی، کەچی کە دەچنە سلێمانی، کۆمەلی خوێندکارانی سەر بە یەکێتی رێیان پێدەدا بچنە هەلبژاردنەوە. (رادیۆی العراق الحر رۆژی ١١/٢٤ لە هەولێرەوە) و،

ـ ئەمە لەکاتێکدایە کە سێ سالە کاربەدەستانی یەکێتی بەلێن دەدەن بە کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان کە ئیجازە بدەن پێی، بەلام ئەنجامەکەی هەر دەستبڕین و دەستخەڕۆ کردن بوو ... بیانویان بۆ ئەمەش وەك لە رۆژنامەکەیاندا «کوردستانی نوێ» بلاویان کردووەتەوە ئەوەیە کۆنگرە مەلبەندەکەی لە کوردستان نییە.

هەروەها دەبێژن کە «کۆنگرەی نەتەوەیی» یش مەلبەندەکەی لە کوردستان نییە بۆیە «ئیجازە» بەو دووانە نادرێ. راستە کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان سەرکردەیەتییەکەی لە کوردستان نییە بەلام کۆنگرە حیزب نییە، بەلکو رێکخراوێکی کوردستانی ئینتەرناسیۆنالییە. کۆنگرە رێکخراوێکی پاکژ و سەربەرزە و نایەوێ ببێتە دەسکەلای هیچ حیزب و رژێم و دەولەتێك و بەشێوەیەکی ئاشتیخوازانە بۆ سەربەخۆیی کوردستان کار دەکا. ئا ئەمەیە کە ترسی بە هێندێك لە کاربەدەستانی یەکێتی پەیدا کردووە، چۆنکە دەزانن رێ بە چالاکیی کۆنگرە بدرێ، جەماوەرێکی زۆری لە گەل دەبێ و، لە سەرێکی دیکەشەوە داگیرکەرانی کوردستان دلیان لە یەکێتی دەئێشێ. ئەگەنا لەبەر ئەوە نییە کە مەلبەندی سەرکردەیەتیی کۆنگرە لە دەرەوەی کوردستانە. چۆنکە کاربەدەستانی یەکێتی زۆر باش دەزانن کە یەکێتی لە

١٩٧٥ دا له کوردستان دانەمەزرا، بەڵکو له دیمەشق و به سەریەرشتیی و چاودێری رژێمی سووریا هاتە کایەوه و سەرکردەتییەکەشی ماوەیەکی زۆر لەوێ مایەوه و هەر لەوێشەوه چەکداریان بۆ دەکرا به باشووری کوردستاندا. ئەمە له کاتێکدایە کە رژێمی سووریا نه ئەو کاته و نه ئێستەش دان به بوونی گەلی کورد دا نانێ له سووریا. تۆ واز له نێوی رۆژاوای کوردستان بهێنه، ئاشکرایە کە یەکێتی لەوه بێدەنگ بووه، کە ئەورۆ باسی گەلی کورد و رۆژاوای کوردستان دەکرێ، به سایەی تێکۆشینی نەتەوەییەکانی کوردەوەیە نەك یەکێتی. پاشان کە **«کوردستانی نوێ»** باسی «کۆنگرەی نەتەوەیی» دەکا، ئایە ئەوه نازانێ کە **«کۆنگرەی نەتەوەیی»** رێکخراوێکی حیزبی سەر به **پی کی کی** یە و لەدامەزراندنی ئەو رێکخراوەیەشدا یەکێتی «دەستێکی باڵا»ی هەبوو. رۆژنامەکانی یەکێتی به ئاوتاوەوه باسی «کۆنگرەی نەتەوەیی» یان دەکرد، بێگومان نەك لەبەر چاوی رەشی پی کی کی بەڵکو لەدژی پارتی، بەڵام به یەك وشە باسی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستانیان نەدەکرد. ئەمە له کاتێکدا کە **کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان** له چاکە پتر هیچ خراپەیەکی بەرامبەر یەکێتی نەکردووه. ئەز گەلێك زانیاریم لا هەیە چ لەبارەی پێوەندییەکانی یەکێتی به پی کی کی وه هەر له ١٩٨٠ ەوه، هەروەها گەلێك زانیاریی دیکەش، بەڵام له لایەکەوه بۆ پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی و له لایەکی دیکەوه له خۆشەویستیی ئەو دۆست و هاوبیرانەی کە ئەندام و لایەنگری یەکێتین و ئەم کردەوه دوژمنانەیەی هێندێك له کاربەدەستانی یەکێتییان زۆر پێ ناخۆشە، جارێ چاوپۆشی دەکەم. بەڵام شەرلەتەنەکانی نێو یەکێتی پێویستە بزانن کە کوردایەتی کردن مافی رەوای هەموو کوردێکە و کوردایەتیکردن «مارگرتن» نییە کە به «ئیجازەی» شێخی شەرلەتەنان بێ.

وادیارە ئەوی رێزی شەرلەتەنان بگرێ، بێ رێز تەماشای دەکەن.

جەمال نەبەز

بەرلین: ٢٠٠١/١١/٢٥

: گۆڤاری «کۆنگرە» ژمارە ٢٢ بەفرانباری ٢٠٠٢ ی زاینی.

# ئازادی

# و

# حیزبایەتی

حیزب وشەیەکی عارەبییە. وادیارە ئەم وشەیە لەزمانی عارەبیدا لەپێش دەرکەوتنی ئیسلامدا بووە، واتە، پانزە سەتە لەمەوبەر. هەرچی چۆنێك بێ نازانین حیزبایەتی لە کۆمەڵگەی عارەبی پێش ئیسلامدا چۆنچۆنی بووە، بەڵام بەهۆی قورئانەوە دەزانین کە ئاینی ئیسلام حیزبایەتی بە شتێکی باش نەزانیوە و خەڵکی هانداوە کە لایەنی **«حیزبی خودێ»** **(حزب الله)** بگرن. دیارە مەبەست لە «حیزبی خودێ» گوێڕایەڵییە بۆ فەرمانەکانی خودێ و گوێنەگرتنە لە فەرمانەکانی «دارودەستەی شەیتان» کە بە **«حزب الشیطان»** نێوی بردووە و، جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە **«حیزبی خودێ»** دەیباتەوە **(سوورەتی المائدة ئایەتی ٥ و سوورەتی المجادلة ئایەتی ٥٨)** و **«حیزبی شەیتان»** دەیدۆڕێنێ **— سوورەتی المجادلة ئایەتی ٥٨ »**.

شایانی باسە کە حیزب لە ولاتی **یۆنانی کۆندا لە شاری «ئاسینا»** گەلێك پێش ئیسلام هەبووە، وەك **«حیزبی ئەرستۆکراتی»** و **«حیزبی دیمۆکراتی»** و ... هتد. بەڵام حیزب بەمانای نوێ لەسەتەی ١٩ ەوە لە ولاتانی رۆژاوادا هاتووەتە کایە، پاش ئەوەی تیۆری **«حکوومەتی گەل»** لە **ئینگلستان و فەرەنسا و ئەمریکا** لە سەتەی ١٨ دا هاتە پێشەوە، بە ئامانجی کۆکردنەوەی هاوولاتانی دەوڵەتێك لە دەوری رێکخراوێکی رامیاری بە مەبەستی چوونە هەڵبژاردنەوە و بردنەوەی زۆرترین ژمارەی دەنگەکان بەنیازی گرتنە دەستی فەرمانڕەوایی لەو دەوڵەتەدا. کوردیش لە کۆتاییی سەتەی نۆزدەهەمەوە (واتە سەت ساڵێك لەمەوبەر) دەستی بە دروستکردنی رێکخراوی سیاسیی کردووە، بەڵام نەك بە ئامانجی چوونە هەڵبژاردن و

فەرمانڕەوایی گرتنە دەست لە کوردستانێکی سەربەخۆ و دێموکراتدا، بەڵکو بۆ خۆکۆکردنەوە و بەرخۆدان و بەربەرەکانێکردنی داگیرکەران.

مەبەستی ئەم وتارە ئەوە نییە کە مێژووی حیزب و حیزبایەتی و حیزبەکانی کوردستان باس بکا، بەڵکو دەیەوێ پێوەندیی حیزب و حیزبایەتی بە تێگە (مفهوم) ی ئازادیی مرۆڤەوە بخاتە بەرچاو. بەرلە هەموو شتێك دەبێ بزانین کە بۆ بوونی حیزب و حیزبایەتی بەمانای راستینەی مۆدێرنی خۆی، دەبێ کۆمەڵگەیەکی دێموکراتی هەبێ تاکو حیزب بتوانێ بە سەربەستی بەرنامەی خۆی لەنێو گەلدا بلاو بکاتەوە و بکەوێتە چالاکی بۆ کۆکردنەوەی خەڵك و، خەڵکەکەش سەربەستیی ئەوەیان هەبێ کە بتوانن بێترس دەنگ بدەن بە «ئا» یان «نا» بۆ ئەم یان بۆ ئەو حیزب. خۆ ئەگەر وانەبێ، ئەوا حیزب مانای نابێ و دەبێتە دەستەیەك خەڵکی ئەڵقە لەگوێی حکوومەت/ یان دەستەیەك خەڵکی هەڵگەڕاوە لە حکوومەت. جا هەتا سیستەمی ولاتێك ملهوڕانەتر و دیکتاتۆرانەتر بێ و حیزبەکانی دژ بە حکوومەت ناچار بن خۆیان بشارنەوە، هەڵسوکەوتی حیزبە بەرهەڵستکارەکان بەناچاری ڕێیەکی نادێموکراتیانە وەردەگرێ و لەوە دەردەچێ کە نێوی «حیزب» یان پێ ببرێ. لەبەر ئەوە باسەکەمان لێرەدا لە سەربەخۆییی راستینەیە، واتە ڕێکخراوێکی سیاسی لە کۆمەڵگەیەکی سەربەستدا.

ئێستە بەرلە هەموو شتێك دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە حیزب بە ژمارە گەورە بێ یان بچووك بێ، ئەوە هەر بریتییە لە دەستەیەك خەڵك، واتە هەموو کۆمەڵگەکە نییە. لە ولاتێکی دێموکراتیدا کە هەڵبژاردنی پەرلەمان بەسەربەستی کوتاییهات و حیزبێك لە ٥٠٪ پتری دەنگەکانی بردەوە، مافی ئەوەی هەیە فەرمانڕەوایی ولات بگرێتە دەست و، حیزبەکەی دیکە، یان حیزبەکانی دیکە ئەگەر ٤٩٪ شیان هەبێت، دەزگەی فەرمانڕەواییان بەدەست نابێ. هەرچەندە دەستووری بنچینەییی ولاتە دێموکراتەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ڕێزی مافی کەمایەتییەکان دەبێ بگیرێ، بەلام ئاشکرایە ئەوی فەرمانڕەوایی بەدەست نەبێ، فەرمان دەکرێ بە سەریدا.

جا فەرمانڕەوایی هەموو جارێك بە بردنەوەی ٥٠٪ پتری دەنگەکان نییە لە لایەن حیزبێکەوە، بەڵکو جاری واهەیە چەند حیزبێك دەچنە زۆرانبازیی هەڵبژاردنەوە و، حیزبێکیان ٤٦٪ ی دەنگەکان وەردەگرێ و، حیزبێکی دیکە ٤٨٪ ی دەنگەکان

دەهێنێ و، حیزبێکی دیکە ٥٪ دەنگەکان. جا لەبەر ئەوەی ئامانجی حیزب فەرمانڕەواییە، ئەو حیزبەی ٤٦٪ی هێناوە لە گەڵ حیزبی ٥٪ دەکەوێتە وتووێژەوە بۆ ئەوەی حیزبی ٥٪ نەچێتە پاڵ ئەو حیزبەی ٤٨٪ی هەیە، ناچار دەبێ گەلێك «تەنازولات» بکا بۆی. حیزبی ٥٪ دەزانێ بەختی باشە، پێ دادەگرێ لەسەر ئەوەی چەند کورسییەکی وەزیرە گرنگەکانی بەربکەوێ، وەك وەزارەتی دەرەوە، یان وەزارەتی نێوخو، یان وەزارەتی کار، یان وەزارەتی زانیاریی. بەوجۆرە حیزبی ٥٪ دەتوانێ چەند ساڵێك سیاسەتی نێوخۆ، یان دەرەوە، یان کار، یان زانیاریی وڵاتێك ئاڕاستە بکا و، ژمارەیەکی زۆر لە لایەنگرانی خۆی بکاتە کاربەدەستی گەورە و دەسەڵاتدار و دەستکەوتی باش پەیدا بکا بۆیان، ئەمە لە کاتێکدا کە تەنێ ٥٪ی گەلی ئەو وڵاتە دەنگی بۆ ئەو حیزبە داوە. جاری واش هەیە حیزبی ٥٪ لە پڕ گێڕ دەگۆڕێ و دەست لە حیزبی هاوپەیمان بەردەدا و دەچێتە پاڵ حیزبی بەرهەڵستکارەوە بەرامبەر دەستکەوتی پتر لە حکوومەتی نوێدا. ئەوی سەرنجی حیزبی «**دیمۆکراتەبەرەللاکان**» FDP بدا کە ئەڵمانەکان بە «**حیزبی پاندۆلی کاتژمێر**» نێوی دەبەن، چۆنکە هەردەم لەملاوئەولا کردندایە، ئەم ڕاستییەی بەجوانی بۆ دەردەکەوێ. ئەمەش لە پێشکەوتووترین وڵاتی دیمۆکراتی جیهاندا وایە. **بەڵام با ئێمە واز لەمە بهێنین و بزانین حیزب نوێنەری بەرژەوەندیی کێیە؟**

بۆ وەرامدانەوەی ئەم پرسیارە **پێویستە بزانین ڕەوایەتیی حیزب لە کوێوە دێ؟ ڕەوایەتیی حیزب لەوەوە دێ کە ئەندامانی کۆمەڵگەیەك هەموو لەباری بەرژەوەندییەوە وەك یەك نەبێت.** بەرژەوەندیی هێندێکیان لە گەڵ بەرژەوەندیی هێندێکی دیکەیان یەك نەگرێتەوە. بۆ پاراستنی ئەو بەرژەوەندییە، **ئەوانەی بەرژەوەندییان وەك یەکە، پێویستییان بەوە هەیە پێکەوە کار بکەن، نەك تاکە تاکە و هەرکەس بۆخۆی. پێکەوە کارکردنیش پێویستی بە ڕێکخستن و بەرنامە و پێوەندی هەیە، کە ئەمانە بە هۆی حیزبێکەوە نەبێ ناکرێ.**

لێرەدا دەبێ بپرسین، بزانین ئایە بەرژەوەندیی چییە؟

**مارکسیستەکان و لیبراڵەکان بەرژەوەندیی بە دەستکەوتی ئابووری لێکدەدەنەوە، بەڵام مارکسیستەکان چینەکانی کۆمەڵگە بە چینەکانی خاوەن بەرژەوەندیی جیاواز و دژیەیەك دەدەنە قەڵەم.** پێیان وایە هەموو حیزبێك بەرژەوەندیی ئابووریی تاکە

چینێکی کۆمەڵگە دەنوێنێ. تەنانەت **لینین** دەیگوت: **«حیزب نێوەرۆکی چینە»**. بە قسەی مارکسیستەکان پارتی کۆمۆنیست نوێنەری چینی کرێکارە. حیزبەکانی دیکەش، یان نوێنەری چینی بۆرژوازیی سەرمایەدارن، یان نوێنەری چینی دەرەبەگن. لێرەدا کە مارکسیستەکان باسی چینی کرێکار دەکەن، سەرنجی ئەوە نادەن کە کرێکاری، بەرلە هەموو شتێك، پیشەیە، وەك دوکتۆری، هەندازیاری، مامۆستایەتی، پۆلیسی و گۆرانیبێژی. کرێکار بە کرێ کار دەکا و ئەگەر کار نەکا، نانی نییە بیخوا، لەبەر ئەوە ناچارە هێزی لەشی بەپارە بفرۆشێ. مامۆستایەکیش بە کرێ (مووچەی مانگانە) کار دەکا، ئەگەر کار نەکا نانی نییە بیخوا، لەبەر ئەوە ناچارە زانستی خۆی بە پارە بفرۆشێ. بەڵام ئەو راستییەش هەیە کە نە کرێکارەکان هەمووکاتێك کرێکەیان وەکیەکە و، نە مامۆستاکانیش هەموو کاتێك مووچەکەیان وەکیەکە. کرێکارێکی کارگەی تێکنۆلۆژیای هورد، کرێکەی گەلێك پترە لە کرێکارێکی سەرجادە کە بەفر بماڵێ لە زستاندا. مامۆستایەکی زانستگە مووچەکەی زۆر زێترە لە مامۆستایەکی قوتابخانەی سەرەتایی. لەبەر ئەوە ئەمانە هەرچەندە سەربە پیشەیەکن (کرێکاری و مامۆستایی)، بەڵام بەرژەوەندیی ئابوورییان وەکیەك نییە. **بەرژەوەندیی وەکیەك لە بارودۆخی وەکیەکەوە دروست دەبێ. کە بارودۆخی دوو کەس، یان دوو کۆمەڵ وەکیەك نەبوو، ناتوانرێ قسە لە بەرژەوەندیی وەکیەك بکرێ. جا لەبەر ئەوەی سنووری چینایەتی، هەموو کاتێك بەرۆنی دیار نییە، ئاشکرایە دابەشکردنی ئەوانەی کە یەك پیشەیان هەیە بەسەر یەك چیندا شتێکی راست نییە. بەپێچەوانەوە دابەشکردنیان بەسەر ساندیکا (نقابة) یەکدا پتر لە واقیعەوە نێزیکە.**

راستییەکەی کۆمەڵگەی مرۆڤ هەرلە بنچینەوە بەسەر دوو بەرەدا دابەشدەکرێ، **بەرەی بەشخوراو و بەرەی بەشخۆر.** تەنانەت وشەی **«زەحمەتکێش»** یش بۆ **«بەشخوراو»** زاراوەیەکی پڕ بە پڕی **«بەشخوراو»** نییە. **چۆنکە زۆر مرۆڤی دەوڵەمەند و سەرمایەدار هەن کە رۆژانە چەند هێندەی کرێکارێك زەحمەتدەکێشن، لە کاتێکدا ئەمانە وەك کرێکارەکە بەشخوراو نین.**

کە لە ساڵی ١٩٧٠ دا هاتم بۆ **بەرلین**، ژوورێکی بچووکم لە ریزە خانوویەکدا بەکرێگرت، کە نێزیکەی ٨٠ ژوور و ئەپارتمانی گەورە و گچکەی بەکرێدراوی تێدا

بوو و، ساڵانی دوورودرێژ لەوێدا ژیام. خاوەنی ئەم ریزە خانووانە کابرایەکی بەساڵداچوو بوو کە شەووڕۆژ لەکاردا بوو. ئەز هەر کاتێك لە ماڵ بچوومایە دەرەوە، یان بهاتمایە ماڵەوە، ئەم کابرایەم لە دەوروبەری خانووەکان، یان لە ژوورەوە دەدی، سا یان شتێکی قورسی هەڵگرتبوو و، یان خەریکی چاککرن و نۆژەن کردنی ئەپارتمانەکان بوو. شەوێکیان دەرنگانێك دەگەڕامەوە ماڵەوە، **هێر شتومفۆلم** دی خەریکبوو دەرکەی خانووەکەی دەکردەوە کە خۆی و ژنەکەی لە نهۆمی دووەمیدا دەژیان و ئەززی لە نهۆمی سەرەوەیدا. **هێر شتومفۆل** زۆر ماندوو و شەکەت دیار بوو. سلاوم کرد لێی و گوتم چۆنیت؟ گوتی: «زۆر ماندووم». گوتم «بۆچی؟». گوتی: «ئەورۆ کار یەکجار زۆر بوو. کرێگرتەیەك ئەپارتمانەکەی چۆلکردووە، داروپەردووی بەسەر یەکدا داوە، دەبێ نۆژەن بکرێ ئەگەنا کەس بەکرێی ناگرێ». منیش بۆ گاڵتە گوتم: «جا کارکردن بۆ تەندروستی باشە، کارکردن خۆشیدەدا بەدڵ. تەمەڵی زۆر خراپە» و قسە نەستەقەکەی ئەڵمانەکانم هێنایەوە بۆی: «چەقۆ کە کاری پێنەکرێ، ژەنگ هەڵدەهێنێ». وادیارە قسەکەم بەدڵی هێرشتومفۆل نەبوو، گوتی: بەهەر جۆرێك بێ ... شەوێکی خۆش دەخوازم بۆت». چەند مانگێك دوای ئەوە، ئێوارەیەکی درەنگ بوو دەگەڕامەوە ماڵێ پاش رۆژێکی پڕ لەکار و هەڵسووڕان. هێرشتومفۆلم دی بە پێپلیکانەکاندا سەردەکەوت بۆ ئەپارتمانەکەی و منیش سلاوم لێکرد و گوتی «چۆنیت؟» گوتم: «سوپاس، ماندووم». گوتی: «بۆچی؟». گوتم: «ئەورۆ کارم یەکجار زۆر بوو». هێرشتومفۆل تەماشایەکی دەموچاومی کرد و گوتی: «جا کارکردن بۆ تەندروستی باشە. تەمەڵی خراپە. چەقۆیەك کە کاری پێنەکرێ ژەنگ هەڵدەهێنێ». بەڕاستی زۆر پێکەنینم هات. گوتم: «هێرشتومفۆل! گۆڵی خۆت کرد. شەوباش».

مەبەستم لە گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە ئەوە بوو کە بەکردەوە پێشانی بدەم، کە هەموو زەحمەتکێشێك مەرج نییە «بەشخوراو» بێ. هێرشتومفۆل بەڕاستی زەحمەتکێش بوو، بەلام ملیۆنێر بوو. هەرچەندە گووینەدەکرد ئەوەك برسیی بێ.

شایانی باسە کە دەسەلاتی ئابووری، دەسەلاتی کۆمەلایەتی لە هەموو کاتێکدا دروستناکا. بۆوێنە کرێکارێکی سوێدی کە بێکار بووبێ و بە پارەی سۆسیال بژی، دەسەلاتی کۆمەلایەتیی و ئازادیی زۆر بەرزترە لە ملیۆنێرێکی کوردی خاوەن

فابریکە و کرێکار و بەردەست کە لە ژێر فەرمانڕەواییی رژێمی دەوڵەتی ترکدا بژی. لەبەر ئەوە، **پلەی چینایەتیی ــ ئابووری، مەرج نییە هەموو کاتێك پلەی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتیی کەسێك دەستنیشان بکا.**

بێجگە لە مارکسیستەکان کە دەبێژن حیزب لەسەر بنچینەی **«چین»** دادەمەزرێ، هێندەك کەسانی ئایینیش هەن کە دەبێژن حیزب لەسەر بنچینەی **«ئاین»** دادەمەزرێ. بۆوێنە موسڵمانەکان دەچن حیزبێکی ئیسلامی دروستدەکەن و مرۆڤی خاوەن باوەڕی تێدەخەن، بۆ ئەوەی بتوانن لەو رێیەوە فەرمانڕەوایی بگرنە دەست. **حیزبە مارکسییەکان و حیزبە ئاینییەکان، هەر یەکە بەشێوەی خۆی، دەچنە ژێر خانەی رێکخراوی خاوەن ئیدیۆلۆژییەوە.** هەڵبەتە رێکخراوی دیکەش هەن کە دەچنە خانەی رێکخراوی ئیدیۆلۆژییەوە، لەگەڵ ئەوەشدا جەماوەرەکەی ئەم حیزبانە وەنەبێ هەموو یەکرەنگ بن، یان هەموو لە ئیدیۆلۆژیای خۆیان باش گەیشتبن، بەڵکو مرۆڤی جیاواز جیاواز خۆیان دەگەیەننە نێو ئەم حیزبانە و جاری واش هەیە دەبنە سەرکردە و بەڕێوەبەر. پاش سەرکەوتنی شۆرشی ئێران بە سەرۆکایەتیی خومەینی و داخویانیکردنی «کۆماری ئیسلامیی ئێران» **گەلێك حیزبی ئیسلامی لە باشووری کوردستان و عێراق و لوبنان و ولاَتانی دی سەریانهەڵدا وەك قارچك**، بەتەواوی وەك ئەوەی کە پاش **سەرکەوتنی شۆرشی ئوکتۆبەر** لە روسیای قەیسەری دا و دامەزراندنی دەوڵەتی سۆڤێت، گەلێك **«پارتی کۆمۆنیست»** لەملاولەولای جیهاندا هاتنە کایەوە.

**جا لەبەر ئەوەی ئامانجی حیزب، هەموو حیزبێك، فەرمانڕەواییە و، ژمارەش دەورێکی زۆر گرنگ و بنچینەیی دەنوێنێ بۆ گەیشتنە فەرمانڕەوایی. بەتایبەتی لە ولاَتانی دێمۆکراتیدا، حیزبەکان ناچار دەبن پرۆگرامی وا دابنێن کە بە دڵی خەڵکێکی زۆر بێ، هێندەك جاریش پرۆگرامەکانیان خۆی لە خۆیدا ناتەبا (متناقض) دەردەچێ. ئەم حیزبانە بەهەمەوو شێوەیەك، هەوڵدەدەن ژمارەی خۆیان زۆرکەن. لەبەر ئەوە گوێنادەنە «زۆروبۆر». هێندەك جار بۆ شاردنەوەی ئەم ناتەواوییە دەبێژن**

حیزبەکەیان «حیزبی گەل» ە و «حیزبی هەموو کەسێک» ە. پاش ئەوەی گەیشتنە فەرمانڕەوایی، هێندەك لەو بەڵێنانەی کە لە پرۆگرامەکانیاندا بووە و خەڵکەکە بە هۆی ئەوانەوە دەنگیان داوە بۆی، دەخرێنە پشت گوێ و ئەوەش بە چەند بیانوویەکی بێشەرمانە پینە دەکەن.

ئەم بارە نالەبارە کارێکی وایکردووە کە راستە خەڵکەکەی ئەو وڵاتانەی دەزگەی حکوومەت بە هەڵبژاردن دادەنرێ، ناهومێد بێن و زۆریشیان تفونەحلەت لە سیاسەت بکەن و لە ماڵی خۆیان دابنیشن و ئەمەش ئاویکردووە بە ئاشی هەلپەرست و هەڵمەتەکاسە و کوڕی رۆژ و بازرگانی سیاسەتدا. **هۆیەکەشی ئەوەیە کە زۆربەی زۆری خەڵك وا پەروەردە کراون کە دەست بە کڵاوی خۆیانەوە بگرن و هەمیشە رەدووکەون و زاتی ئەوە نەکەن بینە دەستپێشکەر و داهێنەر و رێپێشاندەر.**

ئەمە رەوشی حیزب و حیزبایەتی و ئەنجامەکانێتی لەو وڵاتانەدا کە سیستەمی دێمۆکراتییان هەیە. **بەڵام لەو وڵاتانەدا کە سیستەمی دیکتاتۆری تێدا فەرمانڕەوایە، حیزبەکان، یان کلکی فەرمانڕەواکانن، یان ناچارن بە دزییەوە کار بکەن و خۆیان کۆبکەنەوە بۆ چوونە شەڕەوە لەگەڵ فەرمانڕەوایانی دیکتاتۆر و ملهوڕ. خۆ ئەگەر هاتو رۆژێك ئەم حیزبە میلیتانتانە هاتنە سەرکار، ئەوا دەست دەکەن بە تۆڵەسەندنەوە و گوشارخستنە سەر ئەوانەی لەگەڵیان نین. بەکورتی دەبنە جێگرەوەی دیکتاتۆرە لەکار خراوەکان و، لەوانیش خراپتر.** لەبەر ئەوە زۆر بە دەگمەن هەڵدەکەوێ، حیزبێك لە وڵاتێکی دیکتاتۆرفەرمانیدا دەسەڵاتی دەستبکەوێ، سا ئەو دەسەڵاتە لە ئەنجامی شۆرشێکەوە بێ، یان لە ئەنجامی بەسەرهاتێکی چاوەڕواننەکراوەوە بێ، بتوانێ رێیەکی دێموکراتیانە بگرێ و مافی سەربەستی بەوانی دیکە رەوا ببینێ.

**ئەوجا حیزب، لە دەوڵەتێکی دێمۆکراتیدا بێ، یان لە وڵاتێکی تۆتالیتێردا بێ، بەدەنگی جەماوەرێکی زۆر هاتبێتە سەرکار، یان بە هێزی چەك و لێبڕانی ئەوانەی لەو حیزبەدان، دەسەڵاتی دەستکەوتبێ، ئەوا نەك هەر بۆ بەرژەوەندیی ئەوانە کار ناکا کە دەنگیان داوەتێ، یان فیداکارێتییان کردووە بۆی، بەڵکو بۆ بەرژەوەندیی ژمارەیەکی کەم لەوانەی لەنێو حیزبەکەدا کاربەدەستن، سا یان بیرۆکراتن، یان**

**دیماگۆك و درێژدادڕن، یان ماستاوکەری سەرکردەکانی حیزبەکەن.**

ئەز بەچاوی خۆم گەلێك مرۆڤی خەباتکار و دڵسۆز و لێبڕاو و چالاکم دیوە، کە ساڵانی ساڵ بێچاوەڕوانی، لە خزمەت حیزبی خۆیاندا بوون و، بە هەموو جۆرێك قوربانییان بۆ حیزبەکەیان داوە و، لەو پێناوەدا گرتن و لێدان و دەربەدەری و برسێتییان چێشتووە، کەچی کاتێك حیزبەکەیان دەستیبووە، ئەمانە نرخی کەسانێکیان پێ ڕەوا نەدیتراوە کە ساڵانی ساڵ ئەم حیزب و ئەو حیزبیان کردووە، یان لەگەڵ بەرەی نەیار بوون، بەلاّم چۆنکە پارەدار، یان دەستڕۆیشتوو بوون، یان داروەستەیەکیان لەگەڵ بووە، یان بوونە فەرمانڕەوای ڕژێمێك لەڕێی کودەتایەکەوە، وەك داروەستەی بەعس. حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤێت نموونەیەکی ڕۆنی ئەمەیە. **ئەو کۆمۆنیستە کورد و عەرەب و فارسانەی کە ساڵانی ساڵ دەروێشی یەکێتیی سۆڤێت و حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤێتیی بوون، ئەوەتە ئەوڕۆ نرخی بەعسییەکی عەرەب و کاربەدەستێکی ڕژێمی شای لێخراو، یان خومەینی، یان حافز ئەسەد ــ یان نییە کە دوژمنی کۆمۆنیزمن.**

لە گەڵ ئەم هەموو لایەنە خراپانەی حیزبدا، حیزب دەزگەیەکی گەلەکۆمەیە و جارێ هەر دەمێنێ وەك باری ناچاری. لەنێوچوونی حیزب بەندە بە ڕۆشنبیربوونی جەماوەر و پێشکەوتنی تێکنۆلۆژیاوە بە مەرجێك لە خزمەتی هەموو کەسێکدا بێ. لە کۆمەڵگەیەکی ئازاددا هیچ کەسێك پێویستی بە دەمڕاست و نوێنەر و قسەبۆکەر نییە. هەموو کەسێك مافی خۆی دەزانێ و دەتوانێ ئەو مافە بەکار بهێنێ و کۆمەڵگەش دان بەو مافانەدا دەنێ. لەکاتێکدا کە بیروڕای گشتی بەرامبەر ڕووداوێك جیاوازبوو، دەستپێشکەریی جەماوەریی دێتە کایەوە، بۆ دەربڕینی هەڵوێست بەرامبەر بەو ڕووداوە. ئەم دەستپێشکەرییە پاش چارەسەرکردنی ڕووداوەکە نامێنێ، دەستبەجێ گەلەکۆمەکە هەڵدەوەشێتەوە و هەرکەسە دەچێتەوە سەرکاری خۆی.

لەبەرئەوە پێویستی سەرشانی هاوبیرانی ڕێبازی ئازادی و یەکسانیی مرۆڤ ئەوەیە هەتا دەتوانن بۆ ڕۆشنبیرکردنی تاکەتاکەی کۆمەڵگە هەوڵبدەن و بیرۆکەی حیزبی تاقانە و حیزبی پیرۆز و حیزبی سەرکردە و حیزبی پێشڕەو لە مێشکی خەڵك بکەنە دەرەوە و لە ئەندامانی هەموو حیزبەکان بگەیەنن کە بەهیچ جۆرێك

دوژمنایەتی و دژایەتیی یەکدی نەکەن و لەڕێی گۆڕینەوەی بیروڕاوە بگەنە باشترین و لەبارترین چارە بۆ کێشەکانی کۆمەڵگە.

**ڕۆشنبیرانی کورد دەبێ لە ئەندامانی هەموو حیزبەکان بگەیەنن کە نابێ ڕێبدەن بە هەلپەرست و داخ لەدڵ و خۆپەرست و ماستاوکەر، خۆیان بخزێننە حیزبەکانەوە و، گورج کردەوە خراپەکانیان لەبەر دەم جەماوەردا یەکالا بکەنەوە.**

**دەبێ ڕۆشنبیرانی کورد لە جەماوەری کورد بگەیەنن کە حیزب دەزگەیەکی «پیرۆز» نییە، بەڵکو ڕۆلی کەرێک دەبینێ، دەبێ ئەندامەکانی سواری بن، تا دەگەنە ئامانج. خۆ ئەگەر ڕێبدەن خودێ نەکا، «کەرەکە» سواریان بێ، ئەوا هەش بەسەریان!.** ■

**گۆڤاری «کۆنگرە» ژمارە ٢٣**

**نەورۆزی ٢٠٠٢ی زاینی.**

**سەرنج!**

**ئەم وتارە بەشێکە لە «هێندێک لەکێشە بنەڕەتییەکانی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم»**

# ئێزیدییەکان و مالا ئێزیدییان لە ئۆلدنبورگ

لەبارەی کوردە **ئێزیدییەکان و ئاینی ئێزیدییەوە** گەلێك پەرتوك و گوتار بە زمانانی رۆژهەلاتی و رۆژاوایی بلاو کراونەتەوە، کە بە داخەوە زۆربەی زۆریان نابابەتانە و تەنگەتیلکانە نووسراون. مرۆڤ ئەگەر بە چاوێکی زانستکارانە تێیان بڕوانێ، دەبینێ پڕن لە درۆ و دەلەسە و بوختانکردن بە ئێزیدییەکان و هەولدانێکی بێویژدانانەیە بۆ گەلەکۆمەی کەسانی بەرچاوتەنگ و نەزان لەنێو موسلمانانندا لە دژیان. مێژووی کوردە ئێزیدییەکانیش پڕە لە دەستدرێژی و پەلامار بۆ سەرومال و ناموسیان و هەروەها پڕیشە لە ئازایەتی و خۆڕاگری و فیدارکارێتیی ئێزیدییەکان بۆ پاراستنی باوەڕەکەیان. جا لەبەر ئەوەی ئاینی ئێزیدی لە لایەن دراوسێکانیانەوە بە **«خودێ نەناسی»** و **«لە دین وەرگەڕان»**، درابووە قەلەم، ئەوا سەرومالیان حەلال کرابوو، بەتایبەتی لە سەردەمی عوسمانییەکاندا، لەبەر ئەوە ئێزیدییەکان ناچار بوون فەرمانەکانی ئاینەکەیان بە دزییەوە بەجێبهێنن تا لە کوشتن و مال تالانکردن و ئەتککردن و دەربەدەر کردن رزگاریان بێ. دیارە کاتێك کەسێك، یان کۆمەلێك ناچار کرابێ بە خۆشاردنەوە، زۆر بە زەحمەت دەتوانێ وەرامی بوختانی دوژمنانی بداتەوە، بە پێچەوانەی کەسێك، یان کۆمەلێکەوە کە سەربەستیی رادەربڕین و چالاکی هەبێ.

ئەم بارە ناهەموارە درێژەی کێشا هەتا **شۆرشی ئەیلوول** کە لە سالی ١٩٦١ دا لە باشووری کوردستان هەلگیرسا و ژمارەیەکی زۆر لە ئێزیدییەکان، شان بە شانی **کاکەییەکان و هەقەکان و شەبەکەکان** وەك پێشمەرگە بەشدارییان تێدا کرد. ئەم بەشدارییە و بەهێزبوونی رۆژ لەدوای رۆژی بیری نەتەوەیی لەنێو کورددا، رێی بۆ ئێزیدییەکان کردەوە کە برێك لە کولتووری خۆیان پێشانی دەرەوە بدەن، بەلام تێکشکانی کوتوپڕی شۆرشی ئەیلوول لە ١٩٧٥ دا و هەولدانی **رژێمی تیرۆریستی عێراق** بۆ تواندنەوەی ئێزیدییەکان و کردنیان بە عەرەب، بووە بەرهەلست لەڕێی تێکۆشانی ئاشکرای ئێزیدییەکاندا بۆ خستنەڕووی باوەڕەکەیان. شان بە شانی

ئەوەش زۆرداریّتی و ملهوڕیی رژێمەکانی ترك و سووریا دژی کورد و بە تایبەتی دژی ئێزیدییەکان بوو بە هۆی ئەوەی هەزاران خێزانی ئێزیدی ناچار بن کوردستان بەجێبهێڵن و روویکەنە ئەوروپا و ئەمریکا کە لەوێ هەوایەکی ئازادییان هەڵمژی و هێندێك لە رۆشنبیرەکانیان کەوتنە سەر رێی ئەوەی خۆیان بناسێنن بە گەلانی رۆژاوایی. بەلاٌم ئەوانیش کە لە کۆمەڵگەی ترسدا لە دایکبووبوون و گەورە بووبوون، سەریان لە گەلێك لایەنی گرنگی ئاینەکەی خۆیان دەرنەدەچوو. بۆوێنە: **بۆ ئەوەی تۆمەتی «خودێ نەناسی» لە خۆیان دوور بخەنەوە، دەچوون ئاینی ئێزیدییان بە ئاینی زەردەشتی دەدایە قەڵەم، ئەمە لە کاتێکدا کە ژێرخانی باوەڕی ئێزیدێتی و فەرهەنگی ئێزیدێتی گەلێك پارچەی ئاینی میترایزم (خۆرپەرستی) و ئاینە هێندۆئەورووپاییە کۆنەکانی تێدایە کە ئەمانە کۆنترن لە ئاینی مەزدایەسنیی زەردەشت.**

ئەز بەش بە باری خۆم، سەرەتای هەستکردنم بەوەی کە ئاینی ئێزیدی بەشێکە جیا ناکرێتەوە لە کولتووری نەتەوەی کورد، دەگەرێتەوە بۆ سەرەتای پەنجاکان، واتە بۆ ئەو سەردەمەی کە خوێندکار بووم لە زانستگەی **بەغدا** و، چ لە زانستگە و چ لە دوکانی **مامۆستا بەشیر موشیر (ئوستاد) گەلێك ئێزیدی و کاکەییم** ناسکرد و کەوتمە پرسیار لێیان لەبارەی ئاینەکەیانەوە. کاتێك قسەکانی ئەمانم بەراورد دەکرد لەگەڵ ئەو شتانەی کە بە عەرەبی و فارسی و ترکی نووسرابوون لەبارەیانەوە وەك نووسینەکانی **عەباسی عەززاوی و عەبدولڕەزاقی حەسەنی و سەدیقی دەملووجی و مستەفا بەگ** و کێ و کێ، زەوی و ئاسمان دوور بوون لە یەك، ئەوجا بۆم رۆن بووەوە کە زۆر شت بەناڕەوا و بوختان دراونەتە پاڵ ئەم ئاینانە، وەك «شەوەڕەش» (چراپف) و «ئەهریمەن پەرستی». ئەمە وای لە من کرد کە پتر لەو ئاینانە بکۆڵمەوە. لە ئەنجامی ئەوەدا گەیشتمە ئەوەی کە ئەم ئاینانە لەسەر بنەمایەکی کولتووری کۆنی کوردستان دامەزراون و بەشێکن لە فەرهەنگی نەتەوەی کورد و پێویستە بهێنرێنە بەر رۆناکایی.

کە لە سەرەتای شەستەکاندا هاتمە ئەورووپا، زانیارییەکی باشم لەبارەی ئێزیدییەکانەوە کۆکردبووەوە کە لە ئەورووپادا کەوتمە فراوانکردنی. لەنێوەی یەکەمی

حەفتاکاندا **هاوبیری هێژا بەڕێز یوسف نەسرۆ کە ئێزیدیی نێوچەی ئافرینە**، لە سەفەرەکانیدا بۆ رۆژاوای کوردستان گەلێك قەولی ئێزیدییەکانی کۆکردەوە بۆم. خۆشی باسێکی لەوبارەیەوە نووسی.

دۆستایەتی بەستنم لە گەڵ ژمارەیەکی زۆر لە کارکەرە ئێزیدییەکان و کەسایەتییە ئاینییەکانیان لە ئەڵمانیا منی خستەسەر بیری ئەوەی هاوکاریی ئێزیدییەکان بکەم بۆ ناسینی ئاینەکەیان بەڕەسمی لە ئەڵمانیا. بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە لەگەڵ **بەڕێز شێخ سمایل دەنز** پێش ئیمامی ئێزیدییەکان پێوەندیمان بە گەلێك سیاسەتکاری ئەڵمانیاوە کرد و بەسەتان ئیمزامان کۆکردەوە بۆ ئەم داخوازییە و، هێندێك بەڵینیشمان وەرگرت. جا هەرچەندە ئەو بەڵێنانە بەجێ نەهێنران، ئێمە لە هەوڵدانی خۆمان نەکەوتین. **خەریکبوونم بە لێکۆڵینەوەی ئاینی ئێزیدی و کاکەیی (ئەهلی هەق، یارسان) و هەقە و شەبەك و ئاشنایی پەیداکردنم لە گەڵ کوردە ئەلەوییەکان، بەتایبەتی لەو ساڵانەدا کە بۆ «ئەنجومەنی لێکۆڵینەوەی زانستانەی ئەلمان» (دۆیچە فۆرشونگس گێمانین شافت)** کارم دەکرد، **بوو بە هۆی ئەوەی باسی ئەم ئاینانە بخەمە بەرنامەی کاری ئەنجومەنەوە و، دەست بە نووسینی لێکسیکۆنێکی گەورە بکەم بە زمانی ئەڵمانی بەنێوی «لێکسیکۆنی میتۆلۆژیای کورد» ەوە کە بەداخەوە هێشتا چاپ نەکراوە.** هەروەها توانیم گۆتارێك لە «لێکسیکۆنی جیهانی ئیسلام» دا لەسەر ئاینی ئێزیدی بنووسم و بۆ یەکەمجار پەنجە بخەمە سەر ئەو راستییە کە ئێزیدییەکان «یەزیدی» نین و پێوەندییان بە **یەزیدی کوڕی معاویەوە** نییە و، خۆیان بە خۆیان دەبێژن: **«ئێزیدی» نەك «یەزیدی»** و ئەم نێوەش بەسە وەك بەڵگەیەك بۆ راستکردنەوەی ناسنامەی ئێزیدییەکان.

بە توێژینەوەی ئەم ئاینانە دەرکەوت بۆم کە **ئێزیدێتی و کاکەیەتی (یارسانێتی) و ئەلەوێتی**، هەر یەکەیان گۆی ملوانکەیەکن و گەلێك تایبەتکاری وەك یەکیان هەیە و بنەچە و ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ فەرهەنگی کۆنی کورد و کوردستان.

بێجگە لەوەش دەرکەوت بۆم کە هەڵگرانی ئەم ئاینانە «موسڵمانی ساختە» نین، وەك هێندەك پەرتۆکنووسی ئەورووپایی دوور لە بابەت، نێویانلێناون، بەڵکو کۆمەڵە ئاینێکی سەربەخۆن کە من بۆ ئەم ئاینانە و بۆ یەکەمجار زاراوەی

سینکرێتیزمم بەکار هێنا. سینکرێتیزم بریتییە لە پەیدابوونی باوەڕێکی نوێ لە یەکگرتنی چەند باوەڕێك بە شێوەیەکی زنجیرەیی، نەك بەشێوەیەکی تێکەڵوپێکەڵ لەنێو یەکدا توانەوە. **سینکرێتیزم وەك ئەوە وایە تۆ بچیت چەند گوڵێکی رەنگاورەنگ (زەرد و سۆر و پەمەیی و وەنەوشەیی و ... هتد) بە یەکەوە ببەستیت و چەپکێك گوڵ دروستبکەی لێیان، کە دیارە هەر گوڵە رەنگی خۆی و شێوەی خۆی پێوە دیارە، بەڵام هەموو پێکەوە نە زەردن و نە سۆرن و نە پەمەیی و نە وەنەوشەیی، بەڵکو «یەکەیەکی نوێ» یە کە ئەوەش «چەپکە گوڵ» ە. ئەم ئاینانەش تایبەتکاری میترایزم و مەزدایزم و مانیزم و بودایزم و مووسایزم و عیسایزم و ئیسلامەتییان لە خۆیاندا کۆکردووەتەوە بەشێوەیەکی زنجیرەیی وئاینێکی نوێیان هێناوەتە بەرهەم بە وێنەیەکی سینکرێتیستی.**

لە هەشتاکان و نەوەتەکانی سەتەی رابوردوودا ژمارەی ئێزیدییەکان لە ئەلمانیا یەکجار زۆر بوو، ئەوەش بەهۆی ئەو زۆرداریيەوە بوو کە رژێمەکانی **ترك و عێراق و سووریا و ئەرمەنستان و گورجستان** بەرامبەر بە ئێزیدییەکانی بندەستی خۆیان دەکەن و ئێزیدییەکان ناچار دەبن نیشتمان و ماڵی خۆیان بەجێبهێڵن و روو بکەنە تاراوگە. **زۆربەی زۆری ئێزیدییەکانی ئەلمانیا لە شاری تسێلەcelle و بیلەفێلد Bielefeld و ئۆلدنبورگ Oldenburg** دەژین. هەرلەو کاتەدا ژمارەی ئەلەڤییە کوردەکان لە ئەلمانیا بەهۆی هاتنی «کرێکاری مێوان» ەوە بۆ ئەلمانیای رۆژاوای ئەو سەردەمە زۆر بوو. هەروەها بەهۆی ملهوڕیی رژێمی ترکەوە بەرامبەر ئەلەڤییەکان و کوشتاری ئەلەڤییەکانی مەرەش لە لایەن ترکە فاشیستەکانی سەر بە ترکەش و بزووتنەوەی «گورگە بۆر» ەوە، هەزاران ئەلەوی ناچار کرد نیشتمانی خۆیان بەجێبهێڵن.

هەرچی ئێزیدییەکانن، ئەوا دەبێ بزانین کە گەلێك لایەن تا ئەورۆ هەوڵیانداوە دایانبدۆشن بۆ بەرژەوەندیی ناڕەوای خۆیان. بۆوێنە: رژێمی عێراق بە عەرەب نێونووسی کردن. ئەرمەنییەکان و هێندەك ئەورووپایی بەیتوبالۆرەی ئەوە لێدەدەن کە ئێزیدییەکان کورد نین بەڵکو «گەلێکی جیاوازن». دیارە ئەم بەیتوبالۆرەیە لەوە پێش بۆ ئەلەڤییەکان و کاکەییەکانیش لێدەدرا و سەرینەگرت.

شایانی باسە کە تا ئەورۆ هیچ کۆمەڵێکی کورد لە ئەوروپا نەیتوانیوە خانوویەکی سەربەخۆی هەبێ، ئینیستیتۆی کورد لە پاریس نەبێ، بەڵام ئەم ئینیستیتۆیە بە یارمەتی راستەوخۆی حکوومەتی فەرەنسا و بە پارەی پیتاك كڕاوە. لە کاتێکدا کە ئێزیدییەکان بەکارکەری خۆیان و هەندازیاری خۆیان و بەنای خۆیان و ژن و پیاو و مێرمندالی خۆیان و هەمووشی بە خۆڕایی و هەرەوەزی، واتە بە ڕەنجی شانی خۆیان، کۆشکێکی دوو نهۆمی کە رووبەرەکەی ۷۰۰ مەتری چوارگۆشەیە لەسەر زەوییەکی ۳۵۰۰ مەتری چوارگۆشەیی دروستبکەن. ئەم کۆشکە سێ ساڵۆنی تێدایە، یەکێکیان جێی ٤۰۰ کەسێکی تێدا دەبێتەوە و ئەوەی دیکەیان ۱۵۰ و سێیەمیشیان ۸۰ ــ ۹۰ کەسێك. کافەتێریا و ژووری مێوان و بیرۆ و نامەخانە و گەلێك شتی دیکەی تێدایە و تەنانەت شوێنی مردووشوشتنیشی تێدایە بەپێی رێ و ڕەوشتی ئێزیدێتی. سەرۆکی ئەم ماڵە **بەڕێز تەلیم تۆلان**، تەمەنی ۳۱ ساڵانە و لە ئەڵمانیا لە شاری **تسێلە** لە دایکبووە، بەڵام بە کوردییەکی جوانی رەوان دەپەیڤێ و مرۆڤێکی رۆشنبیر و رووخۆشە. بێجگە لەوەش چەند رۆشنبیرێکی کوردی ئێزیدی وەك **پیرخدری سلێمان و ئەسکەری بۆیك و شەوقی عیسا**، هاوکاری ئەم ماڵەن. گۆڤاری **«دەنگی ئێزیدیان»** بە سەرنووسەریی **بەڕێز شەوقی عیسا** یەکێکە لە گۆڤارە باشەکانی کورد کە بە سێ زمانی کوردی و عەرەبی و ئەڵمانی دەردەچێ و تا ئێستە ۹ ژمارەی لێدەرچووە. لەم چەند ساڵەی دواییدا ئەم ماڵە گەلێك پەرتوکی بەزمانی کوردی بۆ زارۆکانی ئێزیدی چاپکردووە کە بە ئاڵای کوردستان و هەستی کوردایەتی رازێنراونەتەوە. بێجگە لەوەش بەرهەمێکی بەنرخی شەوقی عیسا کە بریتییە لە چەند دەقێکی پیرۆزی ئاینی ئێزیدییەکان لە گەڵ وەرگێڕانیان بە زمانی ئەڵمانی و ئەزژی پێشگۆتنم بە ئەڵمانی بۆ نووسیوە، بەمزووانە لە لایەن ماڵا ئێزیدیانەوە چاپدەکرێ. وادیارە ئێزیدییەکانی ئەڵمانیا نرخی ئەم مەڵبەندە دەزانن، بۆیە دووسەت خێزان (ماڵبات) ی ئێزیدی بوونەتە ئەندامی ئەم ماڵە، بێجگە لە ژمارەیەکی زۆر تاکە تاکەی خەڵکی.

ماوەیەکی درێژ بوو کە کاربەدەستانی ماڵا ئێزیدیان و رۆشنبیرانی ئێزیدی بە کولودڵەوە دەیانویست گوێ لە سەمینارێکی من بگرن لەبارەی ئاینی ئێزیدی و

ئاینەکانی دیکەی کوردستانەوە وەك کاکەیی (ئەهلی حەق، یارسان) و ئەلەڤی و ... هتد. مخابن هەر جارە بەرهەڵستێك دەهاتە پێشەوە کە پێمنەدەکرا بەخزمەتیان بگەم. ئەمجارە وا رێککەوت کە ٣ رۆژی یەك لە دوای یەك پشووی گشتی بوو لە ئەڵمانیا. لەبەر ئەوە نیوەڕۆی شەممەی ١٨/ ٥ لە گەڵ هەڤاڵی بەڕێز شەوقی عیسا بە ترۆمبێل کەوتینە رێ و بۆ ئێوارەیەکی زوو گەیشتینە ئۆلدنبورگ. کە گەیشتینە بەر حەوشەی ماڵا ئێزیدییان و ئەو کۆشکەم دی، چاوم رۆن بووەوە، نەك لەبەر ئەوەی خانوویەکە و دروستکراوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی بیستبووم کە کۆمەڵێك کورد توانیویانە بەرەنجی شانی خۆیان و لە تاراوگە و ئاوارەییدا ئەوە پێکبهێنن، کە ئەمەش بەڵگەی هاوکاری لە گەڵ یەك و پێ داگرتنە لەسەر پاراستنی مافی خۆ و فەرهەنگی خۆ و بەرهەمی خەباتی کۆڵنەدەرانەی **«کۆمەلا چاند و دینی ئێزیدی»** یە کە لە ١٩٩٣/١٠/٣١ دامەزراوە.

رۆژی ١٩/٥/ کاتی ١٤/٣٠ سەمینارەکەمان دەستپێکرد. ئەگەرچی ژمارەیەکی زۆر لە ئێزیدییەکان چووبوون بۆ پرسەی یەکێك لە خزمەکانی پێشئیمام کە رۆژێك لەوەبەر کۆچیدوایی کردبوو، لە گەڵ ئەوەشدا نێزیکەی هەشتا کەسێك بەشدارییانکرد کە هێندێکیان لە شارەکانی دیکەوە هاتبوون.

سەمینارەکەمان بە بەخێرهاتنێکی گەرمی من و بەشداران دەستپێکرا کە لە لایەن **بەڕێز دوکتۆر ئەسکەری بۆیکەوە** پێشکێش کرا و، **ئەوجا باس هاتە سەر ئەو تایبەتکارانەی کە ئێزیدییەکان و ئاینە سینکرێتیستەکانی کوردستان دەبەستێ بەیەکەوە، وەك بە پیرۆزدانانی خۆر و رۆناکی و گەڕانی رەوان (روح) لە بەرگێکەوە بۆ بەرگێکی دیکە پاش مردن کە ئێزیدییەکان «کراس گهۆڕین» و کاکەیی و ئەلەوییەکان «دۆنای دۆن» ی پێدەڵێن، هەروەها بەڕێوەبردنی کاروباری جیهان و ژیان لە لایەن «یارانی خودێ» وە کە لە حەوت فریشتە پێکهاتوون و هەر یەکەیان بۆ کارێك بەرپرسیارە و یەکێکیان سەرکردەیانە و بێجگە لەوەش گرێدایی ئەم باوەڕانە بە زمان و فەرهەنگی کورد و خاکی کوردستانەوە و بە تایبەتی بە چیاکانەوە (وەك چیای جودی و شاهۆ).**

ئەوجا رێدرا بە بەشداربووان کە بکەونە پرسیار و رادەربڕین، کە بە شێوەیەکی

سەربەستانە و دیمۆکراتیانە چووە سەر. یەکێك لەو پرسیارە زۆرانەی کە کران ئەوە بوو، **«بۆچی ئێزیدییەکان ڕێنادەن کەسێك کە لە خۆیان نەبێ ببێ بە ئێزیدی، بۆوێنە: موسلمان و دیان ڕێ دەدەن بە هەموو ناموسلمانێك و نادیانێك بێنە سەر ئەو دوو ئاینە»**

لە وەرامدا گوتم: «ڕاستە ئێزیدییەکان چاویان نەبڕیوەتە ئەوەی هیچ کەسێك لەم ئاین و لەو ئاین بکەنەوە، بەڵام بۆچی ئەوانی دیکە بەزۆری دارێ و بە کوشتن و تۆقاندن ئێزیدییەکان لەسەر ئاینی خۆیان لادەبەن و دەیانهێننە سەر ئاینی خۆیان!. ئێزیدییەکان ترسیان بۆ کەس نییە و دینی کەس ناگۆڕن، بۆچی واز ناهێنن لێیان وەك ئێزیدی بژین؟ ».

ئەم وەرامە زۆر بەدڵی بەشداران بوو کە هەستی خۆیان بە چەپڵەڕێزان دەربڕی.

سەمینارەکەمان لە کاتی ۱۸/۳۰ دا کۆتایی هات و لە گەڵ **هەڤاڵی بەڕێز شەوقی عیسا گەڕاینەوە بەرلین. بەم بۆنەوە سوپاسی گەرمی ماڵا ئێزیدییان دەکەم بۆ پێشوازیی گەرمیان و سوپاسی سەرۆکی ماڵ تەلیم تۆلان و هاوکاری ماڵ دوکتۆر ئەسکەرێ بۆیك دەکەم بۆ میوانداریی برایانەیان و هەروەها سوپاسی هاوبیران یوسف نەسرۆ و عەبدوڵلا عەلی چوارتایی و خێزانەکانیان دەکەم کە ئەرکی هاتنیان لە هەمبورگ و براون شڤایکەوە خستبووە سەر خۆیان و هاتبوونە شاری ئۆلدنبورگ بۆ ئامادەبوون لەو کۆڕەدا.**

لە کاتی ماڵاوایدا گەلێك لە هاووڵاتانی ئێزیدی دەیانگوت **«ئاهوڕامەزدا و تاوسی مەلەك کوردستان لە شەڕی دوژمنان و دەستدرێژیی داگیرکەران بپارێزن»**.

جەمال نەبەز

بەرلین ۲۰۰۲/۵/۲۶

گۆڤاری «کۆنگرە» ژمارە ۲٤

ڕۆژنامەی «میدیا» ژمارە ۱۲٤

# پەلاماری ئەمریکا بۆ سەر عێراق
# و
# دۆزی کورد

**کورد، «قسەی نەستەق»** یان زۆرە، ئەگەرچی بەپێی ئەوانە ناجوولێنەوە. یەکێك لەو «قسەنەستەقانە» ئەمەیە: «ئەوەی تۆ ئێستە بە بێوەژنی دەیکەیت، دەبوو بە کچێنی بتکردایە». ئەم «قسەنەستەقە» بەسەر ئەمریکاش و کوردیشدا دەچەسپێ. چونکە ئەمریکا ئەو رۆژەی کە لەشکری عێراقی ناچارکرد، کوێت بەجێبهێڵێ و بەسەری شکاوەوە بگەڕێتەوە عێراق، دەیتوانی بەهاسانی بکشێتە عێراقەوە و رژێمی عێراق بخا و حکوومەتێکی لیبەرال ــ دێمۆکرات لەجۆری حکوومەتەکانی رۆژاوا دابمەزرێنێ و سەرپەرشتیی بکا تا خۆی دەگرێ. بەکورتی، ئەمریکا چی لە ئەڵمانیا کرد پاش شکانی لەشکری ئەڵمانیای نازی لە جەنگی جیهانیی دووەمدا، دەیتوانی هەرئەوەش بکا لە عێراقدا. بەڵام **جۆرج بوشی** سەرکۆماری ئەودەمەی ئەمریکا تەماشای بەرژەوەندیی درێژخایەنی ئەمریکا و بەرەی رۆژاوای نەکرد و گوێی لە قسەوراوێژی سەرلێشێوێنەرانەی «هەڤاڵبەندەکانی» گرت، وەك **حوسنی موبارەکی میسر و شاحسەینی ئەردەن و شافەهدی حیجاز** و، کارەکەی بەناتەواوی بەجێهێشت و، تەنانەت رێیدا بە سەددام کۆپتەرەکانی بەکار بهێنێ و لەوەش خراپتر، جۆرج بوش کورد و شیعەی هاندا کە دژی سەددام راپەڕن، کەچی کە کورد و شیعە راپەڕین و لەشکری عێراق بە کۆپتەرەکانییەوە کەوتە دروێنەی گیانیان، ئەمریکا لەسەری نەکردنەوە و تەنانەت کە کورد بە ملیۆن کەوتنە رەوکردن، جۆرج بوش لەبەردەم کامێرای تەلەڤیزیۆنی CNN دا گۆتی: «ئەز سەددام حسەین بەنەحلەت دەکەم، بەڵام من هیچ بەڵێنێکم نەداوە بەکورد کە لەباری سوپاییەوە یارمەتییان بدەم». ئەم درۆ ئاشکرایە ئەوەتە ئەورۆ لەلایەن کاربەدەستێکی گەورەی ئەمریکایی وەك جێمس وۆلزلیییەوە باسدەکرێ و رەخنە لە بوش دەگیرێ.

**ئەو رۆژەی جۆرج بوش ئەمەی گوت: ئێوارەیەکی مانگی مارتی ١٩٩١ بوو کە گەلڕەوەکەی کوردم لە تەلەڤیزیۆنی CNN دا دی و گوێم لە قسەکانی جۆرج بوش**

**بوو، دەستبەجێ ئەو ئێوارەیەی مانگی مارتی ١٩٧٥ م هاتە بیر کە ئەمریکا کوردی کردە قوربانیی «هەڤاڵبەندە» درۆزنەکانی ئەو سەردەمەی، وەك شای ئێران و ساداتی میسر و بومیدیەنی جەزایر و، سەددامی لە کەوتن و مردن رزگارکرد و نەتەوەی کورد و کەڵەپیاوێکی کوردستان و، رۆژهەڵاتی وەك مەلامستەفای بارزانی کردە قوربانیی کورتبینیی خۆی.** ئەنجامی ئەم کورتبینییەی ئەمریکا پەرەسەندنی ئیسلامی رامیاری (سیاسی) بوو کە بوو بەهۆی نەمانی شای ئێران بەخۆی تاجوتەختییەوە و، کوشتنی ساداتی میسر و لەنێوچوونی بومیدیەن و، بەهێزبوونی لەسنووربەدەری سەددام و، هەڵگیرسانی ئاگری شەڕی هەشت ساڵەی ئێران و عێراق و ئەوجا پەلاماردانی کوێت و، دوژمنایەتییەکی خەستوخۆڵ دژی ئەمریکا لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا و بەجێگەیاندنی گەلێك کرداری تێرۆریستانە دژی ئەمریکا کە دەستوەشاندنی رۆژی ١١ی ئەیلوول دواچالاکیی گەورەی ئەم زنجیرەیە بوو، نەك کۆتایی ئەم زنجیرەیە. ئەمانەش هەمووی بەولاوە، باوەڕنەکردنی کورد بە بەڵێن و پەیمانی ئەمریکا، ئەگەرچی ئەمریکا هێزی پارێزگاری سەرەکیی **(هەرێمی ئاسایش)** ە لە باشووری کوردستاندا.

وادیارە ئەمریکا لەو دۆخوبارانەی کە بەسەر رۆژهەڵاتی ناڤین ونێزیك و دووردا لەم پەنجاساڵەی دواییدا تێپەڕیوون، زۆر کەم فێربووە. هەرلە پاش بەستنی پەیمانی ئازاری ١٩٧٠ وە رێیدا بە سەددام و رژێمەکەی، خۆیان بە یارمەتیی سۆڤێت و دەوڵەتانی چاوچنۆکی رۆژاوا، بەتایبەتیی **فەرەنسا و ئەڵمانیا و ئیتالیا** بەهێزبکەن. کوردیش لەرووی دڵپاکی و کەم ئەزموونیی خۆیانەوە، چوارساڵ پشوویاندا بە سەددام بۆئەوەی گوایە پەیمانی ئازار بهێنێتەدی. سەددام لەم ماوەیەدا توانی خۆی لەباری سوپایی و دیپلۆماسی و رامیارییەوە یەکجار بەهێز بکا و لە ئەنجامدا توانی بەهۆی خلەتاندنی شای ئێران و ئەمریکاوە، پەیمانی جەزایر لەگەڵ شا لە مارتی ١٩٧٥ دا ببەستێ و شۆرشی ئەیلوول رابوەستێنێ و دەردبکا بەگەرووی کورد و هەڤاڵبەندەکانی خۆشیدا، بەتایبەتی کۆمۆنیستە عێراقییەکان کە ئەوانیش لە کورتبینیی رامیاریی خۆیان و سەرشۆڕکردنیان بۆ فەرمانی رژێمی سۆڤێت، بۆماوەیەك بووبوونە دەسکەلای دەستی سەددام.

کورتبینیی ئەمریکا بەڕادەیەك بوو کە کەوتە یارمەتیدانی ئەو موسڵمانە

ئەفغانییانەی کە دژی لەشکری داگیرکەری سۆڤیێت راپەڕیبوون، ئەمەش هەر لەبەر ئەوەی سۆڤیێت رژێمێکی گوایە «کۆمۆنیستی» بوو و، ئەمریکا ترسی هەبوو لێی و بەدوژمنی خۆی دەزانی، ئەمیش هەر وەکو کوردەکە بەپێی پەندی چەواشەکەری **«دوژمنی دوژمنم دۆستمە»**. ئێستەش ئەوەتە ئەمریکا لە جەنگدایە دژی ئەو موسڵمانانەی کە دوێنێ «هەڤاڵبەندیان» بوو و، یارمەتیدان بێنە سەرکار و ئەوەتە لەملی خۆی ئالاون.

شایانی باسە کە ئەمریکا لەنێوخۆیدا سیستەمێکی دیمۆکراتی هەیە و کەس ناتوانێ چاو لەوە بپۆشێ. بەڵام لە سیاسەتی دەرەوەیدا زۆر تەنگەتیلکانە و ناشییانە دوای نەخشەی کورتخایەن دەکەوێ و ئەمەش بەزیان دەگەڕێتەوە بۆخۆی. هەر بۆوێنە لە کاتێکدا دژی **عێراق و ئێران و سووریایە** و ئەم رژێمانە بە رژێمی سەریە تێرۆریزم نێودەبا، کەچی دەستی لەگەڵ رژێمی ترک تێکەڵە و بە هەموشێوەیەك پشتی ئەم رژێمە لەشکرتارییەی گرتووە کە ئەمە هەشتاساڵە بۆ لەنێوبردنی کورد هەوڵدەدا. ئەمریکا لە هەمانکاتدا بزووتنەوەی کوردەکانی باکوور بە بزووتنەوەیەکی تێرۆریستانە دەداتە قەڵەم و بەڵێن بە ترك دەدا کە رێ بە کوردی باشوور نەدا! دەوڵەتێك بۆخۆیان دروست بکەن. ئەم سیاسەتی **«بانێك و دووهەوا»** یەی ئەمریکا وای لە کورد کردووە کە دوودڵ بێ بەرامبەر هەموو بەڵێن و گوتێکی ئەمریکا و ملنەدا بۆچوونە بەرەیەکەوە لە گەڵ ئەمریکا دژی سەددام، مەگەر ئەمریکا بە تەواوی دەستبەربێ بە پاراستنی کورد و مافەکانی. دەستبەربوونیش هەربە «بەڵێن» نابێ، بەڵکو بەکردەوە دەبێ.

ئەمە لەلایەك. لەلایەکی دیکەشەوە، ئەمریکا کە ئەو هەلەی ساڵی ۱۹۹۱ ی لەدەست خۆی دا و یانزەساڵ وازی لە سەددام هێنا خۆی بەهێز بکاتەوە و ژمارەیەکی زۆر لە هەڤاڵبەندەکانی ئەمریکای لە ئەمریکا دوورخستەوە، بەتایبەتی زۆربەی دەوڵەتە ئەورووپاییەکان و رووسیا و چین. هەروەها سیاسەتی «بانێك و دووهەوا »ی ئەمریکا بەرامبەر کێشەی فەلەستین و ئیسرائیل، دڵی گەلی فەلەستین و دەوڵەتە عەرەبییەکانی لە ئەمریکا کرمێ کردووە، بەتایبەتی ئەو دەوڵەتانەی کە لەساڵی ۱۹۹۱ دا هەڤاڵبەندی ئەمریکا بوون لەدژی سەددام، وەك میسر و سووریا و حیجاز و دەوڵەتەکانی کەنداو. تەنانەت کوێتیش دەبێژێ «نامانەوێ عێراق بەر

جەزرەبەیەکی سوپایی ئەمریکا بکەوێ».

ئەوجا ئێستە ئەمریکا هەرچەندێك هەوڵبدا ئێسکی خوی سووك بکا، ئەوا بە هاسانی ناچێتەسەر بۆی و، لە ئەنجامی نەخشەی چەوتوچەوێڵەوە، تەنانەت ئەوانەی زۆر خزمەتیشی کردوون، بەخزمەتەکەی نازانن و وەك، کوردەکە دەبێژێ: «نمەکی ئەمریکا سوێرە». ئەوەتە دەوڵەتی ترك کە مانەوەی بەپێوە بەهۆی ئەمریکاوەیە، بۆ یارمەتیدانی دژی سەددام، داوای گەلێك پاداشی گەورەگەورە دەکات، چ لەباری ئابووری و چ لەباری رامیاری و چ لەباری جوگرافیاییەوە. ئەوجا وەنەبێ هەر ترك وابن، ئەڵمانەکانیش کە مانیان پاش جەنگی جیهانیی دووەم بەسایی ئەمریکاوە بوو، بەهیچ جۆرێك منەت لەوە نازانن. لەمانگی مایسی ئەمساڵدا جۆرج بوش هات بۆ سەردانی بەرلین و ئەورۆژە رۆژێکی خۆشی گەرمی هەتاوی بوو. لە بەستەمەنیخانەیەك دانیشتبووم شتێکی سارد بخۆمەوە! لەبەردەم مێزێکدا دانیشتبووم کە هەشت نۆکەس لە تەنیشتمەوە بوون و قسەیان بە جۆرج بوش و ئەمریکا دەگوت. یەکێکیان بەپێکەنینەوە گوتی «بابچین هێندێك تەماتە بکرین و بیکێشین بە ئوتۆمۆبیلەکەی بوشدا»، منیش هەروەك ئەوان بە پێکەنینەوە گوتم: «دەبێ ئەوە لە گۆرەپانی پردی ئاسمانی بکرێ». کە ئەوەم گوت بێدەنگ بوون. (سەرنج گۆرەپانی پردی ئاسمانی گۆرەپانێکی بەنێوبانگە لە **بەرلین**، کاتی خۆی کە بەرلین بەسەر **ئەمریکا و بەریتانیا و فەرەنسا و رووسیا**دا دابەشکرا و سۆڤێت بەرلینی رۆژهەڵاتی بەرکەوت، لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی بەرلینی رۆژاوای دا و رێی نەدەدا خۆراك بچێ بۆ بەرلینی رۆژاوا. خەڵکەکە وایان لێهات لە برساندا بمرن. ئەمریکاییەکان هەموو رۆژێك تا ئەو گەمارۆیە هەڵگیرا، بەفرۆکە خواردەمەنییان فرێدەدایە خوارەوە لەو گۆرەپانەدا بۆ خەڵکی بەرلین).

هەرچی کوردیشە، دەبێ بزانین کە ئەمە یەکەمجارە کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان پارچەیەك زەوی لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی دەوڵەتێك جیادەکاتەوە و دەیخاتە ژێردەسەڵاتی خەڵکی ئەو پارچە زەوییەوە و بەهێزی سوپا دەیپارێزێ دژی دەستدرێژیی ئەو دەوڵەتە. بەراستی دامەزراندنی «هەرێمی ئاسایش» رووداوێکی مێژوویی بوو لە هەموو جیهاندا کە بۆ یەکەمجار لە کوردستان روویدا. دیارە ئەوەش بەهۆی ئەو هەلومەرجانەوە هاتە پێشەوە کە یەکیانگرت و ئەم «هەرێمی

ئاسایش»ەیان هێنایە بوون. لەمانە: پەلاماردانی سەددام بۆسەر کوێت و جەنگی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان دژی عێراق و راپەڕینی گەلێری کورد و رزگارکردنی بەشێکی گەورەی باشووری کوردستان و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن سەددامەوە و گەلرەوی دووملیۆنی کورد بۆ دەرەوەی باشوور و بوونی فەرانسوا میتران وەك سەرکۆماری فەرەنسا و تورگوت ئۆزال وەك سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتی ترك و بوونی ژمارەیەکی زۆر کوردی رۆشنبیر و چالاك لە ئەمریکا و ئەورووپا و پێشاندانی کوێرەوەریی کورد لەرێی رادیۆوتەلەڤیزیۆن و رۆژنامەکانی جیهانەوە و بوونی هێزێکی چەکداری کورد لە شێوەی پێشمەرگەدا.

راستییەکەی کوردیش هەروەك ئەمریکا زۆرکەم سووتی لەسەردەمی کچێنیی خۆی وەرگرت. ئەورۆژەی کە سەددام لەشکرەکەی و بەڕێوەبەرێتییەکەی لەو سێ پارێزگە کێشایەوە (۱۹۹۱/۱۲/۲۰)، کورد دەیانتوانی سەربەخۆیی ئەو نێوچەیە داخویانی بکەن، کە ئەمەیان نەکرد، ئەو هەلە مێژوویەیان لەدەست خۆیان دا. چۆنکە ئەگەر هەنگاوێکی وایان بنایە و دەوڵەتەکانی دراوسێی ئەو پارێزگایە دستیان لە کورد بوەشاندایە، ئەو دەمە ئەو سێ پارێزگایە دەبووە پرۆتێکتۆرات (محمیە) ی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان.

لەوەش بترازێ هەڵسوکەوتی رامیاریانەی کورد، پاش دامەزراندنی «هەرێمی ئاسایش» (هەرێمی نەفرین) لە باشووری کوردستاندا، واتە «سەردەمی کچێنیی کورد» بەهیچ جۆرێك ژیرانە و بەرپرسیارانە نەبوو. دوای ئەوەی پەرلەمانی کوردستان لە ۱۹۹۲ دا (دەساڵ لەمەوبەر) دەنگی بۆ فیدەراسیۆن دا، هەتا ئێستە دەستوورێك و ئالایەك و سروودێکی نەتەوەیی و هەڵبژاردنێکی گشتی بۆ سەرۆك کۆمار و پەرلەمانی نوێ و لەشکرێکی یەکگرتوو و نوێنەرێتییەکی یەکگرتوو لە دەرەوەی وڵات نییە. هەر نوێنەرێك بەنێوی حیزبی خۆیەوە قسەدەکات، نەك بەنێوی خەڵکی هەرێمی فیدەرالی کوردستانەوە. هەر دەستەیەك لە پێشمەرگەکان خۆی بەچەکداری حیزبی خۆی دادەنێ نەك بە سەربازی لەشکری ناحیزبیی کوردستان. راستە هەردوو حکوومەتەکەی «هەرێمی نەفرین» (پارتی و یەکێتی) توانیویانە تا هەندازەیەك ئاوەدانی بگێڕنەوە بۆ وڵات و گوند و رێ و شەقام و خانی و نەخۆشخانە و قوتابخانە و بازاڕی گەورە دروستبکەن، ئەوەش بەو پارەیەی کە

کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان (١٣٪ی داهاتی نەوتی عێراق) بڕیویەتەوە بۆ کورد، بەڵام گەلێك شتی زۆر گرنگ هەن کە هەتا ئێستە جێبەجێ نەکراون، وەك ئاوی خواردنەوە، کارەبا، پۆستە. بۆ کێشەی بێکاریش ئەوە هەر مەپرسە.

خەریکبوونی هەردوو حیزبەکە چوارساڵی رەبەق بە شەڕێکی ماڵوێرانکەرەوە لەدژی یەك و لە بنچینەدا لەسەر هیچ (کامیان نوێنەرێکی پەرلەمانی لەویدی پترە، کامیان پارەی پتری پێدەبڕێ، کامیان دەسەڵاتی بەسەر رەشوڕووتی کورددا لەویدی زێترە) گەورەترین زیانی بەکورد و گەورەترین سووتی بەدوژمنانی نێوخۆ و دەرەوەی کورد گەیاند و دەستی هەموو جۆرە تاقمێکی نەیار و ناحەز و دەستوەشێنی بەرەڵلاکرد بۆ خۆکۆکردنەوە و، ئەوە بوو لە ئەنجامدا کەوتنە گیانی ئەم دوو حیزبە کە ئەم دوو حیزبە هەرخۆیان هۆی سەرەکی بوون بۆ بوون و باڵگرتنی ئەوانە و لەنێو ئەوانەشدا تورانییەکان و موسڵمانە تەنگەتیلکەکان.

بۆ مسۆگەرکردنی ئاسایشی نەتەوەیی (الامن القومی) هەتا ئەوڕۆ هیچ هەنگاوێك نەنراوە، بەقسەی **هاوبیری هێژا جەوادی مەلا، سەرۆکی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان، هەتا ئەوڕۆ تەنانەت «خەندەکێکی پان و کوور» (قووڵ) بەدەوری "هەرێمی ئاسایش" دا هەڵنەکەندراوە تاکو رێ لە تانك و لەشکری پێدەی بیانیی بگرێ و نەهێڵێ هەروا بە هاسانی بکشێنە کوردستانی رزگارکراوەوە.**

ئەمە یانزەساڵە ئەم دووحیزبە کاربەدەستن، نەك یانزە فڕۆکەوان، بەڵکو یەك فڕۆکەوانیان پێنەگەیاندووە و ژمارەی کادری رامیاری و دیپلۆماتی و ئابووریان بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن.

بەڕاستی دەردوخەفەت زۆرە و، وادیارە کاتیشمان کەم ماوە. هەتا پەلامارەکەی ئەمریکا بۆسەر عێراق، دەبا بێینە سەر ئەوەی کە لەم سەردەمی «بێوەژنی» یەدا هەوڵی کردنی چی بدرێ و کردنی چی پێویستە:

١) ــ دووەم پەرلەمانی کوردستان لە ماوەیەکی زۆر کورتدا هەڵبژێردرێ، نەك لەماوەی شەش مانگ یان ساڵێکی دیدا، چۆنکە هیچ دوورنییە لەماوەیەکی کورتدا کارەساتێکی وابقەومێ کە هەڵبژاردنی پەرلەمان درەنگی بەسەر هاتبێ. ئەم پەرلەمانەی ئێستا هەیە ماوەکەی تێپەڕیوە، کە ماوەی پەرلەمان تێپەڕی، ئەو پەرلەمانە کۆن دەبێ و، رەوایەتی (شرعیەت)ی نامێنێ. ئەمەش خاڵێکی زۆرگرنگە،

تاکو دوارۆژ لە لایەن دەزگە ئینتەرناسیۆنالییەکانەوە رەخنە لە رەوایەتیی بڕیارەکانی پەرلەمانی کۆن نەگیرێ و نەگوترێ ئەمە بڕیاری دووحیزبیە نەك بڕیاری نوێنەرانی خەڵکی کوردستان.

٢) ــ دەستوورێکی بنچینەیی بۆ کۆماری فیدەراڵی کوردستان دابنرێ کە ببێتە دایکی هەموو زاگۆنێك (قانون) کە لەو کۆمارەدا دەربچێ. ئەم دەستوورە سنووری کۆمارەکە دەستنیشان بکا. شایانی باسە لەبارەی سنوورەوە دەنگورەگرتن و گشتپرسی (استفتا ) کارێکی ناڕەوایە. سنووری باشووری کوردستان راستینەیەکی (حقیقة) مێژوویی و جوگرافیایی و ژیارییە، ئەو سنوورە پیرۆز و نەتەکێن (مصون) ە، دیارە وتووێژ ناکرێ لەسەری.

٣) ــ پێشمەرگەکەکانی حیزبەکان، بەپێی زاگۆنێك دەبن بەبەشێك لە سوپای بەرگریی کۆماری فیدەراڵی باشووری کوردستان. ئەم سوپایە مافی دەستوەردانە حیزبایەتی و رامیاری نابێ. سەرکردەکانیشی سەربەخۆ و نەتەوەیی دەبن و دەستناخەنە هیچ کێشەیەکی نێوخوییەوە، کە ئەمەیان لە دەسەڵاتی پۆلیس و هێزی ئاسایشدا دەبێ، ئەمانیش هەردەبێ ناحیزبی بن.

٤) ــ دادگەکانی کوردستان سەربەخۆ دەبن و هیچ دەسەڵاتێك مافی ئەوەی نابێ کار بکاتە سەریان. دادگەکان بەپێی ئەو زاگۆنانە کاردەکەن کە حکوومەتی کۆماری فیدەراڵی کوردستان دەریاندەکا، پاش پشتڕاستکردنیان (تصدیق) لەلایەن پەرلەمانەوە.

٥) ــ پەیماننامەیەك لەنێوان دەسەڵاتدارانی کوردستان و بەرهەڵستکەرە سەرەکییەکانی عێراقدا مۆربکرێ کە فیدەراسیۆنی کورد لەشێوەی کۆماری باشووری کوردستان و بەو سنوورە مێژوویی و جوگرافیاییە دەبێ کە هەیە. ئەم کۆمارە لەگەڵ دوو کۆماری دیکە، واتە کۆماری بەغدا، کە بەغدا و نێوچەکانی نێوەڕاستی عێراق دەگرێتەوە و، کۆماری بەسرە کە نێوچەکانی خوارووی عێراق دەگرێتەوە، بەشێوەیەکی فیدەراڵی یەکدەگرێ.

٦) ــ هەرسێ کۆمارە فیدەراڵییەکە مافیان وەك یەك دەبێ و نێویان «کۆمارە فیدەراڵییەکانی عێراق» دەبێ.

٧) ــ کۆماری فیدەراڵی باشووری کوردستان کۆمارێکی دێموکراتی

پەرلەمانیی ئاشتیخواز و سێکولاریستی (علمانی) دەبێ. مافی هەموو کەمە نەتەوە و پێڕەوانی ئاین و ئاینزاجیاوازەکان، بێ جیاوازی، دەپارێزرێ.

٨) ـ بەلایەنی کەمەوە سێیەکی دەسەلاتی نێوەندیی کۆمارە فیدەرالییەکانی عێراق بەدەست کوردەوە دەبێ، کە بەجێهێنەرانی ئەو دەسەلاتەش تەنێ لەلایەن کورد خۆیانەوە دەستنیشاندەکرێن.

٩) ـ حکوومەتی نێوەندیی کۆمارە فیدەرالییەکانی عێراق دووسەتوپەنجا (٢٥٠) ملیارد پاوەندی ئینگلیزی لەماوەی (٢٥) سالدا دەبژێرێتەوە بۆ کورد لەباتی وێرانکایی کوردستان و گەلکوژی لە کورد لەلایەن عەرەبی عێراقەوە.

١٠) ـ هیچ کۆمارێك لەم سێ کۆمارە مافی ئەوەی نابێ بۆ شتێك دەنگبدا کە تەنێ پێوەندیی بەکۆمارەکانی دیکەوە هەبێ.

١١) ـ بەهیچ جورێك نابێ لە دەستووری عێراقدا بنووسرێ کە «عێراق بەشێکە لە نیشتمان یان نەتەوەی عەرەبی».

١٢) ـ کورد لە کۆماری بەغدادا، بەتایبەتی کوردە فەیلییەکان مافیان لەشێوەی ئۆتۆنۆمیدا دەبێ و لە کۆماری بەسرەدا وەك کەمایەتییەك بەرەسمی دەناسرێن.

١٣) ـ ئەگەر کۆماری بەغدا و بەسرە ویستیان لە گەلْ دەولەتێکی عەرەب یەکبگرن لەشێوەی فیدەراسیۆندا، ئەو هەلە کۆماری فیدەرالی کوردستان بەشێوەی کۆنفیدەرالی لەگەلْ ئەو دوو دەولەتەدا پێوەندیی دەبەستێ. خۆئەگەر ئەو یەکگرتنە لەشێوەی یەکێتیدا بوو، ئەوا کۆماری کۆنفیدەرالی کوردستان مافی جیابوونەوەی دەبێ و ئەمەش دەبێ لە دەستووردا بچەسپێنرێ.

١٤) ـ کۆماری بەغدا و بەسرە بەهیچ جۆرێك لەگەلْ هیچ لایەکدا پەیمان نابەستن دژی کورد و کۆماری فیدەرالی باشووری کوردستان.

١٥) ـ سەرکۆماری فیدەرالگەل (هەرسێ کۆمارەکە) بۆ سێ سالْ هەلدەبژێردرێ و سەرکۆمارێتیش بەنۆرە دەبێ لە هەر سێ کۆمارەکەدا.

١٦) ـ بەلایەنی کەمەوە سێیەکی سەرکردەکانی سوپای عێراق کورد و کوردستانی دەبن.

١٧) ـ زمانی کوردی زمانی رەسمیی یەکەم و زمانی عەرەبی زمانی رەسمیی دووەم دەبێ لە کۆماری فیدەرالی کوردستاندا. لە دوو کۆمارەکەی دیکەدا زمانی

کوردی زمانی رەسمیی دووەم دەبێ.

١٨) ـ ئالأی کوردستان ئەو ئالأیە دەبێ کە لە سەتەی رابردوودا کۆماری کوردستان کردی بە ئالأی کۆمار و سروودی نەتەوەیی (مارشی کوردستان) «ئەی رەقیب» دەبێ.

## ئێستە بابزانین ئەگەر ئەمریکا پەلاماری عێراقی دا کورد چی بکا باشە:

١) ـ ئەگەر ئەمریکا پەلاماری عێراقی دا، ئەوا بێگومان کورد ناتوانن بێلایەن بوەستن. جوگرافیای نێوچەکە و رژێمەکانی رێ بەو بێلایەنییە نادەن. بەلأم ئەو بێلایەنییە دەبێ هاورێ بێ لەگەڵ دڵنیاییەکی تەواو کە کورد دەگاتە ئامانجەکانی خۆی، نەك ئەوەی کە هەیەتی لەدەستی بچێ. بۆئەمەش دەبێ ئەمریکا چەکی کاریگەری دژەفڕۆکە و دەمامکی دژەگازی ژەهراوی و دەرمان و دوکتۆری شارەزا و دەزگەی چەکی پاتریۆت بۆ کەمکردنەوەی مەترسیی راکێت و گوللەتۆپ بدا بەکورد و بەپەلە پسپۆری ئەو چەکانە بۆکورد پێبگەیەنێ.

٢) ـ سەرکردەکانی کورد لەگەڵ ئەمریکا رێکبکەون لەسەر ئەوەی ئەمریکا رێنەدا بە دەوڵەتی ترك باشووری کوردستان، یان بەشێك لە عێراق داگیربکا. چۆنکە ئەودەمە شەڕوشۆر و بەیەکدادانێکی زۆر سەخت دەکەوێتە نێو هێزەکانی کورد و عێراق لەلایەك و هێزەکانی ترك لەلایەکی دیکەوە و دەبنە هۆی دەستێوەردانی دەوڵەتانی دیکە. کە ترك دەستی نەخستە کاروباری باشووری کوردستان و عێراقەوە، ئەو دەمە ئەمریکا دەتوانێ هەڕەشە لە ئێران و سووریا بکا کە دەست نەخەنە کاروباری عێراقەوە و بێلایەن بوەستن.

٣) ـ هێزی چەکداری کوردستان لە گەڵ هێزی چەکداری شیعەکان یەکبگرن و نەخشەیەك دابنێن بۆ داگیرکردنی بەغدا، کاتێك ئەمریکا بەهێزی ئاسمانی خۆی لە عێراق دەدا و، رێنەدەن چەند ئەفسەرێك سەددام بکوژن و بێنە سەرکار و **«کەرێکم دا بە کەرێك»** دووپات بێتەوە.

٤) ـ باشترین شت ئەوەیە لەشکری پیادە (زەوی) ئەمریکا لە کوێتەوە بکشێ بەسەر عێراقدا. بێگومان لەم شەڕەدا چەکی پێشکەوتوو زاڵبوون مسۆگەردەکا، نەك ژمارەی زۆری لەشکر، ئەمریکا ئەوجۆرە چەکانەی هەیە.

٥) ــ ئەو ترسولەرزەی کە دەخرێتە دڵی خەڵکەوە کە گوایە سەددام سوپایەکی یەکجار بەهێزی هەیە، لەسەر بناخەیەکی پتەو دانەمەزراوە و زۆربەی ئەوقسانە پرۆپاگەندە و چاوڕاون. بێجگە لە بەشێکی تایبەتی وەك «پاسەوانی کۆماری» (الحرس الجمهوری) بەشەکانی دیکە «کەرەسەی شەڕ» نین و بەزۆر کراون بە سەرباز. سوپا بریتی نییە لە زۆروبۆر و «ڕەشەلەشکر». هەزارساڵ لەمەوبەر هۆنەری بەنێوبانگی فارس، **فیردەوسی** گۆتوویەتی:

سیاهی لشکر نیاید به کار

چویەك مرد جنگی بە از صد هزار

(واتە: ڕەشەلەشکر بەکار نایەت، تاکە یەك جەنگاوەر لەسەت هەزاری وا باشترە).

سوپای عێراق چەك و تفاقی جەنگی وەك یانزەساڵ لەمەوبەری نییە. لەبەر ئەوە پەلاماری کتوپڕی هێزی ئاسمانیی ئەمریکا بۆ سەر بەغدا و تکریت و مووسڵ و فەلوجە و بەکارهێنانی چەکی پێشکەوتوو، بەمەرجێك لەوە پێش شوێنی مۆڵگەکانی سوپای عێراق و جێی ئەمبارکردنی چەکە قڕکەرەکانی سەددام بەباشی دەستنیشانکرابن، بەرگریی سوپای عێراق دەپسێنێ و بەشێکی گەورەی سوپاکە ناچار بە خۆبەدەستەوەدان دەکا و گەلێك سەرکردەی سوپایی لە سەددام هەڵدەگەڕێنەوە ئەگەر بزانن سەددام دەکەوێ. بەڵام هونەر ئەوەیە پەلامارەکە بروسکەئاسایی بێ بۆئەوەی ڕێنەدرێ بە سەددام و کلکەکانی لە ناهومێدیدا چەکی کیمیایی و میکرۆبی بەکار بهێنن.

٦) ــ زۆرجار ئەفغانستان لەگەڵ عێراق بەراورد دەکرێ، بەڵام ئەم دوو وڵاتە و بارودۆخیان بەهیچ جۆرێك لەیەکناچن و ئەم بەراوردکردنە هەڵەیە. ڕژێمی ئەفغانستان کە «القاعدە»ی بن لادن و مەلاعومەر دەیانبرد بەڕێوە، پشتیوانییەکی یەکجار بەهێزی لەنێو مرۆڤی خاوەن باوەڕ و ئایدیۆلۆژیای بنچینەگرانەی ئیسلامدا هەیە لە هەموو جیهاندا کە ئامادەی خۆبەختکردن و «شەهید» بوونن لەپێناوی چوونە بەهەشتدا. بێجگە لەوەش گەلی پەشتوون کە زۆربەی گەلی ئەفغانستان پێکدێنێ، بەزۆری پشتگیریی ڕژێمی مەلا عومەری دەکرد، چونکە ڕژێمێکی پەشتووندۆست بوون. پەشتوونەکان ئەزموونی باشیان نییە لەگەڵ فارسیزمانانی

تاجیك و ترکزمانانی ئۆزبەکدا. هەرچی سەددامە ئەوا ئەو پشتیوانە گەلێرییەی نییە. جوگرافیای عێراقیش وەك جوگرافیای ئەفغانستان نییە کە ولاتێکی، چیاییە و بۆ خۆشاردنەوە و شەڕی پێشمەرگایەتی لەبارە. عێراق کە کوردستانەکەی پێوەنەبێ تەخت و بێ چیایە. بەلاّم هونەر ئەوەیە رێنەدرێ بە سەددام کە بتوانێ کار لەو موسلمانانە بکا کە بوونەتە دوژمنی ئەمریکا و بیانکێشێ بەلای خۆیدا.

٧) ــ باشتر ئەوەیە هەرلە ئێستەوە سیاسەتکارانی کورد لەگەلّ سیاسەتکارانی بەرهەلستکاری عێراقی لەسەر ئەوە رێکبکەون کە پێکەوە و بەزووترین کات لێبوردنێکی گشتی بۆ هەموو ئەوانە دەربکەن کە لەگەلّ سەددامن، بەمەرجێك تاوانی خەلّك کوشتن نەکەوتبێتە ئەستۆیان، بۆئەوەی لەکاتی پەلاماردانە سەر سوپای عێراقدا، بەلایەنی کەمەوە بێلایەن بوەستن.

٨) ــ نوێنەرانی کورد و بەرهەلستکارانی عێراقی بیرخەرەوەیەك بدەن بە **روسیا و چین و فەرەنسا** و بەئاشکرا پێیان رابگەیەنن کە ئەگەر بێتو یارمەتیی رژێمی سەددام بدەن، ئەوا هەرکاتێك سەددام لەسەر کار نەما، هیچ جۆرە سووتێکی ئابووری لە سیستەمی نوێی عێراق نابینن.

**لەکۆتایی ئەم چەند دێڕەدا دەمەوێ بێژم کە حیزبەکانی کوردستان پێویستە لەسەریان لەمرۆژانەدا کە سەردەمێکە چارەنووسی کوردی پێوەیە، واز لە حیزبحیزبێنە بهێنن و رووبکەنە بەرژەوەندیی نەتەوەیی کە لەسەروو هەمو جۆرە بەرژەوەندییەکی دیکەوەیە.** با تەماشای ترکەکان بکەن. ئەوەتە پاش ئەوەی پەرلەمانی ترکەکان، نەك لەباوەڕەوە، بەلّکو لەژێر گوشاری ئەوروپا و بۆ مسۆگەرکردنی چوونە نێو یەکێتیی ئەورووپاوە، پاش ژانکردنێکی چەند ساڵە، دانی بە هێندێك گوایە «مافی کورد» دا نا، وەك بوونی رادیۆ و رۆژنامەی کوردی و خوێندنی زمانی کوردی لە قوتابخانەی تایبەتدا (نەك لە قوتابخانەی رەسمیدا)، حیزبی تۆرانییەکانی ترکەش MHP دژی وەستا و حیزبی ئیسلامیستەکانیش دژی وەستا. ئەمە هەر لەبەر ئەوەی باسی کورد هاتووەتە پێشەوە. کاتی خۆشی حیزبی ئیسلامیستی ئەربەکان هەموو ئەو پەیماننامانەی پەسندکرد کە حکوومەتی پێش خۆی لەگەلّ ئیسرائیل بەستبوونی. ئێستە با ترکمانەکان و ئیسلامیستەکانی «هەرێمی ئاسایش» مافەکانی خۆیان بەراورد بکەن بەو مافەی دەولەتی ترك بە بیست ملیۆن

کورد رەوای دیوە و «براموسڵمانەکان»ی کوردیش چەند ماف بەکورد رەوا دەبینن.

حیزبەکانی کوردستان پێویستە لەژمارەی ئاژاوەگێڕ و هیچنەکەر و مووچەخۆرە تەمەڵەکان کەمبکەنەوە و مشەخۆرەکانیان بگۆڕن بە مرۆڤی مشوورخۆر. خەڵکی رۆشنبیری دڵسۆز و ژێهاتی بهێننە نێوخۆیان. دڵنیابن کە کوردستان بەشەڕەگەڕەکی رامیاری و حیزبحیزبێنە رزگاری نابێ. یەکگرتن لەسەر بنچینەیەکی راست و پتەو دەبێتە مایەی ئازادیی خەڵکی کوردستان.

بەرلین ٨/٨/٢٠٠٢

«میدیا» ژمارە (١٢٩) ساڵی حەوتەم ١٥/٨/٢٠٠٢

"کۆنگرە" ژمارە (٢٥) رەزبەری ٢٠٠٢ ی زایینی.

# بێلایەنی لەنێوان حیزبایەتینەکردن و بێهەڵوێستیدا
# (فەلسەفەی "بەگونمەوەی" مام ئەوڕەحمانی خامە)

لەنیوەی یەکەمی پەنجاکاندا لە زانستگەی بەغدا خوێندکار بووم. بە هاوینان لە کاتی پشووی زانستگەدا لە سلێمانی دەژیام و، بەزۆری دەمەو ئێواران لە گەڵ چەند هاوڕێیەکی ئەو سەردەمەدا لە چایخانەکەی **"بەرتەکێ"** کۆدەبووینەوە کە بەرامبەر بە گردی **"سەیوان"** و کەناری شار بوو. ئێمە هەرچەندە ئەودەمە سەرەتای ژیانمان بوو، بەڵام کە دەچووینە چایخانەکەی بەرتەکێ لەدەوری پیاوێکی پیر کۆدەبووینەوە کە نێوی **"مام ئەوڕەحمانی خامە سنەیی"** بوو. مام ئەوڕەحمان ئاسنگەرێکی بەنێوبانگ و پیرەمێردێکی هەتا بڵێیت تەندروست و رووخۆش و گاڵتەزان بوو. لەم کۆڕەی ئێمەدا کابرایەك بەشداریدەکرد کە هاوڕێمان نەبوو، بەڵام هەموو جارێك دەهات و لەنێوماندا دادەنیشت. ئەم کابرایە مرۆڤێکی هێندە نەدوو بوو، دەمی لەهیچ بابەتێکەوە نەدەدا. تەنانەت نەشماندەزانی کوێندەرییە، یان چیکەرە. خۆ ئەگەر بهاتایە تۆ پرسیارێکت لێبکردبایە لەبارەی شتێکەوە تاکو بزانیت بیروڕای چییە؟ ئەوا پێکەنینێکی شلەپەتەی دەکرد بۆت و دەیگوت «پەنا بەخوا» یان «خوا گەورەیە» و بەوە پرسیارەکەی جەنابتی بە «تەرسەقول» دەبڕی. خۆ ئەگەر تۆ زۆر لەسەر قسەکەت بڕۆیشتیتایە، ئەوا دەیگوت: «ببوورە، هەقم نییە بەسەرەوە»، واتە بەزاراوەی ئەورۆ **"بێلایەن"** بوو.

رۆژێکیان منداڵێکی ١٤ــ ١٥ ساڵە بە قیژوهۆڕ و زریکەزریك بە باخەکەدا رایدەکرد و پیاوێکی چوارشانەی پتەو ها لێرەوهالەوێ، بەدوایەوە بوو. بەرێکەوت لەبەردەم ئێمەدا پیاوەکە منداڵەکەی گرت و کەوتە گیانی بەزللە و بەشەق و، منداڵەکەش هاواریدەکرد لەدەستی. ئێمە کە بەزەییمان بە منداڵەکەدا دەهاتەوە، هەستاینە سەرپێ و بۆ پیاوەکە چووین و لە منداڵەکەمان جیاکردەوە. پیاوەکە دەیگوت: «منداڵی خۆمە و وازی لێبهێنن، هەموو رۆژێك لە هیچە چەند جارێك لە خۆشکە بچکۆلەکەی دەدات، دەمەوێ پەروەردەی بکەم». لێرەدا نامەوێ لەسەر ئەم باسە پتر بڕۆم، تەنێ مەبەستم ئەوەیە بێژم ئەو کابرایەی کە «حەقی بەسەر هیچەوە نەبوو»، لەم بەزمەشدا هیچ مێشێك میوانی نەبوو، نەهەستایە سەرپێ لە گەڵمان و نەهیچ قسەیەکی کرد. مام ئەوڕەحمان کە دەمێك بوو لەم کابرایە پڕ بووبوو،

لێیپرسی: «ئەرێ برا ئەوە تۆ بۆچی وایت. هەزار شت رووبدات گوێنادەیتێ». کابرا گۆتی: «حەقم نییە بەسەرەوە». مام ئەورەحمان گوتی: «چۆن هەقت نییە بەسەرەوە؟ لەوانەیە سبەینێ یەکێك بێت و لە پێش چاوی ئێمە لەتۆ هەڵبدات، ئەوسا ئێمەش بڵێین هەقمان نییە بەسەرەوە؟». ئەوجا کە کابراکە گوتی: «خوا گەورەیە»، مام ئەورەحمان بەجارێ هەڵچوو و گوتی: «خوا، خوا، لەبن چنگت دا، کەی خوا دۆستی کەروکەربابی وەك تۆیە!» بەڵێ ئەمەیە "فەلسەفەی بە گونمەوە". ئێمەش گوتمان مام ئەورەحمان "فەلسەفەی بە گونمەوە چییە؟" گوتی: «فەلسەفەی بە گونمەوە ئەوەیە لە قوونی خۆت و خەڵك ببەن کەچی تۆ هەر بڵێیت بە گونمەوە. وەك کەر وابیت هەر کەسێك کۆیان بخاتە سەر پشتت، بەلاتەوە وەك یەك بێ. بەکورتی حیزی و سلاّمەتی. ئائەم کابرایە لە حیزیی بە گونمەوەیە» .... .

مام ئەورەحمان لەم قسانەدا بوو کە عەلی شالی هاورێمان گوتی: «مام ئەورەحمان ببوورە، دەبێ برۆم عومەری برام چاوەرێم دەکات». مام ئەورەحمان دەستبەجێ گوتی: «جا دەرۆیت بە گونمەوە». ئەوجا گوتی: «ئەوا فەلسەفەکەی ئەم کەرانباوکگاوەشم خستە کار بۆتان».

راستییەکەی «بێلایەن» ئەوەیە کە مام ئەورەحمان بۆیچووبوو. چونکە «بێلایەنی» مانای خۆدوورخستنەوەیە لە ژیان. کەسیش ناتوانێ تا زیندوو بێ خۆی لە ژیان دوور بخاتەوە. لەبەر ئەوە سەری "بێلایەن" لەژێر خاکدایە. بەڵام دەبێ ئەوە بزانین ئەوانەی خۆیان "بێلایەن" پێشاندەدەن، هەموو هەر یەك بابەت نین. هێندێك هەن نایانەوێ دڵی کەس بیەشێ لێیان. ئەم بابەتەیان هەلپەرست و هەڵمەتەکاسەن، نایانەوێ خۆیان بەسەر لایەکدا ساخ بکەنەوە، وەك کەری نێو جۆگە لە هەردوولا دەخۆن، بەڵکو لە کەری جۆگە خراپتر لە هەموو لایەك دەخۆن. هێندێکی دیکە هەن ترسنۆك و بوودەڵەن، ناوێرن بە ئاشکرا لایەنگریی خۆیان دەربخەن. ئەم تاقمە دەکەونە درۆکردن و دووڕوویی بۆ شاردنەوەی مەبەستی خۆیان لە پەنای بێلایەنیدا. دەستەیەکی دیکەش هەن کە بێلایەنی و حیزبایەتینەکردن وەك یەك تەماشا دەکەن. پێیان وایە ئەگەر هاتو یەکێك حیزبایەتینەکرد ئەوا دەبێ ئەو کەسە بێلایەن بوەستێ، لە ئاست هەڵسوکەوتی حیزبەکان و هیچ هەڵوێستێکی نەبێ بەرامبەریان.

بێهەڵوێستی خۆسووککردن و وازهێنانە لە مافێکی بنچینەیی مرۆڤ. حیزبایەتی

نەکردن مانای بێلایەنی و قوڕوقەپکردن نییە لە ئاستی کاروکردەوەی حیزبەکان. واتە ئەگەر حیزبەکان هەرچییەکیان کرد و هەرچۆنێك جووڵانەوە، ئەوا یەکێك بێ و بەبیانووی حیزبایەتینەکردنەوە بێژێ: "بێلایەنم هەقم نییە بە سەرەوە" و ئەو فەلسەفەیەی کە مام ئەوڕەحمان باسیدەکرد بخاتە کار. بەکورتی، حیزبایەتینەکردن مانای بێهەڵوێستی نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەوانەی حیزبایەتیناکەن ئازادیی بیروڕادەربڕینیان پترە لەوانەی کە لە حیزبەکاندان. لەبەر ئەوە پێویستە لەسەریان بەهیچ جۆرێك لە ڕەخنەگرتن لە کردەوەی حیزبەکان و لێپرسینەوەیان درێخینەکەن. بەڵام ڕەخنەگرتن، هەرچەندە توندوتیژ بێ، دەبێ بۆ چاکەخوازی و بەنیازێکی خاوێن بێ. ئەگەر ڕەخنەگرتن بۆ خۆنواندن، یان بۆ داپۆشینی پاشلی پیسی خۆ بێ، ئەوا زیانی فرەیە و سووتی کەم. دەبێ ئاگاشمان لەوە بێ کە هێندێك کەسی واهەن ژمارەیەك کردەوەی خراپی حیزبێك، یان چەند حیزب دەخەنەڕوو، قسەکانیشیان زۆر ڕاستە، بەڵام ئامانجیان لەو قسەیە ئەوە نییە بارێکی کەوتوو هەڵبگرنەوە یان هەڵەیەك ڕاستبکەنەوە، بەڵکو مەبەستیان گێرەشێوێنی و ماسیگرتنە لە گۆمی لێڵدا. سەبارەت بەمە، کاتێك کە گوێمان لە ڕەخنەیەك دەبێ و دەزانین ڕەوایە، دەبێ هەوڵبدەین بزانین خاوەن ڕەخنەکە و، ڕابردووی ڕەخنەگر چۆن بووە و ئێستە چۆنە؟. باوەڕ بکەن هی وام دیوە لەم ئەورووپایە کە خۆی بەدەمی خۆی گێڕاوییەتەوە بۆم، ساڵانی ساڵ لە کوردستان لە گەڵ ئەو حیزبانە بووە و چاك و خراپی بە قسەی ئەو حیزبانە کردووە و تەنانەت باسی گەلێك کاری تاوانباریشی کردووە کە بۆ حیزبەکانی ئەنجامداوە. دوایی کە هاتووشەتە ئەورووپا، لێرەش ماوەیەك هەر لە گەڵیان بووە تا جێی خۆی کردووەتەوە و کاری نەماوە پێیان، ئەوجا ئێستە کەوتووەتە بەردەفڕکێ بۆ سەروگوێلاکی حیزبەکەی خۆی. باشە، ئێستە ئێمە بچین و هەروا بە هاسانی چەپلە بۆ قسەزلەکانی لێبدەین و جنێوە هەرزانەکانی بەنرخێکی گران لێبکڕین؟ نەخێر، با بەرەوڕووی بینەوە و فیلمی ژینی ڕابردووی خۆی بخەینەوە بەرچاوی. ئەوجا ئەگەر گوتی: "بە هەڵە چووبووم"، نیشانەیەکی پرسیار بنێینە سەردڵی، تا دڵنیا دەبین لەوەی ڕاست دەکا ،یان نا!.

ئەز بۆخۆم نە حیزبایەتی دەکەم و نە حیزبحیزبێنەش بە شتێکی ڕاست دەزانم. هۆی ئەمەشم بە ئاشکرا و بێپێچوپەنا بڵاوکردووەتەوە. بەڵام هی واشم دیوە کە لە

ژیانیدا لە هیچ حیزبێکدا نەبووە و هەر بیری لەخۆیکردووەتەوە و، لەپێناوی بەرژەوەندیی خۆیدا هاوکاریی لە گەڵ هەموو مرۆڤێکی تاوانبار و رژێمێکی تاوانباردا کردووە و شانازیشی پێوە کردووە و خراپەشی لە گەڵ هەموو مرۆڤێکی باش کردووە، تەنانەت ئەوانەش کە چاکەیان بە سەرییەوە هەبووە. ئەوجا ئێستە دەبینیٚ حیزبەکانی کوردستان گلۆلەیان کەوتووەتە لێژی، دەستیکردووە بە پەلاماردان و هاشە و هووشە. ئەمجارە بەنێوی رۆشنبیرێتییەوە کەوتووەتە پلارگرتنە حیزبەکان و ئەموئەو. باشە، ئایە پێویست نییە رووپەڕەی کارنامەی پڕ لە پەڵەی ئەم «رۆشنبیرانەی هاودەستی جەجاڵ» هەڵبدەینەوە و بیخەینەوە بەرچاویان تا خۆیان باشتر بناسن و ئێدی دەمەدەمیٚ نەکەن؟.

راستە، ئەوانەی ریٚ بۆ رزگاری و بەختیاریی نەتەوەیەك خۆشدەکەن رۆشنبیرانی ئەو نەتەوەیەن. رۆشنبیران بەلای منەوە چینێکی کۆمەلایەتین وەك چینی سەرمایەداران و دەرەبەگان و، هەروەها ئەوانیش دەستڕۆیشتووی نێو کۆمەڵگەن. بەڵام بەداخەوە، ئەو چینەی لەنێو کورددا بە رۆشنبیر دەدرێتە قەڵەم ــ وەك چین، نەك وەك تاکەتاکەی خەڵك ــ چینێکی هەلپەرست، کوڕی رۆژ، دووڕوو، دووەك، ترسنۆك، خۆپەرست، ماستاوساردکەرەوە، باوەڕ بەخۆنەکردوو، بێئامانج، خۆبژین، سێرەنگ و دەسکەلای دەستی زورداره. فەرهەنگی ئەم چینە فەرهەنگێکی کوردانەی رەسەن نییە، بەڵکو فەرهەنگێکی تێکەڵوپێکەڵی خواستراوی بێسەروبەرە. هەر لەبەر ئەوەشە کە رێبازی رامیاریی (سیاسی) ئەم چینە رێبازێکی نەتەوەیی نییە. ئەو رێبازەی کە باوەڕ بەخۆکردن و پشتبەستن بەخۆ و ریٚ بە دوودڵی نەدان و کەوتنە ریٚ بەرەو ئامانجێکی دیار دەخاتە بەرچاوی مرۆڤ و لەم پێناوەشدا هەموو بەرژەوەندییەکی تاکی و بنەماڵەیی و هۆزی و حیزبی و نێوچەیی دەکاتە قوربانی بەرژەوەندیی نەتەوە و بەرەو پێشەوە هەنگاو دەنیٚ بەرەو هەوارگەی ئازادی و یەکسانی، رێبازی نەتەوەییە.

دەردی کورد، نەبوونی ئەم چینە رۆشنبیرەیە. بۆ پێگەیاندنی چینێکی وا، یەکەمین هەنگاو ئەوەیە مرۆڤی خێرخوازی کورد بەرەی ژێر خۆیان لە بەرەی ئەو تاقمانەی سەرەوە، لە پێش هەموو شتێکدا لە مرۆڤی هەلپەرست جیا بکەنەوە، ئەوجا دەتوانین بیر لە گەیشتنە ئامانج و ئاواتی نەتەوە بکەینەوە.

«سەکۆ» ژمارە ٥

مارتی ١٩٩٧

# کوردستان بەسەر دەستی
# چەند دێوێکەوە و ڕێیەك بۆ چارەسەر

پاش شکانی لەشکری سەددام لە پەلامارەکەیدا بۆ سەر کوێت و ڕاپەڕینی خەڵکی باشووری کوردستان و خواروی عێراق بەڕووی ڕژێمی سەددامدا، ڕژێمی ئێران هەل هەڵکەوت بۆی کە تۆڵەی جەنگی هەشت ساڵە لە سەددام بسێنێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە سەرکردەکانی ئێران ژمارەیەکی زۆر پاسدار و چڵکاوخۆری خۆیان ڕژاندە خوارووی عێراقەوە کە ئەمانەش کەوتنە دەستوەشاندن و کوشتنی کاربەدەستانی بەعس بەشێوەیەکی جانەوەرانە و هەڵبڕینی وێنەی خومەینی و باسی "کۆماری ئیسلامیی عێراق" و ئەمەش ترسێکی گەورەی خستەدڵی حکوومەتی ئەمریکاوە کە ڕژێمی مەلاکانی ئێرانی خستووەتە لیستەی تێرۆریستەکانەوە و، وای لە ئەمریکا کرد کە گوێ بۆ ڕاوێژی چەواشەکەرانەی **حوسنی موبارەکی میسر و شاحسەینی ئەردەن و شافەهدی حیجاز** شل بکا و پشتبکاتە ملیۆنان خەڵکی ڕاپەڕیوی کوردستان و عێراق و دەست بۆ سەددام و دارودەستەکەی نەبا و لە ئەنجامی ئەوەدا سەددام کەوتە وێزەی کورد و شیعە و، هەزاران کەسی بێتاوان لەکاتی گەلڕەوەکەی کورددا کوژران.

کە «هەرێمی ئاسایش» لە ساڵی ١٩٩١ دا بە دەستپێشکەریی **بەهەشتی سەرۆك میتران (سەرۆکی ئەودەمەی کۆماری فەرەنسا)** لە لایەن کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دامەزرا، ڕژێمی ئێران و ترك و سووریا ترسیان لە «هەرێمی ئاسایش» پتر بوو وەك لە ڕژێمی سەددام، بەڵام ئەودەمە سەردەمێك نەبوو کە بتوانن بەربەرەکانێی ئەمریکا و ئەورووپا بکەن، چۆنکە ڕژێمی تاوانباری سۆڤێت، لە گرێژەنە دەرچووبوو و ماڵی چووبووە سەربەشی ماڵان. ئێران بەهۆی جەنگی هەشت ساڵەوە وزەی لەبەر بڕابوو و نێوبانگیشی بە ڕژێمێکی تێرۆریست ڕۆیبوو. سووریاش هەروەك ئێران خرابووە لیستەی ئەو ڕژێمانەوە کە هاوکاریی تێرۆریزم دەکەن. سەرۆك وەزیرانی ئەوکاتەی ترکیش خودێلێخۆشبوو **تورگوت ئۆزال بوو**، کە سیاسەتێکی تایبەتی هەبوو بەرامبەر بە کورد (*). لەبەر ئەوە **«هەرێمی ئاسایش»** یان **«هەرێمی نەفڕین»** کەوتە سەرپێی خۆی و ئەوە بوو پەرلەمانی کوردستان

هەڵبژێردرا و حکوومەتی کوردستان دامەزرێندرا. ئالەم کاتەشدا دەوڵەتی **ترك و ئێران و سووریا** دڵخۆشیی خۆیان بەوە دەدایەوە کە ئەم **"بارە بارێکی کاتییە"** و **"کورد ئەوە نین خۆیان بیەن بەڕێوە"**، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا سەرسێ ڕژێمەکە سەرەڕای ناکۆکیی نێوانیان لە یەکدی نێزیکبوونەوە و هەرچەند مانگی جارێك پێکەوە کۆدەبوونەوە بۆ باسی **"مەترسیی باکووری عێراق"** و هەر لەو کاتەشدا ڕژێمی ئێران، دەسکەلاکانی خۆی دەناردە باشوور بۆ تێرۆرکردنی ئەو کوردانەی ڕۆژهەڵات کە هاتبوون بۆ باشوور و بەگژیەکداکردنی **پارتی و یەکێتی**. ڕژێمی ترکیش کەوتە هاندانی تورانییەکانی باشوور لەدژی حکوومەتی هەرێم، ئەگەرچی حکوومەتی هەرێم هەر لە یەکەم ڕۆژی دامەزرانییەوە هەموو مافە ئێتنیەکانی ترکمانی بەرچاو گرتووە و پاراستوویەتی. ڕژێمی سووریاش کەوتە هاندانی ئۆجەلان و دروستکردنی شەڕ و بەیەکدادان لەنێوهێزەکانی پێشمەرگەی باشوور و **پ ی کی کی** دا، بەتایبەتی پێشمەرگەکانی پارتی.

ئەم هەموو کەین و بەین و چاوڕاو و داونانەوەیە بۆ کورد و بێئەزموونی کورد لە مەیدانی دەوڵەتداریدا، بوویە هۆی بەیەکدادانی چەکدارەکانی پارتی و یەکێتی و ڕشتنی خوێنی هەزاران کورد لەهەردوولا. ئەوەش ئاوێکی ساردی کرد بە دڵی داگیرکەرانی کوردستاندا و وایکرد لێیان کە ئەو خەتونیشانەی بۆ کوردیان کێشابوو کە گوایە "کورد ناتوانن خۆیان بیەن بەڕێوە" بەڕاست بزانن و، ئەو حەلە کۆبوونەوە سێ قۆڵییەکەیان بەلاوە هێندە گرنگ نەما و تەنانەت ئەو ڕێککەوتننامەیەی کە سەرۆکوەزیرانی دەوڵەتی ترك **نەجمەدین ئەربەکان** لە گەڵ ڕژێمی مەلاکانی ئێراندا بەستبووی، بۆ کڕینی گازی ئێران لەلایەن ڕژێمی ترکەوە، خرایە پشتگوێ و هەڵپەسێردرا و، ڕژێمی سوریاش هەڵوێستی دوژمنانەی خۆی بەرامبەر ڕژێمی ترك و عێراق ڕۆژ لە دوای ڕۆژ توندو تیژتر دەکرد. بەڵام ئەو ڕژێمانە بۆ خۆکردنە "خاوەنی کورد" هەرساتە نەساتێ بەنێوی «نێوبژی» کردنەوە دەستیان دەخستە کاروباری نێوخۆیی کوردەوە. کاتێکیش **پەیمانی واشنتەن** لە ئۆکتوبەری ١٩٩٨ دا لەنێوان پارتی و یەکێتیدا بەسەرپەرشتیی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بەسترا، هەرچەندە سووریا ئۆجەلانی دەرکرد و دەوڵەتی ترك کەوتە خۆسۆرکردنەوە لە پارتی و یەکێتی کە پرسی پێنەکراوە و بۆ واشنتەن بانگنەکراوە،

لەگەڵ ئەوەشدا خۆ بەزلگرتن و کورد بە کەمگرتن وایکرد لێیان کە باوەڕ نەکەن بەوەی شەقی ڕۆژگار سەرخۆشیش دەهێنێتە هۆش و ڕێنادا هیچ کەسێك یاری بە چارەنووسی بکا و، ئەوە بوو شەقی ڕۆژگار و هەوڵوتەقەلای چاکان، پارتی و یەکێتی گەیاندە یەك و، ئەوجا کە ئەم سێ ڕژێمە بۆیان دەرکەوت کە هاسنەکە گەرمە و کورد ئەمجارە بەڕاستیانە و دەیانەوێ یەکبگرن، هەموو کەوتنە هاوار و هەڕەشەوگوڕەشە. ڕژێمی سووریا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خۆی لە ڕژێمی عێراق نێزیکتر کردەوە، لەکاتێکدا کە بەرلە ساڵێك هەردوو ڕژێمی بەعسی **(عێراق و سووریا)** تیروشیریان لەیەك دەسوو. ڕژێمی سووریا لە ۲۰۰۲/٦/۱۹ دا لەگەڵ ڕژێمی ترك پەیمانی هاوکاری سوپایی و ئاسایشی بەست و، تەنانەت جەنەراڵێکی ترکمانی نارد بۆ ئیمزای پەیماننامەکە لە گەڵ ڕژێمی ترك. ڕژێمی ترك کە ڕژێمی مەلاکانی بەوە گوناهبار دەکرد کە یارمەتیی چەکدارەکانی پێ کێ کێ دەدا، دەستی لەو قسانە هەڵگرت و کەوتە بەرتیلدان بە ڕژێمی مەلاکان، بەخستنەکاری ئەو پەیماننامەی کە ئەربەکان لە ۱۹۹٦ دا لەگەڵ ئێران بەستبووی بۆ کڕینی گاز لە ئێران. ئێرانیش ئامادە بوو گازەکەی بەنرخێکی کەمتر لەو نرخەی لەسەری ڕێککەتبوون بفرۆشێ بەترك. سەرۆك کۆماری ترك سێزەر، چوو بۆ سەردانی ئێران و **مەلا خاتەمی سەرۆك کۆماری ڕژێمی مەلاکان** لە ۱۳ی ئۆکتۆبەردا چوو بۆ **ئەنقەرە** بۆ بەشداریکردن لە کۆنفرانسی هاوکاریی (ئاکۆ) دا و، هەر لەوێ گوتی: **"باری سەرنجی ئێران بەرامبەر بەدواڕۆژی عێراق، هەروەك باری سەرنجی دەوڵەتی ترکە و ئێمەش لەدژی ئەوەین کە دەوڵەتێکی کوردی لە عێراقدا دابمەزرێ"**. وەزیری هەواڵگوزاریی ڕژێمی مەلاکان **عەلی یونسی** کە لەم مانگی ئۆکتۆبەرەدا چووبوو بۆ دیمەشق بۆ باسی دواڕۆژی عێراق پاش سەددام، لە گەڵ کاربەدەستانی سووریا، گۆتی: "ئێران و سووریا هەردووکیان دژی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردین". هەروەها لەوەرامی پرسیارێکدا لەبارەی پەرلەمانی کوردستانەوە کە لە ۱۰/٤ دا کۆبووەتەوە لە هەولێر، بە گاڵتەپێکردنەوە گوتی: «ئەمە یارییەکی ڕامیاری و هەواڵگوزارییەوە بۆ مەسرەفی نێوخۆ» (ئەسوشێتد پرێس و ڕادیۆی "العراق الحر" لە ۲۱/ ۱۰ دا). ئەوجا هەڕەشەی ڕژێمی ترك لە کورد کە کەرکووك و مووسڵ داگیردەکا و، ڕێنادا بەدروستبوونی دەوڵەتی کورد و زۆر لە ئەمریکا دەکا کە چەك بدا بە تورانییەکانی

"بەرەی ترکمانی"، وەك ئەوەی رژێمی ترك کەم چەکی دابێ پێیان. ئەمانە هەموو ئامازەی ئەوە دەکەن کە **«هەرێمی نەفرین»** و هەموو باشووری کوردستان وا لەسەر دەستی چەند دێوێك کە لەترسی ئەمریکا و بەریتانیا و باری نێودەوڵەتییە کە جارێ نایدەن بەزەویدا. هەرچەندە بەڕێز مام جەلال لە چەند وتووێژێکی رۆژنامەییدا وایدەربڕی کە ئەمریکا گوتوویەتی: **"کورد دەپارێزێ"**، بەڵام ئەوەی راستی بێ ئەز وەك مام جەلال لەمڕووەوە زۆر گەشبین نیم. چونکە لەو باوەڕەدا نیم کە ئەمریکا هاوپەیمانێکی کۆنی بەهێزی خۆی کە دەوڵەتی ترکە بگۆڕێتەوە بە کوردێکی بێدەوڵەتی بێلەشکری لەنێوخۆدا یەکنەگرتوو و، ترکیش بە هەموو جۆرێك هەوڵدەدا کە کورد هیچی دەستنەکەوێ و ئەوەی هەشێتی ئەوەشی لەدەست بچێ، بەتایبەتی کە ئێران و سووریاش هەروەك دەوڵەتی ترك لەم رۆژانەدا زۆر بە پەرۆشتربوون لە سەددام بۆ **"پاراستنی یەکێتیی خاکی عێراق"**. ئاشکرایە بەشێکی گەورەی گوناهی ئەم هەڵوێستەی ئەمریکا و گەلێك لە دەوڵەتانی رۆژاوا کە زۆر لە کورد نایەنە پێشەوە، لەئەستۆی ئەو شەڕی خۆکوژییەیە کە سالانی ساڵ لە خوتوخۆڕایی درێژەیکێشا و باوەڕی بێگانەی بەرامبەر بە کورد هێنایە سەر سفر. بەبیروبۆچوونی من هەردوو حیزبە دەسەلاتدارەکە **(پارتی و یەکێتی)** لەباتی هەڵنان و پەسندانی دراوسێکانی کوردستان کە هیچ کامێکیان نوێنەرێکی خۆیان نەنارد بۆ جڤینی ١٠/٤ ی پەرلەمانی کوردستان، بچن جارێ نێو ماڵەکەی خۆیان رێکبخەن بە دامەزراندنی حکوومەتێکی یەکگرتووی کاتی و هەڵبژاردنێکی نوێی پەرلەمان بەزووترین کات و تێکەڵکردنی پێشمەرگەکانی هەموو حیزبەکان لە گەڵ یەك و کردنیان بە لەشکری بەرگریی کوردستان و گشتپرسییەك (استفتا )بۆئەوەی بزانرێ کورد چییان دەوێ (سەربەخۆیی، فێدەراسیۆن و ... هتد) تا بەڵگەنامەیەکی قانوونی بکەوێتە دەست کورد، ئەوجا دەستدانە چالاکییەکی دیپلۆماسییانەی زۆر سەخت لە هەموو لایەکی جیهاندا، بەتایبەتی لە **ئەمریکا و ئەورووپا و ئۆستڕالیا و رووسیا و چین** بەنێوی حکوومەتی کوردستانەوە، نەك بەنێوی ئەم حیزب یان ئەو حیزبەوە و هەڤاڵبەندی بەستن لەسەر بنچینەی کردەوە، نەك قسەی رووت و چایی و قاوە خواردنەوە لە گەڵ ئەم وەزیر و ئەو گزیر.

بەکورتی، دەوڵەتانی ترك و ئێران و سووریا بەتەواوی لەیەك نێزیکبوونەتەوە و

دەیانەوێ پێکەوە دەست بدەنە دەست یەك لەدژی کورد و دامەزراندنی کۆمارێکی فیدەراڵیی لە باشووری کوردستاندا، ئەگەر هاتوو ئەمریکا پەلاماری رژێمی سەددامی دا، ئەمە لە کاتێکدا کە تا ئەو هەندازەیەی ئەز ئاگام لێیە، ئەمریکا خەڵکی باشووری کوردستانی ئامادە نەکردووە بۆ ئەوەی ئەگەر سەددام چەکی کیمیایی و بیۆلۆژیی بەکارهێنا، مەترسییەکەی کەمبێتەوە لەرێی ناردنی دەمامك و دەرمان و بژیشك بۆ کوردستان و دروستکردنی پەناگە لەژێر زەویدا و دانانی دژەراکێتی پاتریۆت لە کوردستان. ئەوەی کە بەچاو دیارە ئەوەیە رژێمی ترك لەشکری خۆی ناردووەتە باشووری کوردستان و هەرەشە لە کورد دەکا نەك لە سەددام.

بێگومان ئەگەر سەددام دەستبکاتەوە لە ئەمریکا، دیارە شەرێکی خۆترێن دەکا، بەڵام هەتا ئەو شەرە خۆترێنە کۆتایی دێ، کورد زیانێکی زۆر دەکەوێ لێیان. لەبەر ئەوە باشترین شت ئەوەیە، ئەگەر بکرێ، سەددام دابین بکرێ بەوەی دەست لەکار بکێشێتەوە و، خۆی و دەوڵەتەکەی بداتە دەست نەتەوەی کورد، وەك لەوتاری پێشوومدا نووسیبووم. دیارە ئەمەش پێش دەستوەشاندنی ئەمریکا دەبێ، چۆنکە کە ئەمریکا دەستی وەشاند و بوو بە شەر، ئەوساکە پەنابردن بۆ کورد رزگاری ناکا و کوردیش لە پەنادان بە سەددامێکی تاوانباری راکردوو، هیچی دەستناکەوێ لە زیان بەولاوە.

دیارە ئەمەش "یارییەکی رامیاری و دیپلۆماسیی" زۆر گەورە و گرانە و پێویستی بە رێککەوتنە لەنێوان کورد و ئەمریکا و بەریتانیا و دڵنیاکردنی ئەو لایەنانەی کە بەرژەوەندیی ئابووریيان هەیە لەگەڵ رژێمی سەددام و قەرزیان بەسەر ئەم رژێمەوە هەیە، بەتایبەتی رووسیا و فەرەنسە و چین و لە خاوەنقەرزەکان بگەیەندرێ ئەگەر هاتوو رژێم بەجۆرێکی دیکە هاتە گۆران، ئەوا بەتەمای تیکەی چەور نەبن.

ئەمە بەبیروبۆچوونی من رێیەکە بۆ چارەسەری بەشێك لە دۆزی کورد و خزمەتێکە بۆ ئاشتیی نێوچەکە و جیهان. ئێستە دەخوازم بزانم سەرنجی سیاسەتکارانی کورد، بەتایبەتی **برایانی بەرێز کاك مەسعوود بارزانی و مام جەلال تالەبانی** لەم رۆژە چییە.

**ئاهورامەزدا کوردستان لە دێو ودرنج بپارێزێ.**

بەرلین ٢٠٠٢/١٠/٢٦

* ــ **تورگــوت ئۆیزال** دژی ئەوە نەبوو کـە کـورد لە باشـووری کـوردسـتـانـدا نێوچەیەکی فیدەرالیان هەبێ. تەنانەت دەیگوت پێویستە لە گەڵ "کوردی ترکیا" باسی فیدەرالیزم بکرێ بۆ ئەوەی پێیان بسەلمێنرێ کە بۆچی فیدەرالیزم بۆ "کوردی ترکـیـا" ڕاست نیـیـە. ئۆیزال دەیگوت دەبێ یارمـەتیی "کـوردی عـێـراق" بدرێ بۆ لابردنی ڕژێمی سـەددام. هەرئەویش بوو کـە لەکـاتی سـەرۆکـوەزیرایەتیی خـۆیدا بڕیاریدەرکـرد بۆ ڕێدان بە قـسـەکـردن بە کـوردی بە ئازادی. "مـیـدیا" لەژمـارەی پێشوودا وتووێژێکی گۆڤاری **"شپیگل" ی ئەڵمانی** لە گەڵ ئۆیزالدا بڵاوکردبووەوە. منیش وەرامێکی ئەو قسانەی ئۆیزالم هەر لە "شپیگل" دا بڵاوکردەوە کە ژمارەیەك یان دوو ژمارە پاش هەڤپەیڤینەکەی ئۆیزال و شپیگڵ دەرچوو. دەگەڕێم بەدوایدا کە دۆزیمەوە بەوەرگێڕانی کوردییەوە دەینێرم بۆ "میدیا"ی خۆشەویست.

(جەمال نەبەز)

"میدیا" ژمارە (١٣٥) ٢٠٠٢/١١/١

# نامەیەك بۆ
# بەرێز کەریم ئەحمەد

**هاوولاتی بەرێز کەریم ئەحمەد ، سکرتێری پارتی کۆمۆنیستی کوردستان/ عێراق**

سلاوێکی برایانەت لێبێ و هیوام شادیتە

لەبەشی دووەمی دیدارەکەتاندا لە گەڵ رۆژنامەی **"میدیا"** زمانی رەوشی **یەکێتیی نەتەوەییی دیموکراتی کوردستان** چەند قسەیەکی بەرێزتم خوێندەوە لەبارەی کاژیکەوە. ئەو قسانە پاڵیان بە منەوە نا بێمە وەرامدانەوە. باوەڕ بفەرموو پێمناخۆشە کە وا ئەم چەند دێڕە لە خستنەڕووی راستیدا دەنووسم. بەلام چارم ناچارە. چۆنکە لە لایەکەوە، وەك پێوەنداری بیری **کاژیك** و، لە لایەکی دیکەوە، وەك مرۆڤێکی زانستکاری دەروێست بە بەرگریی لە هەق، بەپێویستی سەرشانی خۆمی دەزانم رۆشنایییەك ئاراستەی دەربرینەکانت بکەم. هیوام وایە تۆش بەرووبەکی گەشەوە بەرەو پیریی بچیت.

لە هەڤپەیڤینەکەدا فەرمووتە:

"پەیوەندیی حیزبی شیوعی لەگەڵ حیزبەکان باش بووە، بەلام کاژیك حیزبێکی کۆنی نەتەوایەتیی کورد بوو و لە کۆنەکانە. هەرچی پاسۆکە لە ماوەیەکی دیکەدا دەرکەوت کە کاژیك نەما و رووخا".

جاریَ با بزانین ئایە "پێوەندیی پارتی کۆمۆنیستی عێراق لە گەڵ حیزبەکان باش بووە" وەك بەرێزت دەفەرموویت، یان نا ؟

پارتی کۆمۆنیستی عێراق لەساڵی ١٩٣٤ دامەزرا و، هەرپاش دامەزراندنی هەوڵی خۆکوتانە نێو کوردستانی دا. کەسانێکی بەژمارەکەمی وەك **سالح کەرکووکی (کە بە سالح بۆلشەویك ناسرابوو) و مەلا شەریفی مەلا عوسمانی** لەدەوری خۆی کۆکردەوە و کەوتە پرۆپاگەندەی **عێراقچێتی و پەرستنی ستالین و رژێمی سۆڤێتی دیکتاتۆر و ئەنفالکەر لە کورد**. ئەم چالاکییەی پارتی کۆمۆنیستی عێراق لەلایەن نیشتمانپەروەرانی کوردەوە بەربەرەکانێکرا و ئەویش کەوتە بوختانکردن و درۆهەلبەستن بۆ کوردپەروەران و، کە حیزبی **« هیوا »** ش لەساڵی ١٩٣٨/١٩٣٩ دا

لەلایەن هێندێك خوێندكاری كوردەوە دروستبوو و، ساڵێك دوای ئەوە مامۆستا رەفیق حیلمی (١٨٩٨ ــ ١٩٦٠/٨/٤) هەڵبژێردرا بە سەرۆكی حیزب. فەهد هەوڵیدا گومان بە خەڵكی كوردستان پەیدا بكا بەرامبەر بە حیزبی «هیوا»، كە گوایە "كورد پێویستی بەكارە نەك بە هیوا". ئەمەش راست نەبوو. چۆنكە جارێ حیزبی هیوا كاری باشی دەكرد، بە شایەتیی **نووری شاوەیس** ــ ئەندامی «هیوا» (بیرەوەرییەكانی نووری شاوەیس تەماشا بكە). بێجگە لەمەش ئەگەر مەبەستی فەهد خزمەتی كورد بوایە، ئەو دەمە بەهاوڕێ كوردەكانی خۆی دەگوت بچن پارتێكی نیشتمانیی چالاك ، یان پارتێكی كۆمۆنیستی كوردستانی دروستبكەن، كەچی ئەو چوو لە كوردستاندا لكێكی بۆ پارتی كۆمۆنیستی عێراق كردەوە و، بەمە دووبەرەكی خستەنێو كوردەوە. كۆنفرانسی حیزبەكەشی كە لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٤٤ دا بەسترا، كوردی بە "كەمایەتی" و ئێزیدییەكانیشی بە "كەمایەتی" یەكی دیكە دانا. رۆژنامەكانی كۆمۆنیستەكانی عێراق، چ دەستەی **"القاعدة"** و چ دەستەی "وحدة النضال" تاساڵی ١٩٤٤/١٩٤٥ باسی كوردیان تێدا نەبوو و، تەنانەت لەساڵی ١٩٤٨ دا كە كۆمۆنیستەكان لە كوردستاندا رەشەكۆشتیان گرتبوو و بە "تحرر" (تەحەڕوڕ) نێویان رۆیبوو دەیانگوت كورد «ئومە» (نەتەوە) نییە. (تەماشای ئەو لێكۆڵینەوە بكە كە لەبارەی رۆژنامەی **"یەكێتیی تێكۆشین"** ەوە لەساڵی ١٩٨٨ دا بلاوكردووەتەوە).

ئەوجا ئەو كۆمۆنیستانەی كە لە حیزبی «هیوا» دا ئەندام بوون، شان بەشانی سیخورەكانی بەریتانیا و كاربەدەستانی عێراق كەوتنە دژایەتیی كوردایەتیی راستەقینە. واتە موكەرەم تاڵەبانی (كۆمۆنیست) و ماجید مستەفای وەزیری عێراق و نۆكەری ئینگلیز، وەكیەك بەربەرەكانێی «هیوا» و سەرۆكی «هیوا» مامۆستا رەفیق حیلمییان دەكرد. هەرلەو كاتەدا ئەوانەی سەر بە بزووتنەوەی نازێتیش بوون و پرۆپاگەندەیان بۆ هیتلەر دەكرد، وەك رەشید عارف، ئەوانیش هەر دژایەتیی «هیوا» و مامۆستا رەفیق حیلمییان دەكرد، چۆنكە مامۆستا هێندە كورتبین نەبوو بچێ لەداخی كردەوەی خراپی ئینگلیزەكان پشتی نازێتی بگرێ و «دوژمنی دوژمنی كورد» بێمەرج و لەبەر بوورە، بەدۆستی كورد بداتە قەڵەم.

مامۆستا رەفیق حیلمی كە لە سەرەتاوە بەهۆی دۆستایەتییەوە لەگەڵ باوكمدا، لە

سلێمانی ناسیبووم، كە چوومە بەغدا بۆ خوێندن و دۆستایەتیمان دەستپێكرد (*)، گەلێك بەسەرهاتی خۆی باسكرد بۆم. یەكێك لەوانە ئەوەبوو كە مامۆستا بەم شێوەیەی خوارەوە گێڕایەوە:

«لەلایەكەوە **بەكر سدقی** لە دژم بوو. چونكە ئەو منی بە لایەنگر و دەروێشی **شێخ مەحموود** دەزانی و پێشی وابوو هەموو كوێرەوەرییەك كە بەسەر كورد هاتووە، گوناهی شێخ مەحموودە كە ئینگلیزەكانی بەخوتوخۆڕایی هێناوەتە كوردستان و، ئەوانیش هیچیان نەداوە بە كورد و، لەلایەكی دیكەوە **موكەڕەم تاڵەبانی** و دارودەستەی كۆمۆنیستەكان دژم دەوەستان بە تۆمەتی ئەوەی كە گوایە «هیوا» حیزبێكە بە ئینگلیزەوە بەستراوە و لەلایەكی دیكەشەوە سیخوڕەكانی ئینگلیز وەك ماجید مستەفا كە دەیانزانی دەمەوێ «هیوا» كوردایەتی بكا و كورد شتێكی دەستبكەوێ و، ئەوانیش نەیاندەویست «هیوا» لە گەڵ **مەلا مستەفای بارزانی** و **شێخ ئەحمەدی بارزانی** هاوكاری بكا، كەوتنە پڕۆپاگەندە لەدژم. لەلایەكی دیكەشەوە ئەوانەی سەر بە هیتلەر و نازییەكان بوون وەك **ڕەشید عارف**، دوژمنایەتیمیان دەكرد. ڕەشید عارف دەیگوت: "پارە ڕژاوە. تۆ هەر ئەوەندەت بەسە بچیت بۆلای **گرووبە** ( باڵوێزی ئەودەمەی ئەڵمانیای نازی لە بەغدا! ج. ن.)، پارە و چەكت چەند بوێ ئامادەیە". لە ئەنجامی ئەم هەموو پەلاماردانەدا «هیوا» لەساڵی ١٩٤٥ دا لەكار كەوت. با هەر لەسەر باسی مامۆستا ڕەفیق حیلمی و كۆمۆنیستە عێراقییەكان كەمێك بڕۆین. هاوینی ١٩٥٧، مامۆستا ڕەفیق حیلمی، كە ئەودەمە لە بەغدا دەژیا، بۆ سەردان هاتە سلێمانی (مامۆستا خۆی كەركووكی بوو، خێزانەكەی خەڵكی سلێمانی بوو). ئێمەش چەند برادەرێك وەك مامۆستا فایەق عارف و دوكتۆر عەلی تەوفیق لە خزمەتیدا بووین و بردمان بۆ سەرچنار و دوكان و ڕۆژێكیان بەرەو زەڵم كەوتینەڕێ و هات بە خەیاڵمدا كە تا هەڵەبجەش بهاژووین. كە چووینە ئەوێ، مامۆستا ڕەفیق حیلمی فەرمووی: «ئێستە حەسەن بەگ ببیستێ هاتوومەتە **هەڵەبجە** و نەچوومەتە ماڵی، زۆر گلەیی دەكا لێم»، لەبەر ئەوە چووینە دیواخانە ڕازاوەكەی حەسەن بەگی جاف. نێزیكەی دەمژمێرێك ماینەوە، حەسەن بەگ بەگەرمی تكای كرد لێمان كە بۆ نانی ئێواریٚ بمێنینەوە، بەڵام نەماینەوە و گەڕاینەوە سلێمانی. پاش چەند ڕۆژ بیستم كە كۆمۆنیستەكان قاویان داخستووە گوایە

"ئەمریكا مامۆستا رەفیق حیلمی بە پارەیەكی زۆرەوە ناردووە بۆ كوردستان كە پێوەندی بكا بە ئاغاكانەوە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێكی كوردیی سەربە ئەمریكا و دژ بە سۆڤێت". بەمەش وەك ئەوەی دروستكردنی دەوڵەت، ئەوجا دەوڵەتی كوردیش ها!، **شۆرباوی خانەقاكەی سەید ئەحمەدی كەركووك بێ و بەخۆڕایی بیدەن بە هەژاران!!!**

پاش كودەتای **قاسم** و هاوڕێ ئەفسەرەكانی لە ١٩٥٨/٧/١٤ دا بەچەند رۆژێكی كەم، ئێمە ژمارەیەك لە ماموستایانی قوتابخانەكانی **كەركووك و هەولێر و بادینان و سلێمانی** بیرخەرەوەیەكمان دا بە قاسم و وەزیری پەروەردەكەی، دوكتۆر جابر عومەر بۆ دانانی بەڕێوەبەرێتییەكی زانیاریی گشتی بۆ كوردستان (مدیریة معارف كردستان العامة) كە نێوەندەكەی لە كەركووك بێ. لەو بیرخەرەوەیەدا پێشنیازی ئەوەمان كردبوو كە مامۆستا رەفیق حیلمی بێ بە سەرۆكی ئەو بەڕێوەبەرێتییە. ئەو رۆژەی گەیشتمە بەغدا، بیرخەرەوەكەم بەیارمەتیی هاوڕێی منداڵیم **دوكتۆر عێزەدین مستەفا رەسووڵ** كە ئەودەمە لەبەشی كوردیی رادیۆی عێراق كاریدەكرد، خوێندەوە و بردیشم بۆ رۆژنامەی **"البلاد"** كە بۆ رۆژی دوای ئەوە بڵاویكردەوە. جەماوەری كوردستان بە تەلگرافلێدان پشتی بیرخەرەوەكەیان گرت، **بەڵام عەبدولسەلام عارف كە جێگری قاسم و وەزیری نێوخۆ و بەڕاستی كابرایەكی زۆر شۆڤێنیست و كەرپیاویش بوو، رۆژنامەی "البلاد" ی لەسەر ئەوە دەستبەجێ داخست.** ئەوجا كۆمۆنیستەكان لەمە گڕیانگرت. لەباتی ئەوەی عەبدولسەلام عارف گوناهبار بكەن، ئێمەیان گوناهبار كرد، چۆنكە ئەوانیش نووسینەكانیان لە رۆژنامەی "البلاد" دا بڵاودەكردەوە و هێشتا رۆژنامەیەكی خۆیان نەبوو. كۆمۆنیستەكان دەیانگوت: **«كەینێ كاتی ئەم شتە پڕوپووچەیە. كۆمارەكەمان جارێ ساوایە، چۆن دەبێ لەم رۆژەدا باسی ئەوشتانە بكرێ»**. ئەمەش لەكاتێكدا كە پارتی كۆمۆنیستی عێراق لە كۆنفرانسی شویاتی ساڵی ١٩٥٦ دا دانینابوو بە مافی نەتەوەی كورددا بۆ بڕینەوەی چارەنووسی خۆی. هەرلەو كاتەدا كە كۆمۆنیستە عێراقییەكان و عەبدولسەلام عارفی شۆڤێنیی عەرەب دژی ئەو داخوازییەرەوایەی ئێمە وەستان، **تورانییەكی وەك نازم تەبەقچەلی** كە ئەودەمە "قائد فیرقەی" كەركووك بوو، كەوتە دژایەتیمان و هاندانی حكوومەت لێمان (كاك كەریم تكایە

بیرەوەریبەکانی نازم تەبەقچەلی بخوێنەرەوە کە لەوێدا بیرخەرەوەکەی ئێمە و نامە ژەهراوییەکەی تەبەقچەلی لەدژمان بلاوکراونەتەوە).

ئەوجا کۆمۆنیستەکان لە کوردستان، لە خۆپێشاندانەکانیاندا کە هەموو ڕۆژێ ٨ــ ١٠ کاتژمێر درێژەی دەکێشا، دەیانقیڕاند: "نامانەوێ مەعاریفی قلیاسان". ئەرێ! کوردستانیان بەچۆمی قلیاسان دەچواند.

سەیر ئەوەیە ئەو مامۆستا ڕەفیق حیلمییەی کە کۆمۆنیستەکان ئەوکاتە بەو شێوەیە بەربەرەکانێیان دەکرد، هەرلە ساڵی ١٩٥٨ دا پاڕانەوە لێی کە بچێتە لێژنەی دامەزراندنی "حیزبی جمهوری" یەوە کە پاشکۆیەکی پارتی کۆمۆنیستی عێراق بوو. هەرچەندە ئەز و هاوبیر کامیل ژیر کە ئەو حەلە هەردووکمان لە بەغدا دەژیاین زۆر تکامانکرد لێی کە ئەوە نەکا، بەڵام لەبەر ئەو ناکۆکییەی کە لەنێوان پارتی دێمۆکراتی کوردستان و ماموستا ڕەفیق حیلمیدا پەیدا بووبوو، بەقسەمانی نەکرد و چووە لێژنەکەوە، دوایی خۆشی پەژیوان بووەوە. شایانی باسە کە کۆمونیستەکان پاش دامەزراندنی "بەڕێوەبەرێتیی زانیاریی کورد" (نەك کوردستان کە ئێمە داوامان کردبوو) چوون کورسی و مێزەکانیان لەنێوخۆیاندا دابەشکرد.

لەساڵی ١٩٥٨ و ١٩٥٩ دا کرام بە مامۆستا لە قوتابخانەی دوانێوەندیی جەعفەرییە لە بەغدا، کە بە **"دوانێوەندیی مۆسکۆ"** بەنێویانگبوو، چۆنکە زۆریەی زۆری قوتابییەکانی کۆمۆنیستبوون. بەشێکی قوتابییەکان کوردی فەیلی بوون. لەو سەردەمەدا کۆمۆنیستەکان لە بەغدا و لە هەموو عێراقدا بەهۆی هاوکارییانەوە لە گەڵ قاسم، دەستیان چاك دەڕۆیی و، لەباتی ئەوەی ئەو دەسەڵاتەیان بۆ کاری باش و خزمەتی گەڵ بەکار بهێنن، کاری زۆر خراپیان دەکرد. کۆمۆنیستە کوردەکان زۆر دوژمنایەتیی **پارتی دێمۆکراتی کوردستان** و کوردایەتییان دەکرد. لەبەرەبەیانی سەرهەڵدانی **کاژێك** دا، **هاوبیر کامیل ژیر** کۆمەڵە هۆنراوەیەکی خۆی لە چاپدا بەنێوی «کوردایەتی» یەوە و منیش پێشەکییەکم نووسی بۆی. هەرچەندە ئەو نامیلکەیە هیچ شتێکی دژی کۆمۆنیستەکان تێدا نەبوو، بەڵام ئەوان کێچ کەوتە کەوڵیان و فەرمانیان بە **مامۆستا محەمەدی مەلاکەریم** دا کە بکەوێتە کار. ئەویش نامیلکەیەکی دژی «کوردایەتی» نووسی کە بە **"نەشتەرەکولەکەی حەمەی مەلاکەریم بەنێویانگە"**. لەو سیپارەیەدا هەرچی بوختان و قسەی قۆڕ هەبوو دژی کوردایەتی

نووسیبووی. ئەوە منی والێکرد کە بەرپەرچی بدەمەوە بەنامیلکەیەك لەژێر سەرنێوی **(کوردایەتی، بزووتنەوە و بڕوا و رژێمە) بەنێوی خواستەمەنیی «زەردەشت»** ەوە، کە ئەوە جەزرەبەیەکی پشتشکێن بوو بۆ بیروڕاچەوتەکانیان. کۆمۆنیستەکان هەرلە سەر رێی ناڕاستی خۆیان رۆیشتن. تەنانەت رۆژنامەی **"اتحاد الشعب"** وتارێکی دژی من بلاوکردەوە، چۆنکە هەوڵمدەدا خەڵکی کوردستان فێری رێنووسی لاتینی بکەم و، ئەوکارەی منی بە "دژایەتیی یەکێتیی عێراق" دابووە قەڵەم و رژێمی قاسمی هاندابوو لێم. ئەمەش منی ناچارکرد بە وەرامدانەوەی ئەو وڕینانە بە عەرەبی لە رۆژنامەی **«صوت الاکراد/دەنگی کورد»** دا کە لە بەغدا دەردەچوو و **جەلال عومەر حەوێزی** خاوەنی بوو و منیش لە رێکخستنی بەشە عەرەبییەکەیدا یارمەتیم دەدا.

لەسەردەمی قاسمدا (تەموزی ١٩٥٨ ــ شوباتی ١٩٦٣) ناکۆکیی نێوان پارتی دێمۆکراتی کوردستان و پارتی کۆمونیستی عێراق هەتا دەهات خراپتر و خراپتر دەبوو. پارتی کۆمۆنیستی عێراق دەیویست هەموو رێکخراوە کوردستانییەکان خۆیان هەڵوەشێننەوە و ئەندامەکانیان بچنەرِیزی رێکخراوەکانی پارتی کۆمۆنیستی عێراقەوە. بەلام **سەرۆك بارزانی** ئەم پیلانەی پووچکردەوە و رێنەدا پێیان.

کە شۆرشی ئەیلول لە پێشەوە وەك بزووتنەوەیەکی چەکدارانە لە ئەیلولی ١٩٦١ دا دەستپێکرد، پارتی کۆمۆنیستی عێراق لەسەرەتاوە بەتوندی دژایەتیی دەکرد، هەرچەندە لە خۆپێشاندانەکانیدا داوای **"ئاشتی بۆ کوردستان" (السلم في کردستان)** ی دەکرد، بەلام بزووتنەوەکەی بەفیتی بەرەی ئیمبریالیستەکانی رۆژاوا دەدایە قەڵەم (**بۆ دووروودرێژیی ئەم باسە بە بەڵگەوە بگەڕێرەوە بۆ سەمیناری "کوردستان و شۆرشەکەی" کە بە ئەڵمانی لە ١٩٧٢ دا لەلایەن «نوکسە» وە بلاوکراوەتەوە و، وەرگێرانی کوردییەکەشی لە ١٩٨٥ دا لە سوێد چاپکراوە**).

ئەم دژایەتییە بەرامبەر شۆرشی ئەیلول درێژەی کێشا تا قاسم کەوت و بەعسییەکان هاتنە سەرکار و ئەوجا کە **یەکێتیی سۆڤێت** کەوتە پرۆپاگەندەی رادیۆیی و رۆژنامەیی و دیپلۆماسی دژی بەعسییەکان، کۆمۆنیستەکانی عێراقیش لەترسی قەلاچۆکردن بەدەستی بەعسییەکان رایانکردە چیاکانی کوردستان و لەلایەن پێشمەرگەی کوردەوە پارێزران، سۆڤێت کەوتە باسی کورد و کێشەکەیان. بەلام پشتگیریی سۆڤێت بۆکورد دژی بەعس هەمووی چەند هەفتەیەکی کەمی خایاند و

دیسانەوە بایدایەوەسەر دۆستایەتیی عێراق. کاك کەریم ئەحمەد تکایە سەمیناری **«کوردستان و شۆرشەکەی»** تەماشا بکەرەوە، ئەوسا هەموو ئەم قسانەت بەبەلگەوە دەستدەکەون هەتا سالی ١٩٧١/١٩٧٢. **ئەوەشمان نابێ لەبیر بچێ کە "هاوپەیمانێتی" پارتی کۆمۆنیستی عێراق لەگەلّ حیزبی بەعس لەسالی ١٩٧٣ وە تاسالی ١٩٧٨ درێژەی کێشا، دیارە دژی شۆرشی ئەیلوول و پ.د.ك. بوو.** ئەوجا شەر و بەیەکدادانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە هەشتاکاندا، ئەمانە گشتیان بەرپەرچی ئەو قسەیەی کاك کەریم دەدەنەوە کە دەبێژێ "پێوەندیی پارتی کۆمۆنیستی عێراق لە گەلّ حیزبەکانی کوردستان باش بووە".

**کاك کەریمی بەرێز، ئەگەر بەراستی باسی هەلّسوکەوتی ناراستی کۆمۆنیستەکانی عێراق بکەم، پێویستم بەیەك تەن کاغەز و سەت گالۆن مەرکەبە.**

ئەمجا با بێینە سەر **کاژیك** و **پارتی کۆمۆنیستی عێراق**. راستییەکەی پارتی کۆمۆنیستی عێراق هەرچەندێك دژایەتیی کاژیك و هاوبیرانی کاژیکی کردبێ، هێشتا ئەو دژایەتییە ناگاتە ١٠٪ ی ئەو دژایەتییەی پارتی و یەکێتی کە بەرامبەر کاژیکیان کردووە و ئەمەش بۆ مێژوو دەبێ بگوترێ و بنووسرێ. بەلاّم تۆ کاك کەریم لە قسەکانتدا وادیارە هەتا ئەورۆش چاو لە هێندێك راستینە (حقائق) دەپۆشیت لەبارەی کاژیکەوە. بۆ وێنە دەفەرموویت: "کاژیك کۆنە و لە کۆنەکانە". ئێستە ئالێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە، ئایە کاژیك نەبوو کە چل سالّ لەمەوبەر گالتەی بە بیری **"دیکتاتۆرێتیی پرۆلیتاریا"** دەکرد و ئێستە ئەوەتە خۆشت گالتەت بەو بیرە دێ، لە کاتێکدا زۆر باشدەزانیت کە "دیکتاتۆرێتیی پرۆلیتاریا" نێوەرۆکی بیری مارکسێتییە وەك **لێنین** دەبێژێ؟.

باشە! لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە گۆرێ، **"ئایە کاژیك ئەودەمە لە کۆنەکان بوو کە ئەو بیرەی بە هەلّە دەزانی، یان بەرێزت ئێستە چوویتە ریزی کاژیك و کۆنەکان"** ەوە؟

دوایی بەرێزت ناکۆکیی نێوان پارتی کۆمونیستی عێراق و کاژیك بەوە لێکدەدەیتەوە کە **کاژیك** گوایە "وەك **پێ کێ کێ** ی جاران داوای سەربەخۆیی کوردستانی کردووە و پارتی کۆمۆنیستیش دژی ئەوە بووە و بەقسەی بەرێزت ئەگەر کورد داوای سەربەخۆیی بکەن، ئەوا داگیرکەرانی کوردستان هەموویان پێکەوە لە کورد دەدەن".

باشە، كاك كەریم! كورد ئەگەر باسی سەربەخۆیی نەكەن، داگیركەرانی كوردستان لە كورد نادەن؟ خۆ ئەوەتە ئەوڕۆ كورد داوای فیدەراسیۆن دەكەن لە عێراقدا! كەچی دەوڵەتی تركان دەبێژێ "نابێ كورد فیدەراسیۆنی هەبێ" و سیاسەتكارێكی ترك دەبێژێ: **"ئەگەر دەوڵەتێكی كوردی لە ئەرجەنتینیش دروستببێ، ئێمە (واتە ترك) لەدژی دەوەستین"**.

**ئەوجا ئێوەی كۆمۆنیست كە هەر لەساڵی ١٩٦٣ وە تائەوڕۆ حكوومەتی سەددام و بەعسییەكان بەئاشكرا و بەنهێنی لێتان دەكوژن، ئایە ئەمە لەبەر ئەوەیە كە ئێوە داوای سەربەخۆییتان كردووە بۆ كوردستان؟ كە سەددام هەڵەبجەی دایە بەر چەكی كیمیایی و بەهەزاران كوردی لە خولەكێكدا كوشت و كە سەددام ئەنفالی لە كورد كرد و گەلكوژیی لە كورد كرد و كە سەددام نیوملیۆن كوردی فەیلی لە وڵات دەركرد و كە سەددام هەشت هەزار بارزانی بێسەروشوێن كرد و كە سەددام بەشێكی گەورەی كوردستان دەكاتە عەرەب و كە خومەینی بانگەوازی "جیهاد" ی دا دژی كورد و سنەی بە فڕۆكە بۆمبابارا ن كرد، ئایە لەبەر ئەوە ئەو كوردانە قڕكران چۆنكە داوای سەربەخۆیی كوردستانیان كردبوو، یان هەموویان كاژێك بوون؟ كاك كەریم دوژمنانی كورد لە كورد دەدەن، ئەگەر بشچن دەستوپێیان ماچ بكەن و بەهیچ جۆرێك باسی سەربەخۆیی و فیدەراسیۆن و ئۆتۆنۆمیش نەكەن. داگیركەرانی كوردستان نایانەوێ كورد بمێنن و دەیانەوێ كوردستان لەسەر نەخشەی جیهان هەڵبگرن.**

ئەوجا كە ئێوە (پارتی كۆمۆنیستی عێراق) جاران كە دژی كاژێك بوون، چۆنكە باسی سەربەخۆیی كوردستانی كردووە و ئێستە كە بە قسەی بەڕێزت لەدژی هیچ حیزبێك نابن كە باسی سەربەخۆیی بكا، واتە ئەگەر لەسەر بیروباوەڕی ئێوە نەبێ، دیارە ئێوە هێڵی سیاسیی خۆتان گۆڕیوە. باشە، ئێوە ئەوكاتەی دژایەتیی كاژێكتان دەكرد لەسەر باسی سەربەخۆیی و، ئێستە ئەوە ناكەن، ئەوكاتە ئێوە لە "كۆنەكان" بوون، یان ئێستە چوونەتە ریزی "كۆنەكان" ەوە؟

كاك كەریمی بەڕێز! كاژێك حیزب نەبوو، هەرچەندە نێوی حیزبی پێوە بوو، بەڵكو كاژێك ڕێبازێكی فەلسەفی و قوتابخانەیەكی كوردیی بیری سۆسیالیستانە بوو.

کـاژێك سـۆسـیـالـیـزمی بە ئازادی و یەکـسـانیی مـرۆڤ تـێـدەگـەیشت، نەك بە "دیکتاتۆرێتیی پرۆلیتاریا"، وەك جارانی ئێوە. بەبیری کاژێك سۆسیالیزم لەڕێی دێمۆکراتییەکی فراوانەوە دێنەدی، نەك لەڕێی دیکتاتۆرێتییەوە. کاك کەریم کاژێك نەڕووخاوە، یەکێتی سۆڤێت رووخا. بیری رەسەن لەنێو ناچێ، بەپێچەوانەی بیری جارانی ئێـوەوە کـە باسی "پرۆلیـتـاریا" تان دەکـرد و ئێـسـتـەش دەفـەرمـوویت لە کوردستاندا "سەرمایەدارێتیی کورد هیچی نییە، لەبەر ئەوە کرێکاریش نییە" کاژێك باوەڕی بەوە هەبوو کە لە کوردستاندا کرێکار هەبووە و هەیە، هەرکەسێك بەکرێ کـاریکرد و هێـزی لەش و مـێـشکی خـۆی فـرۆشت بەپارە بۆ دابینکردنی ژیانی، «کـرێکار» ە، کـرێکاریش هەرئەو کـەسـە نییە کـە قـوڕەکاری بکا. کرێکاری بینا هەیە، کـرێکاری قـوتابخـانە هەیە، کـرێکاری ناو کـارگـە هەیە و ... هتـد. بەڵام کاژێك بەپێچەوانەی ئێوەوە کە مرۆڤتان دابەشدەکرد بەسەر چینی سەرمایەدار و دەرەبەگ و پرۆلیتاریاوە، کاژێك ئەم جیهانە بەسەر دوو چیندا دابەشدەکات: **«چینی بەشخوراو و بەشخۆر»**. چۆنکە هیچ چینێك نییـە وەك چینێکی ئابووری هەمووی وەك یەك بێ، یان هەمـووی بەشـخـوراو بێ. کـرێکاری واهەیە لە کـاربەدەسـتـێکی گەورە پتر پارە وەردەگرێ. بەنایەکی ژێهاتی کە بۆ کۆمپانیایەکی گەورە کار بکا، کـرێکەی لە مـووچەی مـامـۆسـتـایەکی زانسـتگە بەرزترە. بەشـخـوراوان مـەرج نییـە هەمـوویان سەربە یەك چین، یان یەك رەگەز، یان یەك توخم بن. بەشخوراو جارێك گەلێکی دیلکراوە، وەك کـورد، جارێکی دیکە ژنێکی کەنەفتکراوە، جـارێکی دی جۆتکاری زەحمەتکێشی زگبرسییە، جارێکی دی بیانییەکی خەڵکی رۆژهەڵاتە کە لە رۆژاوا بەدەربەدەری دەژی و لەبەر بێدەرەتانی بەنانەسکی گەسك لە جادەکان دەدا و ئاودەستخانەکان پاکدەکاتەوە، جارێکی دی منداڵێکە کە باوکە شەڕلەتانەکەی بەر زللەی دەدا، کـەچی نـاتوانێ لەسـەر خـۆی بکاتەوە و کـەسـیش لەسـەری ناکـاتەوە. تکایە کـاك کـەریم تەمـاشـای نامـیلکەی **«هێندێك لە کـێـشـە بنەڕەتیـیـەکـانی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالزم»** بکە کـە چاپی یەکـەمی لە سـوێد لە ١٩٨٤ دا بڵاوکراوەتەوە و چاپی دووەمیشی لە هەولێر لە ٢٠٠٢ دا لەلایەن رۆژنامەی **«میدیا»** وە بڵاوکراوەتەوە.

ئەوجا کاك کەریمی بەرێز! کاژێك دژی کۆمۆنیزم و کۆمۆنیستان نەبوو، بەڵکو

دژی ئەوە بوو کە رژێمێکی تۆتالیتێری دیکتاتۆری دوژمن بەکورد و ئازادیی گەلان وەك یەکێتیی سۆڤێتی دوابڕاو، لەلایەن کەسانێکەوە بپەرستریٚ کە خۆیان بە "کۆمۆنیست" دەزانن. سۆڤێت ئەو رژێمە بوو کە ئەنفالی لە کورد کرد و پەیمانی لە گەڵ **هیتلەر و ئەتاترك و رەزاخان و سەددام** بەست و پاکانەی بۆ سەددام دەکرد کە چەکی کیمیایی لە هەڵەبجە بەکار نەهێناوە، کەچی داخی گرانم ئەوەتە تۆ ئەوڕۆش دەفەرموویت: "یەکێتیی سۆڤێت تاکە پاڵپشتی بزووتنەوەی نیشتمانیی نەتەوەکان بوو".

**ئەریٚ، ئەو رژێمەی دووجار ئەنفالی لە کورد کرد و کوردەکانی «کوردستانی سۆر» ی گواستەوە بەزۆر بۆ سیبریا و کازاخستان و بە هەزارانی لێکوشتن، تۆ ئەو رژێمە تێرۆریستە بە "پاڵپشتی بزووتنەوەی نیشتمانیی نەتەوەکان" دەدەیتە قەڵەم. خودیٚ لە گوناهت خۆش بیٚ.**

ئێستە با بێینە سەر پێوەندیی هاوبیرانی کاژیك بەتایبەتی من لەگەڵ کومونیستەکان.

بێگومان کاژیك هیچ کاتێك دژی ئەوە نەبووە یەکێك یان کۆمەڵێك، بیروڕای خۆی بەئازادی و بەوپەڕی سەربەستییەوە دەرببڕیٚ و هیچ کاتێکیش کاژیك لەخوتوخۆڕایی دژی هیچ لایەنێك نەبووە. ئەگەر ئێوە لەجیاتی ئەوەی بچنەنێو پارتی کۆمۆنیستی عێراقەوە و دژی ئەوە بوەستن کە پارتێکی کۆمۆنیستی کوردستانی ببیٚ، بچوونایە پارتێکی کومۆنیستی کوردستانیتان پێکەوە بنایە، ئەودەمە کاژیك زۆر رێزی لێدەگرتن و ئاماژە کردنیش بە پارتی کۆمۆنیستی کوردستان لە کاژیکنامەدا هەیە. چۆنکە بۆ کاژیك گرنگ نییە تۆ لەچ حیزبێکیت، گرنگ ئەوەیە باوەڕت بەئازادی و یەکسانیی مرۆڤ هەبیٚ و چالاکییەکانت لە سنووری نەتەوەییدا بگەڕێن. ئێوە دەتانگوت: "کورد نابیٚ پارتێکی کۆمۆنیستی تایبەت بەخۆی هەبیٚ، چۆنکە "ئومّە" (نەتەوە) نییە". راستییەکەش ئەم بیرەتان لە ستالینەوە وەرگرتبوو کە دەیگوت: "هەرگەلێك ئابووریی نێوکۆیی نەبیٚ، نابێتە نەتەوە". دیارە ئابووریی نێوکۆییش تەنیٚ دەوڵەت دروستیدەکات. لەبەر ئەوە قسەکانی ستالینیش هەر قۆپییەکی قسەی زانستکارە بۆرژواکان بوو کە دەڵێن: "ئەو گەلەی دەوڵەتی نەبیٚ نەتەوە نییە". کاژیکنامە کە لەهاوینی سالی ١٩٦١ دا دەرچوو، ئەم باسەی بۆ

یەکەمجار بەباشی رۆنکردووەتەوە.

هەتا ئەو هەندازەیەش کە دۆزەکە پێوەندیی بەمنەوە هەبێ، ئەوا هەر لە کۆنەوە هەوڵمداوە لەگەڵ کومۆنیستەکان نێوانم خۆش بێ. هاوینی ساڵی ١٩٥٦ چوومە شام و لەوێ نامیلکەیەکم نووسی بەزمانی عەرەبی بۆ **جەمال عەبدولناسر** بۆ ئەوەی کێشەی کوردی تێبگەیەنم. رۆژێکیان تکام لە **ئاپۆ عوسمان سەبری** کرد کە بمبا بۆ ماڵی **خالید بەگداش** تاکو دانەیەك لەو نامیلکەیەی بدەمێ و باسێکی کوردستان بکەم لەگەڵی. وەك سەرنجمدا ئاپۆ ئەوەی پێخۆشنەبوو، بەڵام هیچ دەنگینەکرد و لەگەڵم هات بۆ ماڵی خالید بەگداش کە لە گەڕەکی کوردان بوو لە دیمەشق و دوو پاسەوانی کورد بەچەکەوە لەبەر دەرکەکەی بوون. ئاپۆ عوسمان سڵاوی کرد لێیان و گوتی: "دەمانەوێ هاوڕێ خالید ببینین" و باسی من و نامیلکەکەشی کرد. بەرێکەوت منداڵەکەی خالید بەگداش لەبەر دەرکە یاری دەکرد. پاسەوانەکان پێیان گوت بچێ بە باوکی بێژێ کە میوانی هاتووە. منداڵەکە پاش ماوەیەك گەڕایەوە و گۆتی کە باوکی دەبێژێ: «**لە ماڵەوە نیم**». دیارە خالید بەگداش پێیگوتووە بێژە باوکم لە ماڵەوە نییە، بەڵام منداڵ وەك سەرخۆش وانە، درۆیان بۆ ناکرێ. ئەوجا **ئاپۆ عوسمان فەرمووی: «ئێستە هاوڕێ خالیدت ناسی. کاکە ئەو نایەوێ کوردایەتی بکا، وازی لێبێنین"**.

**کاك کەریمی بەڕێزا ئەمە ئەو خالید بەگداشە بوو کە ئێوە لە بەغدا لە خۆپێشانەکانتاندا دەتانقیراند: "عاش الشعب السوری عاش، بقیادة خالد بگداش".**

لەگەڵ هەموو رەخنەیەکمدا لە هەڵسوکەوت و بیری کۆمۆنیستان، هەمیشە هەوڵمداوە دۆستایەتییان بکەم و نێوانیشم زۆر خۆشە لەگەڵ ئەو کۆمونیستانەی سەربەخۆ بیر دەکەنەوە و لەهیچ مەڵبەندێکی کۆمۆنیستی فەرمان وەرناگرن. لەوانە کۆمونیستەکانی باکووری کوردستان کە زورجار لە رۆژنامەکەیاندا «**نەورۆز**» وتاری من و هەڤپەیڤینی لە گەڵ منیان بلاودەکردەوە. گۆڤاری **Kürtsolu (چەپی کورد)** کە لە کۆمۆنیستەکانەوە نێزیکە، چەندجار وتاری رەخنەگرانەی منی بلاوکردووەتەوە. هەرچەندە خۆم کۆمۆنیست نیم وناشمەوێ لە هیچ حیزبێکدا کاربکەم، لەگەڵ ئەوەشدا چەندجار بەو برادەرانەم گوتووە کە لە گەڵ ئێوە پێوەندییبگرن و هەوڵبدەن

پێکەوە حیزبێکی کۆمۆنیستی کوردستانی سەرتاسەری دابمەزرێنن. ئەوانیش پێوەندییان بەئێوەوە بەستووە. بەڵام ئێوە رازی نەبوون. ئەو برادەرانە وایان بەمن گەیاند کە ئێوە "هەرێمی بیر دەکەنەوە نەك نەتەوەیی".

کاکە کەریمی بەڕێز، بەڕاستی حەزمنەدەکرد ئەم چەند لاپەڕەیە بەم باسانە رەشبکەمەوە، بەڵام وەك لە پێشەوە گوتم ناچاربووم وەرامت بدەمەوە. هۆنراوەیەکی فارسی هەیە دەبێژێت:

ناگفته ندارد کسی باتۆ کار ولی چوگفتی دلیلش بیار

(کە تۆ باسی شتێك نەکەیت کەس کاری بەتۆ نییە، بەڵام کە باستکرد، ئەوا بەڵگە بهێنەوە بۆی).

بەڵام بەڕێزت بێبەڵگە نێوی کاژیکت بەخراپ برد.

هیوای تەندروستی و تەمەندرێژیی دەکەم بۆت لەگەڵ سلاوی برایانەم

## بەرلین: ٥/٨/٢٠٠٢

(*) ــ **مامۆستا رەفیق حیلمی** مرۆڤێکی زۆر قسەخۆش بوو و زۆر حەزی بەگاڵتە دەکرد. بەزۆری لە دوکانەکەی **«ئوستاد» بەشیرموشیر** چاومان بەیەك دەکەوت. «ئوستاد» سەردەمێك نەخۆشیی شەکری هەبوو و نانی جۆی دەخوارد. جارێکیان مامۆستا رەفیق حیلمی هات بۆ دوکان و تەماشایکرد «ئوستاد» نانی جۆ دەخوا، گوتی: «ها ... ئەوە چییە رزقی کەر ئەخۆیت؟». لەوکاتەدا ئەز و ناسیاوێکی عەرەبی «ئوستاد» لە دوکان بووین. «ئوستاد» زۆرپێیناخۆش بوو و بەعەرەبی گوتی: «شوف شوف، هذا هوالعاقل ومالنا!». (سەیرکە سەیرکە ئەمە ئاقڵەکەمانە) "بس الاکراد شلون یصیرون حکومة" (ئەوجا ئیدی کورد چۆن دەبن بە حکوومەت). کابرای عەرەب نەیزانی مەسەلە چییە، من تێمگەیاند. زۆر پێکەنی. ئەوجا عەرەبەکە لە مامۆستا رەفیق حیلمی پرسی، مامۆستا ئێستە چ دەکەیت؟ ئەویش گوتی مامۆستای قوتابخانەی دوانێوەندیی مەرکەزیم. ئەوجا کابرا لێی پرسی: "ئەی بەڕێزت بەڕێوەبەری زانیاری (مدیری مەعاریف) نەبوویت؟" مامۆستا رەفیق حیلمی گوتی: بەڵێ. گوتی ئەی پاش ئەوە؟. گوتی کرام

بە پشکنەر (مفتش)، دواجار بە بەڕێوەبەری قوتابخانە (مدیر) و ئەوجا بە یارمەتیدەری بەڕێوەبەر (معاون مدیر) و ئەوجا مامۆستا.

(سەرنج! راستییەکەی حکوومەت زۆردژی مامۆستا رەفیق حیلمی بوو).

ئوستاد کە ئەم قسانەی بیست، بە عەرەبی گوتی: «ئاخر هێشتا ساڵێکی ماوە بیکەن بە فەڕڕاش».

ماموستا رەفیق حیلمی قاقاپێکەنی و گوتی تۆڵەی خۆی سەندەوە.

**«میدیا» ژ ۱۲۹ ساڵی حەوتەم**

**۲۰۰۲/۸/۱۵**

# جەنابی "جەنەراڵ"ی خەزەرجی

# و

# دەمخوارە کوردەکانی

رۆژنامەی عەرەبیی **"الحیاة"** کە لە لەندەن دەردەچێ، لە ژمارەکانی رۆژانی ٨ و ٩ و ١١/٣٠ و ١ و ٢/ ١٢ی خۆیدا وتووێژێکی رۆژنامەیی لەگەڵ **نزار خەزەرجی ، کۆنە سەرکردەی ستوونەکانی سوپای عێراق (رئیس ارکان الجیش)** دا بڵاوکردەوە بەنێوی «نزار خەزەرجی دەمی دەفتەری کۆن و نوێ بۆ "الحیاة" دەکاتەوە». هەرچەندە پرسیارکەر گەلێك پرسیاری مانادار و بەجێی لە خەزەرجی کردبوو، بەڵام هێشتا ژمارەیەکی زۆر پرسیاری گرنگ هەبوون کە دەیتوانی بیانکا، لە گەڵ ئەوەشدا قەوارەی وەرامەکانی خەزەرجی بایی ئەوەن کە چەپکێك تیشك بخەنە سەر دۆزی خەزەرجی. ئەز خۆم لێدوانێکی کورتم لەبارەی ئەو قسانەوە بەعارەبی نووسی و ناردم بۆ رۆژنامەی "الحیاة"، لێ نازانم ئایا بڵاویدەکەنەوە یان دەیخەنە پشتگوێ، یان ئەگەر بڵاویانکردەوە، کەینێ و چەندی لێبڵاو دەکەنەوە. هەرچی چۆنێك بێ وایبەباش دەزانم سەرنجی خوێنەرەوەکانی «میدیا» کە بە سایی سەرنووسەرەکەیەوە بووتە رۆژنامەی رەخنەگران و ئازادیخوازان لە کوردستاندا، بۆ هێندەك لایەنی ئەو وتووێژە رابکێشم.

**وەك لە رۆژنامەی "الحیاة" دا نووسراوە، نزار خەزەرجی خەڵکی مووسڵە و لەسەردەمی رژێمی شایەتییەوە، وەك ئەفسەر لە لەشکری عێراقدا بووە و، لەساڵی ١٩٨٧ەوە بووە بە سەرکردەی ستوونەکانی سوپای عێراق، واتە ساڵێك بەرلەوەی هەڵەبجە بدرێتە بەر چەکی کیمیایی و، پێش ئەوەش لە هەشتاکاندا، واتە لەکاتی جەنگی عێراق ــ ئێراندا، "قائد فیلق" بووە. کە ئەم کاتە سەردەمی «ئەنفالکردنی» کوردە لەلایەن لەشکری شەڕخوازی عێراقەوە.** ئەوجا بابزانین خەزەرجی چ دەبێژێ:

**خەزەرجی** دەبێژێ کیمیابارانکردنی هەڵەبجە، نەکاری وی بووە و، نە بەفەرمانی

وی کراوە و، نە ئاگاشی لەو تاوانە بووە. کیمیابارانکردنی هەڵەبجە بەبڕیاری **سەددام** خۆی بووە و، لێرەشدا خەزەرجی شتێك دەڵێ کە نەك هەر پاکانەکردنە بۆخۆی و بەس، بەڵکو لە پاکانە دەچێ بۆ سەددامیش، چۆنکە دەبێژێ، سەددام کاتێك بڕیاری «لێدانێکی تایبەتی» هەڵەبجەی دا کە **عەلی حەسەن مەجیدی خزمی «راپۆرتێکی درۆ» ی ناردبۆی کە لەوێدا گوتبووی «ئێرانییەکان هاتوونەتە هەڵەبجەوە»** و سەددامیش پێیوابوو بەو دەستوەشاندنە ئێرانییەکی یەکجار زۆر دێنە کوشتن، بۆیە بڕیاری ئەو «لێدانە تایبەتیە» ی دا کە تەنانەت "قائد فیرقە" و "قائد فیلق" ی ئەو نێوچەیە و جەنابی خەزەرجی خۆشی ئاگایان لەوە نەبووە. واتە خەزەرجی دەیەوێ تەنێ عەلی حەسەن مەجید تاوانبار بکا و بێژێ: سەددامیش لە خشتەبراوە و تەفرەدراوە، ئەگەنا ئەو کارەی نەدەکرد.

راستییەکەی، ئەز هیچ سەرم لەم قسانەی خەزەرجی سوور نامێنێ، چۆنکە پاش جەنگی جیهانیی دووەم کە بەشکانی ئەڵمانیای نازی کۆتاییهات و، سەرکردەکانی لەشکری ئەڵمانیا خرانە بەردەم **«دادگەی نۆرنبێرگ»**، دەیانگوت: «ئەوان هیچ گوناهیان نەبووە و، خاوەن بڕیار نەبوون و، ئاگاشیان لە هیچ "بڕیارێکی رامیاری" نەبووە و، **وەزیری پرۆپاگەندە و هەواڵگوزاریی ئیمپراتۆرێتیی ئەڵمانیا "هێر گوبێلز" هیتلەری هانداوە بۆ قڕکردنی جوولەکە و هەڵگیرساندنی جەنگ و، ئەمان ئاگاشیان لەوە نەبووە کە لە شاری ئاوشڤێتز کۆشکێك بووە، مەکینە و ژووری تایبەتیی بۆ گازی ژاراوی تێدابووە و لەوێ رۆژانە سەتان جوولەکەیان بەگاز خنکاندووە».**

بەکورتی، دەیانویست تاوانی قڕکردنی شەش ملیۆن جوولەکە و جەنگێکی پێنج ساڵە کە بەهۆیەوە پەنجا ملیۆن خەڵك ژیانی خۆیان لەدەستدا، بخەنە ئەستۆی یەك زەلام. بەڵام دادپرس (حاکم)ەکان گاڵتەیان بە قسەکانیان هات و، هێندەك لەو سوپاییە ئەڵمانانانە فەرمانی سزای مراندن (عقوبة الاعدام) درا بە سەریاندا و، گوللەبارانکران، چۆنکە ئەو سەردەمە هێشتا سزای مراندن لە ئەورووپا هەڵنەگیرابوو و، بێجگەلەوەش زاگۆن (قانون) ی جەنگ لەکایەدا بوو. خۆشم کە هاتمە ئەڵمانیا هەمووی شانزە ساڵێك تێپەڕ ببوو بەسەر براندنەوەی جەنگدا و بەشێکی زۆری خەڵکەکەی ئەڵمانیا ئەو سەردەمەیان بەچاوی خۆیان دیبوو، کەچی بە دەگمەن یەکێك هەڵدەکەوت کە خۆی بە گوناهباربزانێ، دەیانگوت کەس ئاگای

لەبوونی «کۆشکی گاز» نەبووە. ئەوجا کە **«شەوی بلوور»** (٢) و **«خوشك و برای شۆل»** م (٣) دەهێنایەوە بیریان، سەریان لێتێکدەچوو و نەیاندەزانی بێژن چی.

نزار خەزەرجی، ئەگەرچی کیمیابارانی هەڵەبجە ناکا بەماڵ بەسەر خۆیەوە، بەلاّم دان بەوەدا دەنێ کە شەڕی کوردی کردووە، چۆنکە دەبێژێ: «کورد ئەوە چل ساڵە شەڕی حکوومەتی عێراق دەکەن، (دیارە) هەموو لەشکرییەکی (عێراقی) شەڕی کوردی کردووە، ئەوجا هەریەکەو لە سەردەمێك لە سەردەمەکاندا». **هەر خەزەرجی لە شوێنێکی دیکەی قسەکانیدا باسی رێکخستنی «شەڕی چەتەگەرێتی» (حرب العصابات) دەکا دژی پێشمەرگەکانی حیزبەکان، ئەو حیزبانەی کە ئەوڕۆ جلکە خوێناوییەکانی خەزەرجی دەشۆن.**

باجارێ ئێمە بێین سەرنجێکی ئەو چل ساڵە بدەین کە خەزەرجی باسیدەکا، تابزانین چی دەگرێتەوە. ئاشکرایە **شۆرشی ئەیلوول** لەساڵی ١٩٦١ دا دەستیپێکرد و ئێستە کە ساڵی ٢٠٠٣ ە، واتە چل ساڵێك بەسەر تەمەنی شۆرشدا تێپەڕیوە. کەواتە خەزەرجی، کە گوایە بەخێرێ بەرهەڵستکەری رژێمی عێراقی بووە و لە رژێم هەلاّتووە، ئێستەش هەر کورد بە گوناهبار دەزانێ، چۆنکە شەڕی حکوومەتی عێراقیان کردووە. ئەوەتە باسی چل ساڵ دەکا، کە ئەگەر لە ئێستەوە بیگریت، سەرەتای شۆرشی ئەیلوول دەگرێتەوە. ئەوجا کە راپەڕینی کورد بەرووی حکوومەتی عێراقدا کارێکی ناڕەوابێ، دیارە دەبێ حکوومەتی عێراق و دەوڵەتی عێراق بەلای خەزەرجییەوە رەوایەتییان هەبێ بۆ گەلکوژی لە کورد و کاولکردنی هەزاران گوندی کوردستان و سووتاندنی کێلگە و باخەکانی کوردستان و، ژەهرکردنە نێو کانیاوەکانیانەوە و کوردستان کردن بە عەرەبستان و دەرکردنی خەڵکەکەی!! کە واتە ئەو کارانەی رژێمی عێراق دژ بە کورد کردوونی هەقن و کورد نەدەبوو بەربەرەکانێیان بکا. ئەمە ئەو نزار خەزەرجییەیە کە بەقسەی سیاسەتکارە حیزبییەکان بەرهەڵستکەری رژێمی عێراق بووە و، بەیارمەتیی حیزبەکانی کوردستان لەمردن رزگاری بووە و هەلاّتووە بۆ دەرەوەی ولاّت و ئێستەش دەیەوێ حکومەتی دانمارك رێبدا پێی لە دانمارکەوە بچێ بۆ «باکووری عێراق» تاکو بیبێتە «فەرماندەی لەشکری رزگارکەری عێراق» و ئەوەتە سیاسەتکارە حیزبییەکانی کورد، ئەم وڕینانەی خەزەرجی بەڕاستدەگێرن بۆی و شایەتیدەدەن بۆی کە لە گەلکوژی کورددا

دەستینەبووە (٤) تۆش ئاو بێنە و دەست بشۆ و گوێ بدەرە قسەی دەمخوارەکانی نزار خەزەرجی.

نزار حەزەرجی لە بەشێکی دیکەی وتووێژەکەدا باسی «ناکۆکیی خۆی لە گەڵ سەددام» دەگێڕێتەوە کە گوایە دژی پەلاماری کوێت بووە، ئەوەش نەك لەبەر ئەوەی کە پێیوابووە کە پەلاماردانی گەلێك لەخوتوخۆڕایی، بەتایبەتی گەلی کوێت، کە حکوومەتەکەی سەتان ملیۆن دۆلاری داوە بە سەددام، کردارێکی تاوانبارانە و نانکۆرانەیە، بەڵکو ویستوویەتی وا لە سەددام بگەیەنێ کە ئەو پەلاماردانە «لەوزەی وی و لەشکری عێراقدا نییە، چۆنکە ناتوانن شەڕی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی بکەن». گوایە لەسەر ئەوە سەددام ، خەزەرجی لەسەر کار، وەك سەرکردەی ستوونەکانی سوپای عێراق، لابردووە و کردوویەتی بە «ڕاوێژکاری خۆی و، خەزەرجی دەڵێ گوایە "نەچووەتە سەرکارە نوێیەکەی خۆی ، چۆنکە هیچی بەدەست نەبووە و، بەکەمی زانیوە بۆ شانی خۆی" و، پاش ئەوە لەڕێی کوردستانەوە رایکردووە، کە ئەو کوردستان بە «باکووری عێراق» نێو دەبا و، لەهەموو ئەو وتووێژەدا بەیەك وشە نێوی کوردستان بەدەمدا ناهێنێ، ئەوە نەبێ کە یەکجار نێوی «نێوچەی کوردی (المنطقة الكردية) دەبا. ئەمەش هەموو پێزانین و سوپاسێکی «جەنەراڵ» خەزەرجییە بۆ ئەو وڵات و نەتەوەیەی ژیانی لە مردن رزگار کردووە.

لەبارەی ئەوانەوە کە هەوڵی دادگەییکردنی خەزەرجی دەدەن، خەزەرجی دەبێژێ: «زانیاریی دڵنیاکەرم لاهەیە کە لە پشت ئەم تۆمەتانەوە عەرەب و کوردی واهەن کە پێوەندییان بە رژێمی (عێراقەوە) هەیە».

لێرەدا دەبێ بێژم کە خەزەرجی دەبوو شەرم بکا کە ئەو قسەیە دەکا. خەزەرجی نێزیکەی (٣٠) ساڵ گوێڕایەڵ و کاسەلێسی رژێمی بەعس و سەددام بووە و ئێستەش دەیەوێ بەوشێوە بێشەرمانەیە، خزمەکەسوکاری ئەنفالکراوەکان و بەرچەکی کیمیایی کەوتوانی ئەو رژێمە کە ئەو ٣٠ساڵ یەکێك بوو لە پایەکانی بەوجۆرە نێوببا ؟ ئایە ئەوە نازانێ ئەگەر ئەو قسانە بەبەڵگەوە لەبەردەم دادگەوە ئیسپات نەکا، ئەوا بەهۆی «تۆمەتی درۆیین» ەوە سزادەدرێ.

بەڕاستی کە مرۆڤ لە دۆزی خەزەرجی هورد دەبێتەوە و چاوێك بەهەڵوێستی کاربەدەستان و سیاسەتکارانی کورددا دەگێڕێ کە دەمخوارانە (نەك دەمڕاستانە)

هەر یەکە بەچوارچاو بۆ خەزەرجی دەگرین و دەپاڕێنەوە و، بە بەرهەڵستکەری ڕژێمی سەددامی دادەنێن، ئەگەر بێتو خاتریان بگرم، دەبێ بێژم «زۆر نابەرپرسیارانە دەجووڵێنەوە».

بەڵێ، ئەمانە دەیانەوێ نزار خەزەرجی بێننەوە کوردستان و لەوێوە بیکەنە سەرکردەی خۆیان و چەکدارەکانیان و ئەو حەلە کە لەشکری سەددام جەنابی «جەنەراڵ» خەزەرجییان دی، دەستبەجێ لە سەددام دوور دەکەونەوە و دێنە ژێر هێز و «ئالأی» ی خەزەرجییەوە و، عێراقیش دەبێتە «دێمۆکرات». ئەمەش خالأنەی ئەوەیە جارێکیان یەکێك لە شاعیرە بەرێزەکانمان لە چلەکاندا، بۆ ئەوەی دڵی ئینگلیزەکان خۆش بکا گوتبووی «ئێمە لە کوردستان هێندە دێمۆکراتین تەنانەت کە مریشکەکانیشمان دەگارێنن، دەبێژن! دێمۆکرات ... دێمۆکرات»!!!

بەراستی کاربەدەستینە ببوورن لێم، ئەم خەیاڵەی ئێوە کردووتانە لە خەیاڵەکانی «عەبە هەرشەکەنە» دەچێ.کاربەدەستە بەتەمەنەکانی سلێمانی باشیان لەبیرە کە «عەبە هەرشەکەنە» ی دەرۆزەکەر، هەر داوای دەفلسی دەکرد. خۆئەگەر سەت فلسی و دینارێك و هەزار دیناریشت بدایە نەیدەویست و هەر دەیگوت «دەفلس». کە بازیشی بدایە بەسەر جۆگەلەی نیومەتریدا نیودەمژمێر گوڕی دەبەستەوە و پێیوابوو بەسەر گۆلی زرێباردا بازدەدا. دیارە عەبە هەرشەکەنە پێیوابووە کە لێینایە پارەداریێ، بەلأم ئێمە کە یانزەساڵە جۆرە سەروەرێتێکمان هەیە، پێمانوایە لێماننایە و بەخۆمانی رەوانابینین، بۆچی دەبێ بیگۆڕینەوە بە «کوێخایەتی» یەك، ئەویش لەژێر ئالأی خەزەرجیدا. خەزەرجییەکی بێدەسەلأتی هیچ لەباردا نەبوو. کورد دەبێژن «ئەگەر کەچەڵ دەرمانکەر بوایە، دەرمانی سەری خۆی دەکرد».

خەزەرجی کە سالأنی ساڵ سەرکردەی ستوونەکانی عێراق بوو و، هەر بە قسەی خۆی، سەددام دەچوو بۆلای بۆ گۆرەبانی جەنگ و پێیدەگوت کە بیبا بۆ ریزی پێشەوەی بەرەی جەنگ، بەلأم ئەو (خەزەرجی) سەددامی نەدەبردە ریزی پێشەوەی بەرە، بەڵکو دەیبردە شوێنێکی دیکە و پێیدەگوت «ئەمە ریزی پێشەوەیە» بۆئەوەی بیپارێزێ. ئەمە قسەی خەزەرجی خۆیەتی، فەرموو بچن وتووێژەکەی بخوێننەوە. کەواتە خەزەرجی چەند جار هەڵکەوتووە بۆی سەددام لەنێوبیا و نەیکردووە و پاراستوویەتی. کە سەددام دەریکردووە (خودێ دەزانێ لەسەر چی)، ئەوجا پاش ئەم

هەموو گەلکوژییە لە کورد، بەهۆی کاربەدەستانی کوردەوە خۆی گەیاندووەتە ئەوروپا و ئێستەش دەیەوێ هەر بەهۆی کاربەدەستانی کوردەوە جارێکی دیکە بێتەوە پێش و ببێـەرە بە کەڵەگای عێراق. **ئەی قـوڕ بەسـەر کـورد بۆخـۆی و سـیاسـەتکاران و کاربەدەستانی!!!**

بەڕاستی، ئەگەر گەلی کورد زۆر وریا و هۆشیار نەبێ و خۆی باش کۆنەکاتەوە بۆ رۆژی تەنگانە، بەتایبەتی ئەگەر گوشار نەخاتە سەر کاربەدەستانی هەرێمی ئاسایش بۆ ئامادەکردنی زەوییەکی لەبار بۆ گشتپرسییەکی ئازادانەی دێمۆکراتانە، تابزانرێ گەلی کورد، نەك حیزبەکان، چیدەوێ و، پێش ئەوەش کارێکی وانەکرێ بۆ هەڵوەشاندنەوەی میلیشیاکانی حیزبەکان و رێکخستنی لەشکرێکی کوردستانیی نەتەوەیی ناحیزبیی، ئەوا دەبێ رەشورووتی کورد جارێکی دی کورتانەکەی جەجاڵ بدوورنەوە.

کاربەدەستانی کورد کە چەرخی رۆژگار کردوونی بە سیاسەتکار، زۆربەی زۆریان بەهۆی کورتبینیی رامیارییەوە، پەنجاساڵی رەبەق کۆرانە دوای رژێمی دوابڕاوی سۆڤێت کەوتبوون بەرامبەر بەهیچ!!! هێندێکیشیان پێوەندییان هەبوو و هەیە بەملاوبەولاوە کە ئەوەش هەتا ئەورۆ ئەنجامەکەی رۆنە. ئەمانە پێیانوایە ئەگەر عێراق بوو بە یەك دەوڵەت، ئیدی ئەمان «کوێخایەتی» یەکیان دەستدەکەوێ. بەڵام با دڵنیابن کە ئەوە تراویلکەیە و رۆژێك دێ خەون بەم سەربەستییەی ئەورۆوە ببینن، کە هەیانە و نرخی نازانن. خۆئەگەر بیانزانیبایە یەك رۆژ شەڕی نێوخۆییان نەدەکرد.

ئەز چەند ساڵ بەرلە ئەورۆ و چەند جار باسی ئەوەم کردووە کە ئەم «هەرێمی نەفرین» ە بەهۆی هەلومەرجی دەرەکییەوە دروستبووە و، لەکاتێکی تاکپەڵکەوتوودا هاتووەتە کایەوە. ئەو هەلومەرجەش، وەك ئەو چۆلەکەیە وایە کە بە رێککەوت هاتووەتە ژوورەکەتەوە و، ئەگەر تۆ و هاوژوورەکەت خەریکی زۆرانگرتن بن لەگەڵ یەك و زوو پەنجەرەکە دانەخەن لەسەری، ئەوا دەفڕێتە دەرەوە و جارێکی دی نایبینیتەوە.

سەمینارەکەی ئەم دوایییەی پاریس کە لە ١١/٢٩ دا رێکخرا، راستیی ئەم قسەیەی بەرۆنی دەرخست. یارمەتیدەری وەزارەتیدەرەوەی فەرەنسا، بێرنارد ڤالیرۆ

گوتی: کە فەرەنسا «لایەنگیریی یەکێتی عێراق و پارچەنەکردنی عێراق دەکا» و لەبارەی فیدەرالیشەوە گوتی «رێکخستنی کاروباری نێوخۆ بەدەست گەلان خۆیانە. بڕیاردان لەسەر فیدەرالیزم بەدەست گەلی عێراقە»، واتە بەدەست کورد نییە. بەکورتی، ئەگەر عەرەب و عێراقییەکانی دی رازی نەبن، ئەوا کوردیش مافی فیدەراڵیتی نابێ. ئەمە لەکاتێکدا کە رۆژنامەکانی هەردوو حیزبەگەورەکە سەمیناری پاریسیان بە «سەرکەوتنێکی یەکجار گەورە» بۆ کورد دایە قەڵەم. شایانی باسە کە بێرنارد کۆشنەری کۆنە وەزیری تەندروستی فەرەنسا، کە دەساڵێك لەمەوبەر باسی «سەربەخۆیی کوردستان و دەوڵەتی کورد» ی دەکرد، ئەوە لە **سلێمانی** باسی «یەکێتیی عێراق» و «پێتەختی عێراق» ی دەکرد کە چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەوێ دەبێ. واتە فەرەنسا لەبارەی دوارۆژی کوردەوە هیچ دەورێکی نابێ. ئەوەش وەنەبێ لەوەوە هاتبێ کە نیازی ئەم پیاوە باش نەبێ. نەخێر. بەڵکو ئەوەیە ناتوانێ باسی شتێك بکا کە کاربەدەستانی کورد خۆیان نەیانەوێ. ئەمەش خاڵانەی ئەوەیە کاتی خۆی **هاوبیری هێژا جەواد مەلا** داوای لە **سەرۆکوەزیرانی ئەوسەردەمەی بەریتانیا بەڕێز جۆن مێجەر** کردبوو پشتی کورد بگرێ بۆ سەربەخۆیی کوردستان. **جۆن مێجەر** لە وەرامدا نووسیبووی بۆی: **"ئێمە پشتی مافی ئۆتۆنۆمیی دەگرین، نەك سەربەخۆیی، چۆنکە سەرکردەکانی کۆمەڵگەی کورددداوای ئۆتۆنۆمی دەکەن».**
**ئایا قسە لەمە ڕەپوڕاستتر دەبێ؟**

داخەکەم کورد کادری رامیارییان زۆرکەمە، ئەگەر نەیژم هەر نییانە. ئەگەر کادری رامیاری هەبوایە، دەیانزانی کە **فەرەنسای سەردەمی میتران، فەرەنسای پاش ئەو و ئێستەی سەردەمی ژاك شیراکی هاوڕێی سەددام نییە**. فەرەنسای دیگۆلییەکان ساڵانی ساڵ لەکاتی جەنگی عێراق و ئێراندا و پاش ئەوەش یارمەتیی رژێمی سەددامی دا. فەرەنسا بوو کە پرۆژەی ئەتۆمی بۆ سەددام دامەزراند و لەکاتی جەنگدا چەکی قورسی دایە و پشتگیریی دیپلۆماسیانەی سەددامی کرد و پارەیەکی فرەی بەقەرز داپێی. ئێستەش پاش ئەوەی سەددام هەزاران لاپەڕە و کاغەزی رەشکردووەتەوە، گوایە بۆ رۆنکردنەوەی ئەو چەکە کۆمکوژانەی بەدەست عێراقەوەن و، داوێتی بە کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان، فەرەنسا لەوە زراوی چووە کە نێوی کارگەکانی فەرەنسا کە یارمەتیی سەددامیان داوە بۆ دروستکردنی چەکی کۆمکوژ،

ئاشکرابیێ و، ئەوەتە فەرەنسا کەوتووەتە پەلەقاژە و، بەبیانووی ئەوەوە کە گوایە ئەو زانیارییانە نابێ بدرێن بە ئەندامە ناهەمیشەییەکانی (غیردائمی) کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکـان، نەبا «هێندەك دەوڵەتی خراپ» فێری دروستکردنی ئەو چەکانە بێن. ئەمەش درۆیەکی روونە. فەرەنسا دەیەوێ پاشلی گەماری خۆی بشارێتەوە. بێجگە لەوەش سالآنی سالیشە وازیهێناوە لەوەی، وەك **ئەمریکا و بەریتانیا «هەرێمی نەفرین»** بپارێزێ. ئەم سەمینارەی پاریسیش کە کەندال نەزان بۆ بەرژەوەندیی خۆی و، بەفیتی کاربەدەستانی فەرەنسا پێکیهێنا، هیچ سووتێکی بۆکورد تێدا نەبوو لە پرۆپاگەندەیەکی رۆژنامەیی بەولاوە. بەلأم هەرلەو کاتەدا گومانی بە ئەمریکا پەیداکرد بەرامبەر بە کورد. چۆنکە فەرەنسا بەدژایەتیکردنی ئەمریکا و لایەنگریکردنی رژێمی سەددام ناسراوە. دوور نییە رووسیاش خۆی لە کاربەدەستانی کورد نێزیکبکاتەوە بۆ دەسبرینیان و پیسکردنی دڵی ئەمریکا لێیان.

دوارۆژی عێراق زۆر زۆر ئاڵۆز و نادیارە. دوور نییە پشکنەرانی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان نەتوانن لە عێراق هیچ شوێنەوارێکی چەکی کۆمکوژ بدۆزنەوە. دانی کێشەکەش بە کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکـان، هەڵەیەکی گەورەی کاربەدەستانی ئەمریکا بوو، کە ئەوەش لەژێر گوشاری **فەرەنسا و چین و رووسیا** روویدا کە بۆ بەرژەوەندیی خۆیان پشتی سەددامیان گرت.

کورت و کرمانجی باشترین رێ بۆ دیاریکردنی هەڵوێستی رەوای «هەرێمی نەفرین» ئەوەیە گشتپرسییەکی ئازادانە لەو نێوچەدا بکرێ بۆ ئەوەی بزانرێ کورد چی دەوێ. چۆنکە هومێدی یەکگرتنی راستینەی دوو حیزبە گەورەکە زۆر لاوازە. ئەوەتە هەتا ئێستە بارەگەی هیچ لایەکیان لەلایەکی دیکەدا نییە، کە ئەمە ئەلفوبێی رێککەوتنەکە بوو.

**بەبیروبۆچوونی من، ئەگەر کورد نەیانتوانی بگەنە سەربەخۆیی، یان ببنە خاوەنی کۆمارێکی فیدەراڵی بەو شێوەیەی لە هێندەك لە وتارەکانمدا باسمکردووە، باشتر ئەوەیە جارێ باشووری کوردستان ببێتە پارێزگە (محمیة/پرۆتێکتۆرات) ی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان بە ماندارێتیی (انتداب) ی ئەمریکا و بەریتانیا و دانمارك.**

— — —

**پەراوێزەکان:**

**(١)** ــ جاران لە گوندەکانی باشووری کوردستاندا کە خەڵکە هەژارەنەخوێندەوارەکە پێویست بوایە لەگەڵ کاربەدەستێکی میری قسەبکەن، قسەزانێکیان هەڵدەبژارد بەنوێنەر، بۆ ئەوەی لەسەر مافی خوراویان هەڵبداتێ و، بەو کەسەیان دەگوت **«دەمڕاست»**. منیش وشەی **«دەمخوارم»** وەك پێچەوانەی «دەمڕاست» داڕشتووە بۆ ئەو کەسانەی کە بەناهەق لەسەر زۆرداران دەکەنەوە.

**(٢)** ــ لەشەوی ٩ــ١٩٣٨/١١/١٠ دا هەزاران ئەڵمانی هاتنە سەرجادەکانی بەرلین و بەپێی بەرنامەیەکی لەوەپێش ئامادەکراو، وەك شێت و هار، کەوتنە پەلاماردانی دوکان و موغازەی جوولەکەکان و، هەرچی شووشە و پەنجەرەکانیان هەبوو، هەموویان هورد و خاش کرد و کەلوپەلەکانیان بردن و، پارچە و پۆرچی شووشەشکاوەکان کە رژانە سەرجادەکان لەبەر تیشکی چراکاندا وەك بلوور دەدرەوشانەوە. لەبەر ئەوە، بەوشەوە دەگوترێ **«شەوی بلوور»** (بەئەڵمانی: کریستال ناخت).

**(٣)** ــ **«خوشك و برای شۆل»** خوشك و برایەکی گەنج و منداڵی بنەماڵەی شۆل بوون. هەردووکیان خوێندکاری زانستگە بوون. لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتیی نازییەکاندا گەلێك کاروکردەوەی خراپی رژێم و دارودەستەکەیان دیبوو و، لووتیان پڕبووبوو. لەبەر ئەوە بڕیاریاندا کارێك بکەن دژی ئەو بارە نالەبارە. بۆئەمە بلاڤۆکێکیان بەچەند دانەیەك نووسیبوو و بۆ هۆشیارکردنەوەی خەڵك، بەیانییەکی زۆرزوو چووبوونە زانستگە و بلاڤۆکەکەیان بردبووە ژوورێ و لەملاولەولا دایاننابوو، پێیانوابووبوو کەکەس چاوی لێیان نییە. بەڵام گەسکلێدەری زانستگە چاوی پێیانکەوتبوو و، دەمودەست بێئەوەی ئەوان هەستبکەن دەرگەی زانستگەی داخستبوو لێیان و هێزی "ئێس ئێس" ی ئاگادارکردبوو. **(هێزی ئێس ئێس SS هێزێك بوو سەربە حیزبی نازی، وەك «پاسەوانی ناسیۆناڵ» (الحرس القومی، بەعسییەکان)** و هەردووکیان گیرابوون و دەستەکەیان کەوتەڕوو. دادگە فەرمانیدا بە سەربڕینیان بە گیۆتین (مقصلة) و هەردووکیان بەوشێوەیە ژیانیان کۆتاییهات.ئەورۆ لەبەردەم زانستگەی مۆنیخدا گۆرەپانێك هەیە بەنێوی «گۆرەپانی

خوشکوبرای شۆل» ەوە. فیلمێکی ئەڵمانیش هەیە لەسەر ئەم دوو قوربانییەی رۆشنبیری.

**(٤) - لێرەدا سەرنجی خوێنەرەوەی ئەم وتارە رادەکێشم بۆ قسەکانی بەرێز فەرەیدوون عەبدولقادر، وەزیری نێوخۆی یەکێتی لە سلێمانی، هەروەها بۆ دەربڕینەکانی مام جەلال کە لە ئێوارەی سێشەمەی ٣/١١/ دا لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی لە کوێت ("الحیاة" ٢٠٠٢/١٢/٥) کە زۆر بەتوندی لەسەر خەزەرجی کردەوە و گوتی: «ئەم تۆمەتانەی کە دەخرێنە مل خەزەرجی، رژێمی عێراق دروستیکردوون و ئەمەش مناوەرەیەکی زیرەکانەیە لە رژێمەوە بۆ پشتساردکردنەوەی سەرکردایەتییە لەشکرییە عێراقییەکان، لەوەی بچنە لای بەرهەڵستکاران». هەروەها گوتی: «نامەیەکی نووسیوە بۆ وەزیری دادی دانیمارکی و ئەو تۆمەتانەی دژی خەزەرجی پووچکردووەتەوە».**

دیارە ئەم قسانە هەویرێکن زۆر ئاو دەکێشن. بەڵام دەبێ **مام جەلال** ئەوە بزانێ کە وەزیری دادی دانمارکی لە سلێمانی دانەنیشتووە. وەزیری داد هیچی بەدەست نییە، دادگە بڕیاردەدا پاش لێکۆڵینەوە.

دەبوو مام جەلال لەوەش دڵنیابێ کە ئەم تۆمەتانە لە رژێمی عێراقەوە هاتوون، ئەوجا قسەی وا بکا.

**«میدیا» ٢٠٠٢/١٢/١٣ - ژمارە (١٣٨)**

**«کۆنگرە» زمانڕەوشی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان**

**ژمارە (٢٦) - نەورۆزی ٢٠٠٣ی زاینی**

# دواڕۆژی عێراق و دۆزی کورد

**"ئەم سەمینارە بە بانگێشتی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان لە هانۆڤەر (ئەڵمانیا) لەڕۆژی یەکشەممەی ٢٠٠٢/٩/٢٢ دا پێشکێشکرا!"**

هاوبیران، دۆستان، میوانانی بەڕێز!

لەکانی دڵمەوە بەخێرهاتنتان دەکەم و سوپاسی گەرمی ئەو زەحمەتەتان دەکەم کە بۆ بەشداریی لەم سەمینارەی ئەوڕۆدا کێشاوتانە، بەتایبەتی هێندێکتان لە شارەکانی دیکەوە ئەرکی هاتنە هانۆڤەرتان خستووەتە سەرخۆتان، جارێکی دی هەموو لایەکتان بەخێرهاتن و سەرچاوان.

بەڕێزینە! وەك خۆتان دەزانن باسەکەی ئەوڕۆمان «دواڕۆژی عێراق و دۆزی کورد» ە، بەڵام ئەگەر رێم بدەن، بەرلەوەی بچینە نێو باسەکەوە، دەمەوێ ئاماژە بۆ شتێکی دی بکەم کە پێوەندییەکی نێزیکی بە سەمینارەکەی ئەوڕۆمانەوە هەیە.

وەك دەزانن، ئەوڕۆ ٢٢ ی ئەیلوول، رۆژی هەڵبژاردنی پەرلەمانی نوێیە لە ئەڵمانیا و ئەزیش کە یەکێکم لەوانەی مافی دەنگدانیان هەیە، لەناخی هەست و هۆشمەوە هاتمە سەر ئەو باوەڕەی کە دەنگ بۆ هیچ حیزبێك نادەم. ئەم بڕیارەش وەنەبێ هەر لەوەوە هاتبێ کە خۆم سەرنجێکی ئەرێنی (ایجابی) م نییە بەرامبەر حیزبایەتی و دڵم پڕ بووە لە بەڵێنی تەفرەدەرانەی کاربەدەستە خۆپەرستە برسی کورسییەکانی حیزبەکان، پێش هەڵبژاردن، بەڵکو ئەمجارە هەڵوێستی حیزبەکانی ئەڵمانیا بەرامبەر کێشەی عێراق، بەتایبەتی **سۆسیال دێمۆکرات و کەسکەکان** منی والێکرد کە تەنانەت بۆ بێزاریدەربڕینیش بێ بەرامبەر یەکێکیان، دەنگ بۆ نەیارەکەشی نەدەم. چونکە هەڵوێستی حیزبەکانی ئەڵمانیا، هەموویان، بەرامبەر کێشەی عێراق، هەرچەندە بەسەرزاری بەنێوی ئاشتیخوازی و بەربەرەکانێی جەنگەوە پێشاندەدرێ، بەڵام لە ئەنجامدا هەر پشتگیرییە بۆ رژێمی سەددام و خراپەکارییە لە گەڵ نەتەوەی کوردی زۆرلێکراو و خەڵکی رەشورووتی عێراق و گشت مرۆڤی لێقەوماو. بەکورتی کار گەیشتووەتە ئەوەی **کانسلەری ئەڵمانیا گێرهارد شرۆیدەر** دەبێژێ: **«تەنانەت ئەگەر کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکانیش بڕیارێك بدا بۆ**

**پەلاماردانە سەر عێراق، ئەوا حکوومەتی بەرێزی، ئەگەر هەڵبژێردرایەوە، هەر دژی ئەوە دەوەستێ و، ئەڵمانیا لە شەڕدا دژی عێراق بەشدار نابێ». واتە، ئەویش وەك سەددام دژی بڕیاری کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان دەوەستێ.** ئەمەش لە کاتێکدا لەشکری ئەڵمانیا، بەرازیبوونی شرۆیدەر خۆی و سەرکردەی کەسکەکان **"یۆشکا فیشەر"** و تەواوی بەرهەڵستکەرانی نێو پەرلەمانی ئەڵمانیا، لەشکریان کردە سەر **یۆگسلاڤیا** و سەربازی ئەڵمانی خوێنی ژمارەیەکی زۆری خەڵکی یۆگسلاڤیای رشت. ئەمە لە ئەفغانستانیشدا هەروایە. ئەرێ، بانێکە و دوو هەوا. سەیر ئەوەیە وەزیری دادگەریی ئەڵمانیا خانمی **"هێرتا دۆیبلەر گمێلن"** تاکتیکی **جۆرج بوشی بەرامبەر سەددام بە تاکتیکی هیتلەر چواند.** ئەمەش پشتگیرییەکە بۆ مانەوەی سەددام، سەددامی هیتلەری عێراق کە دەستی بەخوێنی نیوملیۆن کورد و یەك ملیۆن ئێرانی و هەزاران عێراقی سوورە. ئەمەش هەر بۆ راکێشانی دڵی دەنگدەران لە لایەکەوە و، لە لایەکی دیکەشەوە لە ترسی ئەوەی کە رووخانی رژێمی سەددام گەلێك نهێنی دەردەخا کە لەوانەیە لە بەرژەوەندیی دەوڵەتە ئەوروپاییەکان، بەتایبەتی ئەڵمانیادا نەبێ، لەبەر ئەوە ئەنجامی هەڵبژاردنی ئەورۆ، هەرچی چۆنێك دەربچێ، ئەوا بەلای منەوە وەك یەکە. ئەوجا ئێستە با بگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان و بۆ ئەوەی هەمووومان لەم سەمینارەدا بەشداربین، ئەوا باسەکە دەخەمە چوارچێوەی چەند بابەتێکەوە کە تکام وایە ئێوەش، ئەگەر ویستتان، بیروڕای خۆتان لە بارەیانەوە دەرببڕن.

ئەو بابەتانەی دێنە پێشەوە ئەمانەن:

١ ــ ئەمریکا کە لەشکری سەددامی لە کوێت دەرکرد، دەیتوانی بکشێتە عێراقەوە و رژێمی سەددام برووخێنێ، بەڵام ئەو هەلەی لە دەست خۆی دا و، ئەم باسەشم بە دووورودرێژی لە رۆژنامەی «میدیا» دا رۆنکردووەتەوە و کۆپیی ئەو وتارە بە ژمارەیەکی زۆر لەسەر مێزەکە دانراوە و ئەوی دەخوازێ دەتوانێ بیخوێنێتەوە، تەنێ دەمەوێ ئەوە بێژم کە ئەو رۆژە ئەمریکا هەڤاڵبەندێکی یەکجار زۆری هەبوو. لەماوەی ئەم ١١ ساڵەدا گەلێك هەڤاڵبەند لە ئەمریکا دوور کەوتنەوە و هەریەکە لەبەر هۆیەکی جیا لە هۆی ئەوی دیکە. بۆ جاری دووەم ئەمریکا پاش پەلاماری تیرۆریستانەی ١١ی ئەیلوول هەلێکی نوێی دەستکەوتەوە بۆ پەلاماردانی سەددام،

بەلاّم ئەوەشی بەکار نەهێنا و ئەوەتە ئەمریکا وایلێهاتووە کەسی وای لەگەڵ نییە.
ئەوجا ئێستە ئەم پرسیارە روو لە هەموومان دەکا، ئایە ئەگەر ئەمریکا لە گەڵ هەڤاڵبەندان، یان بەتەنێ، پەلاماری عێراقی دا، دەبێ هەڵوێستی کورد چ بێ؟ دیارە کورد نەلە دژی پەلاماری ئەمریکا دەوەستن و نە دەشتوانن بوەستن، بەلاّم ئایە دەتوانن بێلایەن بوەستن؟ خۆ ئەگەر ویستیان، یان بە پێویستیان زانی بەشداریبکەن، لەچ هەلومەرجێکدا ئەوەیان پێدەکرێ و بەشداریکردنیان دەبێ لەچ شێوەیەکدا بێ؟ ئەمەش لەکاتێکدا کە کورد حکوومەتێکی یەکگرتوو و سوپایەکی یەکگرتووی پڕچەك و خۆئامادەکردنێکی لۆجیستیی پێویستە بۆ ئەوە. ئایە سووت و زیانی کورد لە بەشداریکردنیدا چ دەبێ؟

**(۲)** ـــ ئایە نەدەبوو تا ئێستە کورد پەرلەمانێکی رەوایەتیداری (شرعی) لەڕێی هەڵبژاردنێکی نوێوە ببوایە کە دەستوورێکی بنچینەیی بۆ کۆمارێکی فیدەراڵی دابنێ و سنووری باشووری کوردستان بە تەواوی دەستنیشان بکا بەپێی راستینەی مێژوویی و جوگرافیایی باشووری کوردستان، کە **ستانەکانی مووسڵ و کەرکووك و هەولێر و سلێمانی و زۆربەی خاکی هەردوو ستانی کۆنی (دیالە و کووت** دەگرێتەوە). ئەمە بەداخەوە تائەوڕۆ نەکراوە، ئەگەرچی ئەمە ۷ ساڵە تکا لە هەردوو حیزبی دەسەلاّتدار دەکەم بۆ ئەمکارە. راستە، باسی فیدەراڵیزم کراوە و دەکرێ، بەلاّم فیدەراڵیزم شێوەی زۆرە، لەبەر ئەوە دەبێ کورد بەزوویەکی زوو ئەو جۆرە فیدەراڵیزمە کە مەبەستێتی بێپێچوپەنا دیاریکا. وەك لە وتاری نێوبراودا باسمکردووە، پێویستە سێ کۆماری فیدەراڵی هەبێ، باشووری کوردستان، بەغدا، بەسرە. ئەمەش پێوەندیی بە کورد و شیعە و سوننییەوە نییە، بەڵکو دابەشکردنەکە لەباری جوگرافیاییەوەیە.

**(۳)** ـــ داخوازیی جۆرج بوش (کوڕ) لە کۆنگرەی ئەمریکا ئەوەیە دەسەلاّتێکی فراوان بدرێ پێی بۆ پەلامارێکی لەشکریی بۆ سەر عێراق کە وادیارە مەبەستی جۆرج بوش هەر عێراق نەبێ، بەڵکو لە عێراق گەورەتر و ئێران و رەنگە سووریاش بگرێتەوە. راستییەکەی جارێ ئاشکرا نییە، ئایە کۆنگرەی ئەمریکا ئەو مافە دەدا بە جۆرج بوش یان نا، چونکە ئێستە لە کۆنگرەی ئەمریکا قسە لەوە دەکرێ کە داخوازییەکەی بوش چاوی پێدابخشێنرێتەوە و سەرلەنوێ دابڕێژرێتەوە. بەلاّم ئەگەر

جۆرج بوش ئەو مافەی وەرگرت و پەلاماری هێنایە سەر ئەو دەوڵەتانە، دیارە دەرفەتێکی نوێ بۆ کورد دروستدەبێ وەك ئەو دەرفەتەی پاش جەنگی جیهانیی یەکەم کە ئیمپراتۆرێتیی عوسمانی رووخا و **پەیمانی سێڤر** هاتەکایەوە. پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە، ئایە کورد دەتوانن سووت لەو دەرفەتە وەربگرن، ئەمە لە کاتێکدا کە ئاشکرایە دەوڵەتی ترك کە بۆ بەرژەوەندیی چاوچنۆکانەی خۆی هەڤالبەندی ئەمریکایە، دژ دەوەستێ بەرامبەر بەوەی دەوڵەتێکی کوردستانی دابمەزرێ. تەنانەت ئەگەر لە ئەرجەنتینیش بێ، وەك وەزیرێکی دەوڵەتی ترك گوتی. ئایە دەوڵەتی ترك دەتوانێ لەو کاتەشدا رێ لە هاتنەکایەی کوردستانێکی سەربەخۆ بگرێ؟ پاشان ئایە هەڵوێستی فارس و عەرەب چ دەبێ؟ ئەمە لە کاتێکدا کە کێشەی **ترکە ئازەربیەکان و ترکەکانی ئێران و بلووجەکانی ئێران دێتە پێشەوە کە ئەودەمە دەوڵەتی ترك خۆیدەکا بە کوێخای ترکەکانی ئێران و پاکستانیش بە کوێخای بلووجەکان.**

**(٤)** ــ ئایە کورد لە عێراقدا دەتوانێ ببێ بە خاوەنی مافی خۆی، ئەگەر هەوڵنەدا دەسەلاتی نێوەندیی بکەوێتە دەست؟ ئەگەر هاتو دەسەلاتی نەکەوێتە دەست، مەترسیی ئەوە نابێ هەر ساتێك کە عەرەبە شۆڤێنییەکانی عێراق ویستیان، بتوانن جارێکی دی **«ئەنفال»** لە کورد بکەنەوە و کوردستان کاول بکەنەوە؟ ئایە گەرەنتی هەیە بەرامبەر بەوە؟ گەرەنتییەکە هەر بە نووسینە یان قسە؟

**(٥)** ــ بێگومان کێشەی **فەلەستین** کێشەیەکی گەورە و سەخت و ئاڵۆزە لە رۆژهەلاتی ناڤیندا و بە بیروڕای من ئەگەر فەلەستینییەکان سیاسەتکاری باشیان هەبووایە، هەلی باش لەبەر دەمیاندا هەبوو بۆ گەیشتنە هێندەك لە ئامانجەکانیان، بەتایبەتی لەسەردەمی دەسەلاتی سەرۆك وەزیران **یەهوود باراك و ئیسحاق رابیندا.** باوەڕ بفەرموون، جاران وامدەزانی کە هەر ئێمەی کورد لە سیاسەتدا کۆڵەوارین، دوایی دەرکەوت بۆم کە لە ئێمەش کۆڵەوارتر هەن. ئەمەتە پاش ئەوەی فەلەستینییەکان، ئەو هەلە باشانەیان لەدەست خۆیان دا، سەرۆکوەزیرانی ئەوڕۆی ئیسرائیل **ئەریەل شارۆن** دەیەوێ بە ملهوڕی و زۆری زۆردارەکی و سووتوەرگرتن لە کرداری هێندەك کۆمەڵەی دەستوەشێنی وەك **جیهاد و حەماس و حیزبوڵلای لوبنان** و بێدەسەلاتیی و گامەسلەکیی دەوڵەتە عەرەبەکان، نەخشە و پیلانی خۆی بەسەر فەلەستینییەکاندا بسەپێنێ، ئایە چارەسەرکردنی کێشەی فەلەستین، پاش پەلاماردانە

سەر عێراق و زاڵبوون بەسەریدا، چ کارکردێك (تاثیر) ی دەبێ لەسەر کێشەی کورد، بەتایبەتی لەوڕووەوە کە ئسرائیل و دەوڵەتی ترك هەڤاڵبەندی یەکن! ئەوجا ئەگەر پەلاماری ئەمریکا بۆ سەر عێراق ببێتە هۆی رووخانی رژێمی ئێران و سووریا، کە دوو دوژمنی ئیسرائیلن، گەلۆ ئەو دەمە نرخی دەوڵەتی ترك بۆ ئیسرائیل و ئەمریکا هەروەك ئێستە دەمێنێ؟.

**(٦) ـ زۆرجار بەرهەڵستکەرانی عێراقی دژبە رژێمی سەددام، بەتایبەتی ئیسلامییەکانی سەربە رژێمی تاران و ناسیۆنالیستە عەرەبەکانی سەربە رژێمی سووریا و، تەنانەت حیزبە کۆمۆنیستە عەرەبەکانیش و لەنێو ئەوانەدا پارتی کۆمۆنیستی عێراق دەبێژن، رووخانی رژێمی سەددام تەنێ کاری "گەلی عێراق" ە و، لە دژی پەلاماری ئەمریکا بۆسەر عێراق دەوەستن. ئەم هەڵوێستەشیان هەرلە هەڵوێستی فەرمانداارانی دەوڵەتە عەرەبەکان دەچێ کە لە ترسی عێراقێکی دێمۆکراتی و کوردستانێکی ئازاد، خۆیاندەخەنە پاڵ سەددامەوە،** دیارە **رووسیا و چین** و زۆربەی دەوڵەتە ئەورووپاییەکانیش بۆ بەرژوەندیی خۆیان هەر ئەو قسەیە دەکەن، ـ

**ئایە بەڕاستی گەلی عێراق دەتوانێ بێیارمەتی هێزێکی سوپایی دەرەوە، رژێمی سەددام بڕووخێنێ؟ ئایە ئەگەر هێزی لەشکریی سوێندخۆران و لەپێش هەموویانەوە ئەمریکا و، بەریتانیا، لە جەنگی جیهانیی دووەمدا، بەهێزی چەك رژێمی نازی نەخستایە، بەرهەڵستکارانی ئەڵمان پێیاندەکرا رژێمی نازی لەنێو ببەن، کە ئەورۆ سیاسەتکارانی ئەڵمانیا ئەم قسەزلانە دەکەن و، ئەم سپڵەییە دەنوێنن؟.**

(٧) ـ شەڕی خۆکوژیی نێوان **پارتی و یەکێتی**، بووبە هۆی بەهێزبوونی تۆرانێتی و ئیسلامی رامیاری لەنێوچەی نەفرینی باشووری کوردستاندا **و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان گەلێك «تنازلات»ی تا ئێستە کردووە بۆ تۆرانییەکانی سەر بە «بەرەی ترکمان» کە دان بەبوونی کوردستاندا نانێن و، دەسکەلای رژێمی ترکن**، هەروەها ئیسلامییەکان، چ لەنێوچەی یەکێتی و چ لەنێوچەی پارتی، گەلێك مافیان پێدراوە، لەکاتێکدا کە ئیسلامییەکان لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان لە ساڵی ١٩٩٢ دا لە ٥٪ کەمتریان هێنا، ئێستەش هی وایان تێداهەڵکەوتووە وەك

**"انصارالاسلام"** كە بە چەك شەڕی یەكێتی و پارتیش دەكەن. كاربەدەستانی یەكێتی دەبێژن كە "انصارالاسلام" سەربە كۆمەڵی **"القاعدە"** و **بن لادنن** و ژمارەشیان (١٥٠ ــ ٤٠٠) كسێك دەبێ. ئێستە ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە، ئایە ئەمانە بەفڕۆكە لە ئەفغانستانەوە هاتنە "فڕۆكەخانەی **تەوێڵە** و **بیارە**" و چل گوندیان داگیركرد و، هەر بە "فڕۆكە" تۆپی هاوەن و چەكی قورسیان" گەیاندە گوندی **"خێڵی حەمە"**؟ پاشان ئایە ئەم چەند سەت چەكدارە بە بای خودێ دەژین، وەك كوردەكە دەبێژێ؟ یان پێویستیان بە نان و ئاو و دەرمان و گەلێك شتومەكی دیكەیە، گەلۆ ئەم ئازووخەیە لەكوێوە دێ بۆیان؟ **ئەوەش پێویستە بێژم كە ئەمانە ئەم هەموو یارمەتییەیان لە پارتی و یەكێتی وەرگرت، لە كاتێكدا نەتەوەییەكانی كورد یەك بیرۆی چەند مەترە چوارگۆشەییان پێنەدراوە، بەتایبەتی كۆنگرەی نیشتمانیی كوردستان بە سەرۆكایەتیی هاوییری هێژا جەواد مەلا كە خۆی ئەوەتە لەم سەمینارەدا بەشدارە و، بەوپەڕی دڵەوە بۆ مان و خانۆچكەكەی كورد تێدەكۆشێ.**

ئێستەش پاش پشوویەكی كورت تكایە هەریەكە بیروڕای خۆی بەوپەڕی سەربەستییەوە دەرببڕی و ڕەخنەی خۆی بخاتەڕوو، بەڵام تكایە بەشێوەیەكی دێمۆكراتانە و هێمنانە و بێ ڕووشاندنی هەستی هیچ لایەك و زۆر سوپاس.

— — —

**چەند تێبینییەك لەسەر سەمیناری هانۆڤەر!**

**مامۆستا جەمال نەبەز** لەكاتی باسكردنی هەڵوێستی ئەڵمانیا بەرامبەر پەلاماری ئەمریكا بۆ سەر عێراق چەند وێنەیەكی كۆنی **"گێرهارد شرۆیدەر"** و سەركردەكانی **كەسكەكان** لە گەڵ **جەلال بارزانی** پێشاندا و، گوتی ئەمانە دۆستی جەلال بوون كە ئەوەتە خۆی لێرەیە. تكایە بپرسن لێی بزانن شرۆیدەر و فیشەر ئەورۆ سڵاو دەكەن لێی؟ كاك جەلال بارزانی گوتی "نەئ".

— — —

بەرلەوەی سەمینارەكە دەستپێبكا **بەڕێزان، مامۆستا جەواد مەلا سەرۆكی كۆنگرەی نیشتمانیی كوردستان و بروسك ئیبراهیم بەرپرسیاری پێوەندیی دەرەوەی كۆنگرەی**

نیشتمانیی کوردستان KNC وتاری خۆیان پێشکێشکرد و هێندێك باسی تێکۆشین و ئامانجی کۆنگرەیان کرد.

ئەم سەمیناره پتر لە سێ کاتژمێر درێژەی کێشا. ئەگەرچی ژمارەیەکی زۆری ئەندامان و دۆستانی KNC کە لە شارە دوورەکانی ئەڵمانیا دەژین نەیانتوانی ئامادە بن، چۆنکە دەبوو رۆژی دووشەممە بەیانی زوو، هەریەکە لەسەر کاری خۆی بێ، لەگەڵ ئەوەشدا سەت کەسێك بەشدارییان کرد. برێکی باش کاتەکە تەرخانکرابوو بۆ وتووێژی ئازاد و ژمارەیەکی زۆر لە بەشداران بیروڕای خۆیان دەربڕی و زۆربەی زۆری قسەکەران بێزاریی خۆیان بەرامبەر هەڵوێستی حکوومەتی ئەڵمانیا پێشاندا کە بەنێوی پاراستنی ئاشتییەوە رژێمی سەددام دەپارێزن. یەکێك لە بەشداران گوتی: «ئاشتی شتێکی رەوایە، بەڵام ئەم قسەرەوایە کاری نارەوای سەددام دەشارێتەوە». دوو بەشدار کە سەر بە «پارتی کۆمۆنیستی کرێکاریی عێراق» بوون گوتیان: «ئەمریکا دەیەوێ بێتە عێراقەوە و نەوتی کوردستان داگیربکا ئەوجا دەستبگرێ بەسەر نێوچەی کەنداودا». چەند کەسێکی دیکە گوتیان: «ئەمریکا بەخێربێ بۆ کوردستان. ئێمە تا ئێستە چیمان لە نەوتەکەمان بەرکەوتووە؟». یەکێکی دیکە گوتی: «هێندێ جار باسی مردنی منداڵانی عێراق دەکرێ بەهۆی گەمارۆدانی عێراقەوە. ئەمە راستە. بەڵام باسی هەزاران کورد و عێراقی ناکرێ کە سەددام لە بەندیخانەدا دەیانکوژێ و زمانیان دەبڕێ و چاویان کوێردەکا و لە وڵاتی خۆیان دەریاندەپەڕێنێ». یەکێکی دیکە گوتی: «باشە کێ بەرپرسیارە لە مردنی منداڵانی عێراق؟ سەددام بەرپرسیارە!». یەکێکی دیکە گوتی: «باشە بۆچی منداڵانی نێوچەی رزگارکراوی کوردستان بەو شێوەیە و بەو زۆرییە نامرن و منداڵانی ژێردەستی سەددام بەوجۆرە دەمرن، سەددام خۆی بەرپرسیارە». یەکێکی دیکە کە خەڵکی رۆژهەڵاتی کوردستانە، روویکردە ئەو دوو بەشدارەی کە سەربە "پارتی کۆمۆنیستی کرێکاریی عێراق» ن و گوتی: «بزووتنەوەی کوردایەتی مارکسیست لێنینیست و ئیسلامییەکان شێواندیان. ئێوە باشدەناسم، چۆنکە خۆشم کاتی خۆی مارکسیست لێنینیست بووم». یەکێك لەو دوو "کۆمۆنیستە کرێکارییە" روویکردە مامۆستا جەمال نەبەز و گوتی: «تۆ باسی عەرەبیی جلفەت کرد بۆ نزمکردنەوەی سەرکردەکانی عەرەب، خۆ سەرکردەکانی

کوردیش بە کوردییەکی شەقوشڕ قسەدەکەن!».

**(سەرنج!**

**کاتێك یەکێك لە بەشداران باسی مەترسیی ئەوەیکرد کە ئەفسەرێکی عێراقی لەکاتی پەلاماری ئەمریکادا هەل هەڵکەوێ بۆی و، خوتبەیەك بدا و سەربازەکان بنێرێ بۆ شەڕ دژی کورد. مامۆستا جەمال نەبەز بۆ پێکەنین گوتی: "خوتبەکەی بە عەرەبیی جلفە دەدا").**

مامۆستا جەمال نەبەز لەوەرامی رەخنەی بەشداربووی کۆمۆنیستی کرێکاریدا گوتی: «ئەو قسەیەی بەرێزت راست نییە. هەربۆوێنە مام جەلال بەکوردییەکی جوانی رەوان قسە دەکا و، تەنانەت هێرۆخان ژنی مام جەلال بەکوردییەك قسە دەکا ئەگەر بەرێزت پێنج سالی دیکەش خەریکی فێربوونی زمانی کوردی بیت، ناتوانیت بەو کوردییە قسە بکەیت. پاشان ئەگەر کوردێك زمانی خۆی باش نەزانی، گوناهی گەورەی دەکەوێتە ئەستۆی داگیرکەرانی کوردستان کە رێنادەن زمانی خۆمان بەباشی فێربین. بەلاّم بۆچی دەبیّ کوردێکی وەك من، بیّ گرێوگۆلّ بە عەرەبی قسە بکەم و بنووسم و ئەویش، کە خۆی عەرەبە و لافی سەرکردەیەتیی لێدەدا، زمانی خۆی بەباشی نازانیّ، لەکاتێکدا هیچ بەرهەلّستێك نییە لەبەردەم فێربوونی زمانی عەرەبیدا و ئەویش هەموو ساتێك باسی "عروبە" بکا بۆمان؟».

کاتێك مامۆستا جەمال نەبەز باسی حکوومەتی کوردستانی کرد، یەکێك لەو دوو کۆمۆنیستە کرێکارییە گوتی: «کام حکوومەتیان؟» مامۆستا جەمال نەبەز گوتی: «پێم خۆش نییە کە دوو حکوومەتن، بەلاّم عەرەبەکان ٢٤ حکوومەتیان هەیە، جاریّ با کوردیش دوو حکوومەتی هەبیّ». ئەم قسەیە بە چەپلەی گەرمی بەشداران وەرامدرایەوە. یەکێك لە بەشداران گوتی: "بۆچی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان لە گەلّ کۆنگرەی نەتەوەیی و کۆنگرەی کوردی ئەمریکا یەکناگرن؟». بەرێز مامۆستا جەواد مەلا گوتی: **«کۆنگرەی نەتەوەیی ــ برۆکسل کۆنگرەیەکی سەر بە پیّ کیّ کیّ یە. کۆنگرەی نەتەوەیی نابیّ سەر بە هیچ حیزبێك بیّ. کۆنگرەی ئەمریکاش کۆنکرەیەکی خوێندکارانەیە. کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان، کۆنگرەیەکی ناحیزبی و گشتییە کە هەوڵی کۆکردنەوەی هەموو حیزب و کۆمەلّ و رێباز و کەسایەتییەکانی کوردستان دەدا لەژێر چەترێکی نەتەوەییدا».** یەکێك لە بەشداران

گوتی: "بۆچی کۆنگرە ئەمە و ئەوە ناکا؟" مامۆستا جەواد مەلا لە وەرامیدا گوتی: «ئێمە هەر هێندەمان لەدەستدێ. تۆ فەرموو وەرە نێو کۆنگرەوە و بۆ ئەو شتانەی دەفەرموویت کار بکە. دەرگەی کۆنگرە دانەخراوە لەبەردەم کەسدا ...».

یەکێك لەو دوو کۆمۆنیستە کرێکارییە بە مامۆستا جەمال نەبەزی گوتی: «تۆ نێوانت لە گەڵ سەرکردەکانی کورد باشە و ئەو نامانەش بلاو دەکەیتەوە کە دەینێریت بۆیان، بەلام تا ئێستا بە ئێمەت نەگوتووە، ئەوان بەرامبەر بەو داخوازییانەی تۆ چ دەلێن؟». مامۆستا جەمال نەبەز گوتی: «داخوازیی گەورەی من لەوان ئاشتی و پێکەوە کارکردنە و، زانتانەبەریانە بۆ یەکگرتن و، ئەوانیش بەڵێنیان داوە کە بۆ ئەوە کاربکەن و ئەم هەنگاوەی دواییش لە سەلاحەدین ئەنجامی هەوڵوتەقەلای هەموو لایەکمانە. لەبارەی ئێوەشەوە "پارتی کۆمۆنیستی کرێکاریی عێراق" پرسیارمکردووە لێیان، ئەوان دەبێژن کە سەربەستییان داوە بەئێوە بۆ کارکردن و پارەیان داوە پێتان ..». لێرەدا هەردووکیان قسەکەیان بڕی پێی و گوتیان «نە. ئەوە درۆیە .... مامۆستا جەمال نەبەز گوتی: «باشە ئێوە دەتانەوێ پێتان بلێم ئەوان چییان گوتووە و منیش گوێم بۆ هەموو قسەکانتان راگرت. بەلام ئێوە رێنادەن بیروڕای وان بگەیەنم پێتان ... .»

سەمیناری **هانۆڤەر** دوانگەیەکی ئازاد بوو بۆ گۆڕینەوەی بیروڕا و بەشداران خۆشیی خۆیان دەربڕی بە چەپلەرێزان.

**سەرۆکی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان، بەڕێز مامۆستا جەواد مەلا، سوپاسی ئەندامان و دۆستانی KNC لە هانۆڤەر (ئەلمانیا) کرد، بۆ رێخستن و سازدانی ئەم سەمینارە.**

«میدیا» ژمارە (١٣٣) ساڵی حەوتەم ٢٠٠٢/١٠/١

# نەتەوەییەکانی کورد و
# کاربەدەستانی «هەرێمی ئاسایش»

ئەوانەی ئاگاداری کاروباری رامیارین، چ لە کوردستان بن، یان لە دەرەوەی وڵات، زۆر باشدەزانن کە نەتەوەییەکانی کورد، هەرلە پاش دامەزراندنی «هەرێمی ئاسایش» ەوە تا ئەورۆ، بێوچان هەوڵیانداوە لەپێناوی ئەوەدا کە ئاشتی نەتەوەیی لە کوردستاندا جێگیربێ و حیزبحیزبێنە شوێنی خۆی بدا بە نیشتمانپەروەری و، بەرپرسیارێتیی نەتەوەیی بیێتە سەرپەڕەی دەفتەری رەوشت و نەرێتی کوردەواری، بۆئەوەی بتوانرێ سووت لەو هەلە مێژووییە تاکهەڵکەوتووە وەربگیرێ کە بوو بە هۆی ئەوەی نێوچەیەك لە باشوور بکەوێتە دەست کورد خۆی، تاکو خانۆچکەیەك بۆ کورد بنیاتبنرێ. بەڵام زۆربەداخەوە، تەنگەتیلکەیی حیزبحیزبێنە و زۆرانگرتنی ناشیانە لەسەر دەسەڵات و دەستبردن بۆ چەك لەباتی کێبەرکێی خزمەتی گەل و راکێشانی دڵی جەماوەر، شەڕوشۆڕێکی وا چەپەڵی لە باشووردا هەڵگیرساند، کە ئەوەتە ئەنجامەکەی بەچاوی خۆمان دەبینین و دیارە داروپەردوو و پارچەوپۆڕی ئەم شەڕەزرتانێیەی کورد، هەروا بەمزووانە و بە هاسانی کۆناکرێتەوە بۆمان. ئەمە لە کاتێکدا کە داگیرکەرانی کوردستان رۆژبەرۆژ لە یەك نێزیکدەبنەوە و خۆیان لە گەڵ دەسەڵاتدارانی جیهان، بەتایبەتی ئەمریکا رێکدەخەن. کورتوکرمانجی، وەك لە وتاری پێشوومدا نووسیبووم، "کوردستان وا بەسەر دەستی چەند دێوێکەوە".

ئا لەم بارە نازکە و لەم رۆژگارە تەنگانەیەدا و، لە پاداشی چاکەخوازی و دڵسۆزیی نەتەوەییە ئازادیخوازەکانی کورددا، دەسەڵاتدارانی کورد دژایەتیی نەتەوەییەکانی کورد دەکەن. ئەمەش نەك بەشێوەیەکی بابەتانە و راستەوخۆ و رووبەڕوو، بەڵکو دزانە و لە پشتەوە تێسرەوێنەرانە. **ساڵانی ساڵە بەڵێن بە نەتەوەییەکان دەدەن کە رێیدەن پێیان، رێکخراوێك لە هەرێمی ئاسایشدا بەنێوی «کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان» ەوە بەرەسمیی کاربکا، کەچی هەردەمە بەجۆرێك و بە بیانوویەك دەستیدەستیدەکەن پێیان و، بە پێچەوانەی ئەمەوە دەچن هەموو مافێك بە تورانییەکان و بەوانە دەدەن کە پێ بە سێبەریاندا دەنێن.** لە دەرەوەی وڵاتیش لە گەڵیاندا کۆدەبنەوە، وەك ئەو کۆبوونەوەیەی کە نوێنەرانی **پارتی و**

**یەکێتی و KNK (واتە پیْ کیْ کیْ)** لە لەندەن لەرۆژی ١٥/١٠/٢٠٠٢ دا پێکەوە کردیان بە بانگێشتی دەزگەی Liberation (لیبەرێشن)، بەڵام کە کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان جەژنێکی چڕوپڕ سازدەکا و ئەمانە بەڕێزەوە گاز دەکا، یان نایەن، یان تاکە یەك کەس دەنێرن کە ئەوانیش بەنێوی خۆیانەوە قسەدەکەن، نەك بەنێوی کۆمەڵە، یان حیزبەکەیانەوە و، رۆژنامەکانیشیان یەك وشە لەو بارەیەوە نانووسن.

**ئەم هەڵوێستە نادۆستانەیەی کاریەدەستانی "هەرێمی ئاسایش" بەرامبەر نەتەوەییەکانی کورد لە کاتێکدا دەبینریْ کە هێندەك لەو کاریەدەستانە بە دەم و بە نووسین پەسنی داگیرکەرانی کوردستان دەدەن و بە دۆستی خۆیان و کورد دەیاندەنە قەڵەم. لێرەدا بەوکاریەدستە سەرلێتێکچووانە دەبێژم کە پەندێك لە چارەنووسی ئۆجەلان و مەلا کرێکار و کورەکەی بن لادن وەربگرن.**

**مەلا کرێکار** سالانی سالْ خۆی و خێزانی وەك پەنابەر لە **ئۆسلۆ (پێتەختی نەرویج)** دەژیا و چالاکیی ئیسلامیستانەی خۆی دەنواند و چەند جار و چەند جار سەردانی ئێرانی دەکرد و دەگەڕاوە و کەسیش پێینەدەگوت **"بەری چاوت کلی پێوەیە"**. هەر لە ئۆسلۆش رۆژنامەیەکی بەزمانی عەرەبی دەردەکرد کە لە سەرەتاوە نێوی **"کردستان"** ی پێوە بوو و گوایە بلاْوکراوەی **"مکتب الاعلام الکردی"** بوو. دوایی لەسەر داخوازیی رژێمی مەلاکانی ئێران وشەی **"کردستان"** و **"کردي"** یەکەی لێلابرد و کردی بە **"مکتب ازمر"**. بەڵام ئەم گۆڕانکاریەڵییە فریای **مەلا کرێکار** نەکەت. پاش پەلاماری ئەمریکا بۆسەر ئەفغانستان، کە مەلاکان دەرکەوت بۆیان هاستەکەی ئەمریکا داخە، ئەوە بوو ئەمجارە مەلا کرێکار دەیویست لە ئەورووپاوە بە تاراندا بگەڕێتەوە بۆ کوردستان، لە تاران گرتیان و لەباتی ئەوەی هیچ نەبیْ بیدەنە دەست کاربەدەستانی "یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان" کە گوایە "هاوپەیمانی ئێرانن" یەکسەر دایانە دەست هۆلەند و لەوێش تۆمەتی ئەوەیان خستەپالْ کە گوایە لە "ئەردەن بازرگانیی بە تریاکەوە کردووە". ئەردەنیش داوای ئەوەیکرد مەلا کرێکار بدەنە دەستی. هۆلەندە زۆرباش دەزانیْ کە ئەگەر ئەمریکا داوای مەلا کرێکار بکا ناتوانن بینێرن بۆ ئەمریکا، چۆنکە لە ئەمریکا سزای مراندن (عقوبة الاعدام)

هەیە و لە ئەورووپا ئەو سزایە نییە. بەلاّم لەوانەیە ئەردەن رەوانەی ئەمریکای بکا.
بێگومان ئەگەر مەلا کرێکار دڵنیانەبوایە لەخۆی، بە تاراندا نەدەهاتەوە کوردستان.
بێجگە لەمەش هەر رژێمی مەلاکان لەم ماوەی دواییدا (٣٠٠) هاوکاری کۆمەڵەی "القاعدە" و لەنێو ئەوانەدا کوڕەکەی بن لادنی دایە دەست پاکستان و عەرەبستانی سعوودی. ئەمە لەکاتێکدا کە رژێمی مەلاکان هەتا ئەم رۆژانەی دوایی دەیگوت یەك ئەندامی "القاعدە" لە ئێراندا نییە.

**ئەمەیان ئێران. سووریاش هەرلە ساڵی ١٩٦٦ ەوە کە کودەتای حافز ئەسەد روویدا و میشل عەفلەق لە سەرۆکایەتیی بەعس لابرا و رایکردە لوبنان وئەوجا عێراق، تا** کۆتاییی نەوەتەکانی سەتەی رابوردوو، شەڕی رژێمی عێراقی دەکرد و بەعسی عێراقی بە دوژمنی خوێنینی خۆی دەدایە قەڵەم. بەلاّم دووساڵێك لەمەوبەر بایدایەوە و، خۆی لە عێراق نێزیککردەوە و گەلێك پەیماننامەی بازرگانی و ئابووری لە گەڵ رژێمی سەددام بەست و پارەیەکی باشی دەستکەوت و، لەمەوە ساردییەکی تەواو کەوتە نێوان کاربەدەستانی سووریا و ئەو بەرهەڵستکەرە عێراقییانەی لەوێ دەژین و دەنگۆ هەبوو کە بیرۆکانی حیزبە کوردی و عێراقییەکان لە سووریادا دادەخەن. بەلاّم کە سووریا زانی ئەمریکا بەڕاستیەتی و دەیەوێ لە سەددام بدا و، سۆڤێتە کۆنەکەش نەماوە سووریا بپارێزێ، ئەوجا جارێکی دی بایدایەوە و گێرِی گۆڕی و، ئەوەتا فڕۆکەی تایبەتی دەنێرێ بۆ قامیشلی کە مام جەلال و هاوڕێیەکانی لەوێوە ببا بۆ دیمەشق و لە دیمەشق لە سالۆنی شەرەفدا دایدەبەزێنن و لەماوەی دە رۆژاندا سەرکردەکانی سووریا چەند جار لە گەڵ مام جەلال کۆدەبنەوە، بەلاّم دەزگەکانی راگەیاندنی سووریا هیچ باسی ئەم میواندارێتی و وتووێژانە ناکەن، نەبا ئەمریکا پەلاماری عێراق نەدا و سەددام، یان داروودەستەکەی لەسەر کار بمێنن و رۆژێك بێ پێیان بێژن: "ها سپلەیینە! ئێوە مام جەلال و ئەندامانی حکوومەتەکەیتان بەڕەسمی وەك سەرۆکدەوڵەتێك پێشوازی کرد".

ئەمە بێجگە لەوەی کە رژێمی سووریا چەند هەفتەیەك بەرلەوەی کۆمەڵگەی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیار لەسەر پێشنیازەکەی ئەمریکا و بەریتانیا بدا، دەیگوت لەدژی ئەو پێشنیازە دەوەستێ، کەچی کە کات هاتە سەر دەنگدان، لە پڕ سووریا دەنگی بۆ دا.

سەیرەکە ئەوەیە، سەرکردەی هەموو حکوومەتێك، یان دەوڵەتێك، بەنێوی حکوومەت، یان دەوڵەتی خۆیەوە قسەدەکا، تەنانەت ئەگەر لەرێی هەڵبژاردن و سەرکەوتنی حیزبەکەشیەوە، سەرکردەیەتیی دەستکەوتبێ، بەلام ئەمانەی ئێمە، زۆربەداخەوە، هەر وتووێژێك دەکەن، یان هەر تەلگورافێکی پیرۆزبایی لێدەدەن، هەر بەنێوی حیزبی خۆیانەوە دەیکەن. ئەوجا چۆن خەڵك ئێمە وەك نەتەوەیەك تەماشا بکەن؟.

لە کۆتایی ئەم چەند دێرەدا دەمەوێ ئەوە بخەمە بیر هەموو لایەك کە دژایەتی، یان دوژمنایەتیکردنی ئازادیخوازانی نەتەوەیی کورد، هیچ کەڵکێك بەنەیاران ناگەیەنێ لە پەژیوانی و پاشگەزبوونەوە پتر، چونکە لەوانەیە رۆژانی یەکجار سەخت و ناخۆش بێنە رێمان. لەبەر ئەوە کەس نابێ لەخۆبایی بێ. مرۆڤی ژیر، ئەگەر بەدرێژاییی خۆیدا روانی، بە پانایی خەڵکیشدا دەروانێ.

گۆڤاری "کۆنگرە" ژمارە (٢٦) - نەورۆزی ٢٠٠٣ ی زایینی.
«میدیا» ژمارە (١٣٦) ساڵی حەوتەم رۆژی ٢٠٠٢/١١/١٦.

**برای مێژوونووس دوکتۆر جەمال نەبەز**

**گەرمترین رێزوسلاو پێشکێشتان دەکەم**

دوو وتارم بۆتان ناردووە لە گەڵ بەرێز د. سەروەر لەبارەی چەواشەکردنی مێژووی کورد لەلایەن نۆکەری بەعسی **عبدالخالق سەرسامەوە** بە هاندان و پشتگیریکردنی نۆکەر و جاسووسانی بەعس وەك **سەلاح بەدرالدین و فیصل دەباغ و محمد خضر مەولوود و بەدران ئەحمەدی جاشی مامەن قەشقە**. زۆر کەس رەییان وایە کە بە هاندانی موخابەراتی بەعس کراوە لەبەر ئەم دوو هۆیانە:

١ ــ حەساسییەتی رۆژاوا بەرامبەر بە سەلاحەدینی ئەیووبی کە ئەمە یەکێك بووە لە هۆیەکانی دروستنەکردنی دوڵەتێکی کوردی لەلایەن ئینگلیزەوە.

٢ ــ مەسەلەی بەعەرەبکردنی کوردستان، چۆنکە هێنانەوەی ئەسلی سەلاحەدین لە قەفقاسییەوە بۆ هەولێر و کردنی ئەم بنەماڵەیە بە گەورەی نێوچەکە، بەڵگە و بەهانەیەك دەخاتە دەستی رژێمی بەعس بۆ (تعریب) لە نێوچەی هەولێر، چۆنکە دەڵێ سەلاحەدین عەرەبە لەبەر ئەوەی لە تکریت لە دایکبووە و شەجەرەیەکیش لە چەندین سەرچاوەدا هەیە کە **ئەیووبییەکان** بە ئەسڵ عەرەبن کە **(اسماعیل بن طغتکین) ی برازای سەلاحەدین و پاشای یەمەن** دروستیکردووە. جا ئیتر رژێمی بەعس دەتوانێ بەپێی ئەم چەواشەکردنەی مێژوو بڵێ ناوچەی هەولێر عەرەبستان بووە ....

**سەلاح بەدرالدینی موخابەراتی عێراقی** تا ئێستا دووجار کتێبەچەواشەی **عبدالخالق (صلاح الئەیوبی من جدید)** ی چاپکردووە و نیازیەتی بۆ جاری سێیەمیش چاپی بکات.

زۆر کەس وایاندەزانی مێژوونووسانی کورد بەتایبەتی تۆ زۆر بە توندی بەرگریی لەمێژووی کورد دەکەن و فەزحی ئەم چەواشەکردنەی مێژوو دەکەن بە وتار و بە وتەکانی تەلەفزیۆنی، بەڵام مخابن هیچ دەنگێکتان نەبوو.

هیوادارم رەیی خۆتان لەمبارەوە بنووسن بۆ رۆژنامەی **(میدیا)** کە شتی باشی تێدا بلاو دەکەن وەك چۆن بەرگریتان کرد لە سەرای سلێمانی و، ئەو هەڵوێستەتان دەنگێکی گەورەی پەیدا کرد.

زۆر کەس لێرە چاوەڕوانی رەیتانە.

**لەگەڵ رێزم**

**براتان عبدالرقیب یوسف ــ ٢٠٠٢/١١/١٥**

**بەهۆی رۆژنامەی «میدیا» و،**
**ماڵپەڕی «کوردبوون» ە وە،**
**پێشکێش بێ بە مامۆستا ئەبدولڕەقیب یۆسف،**

سلاوێکی برایانەت لێبێ و هیوام شادی و سەرفرازیتە.

گلەیینامەکەت کە رۆژی ۱۱/۱۵ی لەسەر بوو، گەیشت پێم. پێش ئەوەش، ئەو بەڵگەنامـانەی کـە بەدەسـتی ناردبووتـان، وەرمگرتن. سـوپاسـست دەکـەم. راستییەکەی، ئەز دەمێکە ئاگام لە خەباتی سەختی زانستکارانەی بەڕێزت هەیە لەپێناوی راگـرتنی رووی دەسـتکارینەکـراوی مـێـژووی نەتەوەی کـورد و پاراستنی ئاسەوارە دێرینەکـانی کوردسـتـاندا.باوەڕ بفەرموو، پێموایە ئەگەر شتێك ببوایە بەنێوی «پرۆلیتاریای رۆشنبیری» یەوە، ئەوا ئەو زاراوەیە پڕ بە پێستی تۆ دەبوو. ئافەرین بۆ هەوڵوتەقەلای بێپسان و هەڵسووڕانی بێوچانت لەڕێی خزمەتی فەرهەنگی نەتەوەی کورددا.

کاکی بەڕێز:

تێکدانی مێژووی کورد لەلایەن هوردەبۆرژوای چلێس و خۆبژێنی کوردەوە، بەدڵی داگـیـرکـەرانی کـوردسـتـان، کـە لـە نامـەکـەتدا باسـتکردووە، نەلە دوێنێ و پێـرێوە دەستیپێکردووە و، نەلە **«نالبـەندکـارییـەکـە» ی عـەبدولخـالیق سەرسامەوە (صلاح الدين الايـوبی من جـديد)** سەرچاوەیگرتووە. نووسینەکانی شوکری مەمەد سەگبان (دۆزی کـورد **Laouestian Kurde** لە بیستـەکـاندا بەزمـانی فـەرەنسی، کە **مامۆستا رەفیق حیلمی بەترکی بەنێوی «دۆزی کورد لەچەند لاپەڕیەکدا ـــ «کورد مسئلەسی صفحاتنون»** بەرپەرچی داوەتەوە و، پەرتۆکـەکەی **رەشید یاسمی (کرد و پیوستگی نژادی و تاریخی او "بەفـارسی")** و پەرتۆکـەکانی **دوکتۆرکەمال مەزهەر لەبارەی بەکر سیدقی و شۆرشی ۱۹۲۰ ی عێراق و رۆڵی شێخ مەحموود** بەعەرەبی **(۱)**، هەروەها نووسینەکانی ئیسلامیستە کوردەکان، کە گوێڕایەڵی رژێمی ئێران و شـاسـعـوودن، بەتایبـەتی لە "رایه الاسـلام" دا، لەدژی سـەمـینارەکـەی من **«المستـضـعـفـون الكرد و اخوانهم المسلمون» لە شاری (کـوێڵن ۱۹۹۳)**، بێجگە لەمـانەش رووخاندن و کـاولکردنی ئاسەوارەکـانی کـوردسـتـان، وەك **خانەسووتاو و**

**گەرماوی فاتمەخانی بابان لە سلێمانی** و، هەوڵدان بۆ رووخاندنی **سەرای سلێمانی، کە شوێنەواری بابانەکانە** و چەند ساڵێك لەمەوبەر بە هەڕشەی تۆ، کە گوتبووت: «خۆت دەسووتێنیت ئەگەر ئەو کارە کرا»، وەستێندرا، ئەمانە هەمووی نموونەی خراپەکاری و نابەرپرسیاری و ناپاکییە بەرامبەر فەرهەنگی نەتەوەی کورد و، هیچ چەپی نییە لە هەوڵدانی **داگیرکەرانی ترك و فارس و عەرەب** بۆ کۆرکردنەوەی ئاسەوارەکانی کوردستان **(هەر بۆوێنە: ژێر ئاوخستنی شاری حەسنکێف و رووخاندنی قەلأی کەرکوك)**، دیارە خۆشت ئاگات لەوە هەیە کە **لە هەولێری پێتەختی باشووری کوردستاندا، بەرۆژی نیوەڕۆ خۆشاوی "جێژنی" گۆڕینی نێوی کوردی بە عەرەبی دەخۆنەوە، وەك ئەوەی نێوی تاڤین و ئەڤین و ئاڤان و بارزان و ئاکۆ و ئاسۆ و سمکۆ نێوی کافران بن و، عەبدوڵلا و عومەر و فاتیمە و عائیشە و ئەبوبەکر و عەلی، لە ئاسمانەوە بەسەر موسڵمانانداندا کەوتبنەخوارێ و، هیچیان نێوی سەردەمی بتپەرستیی عەرەبی بیابانی ١٥ سەتە لەمەوبەر نەبووبن.** تۆش، برای بەڕێز، کە خۆت تەرخانکردووە بۆ بەربەرەکانێی ئەم جەردەیەتییەی کە بەرۆژی نیوەڕۆ لە جەستەی فەرهەنگی کورد دەکرێ و، بەتاکی تەنێ ئازایانە شانتداوەتە ژێر ئەم بارە گرانە، ماڵت ئاوا بێ و، ئاهوراوەزدا دەست بە پشتەوە بگرێ و، دەنگی منیش بخەرە سەر دەنگی خۆت.

لەلایەکی دیکەوە، برای بەڕێز، ئەز لە کردەوەی ئەمانەی نێومبردن «سەرسام نیم»، هەروەها لەوەش سەرسام نیم کە **سەلاح بەدرەدین** دووجار "سەرسامنامە" کەی عەبدولخالیقی سەرسامی چاپکردووە و، دەیەوێ بۆ جاری سێیەمیش چاپیبکاتەوە. چۆنکە ئەمانە هەموو پێویستیی بەجێهێنانی فەرمانی پێدراو دەبەن بەڕێوە و، گەلێك هەن چاوەڕوانی ئەوەن سەردەمی سەددام بگەڕێتەوە و، دەستەی «ترم ... پرم ... پف ــ ف» ببووژێتەوە ... بەلأم ئەوەی منی «سەرسام» کردووە، ئەوەیە کە کاربەدەستانی هەولێر، کە بە هۆی دەنگی جەماوەری کوردەوە هاتوونەتە سەرکار و، بەنانی کورد دەژین، نەك هەر لەم خیانەتانە بێدەنگن و بەس، بەڵکو یارمەتیی ئەم کردەوە دزێوانەش دەدەن، یان چاودەپۆشن لێی!! بۆچی سەلاح بەدرەدین لەباتی ئەوەی لە سووریاخەریکی حیزبی کۆنە زورناژەنی رژێمی دوابڕاوی سۆڤێتی خۆی

بێ، خۆی خزاندووەتە سەلاحەدین؟ چ دەکا لەوێ؟. ئێمە نامانەوێ پتر چیلکە لەمە بدەین، ئەوەش نەك لەبەر خاتری کەس، بەڵکو لەبەر خاتری ئاسایشی نەتەوەیی و بەس، ئەگەنا هەرچی لە دێزەکەی سەردەمی DDR دا ماوە، بە ئەسکوێ دەرماندەهێنا بۆی. باشە!! تۆ واز لەمە بهێنە. ئایا کاربەدەستانی هەولێر نازانن کە **فازیل عەزاوی تورانی**، چ دوژمنێکی کوردە، ئاوا وەك میوانێکی بەرێز لە هەولێر پێشوازیدەکەن لێی و، هەزاران دۆلار کە پارەی کوردی هەژارە، دەکەنە قوربانی **«مام فازیل»؟** بەڵام **زانایەکی گەورەی لە جیهاندا ناسراوی وەك پرۆفیسۆر بارام رەسووڵ کە بە پارەی خۆی دێتە هەولێر بۆ یارمەتیدانی زانستگەکانی باشوور، کەچی تەنێ رۆژنامەی "میدیا" وتووێژ دەکا لەگەڵی** و، کە پرۆفیسۆر بارام رەسووڵ لە چاکەی خوی، یارمەتیی شاندێکی زانستگەی هەولێر دەدا لە ئۆپسالا (سوێد)، کاربەدەستانی هەولێر هەر باسیشی ناکەن؟ دەزانی بۆچی؟ چۆنکە بارام رەسووڵ مرۆڤێکی نەتەوەییە و حیزبحیزبێنە ناکا. زانایەکی گەورەی دیکەی کورد **پرۆفیسۆر حەسەن حەمە عەلی کەرکووکی**، کە چەند جار ویستی لە کۆلیجەکانی بژیشکی زانستگەی کوردستان خزمەت بکا، بەڵام گوێیان نەدا پێی، چۆنکە رەخنە لە شەڕی نێوخۆیی حیزبەکان دەگرێ.

باشە!! تۆ واز لەمە بهێنە. ئایا **یەکێتی و پارتی و بزووتنەوەی ئیسلامی**، کە وا بە **ئاووتاوەوە لەسەر نزار خەزرەجی تاوانبار دەکەنەوە، نازانن نزار خەزرەجی کێیە، ئا بەو شێوە ئاورووبەرانەیە بەرگریدەکەن لێی؟ تەنانەت وەزیری نێوخۆی یەکێتی بەرێز فەرەیدوون عەبدولقادر، لەرۆژی ۱۰/۲٦ دا فەرمووی کە ئەوان (واتە یەکێتی، کە خۆیشی ئەندامی سەرکردەیەتیی یەکێتییە) لە ساڵانی ۱۹۸۳ ـــ ۱۹۸٤ ە وە پێوەندییان لە گەڵ نزار خەزرەجی بووە و، ئەم پێوەندییەش هەتا هاتنەدەرەوەی نزار خەزرەجی لە عێراق (واتە لە ساڵی ۱۹۹۹ دا) هەر بەردەوام بووە؟** ئایا کاك فەرەیدوون کە ئەم قسانەی بە تووڕەیی و لووتبەرزییەوە لە وەرامی پرسیارێکدا کردووە، کە ماڵپەڕی "کوردستان نێت" لەرۆژی ۱۰/۲٦ دا بڵاویکردووەتەوە، ئەوە نازانێ کە ئەم قسانەی وی زۆر دەکەون لەسەر خۆی و حیزبەکەی و کوردیش؟ چۆنکە تاکە داخوازینامەیەك کە بدرێ بە کاربەدەستانی دانمارك، بەسە بۆ ئەوەی

کاك فەرەیدوون وەك شایەت بانگبکرێ بۆ دادگە و، ئەوجا ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە، **ئایە یەکێتی، کە ئەوەتە بە دەربڕینی یەکێك لە سەرکردەکانی (وشهد شاهد من اهلها) نێزیکی شانزە ساڵ پێوەندیی بە نزار خەزرەجییەوە بوویێ، ئایا یەکێتی و نزار ئاگایان لە نەخشەی ئەنفال و بەهەرمهێنان و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و چارەنووسی دووسەت هەزار گیراوی کورد نەبووە؟ تۆ بڵێی سەددام شانزە ساڵ لە گوێی گادا نووستبێ و، ئاگای لەم پێوەندییە «بەردەوام» ە نەبوویێ، یان بابەتەکە جۆرێکە کە دەبێ «دێزە بە دەرخۆنە» بکرێ؟؟؟. جاران دەیانگوت «سەیرە لە کۆیە!» وادیارە ئێستە «سەیرە لە سلێمانی!»**.

بەڕاستی دوور نییە کە کێشەکە ئەگەر بکەوێتە دادگە (٢) هەر بەوەوە نەوەستێ، بەڵکو تەشەنە بکا بۆ لێکۆڵینەوە لە گەلێك شت، وەك شەڕی نێوخۆیی و پێوەندیی حیزبەکان بە دەرەوە و، جۆری ئەو پێوەندییانە و هێندێك شتی دیکە کە بێگومان لە بەرژەوەندیی حیزبەکان و کورددا نابێ.

برای بەڕێز:

ئەمانە هەموو چەند نموونەیەکی یەکجار کەمن لەو بارە نالەبارەی کە حیزبحیزبێنە خستوویەتە سەر کۆڵی نەتەوەی کورد، ئەوجا تۆ گلەیی لە من دەکەیت، کە بۆچی ئەز لە تەلەفیزیۆنە کوردییەکاندا هەڵوێستی خۆم دەرنابڕم بەرامبەر بەم شتانە؟ باشە، برای بەڕێز، لەکام سەتەلایتدا؟ کورد سێ ساتەلایتی هەیە، ئەگەرچی هەرسێکیان نێوی کوردیان پێوەیە و، بەپارەی کورد دەچن بەڕێوە، بەڵام هەریەکەیان بەدەست حیزبێکە. ڕاستە خەڵکەکە، نەك هەر لە کوردستان، بەڵکو لەگەلێك شوێنی جیهاندا لووتیان لەم حیزبحیزبێنە پڕ بووە و، بێزیان دێتەوە لێی، بەڵام ئەوەتە حیزبەکانی کوردستان بەهۆی زۆرەملیی چەکدارەکانیانەوە قسەیان بەسەر کوردی ڕەشوڕووتدا سوارە. با ئەم حیزبانە میلیشیاکانیان نەمێنێ، ئەوسا بزانین لە هەڵبژاردنێکی ئازاددا چەند دەنگیان بەردەکەوێ؟ لەهیچ کۆمەڵگەیەکی دێمۆکراتی ئەم جیهانەدا، هیچ حیزبێك میلیشیای نییە. باشە! ئەگەر ئەمانە باوەڕیان بە دێمۆکراسی هەیە، فەرموو با میلیشیاکانیان هەڵوەشێننەوە. خۆ ئەگەر ئەوە نەکەن، ئەوا هەموو تاقمێکی دیکەی کوردستان، مافی ئەوەیان دەبی، کە، ئەوانیش

میلیشیا دروستبکەن و، ڕەنگە دروستیشی بکەن و، کەسیش ناتوانێ ڕێبگرێ لێیان. هەتا میلیشیاکان نەبنە لەشکرێکی نەتەوەیی ناحیزبی، ئەوا هیچ جۆرە ڕەوایەتییەکی قانوونییان نابێ. دێمۆکراسی و ئازادی **«بانێك و دوو هەوا»** ناناسن.

کاکی بەڕێز:

ئەوەی لەسەر من و تۆ و هەموو ڕۆشنبیرانی کورد پێویستە ئەوەیە، ڕاستەخەڵکەکە والێبکەین کە بە مێشکی خۆیان بیربکەنەوە و، خۆیان بڕیاردەری چارەنووسی خۆیان بن. دیارە هیچ کەسێك بێهەڵە وکەموکوڕی نییە، بەڵام هونەر ئەوەیە مرۆڤ لەسەر هەڵەی خۆی سوورنەبێ و خۆی ڕاستبکاتەوە و، گەر هەڵەکەی زیانی بە خەڵکی دیکە گەیاندبوو، ئەوا داوای لێبوردن بکا لێیان و، زیانەکەیان قەرەبوو بکاتەوە و، جارێکی دیکە ئەو ڕێیە چەوتوچەوێلە نەگرێتە بەر.

برای بەڕێز:

لە کۆتاییی نامەکەدا ئەوە ناشارمەوە لێت کە گلەییەکانت لە لایەکەوە و، تێکۆشینی سەخت و کۆڵنەدەرانەت لەلایەکی دیکەوە، وایان لە من کرد، بە چەند وشەیەکی کێش و لەنگەردار، هەستی خۆم بەرامبەرت دەربڕم. ڕەنگە ئەوە بزانیت کە ئەز هۆنەر (شاعیر) نیم و حەز لە وشەهۆنینەوە ناکەم. لەبەر ئەوە ئەم چەند وشەیە نێونەنێ «هۆنراوە» نێوی بنێ « مۆنراوە» و ئەمەش دیارییەکە لە برای خۆتەوە بۆ تۆی بەڕێز. دیارە، دیاریی بابایەکی وەك من، دەبێ چی بێ لە «گەلاّمێو» پتر.

تەندروستی و سەرکەوتن دەخوازم بۆت و دەبێژم:

**ڕەقیب (٣)، ڕەقیبی (٤)، ڕەقیبانت (٥) بێ**

**ئاهوڕامەزدا، پشتیوانت بێ**

**خوای گەورە، کەسی، بێکەسانت بێ**

**سیمیاری (٦) مەزن نزاخوانت بێ**

**تاوسی مەلەك، پاسەوانت بێ**

**پاپەك (٧) لەدەستەی هاوبیرانت بێ**

**زانای سۆرەوەرد (٨)، لە یارانت بێ**

**سەهاکی سوڵتان بە میوانت بێ**

**لانەی سەربەرزان، ئاشیانت بێ**
**فریشتەی شادی، دەستلەملانت بێ**
**تۆیش دەبێ، سینگی فراوانت بێ**
**خزمەت بەرنامەی، گشت ژیانت بێ**
**تا ماوی، خەمی کوردستانت بێ**
**شەڕی ملهۆڕ و زۆردارانت بێ**
**شیلەی تێکۆشان، نۆشی گیانت بێ**
**سەت جەمال نەبەز، بە قوربانت بێ**

## پەراوێزەکان

**(١)** ــ بۆ زانیاریی پتر لەبارەی **بەکر سیدقی و شێخ مەحموود** و پووچکردنەوەی بۆچوونەکانی **دوکتۆر کەمال مەزهەر**، تەماشای ئەو وتارە بکە کە لەژێرنێوی **«پاشنیوەڕۆیەك لە خزمەت شای کوردستان شێخ مەحموودی نەمردا»**، لە رۆژنامەی سەکۆ» ی ژمارە ١٣ تیشرینی دووەمی ١٩٩٧ و، گۆڤاری «کۆنگرە» ژمارە ٢٠ ی جۆزەردانی ٢٠٠١ بلاْومکردووەتەوە. هەروەها وتاری **«فەقیانەکەی شێخ مەحموود بوو بە دەستەسرە»**، لە بەریەرچی وتارێکدا نووسیبووم کە لە رۆژنامەی **«پەیام»** (لەندەن) ژمارە ٣٢، رەشەمە و نەورۆزی ٢٠٠١ دا بلاْوکرابووەوە و، پڕ بوو لە بوختان بەرامبەر شێخ مەحموود. «پەیام» ئەو وتارەی منی بلاْونەکردەوە. ئەمەش نموونەیەکی دیکەیە بۆ ئەو «دێمۆکراسی» و «ئازادی» یەی کە بە زمان دەگوترێ و بەکردەوە نابینرێ. گۆڤاری **«کۆنگرە»** لە ژمارە ٢١ی گەلاوێژی ٢٠٠١، بەرامبەر ئابی ٢٠٠١ دا بلاْویکردەوە. هەروەها رۆژنامەی «سەکۆ» ش. ماڵپەڕی «کۆنگرە» لە کۆتاییی ئەم ژمارەدایە.

**(٢)** ــ پاش ئەوەی ئەم نووسینەم تەواو کرد، بیستم کە کاربەدەستانی دانمارك بڕیاریانداوە نزار خەزرەجی بدەن بە دادگە و لە هەواڵێکیشدا هاتووە کە نزار خەزرەجی ویستوویەتی لە دانمارك دەربچێ، بەلاْم کاربەدەستانی دانمارك، رێیان نەداوە و دەسبەسەر (اقامه جبریه) یانکردووە.

(٣) ـــ «رەقیب» نێوی خودێیە و، وشەکە عەرەبییە و لەکاری «راقب، یراقب» وە وەرگیراوە.

(٤) ـــ «رەقیب» وشەیەکی کوردیی سەروگوێلاك شکاوە کە بنەڕەتەکەی دەبێ «رقیـــو»، «رکیـــو» بووبێ. چونکە پێـوەندیی بە «رك» ەوە هەیە. وشـەی «رکەبەرایەتی» بەمـانای «دژایەتی» و «بەرەنگری» دێ و، لە فـارسیـدا بووە بە «رقـابت» کـە بەمـانای «منافـســە» دێ. وشـەی «رەقـیب» ی کـوردی لەبارەی ئیتمۆلۆژییەوە، پێوەندیی بە «رەقیب» ی عەرەبییەوە نییە.

(٥) ـــ «رەقیبانت» واتە دوژمنانت.

(٦) ـــ «سیمیار» ئەوکەسەیە کە زانستی «سیمیا» بزانێ. «سیمیا» بریتییە لەو شتە نهێنییانەی کە لە جیهـاندا هەن، یان ئەو شتـانەی پێچەوانەی ئەوانەن کـە مرۆڤ دەیانزانێ. «سیمیـار» نازنـێوێـکە بۆ زەرِدەشت. زەرِدەشت بە «زانـای سـیـمـیــار» نێـوی رۆیـوە، وەك لە ماریفەتی پیرشالیاری زەرِدەشتیدا هاتووە.

(٧) ـــ پاپەك، پاپەکی خوڕەمی (خوڕەمدین) ە، کە عـەرەبەکـان بەشێوەی «بابەك» (بابك) دەریدەبڕن. پاپەك شۆرشگێڕی مەزنی کورد بوو کـە دوانزە سـەتە لەمـەوبەر، باسی کـۆمـەڵگەیەکی بێـچـینی کۆمەڵایەتی دەکرد، کە ژنانیش مافیان وەك پیاوان بێ. پاپەك نێزیکەی ٢٠ ساڵ لە چیاکانی کوردستانـدا شەڕی دەسەڵاتی خەلیفەی عەرەبی کـرد، بەڵام دوایی بەهۆی ناپاکـیی یەکـێك لە سـەرکـردەکـانی لەشکرەکەیەوە، دزانە گیرا و جانەوەرانە لە لایەن خەلیفەی عەرەبەوە کوژرا.

(٨) ـــ مەبەست لە «زانای سۆرەوەرد» فەیلەسووفی کورد و رۆژهەڵات «سوهرەوردی» یە کـە خاوەنی فەلسەفەی «تیشکهاوێشتن» (الفلسفه الاشراقیه) یە. سۆرەوردی لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئەیووبییەکاندا، سەرەڕای پێداگرتنی کوڕی سەلاحەدین ئەیـووبی لەدژی کـوشـتنی سـۆرەوردی، بەفـتـوای مـەلا عـەرەبە تەنگەتیلکەمێشکپووتەکان کوژرا. پاش کوشتنی نێوی بە «شیخ المقتول» (شێخی کوژراو) دەرچوو.

**(٩) ــ مەبەست لە «سەهاکی سولتان» (سولتان سەهاک)ە، کە دامەزرێنەری ئاینی «یارسان» ە، کە بە کاکەیی و ئەهلی هەقیش نێو دەبرێن.**

سەرنج!

**ماڵپەڕی «کوردبوون» ئەمەیە: www.kurdbun.de.**

**ماڵپەڕی «کۆنگرە» (ئینگلیزی) www.knc.org.uk**

**ماڵپەڕی «کۆنگرە» (کوردی) www.kncscandinavia.com**

جەمال نەبەز

بەرلین

٢٠٠٢/١١/١٦

# ئازادیی مرۆڤ لەنێوان
# باوەڕ و زانست و فەلسەفەدا (*)

مـرۆڤ لەوکـاتەوە کـە خـۆی لەسـەر ئەم خـڕەی زەوییـە دیوەتەوە تا ئەوڕۆ، لەبیرکردنەوەیدا بەرامبەر بە بوونی خۆی و کارەساتەکانی ئەم جیهانە، سێ ڕێبازی گرتووەتەبەر، **ڕێبازی یەکەم: ڕێبازی باوەڕانە، ڕێبازی دووەم: ڕێبازی زانستانە، ڕێبازی سێیەم: ڕێبازی فەلسەفانە.**

مرۆڤ لەسەرەتای پەیدابوون و ڕووبەڕووبوونییەوە لەگەڵ دیاردە (ظاهرة)ی بوون (الوجود) و ئەو ڕووداوانەی کە لە دەوروبەریدا بەچاوی دیونی، وەك بەفر، باران، بروسکە، هەور، گرمە، نەخۆشی، لەدایکبوون، مردن ... هتد، بەدوای نهێنیی ئەوانەدا گەڕاوە و هەوڵیداوە بزانێ هۆی ئەمانە چییە و لەکوێوە دێن. وادیارە لەبەر بێدەسەڵاتیی خۆی و سنوورتەنگیی بیرکردنەوەی بەرامبەر لێکدانەوەی ئەم ڕووداوانە، پەکیکەوتووە و لە داماویدا خەیاڵی بۆ هۆکرد (عامل، سبب) ی سەراسایی (خارق العادة) چووە. بەڵام هوردەهوردە کەوتووەتە سەر ئەوەی ئەو کەرەستانەی لەدەوروپشتی خۆی دیونی، وەك: بەرد، ئاو، گڵ، درەخت، گیا و ...هتد، تاقی بکاتەوە و لە ئەنجامی ئەم تاقیکردنەوانەدا هێندەك زانیاریی دەستکەوتووە. هەر بۆوێنە: بە ئەزموونی ڕۆژانە تێگەیشتووە کە هیچ بووەیەکی ژیار بەبێ ئاو ناژی. لەبەر ئەوە لەڕۆژی گەرمادا درەختی ئاو داوە. کە بروسکەیەك لەڕۆژێکی هەور و هەڵادا لە شوێنێکی داوە و، ئەو شوێنە گڕیتێبەربووە و گڕەکە گەرم بووە و ئەو شتەی سووتاندووە، ئاگری ناسیوە وەك هۆیەك بۆ گەرم کردنەوە و سووتاندن. لەم زانیارییە سەرەتاییانە سووتی وەرگرتووە بۆ دۆزینەوەی شتی دیکە. بۆوێنە کە دوو شتی لەیەکخستووە، هەستیکردووە کە گەرمایی دروستدەبێ و هەتا ئەو دووشتە پتر و توندتر لەیەك بخرێن، گەرمایی پتر دەبێ. لەمەوە توانیوێتی هۆی گەرمیی بدۆزێتەوە. بەکورتی: لە ئەنجامی زنجیرەیەك ئەزموونی ڕۆژانەوە، هێندەك زانیاریی دەستکەوتووە کە بۆ دۆزینەوەی شتی نوێ بەکاریهێناون و، لەمەوە سەرەتای ئەو بابەتە دروستبووە کە پێیدەگوترێ **«زانست»**.

ئەم زانستەی کە مرۆڤ پێیگەیوە، هێندەك تایبەتکاری هەیە:

**یەکەم: بابەتەکانی زانست ـــ شێوای پێوانن، بەرزی، درێژیی، پانایی، قەوارە، قورسایی، پلەی گەرمی، بارست.**

**دووەم: زانست بەرووبوی خەیالی رووت نییە، بەڵکو بەرەنجامی زنجیرەیەك ئەزموون و تاقیکردنەوەیە لە شوێن و کاتی تایبەتیدا.**

**سێیەم: بابەتی زانستانە، شێوای بەراوردکردنە. واتە ئەو ئەنجامەی لە ئەزموونێکەوە دەستدەکەوێ، دەتوانرێ لە گەڵ ئەو ئەنجامەی لە ئەزموونێکی دیکەوە دەستکەوتووە، بەراوردبکرێ. ئەوجا ئەگەر ئەنجامێك لەریزە ئەزموونێکدا، وەکیەك دەرچوو، ئەوا دەبێتە ئەوەی کە پێی دەگوترێ «تیۆری زانستانە».**

**چوارەم: زانست لە بابەتەوە دەستپێدەکا و لە بابەتکە دەکۆڵێتەوە، نەك لەو شتانەی لە دەرەوەی بابەتەکەن، مەگەر ئەوەی پێوەندییان بەوبابەتەوە هەبێ.**

**پێنجەم: زانست رێژەیی (نسبی) یە. واتە، زانستێك نییە کە هەتاهەتا لە هەموو شوێن و کاتێکدا راست و گونجاو دەربچێ.**

بەکورتی: زانست شێوای دۆخگۆڕی (تطور)ە. تەنانەت، زانستێکی وەك ماتماتیك کە بە «نەگۆڕ» و «نەتەکێن» (مصون، غیر قابل الشك و النقد) دادەنرێ، لە گەڵێك رووەوە، شێوای رەخنەلێگرتنە. بۆ روونکردنەوەی ئەمەش دەبێ بزانین ماتماتیك چییە. ماتماتیك بریتییە لە لێکۆڵینەوەی چەندایەتییە ژمارەییەکان (الکمیات العددیة) و چەندایەتییە ڤالأییەکان (الکمیات الفراغیة) و دۆزینەوەی پێوەندیی لەنێوانیاندا. هەروەها گشتیکردن (تعمیم) ی ئەم پێوەندییانە. ئەوجا کۆڵینەوە لەم چەندایەتییانە، پێویستی بەوەیە کە لە پێشەوە بەهوردی تاریف بکرێن، ئەوەش لەسەر بنچینەی ئەو تایبەتکارانەی کە هەیانە. دیارە ئەم تایبەتکارانە بە یارمەتیی هێندەك زاگۆن (قانون)ی ژیربێژی (منطق) دەخرێنە کار، بۆ گەیشتنە ئەنجامی ئەو پێوەندییانەی نێوان چەندایەتییەکان خۆیان و، ئەو پێوەندییانەی کە لەوەبەر لە ئەنجامی ئەمجۆرە لێکۆڵینەوانەوە دەستکەوتوون. جا لەبەر ئەوەی ماتماتیك پەنا دەباتە بەر تاریف و ژیربێژی و، لەبەر ئەوەی ژیربێژی تەنێ بەدوای وێنەی "بیر" دا دەگەڕێ، دوور لە ماددەی بیرە، تاریفیش شێوای گۆڕانە، دیارە زاگۆنەکانی ماتماتیکیش ئەو جۆرە نەگۆڕەنین کە بۆ هەموو کات و

جێگیرو نەگۆڕیەك بن. هەربۆ نموونەیەكی سادەی ئەم قسانە، سالأنێك لەمەوبەر زانایەكی ماتماتیك لەبەردەم ژمارەیەك لە ماتماتیكوانەكانی ئەوروپادا ئیسپاتی كرد كە (٢٢/٧) كە بەڕێژەی نەگۆڕ (النسبة الثابتة) نێودەبرێ، ڕێژەیەكی نەگۆڕ نییە.

زانای بەنێوبانگی ئینگلیز، **ئایزاك نیـوتن Isak Newton**( ١٦٤٣ ـ ١٧٢٧) بێجگە لەو ئەزموونەی كە لەسەر ڕۆناكیی ئاسایی كردی و توانی بەهۆی پوازك Prism ەوە بیكاتە چەند شەبەنگێكی جیاواز و دوایی ئەم شەبەنگانە كۆبكاتەوە و بیانكاتە یەك، سێ جۆرە دووری خستەبەرچاو؟! درێژی و پانایی و بەرزی. بەڵام **زانای جوولەكە ئەلبەرت ئاینشتاین** (١٨٧٩ ـ ١٩٥٥) كە ئەویش هەروەك نیوتن خەریكی ئەزموونی ڕۆناكی بوو، بەتوێژینەوەی ئەلیكتێرۆ ـ ڕۆناكی گەیشتە ئەو ئەنجامەی كە ڕۆناكی بریتییە لە چەندایەتیی گچكە كە بە فۆتۆن نێودەبرێن. ئەم فۆتۆنانە بەجارێك دەرناپەڕن، بەڵكو بەچەند جار. لەمڕووەوە توانی دیاردەی ئەلیكتێرۆ ـ ڕۆناكی بە تیۆری چەندایەتی لێكبداتەوە. ئاینشتاین توانی لەڕێگەی لێكۆڵینەوەی پێوەندیی نێوان وزە (طاقة) و بارست ( كتلة) ەوە بگاتە تیۆری ڕێژەیی تایبەتی. ئەوجا بەیارمەتی ماتماتیك توانی تیۆری ڕێژەیی گشتی دابهێنێ. كە لەمەیاندا، بە پێچەوانەی نیوتنەوە، لەپێوەندیی هێزی ڕاكێشان و چەمانەوەی ڤالأیی (الانحنا الفراغی) دوورییەكی چوارەمی پێدا كە ئەمەش سەردەم (زەمان) بوو. بەكورتی تیۆری ئاینشتاین ڕاستكردنەوەی تیۆری نیوتن بوو. لەم سەتەیەشدا **فیزیكزان و فەیلەسووفی گەورەی كورد محەمەد لەیلا**، پاش خەریكبوونی سالأنی ساڵ بەبابەتی بارستایی Massismus یەوە تیۆرییەكی داهێناوە كە كەموكورتی تیۆرییەكانی **نیوتن و ئاینشتاین** دەخاتەڕوو **(١)**.

ئەمانەی سەرەوە چەند نموونەیەك بوون بۆ ئەوەی كە ماتماتیك و فیزیكی ماتماتیكانەش، وەك زانستەكانی دیكە شێوای گۆڕان و دۆخگۆڕینن، ئەگەرچی بەقەوارەیەكی كەمتر لەوانی دی.

مرۆڤ هەر لە كۆنەوە هەستی بەوە كردووە كە هەموو شتێك بەزانست لێكنادرێتەوە بۆی. چۆنكە هەتا ئێستە زانست نەگەیشتووەتە ئەوەی ماك و بنچینەی بوون (وجود) بەتەواوی لێكبداتەوە. لەبەر ئەوە بۆ لێكدانەوەی دیاردەی بوون، پەنای

بردووەتە بەر خەیاڵ و، هێزێکی سەراسایی (خارق العادە) ی کردووەتە رامانی خۆی، کە ئەمەیان بەپێچەوانەی کەرەستەی زانستەوە، نە دەبینرێ و، نە دەپێورێ و نە تاقیدەکرێتەوە و، نە دەتوانرێ بوون، یان نەبوونی ئیسپات بکرێ. بەمەش دەگوترێ **«باوەڕ»**.

وشەی **«باوەڕ»** کە بە **کوردیی «پەهلەوی» Vaver (ڤاڤەر)** ە و بەمانای «دڵنیابوون» و «پەسندکردنی قسەی کەسێک» دێ، لە دووبەش پێکهاتووە. **«با» و «وەر». «با» بەکوردی «پەهلەوی» Epak (ئەپاک)** ە و بەمانای **«خودێ» و «خاوەنی شتێک»** دێ (۲). واتە، باوەڕ پێوەندییەکە لەنێوان "مرۆڤ و خودێ" دا بۆ لێکدانەوەی بنەمای بوون. کەسێک کە باوەڕی بە شتێک هەبێ، سا ئەو شتە دیاربێ، یان نادیاربێ، خۆشییەک دەکەوێتە گیانی. چۆنکە هەموو خۆشییەکی گیانی لە دڵنیاییەوە سەرهەڵدەدا و هەموو ناخۆشییەکیشی لە دڵەڕاوکە و ترس و نادڵنیاییەوەیە. شتێکی ڕێکەوت نییە کە وشەی «ایمان» ی عەرەبی مانای «دڵنیابوون لەڕێی خۆبەستنەوە بە باوەڕێکەوەیە».

مرۆڤ لە ڕێگەی باوەڕەوە جۆرە هۆکردێکی دۆزیوەتەوە بۆ بنەمای بوونی خۆی و خاوەنی بوون (واتە: خودێ) کە لە ڕێی تاقیکردنەوەی زانستەوە بۆینەکراوە.

دەبێ ئەوە بزانین کە باوەڕ لە گەڵ پڕوپووچ (خرافات) دا، دووشتی جیاوازن. چۆنکە ئیسپاتکردنی ناڕاستیی (پڕوپووچ) لەڕێی زانستەوە هاسانە. بۆنموونە پاش ئەوەی تێلسکۆپ دروستکرا، توانرا بانگەشەی کلێسەی دیانی بەدرۆ بخرێتەوە کە گوایە «زەوی پانە و خۆر بەدەوری زەویدا دەخولێتەوە». لەگەڵ ئەوەشدا زۆرکەس هەن باوەڕیان بە پڕوپووچە. لەنێو کوردەواریشدا باوەڕ بە پڕوپووچ زۆرە، هەر بۆنموونە یەکێک لووتی خورا، دەبێژن ئەوە «شەڕێک دەبێ بە تووشییەوە»، یان بەری دەستی خورا، دەبێژن «پارەی تێدەچێ»..!.. کەڵەشێر دەمەو ئێوارە بخوێنێ سەریدەبڕن، دەبێژن «سەری خاوەنەکەی دەخوا» !!!

گرنگترینی شتێک کە لەسەر بنچینەی باوەڕ دامەزراوە ئاینە. بناخەی ئاین لەسەر بوونی دۆگمامێتۆلۆژیا و بوونی خودێ دامەزراوە کە لە هۆکرد و هێنەربوونی مرۆڤ و جیهانە. **بەڵام وێنەی خودێ خۆی و پێوەندیی لە گەڵ مرۆڤدا، لە رامانە ئاینییەکاندا وەکیەک نییە. هەر بۆوێنە: خودێ بەپێی ئیزدناسیی (الهیات) ی**

**موسلمانان «نەلەکەس بووە و، نەکەسی لێدەبێ» (لم یلد و لم یولد)، بەلاّم بەپێی ئیزدناسیی دیانەکان حەزرەتی عیسا «کوڕی خودێ»یە. بێجگە لەمەش، هەر ئاینە بۆخۆی جۆرە دەستوور و نەرێت و ڕێی پەرستن و ڕەوا و ناڕەوا و ڕێەنەند (ممنوع) و ڕێنەبەند (حەلال)ی هەیە کە لەهی ئەوی دیکە ناچێ و، هەمووشیان ئەمانە دەبەنەوە سەر «ویستەی خودێ»**. جا لەبەر ئەوەی ئەم ناکۆکییانە شێوای لابردن و گۆڕین نین، دیارە بوونی باوەڕێکی یەکتا، شتێکە لە نەبوانە. لە پاڵ ئەوەشدا کەسانێکی زۆر هەن کە باوەڕیان بەهیچ جۆرە ئاینێك نییە.خاوەنباوەڕەکان ئەم بێباوەڕانە بە "کافر" و "خودێنەناس" و "گلاو" دەدەنە قەلەم و، هێندێك جار شەڕ و هەرا و بەیەکدادان و خوێنڕێژی لێیەیدا دەبێ.

ئاین وەك زانست ڕێژەیی نییە، بەپێی کات و شوێن ناگۆڕێ. وەك زانست شێوای تاقیکردنەوە و دەمەتەقێ لەسەرکردن نییە. فەرمانێکە و لە خودێ وە هاتووە و دەبێ بەو جۆرەی لەو ئاینەدا هاتووە جێبەجێ بکرێ. ئاین لەمڕووەوە هەرچەندە جۆرە پەروەردەیەکی ڕەوشتانە (اخلاقی) دێنێتە پێشەوە، بەلاّم ناتوانێ ببێتە هۆی گرێدانی مرۆڤ بەیەکەوە. لەبەر ئەوە باوەڕ وەك دۆزێکی کەسی (مسئلة شخصیة) دەمێنێتەوە، کە دەبێ بۆ ڕێزلێنان لە هەلگرانی، ڕێز بنرێ لێی. بەلاّم ناتوانێ بێتە دەستوورێکی گشتی بۆ تەواوی کۆمەلگە، چۆنکە کۆمەلگە ئەوانەش دەگرێتەوە کە باوەڕیان جیاوازە، یان هیچ جۆرە باوەڕێکیان هەلنەگرتووە. جا لەبەر ئەوەی وەك گوتمان ــ باوەڕ دەمەتەقێ ناکرێ لەسەری و پێویستی بە ئیسپاتکردن نییە، دیارە یەکێك کە لە دلنیاییەوە باوەڕێکی هەلگرتبوو، هەرچەندێك بەلای تۆوە ناڕاست بێ، ناتوانیت بلێیت «درۆ دەکا». چۆنکە درۆ بریتییە لە گێڕانەوەی بابەتێك، یان بە هەلە، یان بە ناتەواوی و بەوپەڕی هۆشیارییەوە. لێرەدا دەمەوێ چیرۆکێك بۆنموونە بخەمە بەرچاو:

جارێکیان لەشاری **گراتس Gratz**(نەمسا) سەمینارێکم گرتبوو بەبانگێشتی زانستگەی ئەوێ و گەلێك کورد و نەمسەیی و خەلکی دی تێیدا بەشداربوون. لەو سەمینارەدا باسی مێتۆلۆژیای کوردم کرد و لەوبارەیەوە **مێتۆلۆژیای ئێزیدییەکان و چیای جودی**. کە سەمینارەکە تەواو بوو و، مالاّوایيم کرد، ویستم بڕۆم، کوردێکی خەلکی باکوور، کە گوتی دەسالێکە کارکەرە، گوتی حەز دەکەم هێندەك قسە بکەم

لەگەڵت، گوتم، بەراستی کاتم زۆر کەمە و دەبێ دەستبەجێ بچم بۆ وێستگەی شەمەندەفەر، فەرموو بەڕێوە قسە بکەین. گوتی ئەز بە ئۆتۆمۆبیل دەتبەم بۆ وێستگەی شەمەندەفەر. کە سواری ئۆتۆمۆبیل بووین، گوتی «زۆر پێم خۆش بوو کە باسی چیای جودیت کرد، بەڵام چیرۆکەکە جۆرێکی دیکەیە. «خودێ خۆی قاچێکی لەسەر چیای جودی داناوە و قاچەکەی دیکەشی بە هەموو ئەم گەردوونەدا دەسوورێنێتەوە و، بەو جۆرە سەرنجی جیهان دەدا. هەر کەسێك خراپەیەك بکا بەردێکی تێدەگرێ». منیش بزەیەك گرتمی و گوتم «باشە بەردەکە گەورەیە، یان گچکەیە؟» گوتی: «ئەوە بەپێی گوناهە. ئەوی گوناهی گەورەبێ، بەردێکی گەورەی تێدەگرێ و، ئەوی گوناهی گچکە بێ، بەردێکی گچکەی تێدەگرێ. هی وا هەیە کوێر دەبێ، هی وا هەیە، شوێنێکی دەشکێ، هی وا هەیە دەمرێ، هی وا هەیە هەر ئازاری پێدەگا». گوتم: «باشە ئەم هەموو بەردە چۆن کۆدەکرێتەوە؟». گوتی: «ئەوە هاسانە. دە دوانزە فریشتەی هەن، بێوچان بە (لۆری گەورە) "ترێلی" بەرد کۆدەکەنەوە و دەیهێنن بۆی». کە ئەم قسانەی دەکرد، جۆشی سەندبوو، بە هەردوو دەست لە جووڵەدا بوو. گوتم: «دەست لە سۆکانی ئۆتۆمۆبیلەکە بەر نەدە، ئەگەنا خۆمان دەدەین بەلایەکدا». گوتی: «نەترسە، خودێ بامەیە». پاش ئەم وانەیە، پێکەنینێکی خەست گرتبوومی و، شەرمیشم بەخۆم دەهات، بەتایبەتی چونکە ئەو زۆر پێناخۆش بوو. گوتی: «پێ نەکەنە. ئەز تۆم خۆش دەوێ، چونکە تۆ خزمەتی گەلەکەمان دەکەیت، بەڵام خۆت کافر نەکە». لەم قسانەدا بووین گەیشتینە وێستگەی شەمەندەفەر. کە دەرکەی تەنیشتم کردەوە بۆ دابەزین، سەرم بەر لاشیپانی سەرەوەی چوارچێوەی دەرگەکە کەوت و زۆر ئێشا. برادەرەکە دەستبەجێ گوتی: «ئەوە بەردەکە بوو». تاوێك پاش ئەمە، ئۆتۆمۆبیلێك زۆر بەخێرایی بە تەنیشتمدا تێپەڕی و چەند سانتیمەترێك زێتر لێم نێزیك بوایە خۆی دەدا لێم. برادەرەکە گوتی: «تۆبە بکە، ئەگەنا بەردێکی دیکەت تێدەگرێ».

جا ئێستە ئێمە ناتوانین بڵێین ئەو برادەرە درۆ دەکا. درۆ ناکا. چونکە باوەڕی بەو شتە هەیە. هیچ خاوەن باوەڕێك درۆناکا. درۆ ئەمەیە بابەتێك بەو پەڕی هۆشیارییەوە بە هەڵە، یان بە ناتەواوی بگێڕدرێتەوە. لێرەدا باس باسی درۆ نییە، بەڵکو ئەوەیە، ئایە ئەو شتە خۆی لەخۆیدا بە پێی پێوانەی زانستانە، راستە یان نا.

ئەز بۆخۆم ناتوانم باوەڕ بە خودێیەك بكەم كە بەردەفركانیێ بكا. ئەگەر یەكێكی دیكە باوەڕ بەوە دەكا، ئەوا ئازادە. بەلاّم ئەوەی لێرەدا شایانی سەرنجدانە ئەوەیە، كاتێك سەری من بەر لاشیپانی سەرەوەی دەرگەی ئۆتۆمۆبیلەكە كەوت، بەلای منەوە هۆی بێئاگاییی خۆم بوو. بەلاّم بەلای ئەو برادەرەوە، ئەوە ئەو بەردە بوو كە خودێ گرتوویەتی لە من لە چیای جودییەوە بەرەو نەمسا. فڕكەی ئۆتۆمۆبیلەكە بە تەنیشتمدا، بەلای منەوە، گوێنەدانی هاژۆری ئۆتۆمۆبیلەكە و پەلەكردنی بوو، بەلاّم بەلای ئەو برادەرەوە، وریاكردنەوەیەك بوو لەلایەن خودێ وە و، ئەگەر، چیدی پێبكەنم، ئەوا بەردێكی دیكەی وا دەگرێتە من، كە كۆتاییی ژیانمی لەگەلّ بێ. هەردوو رووداوەكە بەلای منەوە لە بێئاگاییەوە روویاندا و، بۆ ئەو برادەرەش ئیسپاتی تەواو بوون بۆ باوەڕەكەی خۆی. لەگەلّ ئەوەشدا ئەگەر هەر لەو سنوورەدا بوەستایە هیچ زیانێكی نەدەبوو. بەلاّم كە لەو سنوورەوە دەرچوو، زیانی گەورەی هەیە، چۆنكە ئەو برادەرە باوەڕنەكردنی من بە باوەڕەكەی وی، بە سەربەستیی باوەڕ دانانیێ وەك من، بەلّكو بە «كفر»ی دادەنیێ و پێكەنینەكەی من، بە بێ تۆرەیی (بێ ئەدەبی) ناداتە قەلّەم، بەلّكو بە «كافرێتی» دادەنیێ. ترسەكە ئالێرەدایە و لێرەوە دەستپێدەكا. چۆنكە ئەگەر تۆ باوەڕت نەهێنا بەباوەڕی كەسێك كە سنووری بیركردنەوەی هێندە تەسك بوو، تۆی بە «كافر» دایە قەلّەم، دیارە تۆ ناتوانیت چاوەڕوانی رێزی ئازادیی خۆت بیت لەو كەسە.

**جا ئێمە ئێستە ئەگەر ئازادی بكەینە مافێكی بنچینەییی مرۆڤ، دەبێ بێژین كە هەموو خاوەن باوەڕێك - وەك مرۆڤ - ئازادە لە جۆری رامانی خۆی و دەبڕینی ئەو رامانە، بەلاّم هەموو ئەوانەی كە خاوەن باوەڕ نین، ئەوانیش هەر ئازادن، بە مەرجێك دەربڕینی باوەڕ، بەشێوەیەكی ئاشتیخوازانە و بێ زۆر و زەنگ بێ. دیارە لە كۆمەلّگەیەكی سۆسیالیستیدا كە ئازادی و یەكسانیی مرۆڤی كردبێتە بنەمای خۆی، هیچ كەسێك مافی ئەوەی نییە بەزۆر باوەڕی خۆی بەسەر كەسێكی دیكەدا بسەپێنیێ. واتە، كۆمەلّگە دەبێ لەڕووی باوەڕەوە پلورالیستی بێ. جا لەبەر ئەوەی «دەولّەت» دەبێ دووریبە ژیاریبەكانی لەگەلّ دووریبە ژیاریبەكانی كۆمەلّگەدا یەكسان بن، دیارە دەولّەتیش دەبێ پلورالیستی بێ، واتە نابێ ببێتە دەزگەی دەسەلاّتی هیچ**

باوەڕ و هیچ ئایینێک. بێگومان لەمجۆرە دەوڵەتەدا، هەموو جۆرە ئایینێک و رامانێک رێزی خۆی دەبێ، بەڵام ناکرێتە دەستووری کۆمەڵگە.

بێجگە لە باوەڕ و زانست، مرۆڤ هەر لە کۆنەوە بۆ لێکدانەوەی بنەمای بوون، رێیەکی دیکەشی گرتووەتە بەر، کە ئەمەش فەلسەفەیە.

**فەلسەفە بریتییە لە توێژین و هوردکردنەوەی سەرەتا بنچینەییەکانی بوون (وجود) و هزر (فکر) بەشێوەیەکی تایبەتی، بۆ گەیشتنە «راستی».** بۆ ئەمەش فەلسەفە پەنا دەباتە بەر ژیربێژیی هۆش (منطق العقل). لەبەر ئەوە فەلسەفە لە بەڵگەنەویستەکان (مسلمات، بدیهیات) ەوە دەستپێناکا، ئەوجا ئەو بەڵگەنەویستانە، نەخۆیا (غیبی) بن، یان دیار بن، ئەوە بەلای فەلسەفەوە وەکیەکە. لێرەدا فەلسەفە خۆی لە ئاین جیادەکاتەوە. چۆنکە بنچینەی ئاین باوەڕە. بەڵام فەلسەفە باوەڕ ناکاتە بنچینەیەک بۆ ئەو شتەی بە «راستی» دەدرێتە قەڵەم. فەلسەفە خۆشی لە زانست جیادەکاتەوە، چۆنکە زانست لە «مادده» وە دەستپێدەکا. بۆوێنە فیزیک لە خۆڕسک (طبیعة) ەوە دەستپێدەکا و بە پەنابردنە بەر ماتماتیک دەیەوێ دیاردەکانی خۆڕسک لێکبداتەوە. بەڵام فەلسەفە دەیەوێ ئەم سەرەتایانەی خۆڕسک شیبکاتەوە و بیانباتەوە سەرماکی بنچینەییان. فەلسەفە سەتان و بگرە پتر، قوتابخانە و رێبازی جیاجیای هەیە. **کۆنترین فەلسەفە فەلسەفەی رۆژهەڵاتییە کە لە زەردەشت و کۆنفۆسیۆس و بووداوە دەستپێکردووە.** ئەوجا فەلسەفەی **یۆنان** دێ کە **ئەرستۆ و سۆکرات و پلاتۆ (ئەفلاتوون) و دیۆگین** نوێنەرانی گەورەی ئەم قوتابخانەیەن. لە سەتەی نوێشدا **دێکارت و کانت و فۆیەرباخ و هیگل و لایبنیز و رەسل** سوارچاکانی فەلسەفەی ئەورووپایین.

**فەلسەفە و فەیلەسووفەکان بەگشتی، دەکرێن بە سێ بەشەوە!**

**١- ئیدیالیستەکان کە بنچینەی هەموو شتێک دەبەنەوە سەر هۆش (عقل).**

**٢- مەتریالیستەکان کە بنچینەی هەموو شتێک دەبەنەوە سەر مەنی (مادده).**

**٣- دووەکەکان کە هەموو شتێک دەبەنەوە سەر هۆش و مەنی پێکەوە.**

دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە هەر لە کۆنەوە و بەهۆی **زانستگەی «حەڕان» ی کوردستانەوە،** جۆرە فەلسەفەیەک لە رۆژهەڵاتدا هاتە کایەوە کە بە فەلسەفەی

**«نەزانینی راستیی پەتی»** نێویڕۆی کە عەرەبەکان پێیان دەگوت: «لاادرية».
بەپێی ئەم فەلسەفەیە «هۆش»ی مرۆڤ ناتوانێ سنووری ئەزموونی خۆیی خاوەنەکەی ببەزێنێ. لەبەر ئەوە ناتوانرێ هیچ شتێك ئیسپاتبکرێ کە لە دەرەوەی ئەو سنورەدا بێ». هێندەك کەس هەن کە ئەمە بە گومانکردن لە بوونی خودێ و ژیانەوەی مرۆڤ پاش مردن، لێکدەدەنەوە. بەهەر جۆر، لەم سەتانەی دواییدا لە ئەوروپا چەند فەیلەسوفێك هاتنەکایە کە سەربە قوتابخانەی «نەزانینی راستیی پەتی» بوون و، لەوەوە لیبەرالیزم هاتە کایە. یەکێك لەوانە فەیلەسووفی ئەڵمانی فرە بەنێوبانگ **ئیمانۆئێل کانت Emanuel Kant (١٧٢٤ ــ ١٨٠٤)** بوو، کە هەوڵیدا هۆش و هەست (عقل و حس) پێکەوە ببەستێ. **کانت دەیگوت «ئەو شتانەی هۆش سەر دەردەکا لێیان، پێویستییان بە ئەزموونی هستە، ئەگەنا بەبێ ئەزموونی هست، هەروەك پەیکەری بێگیان دەمێنێتەوە».**

**کانت** دەبێژێ: «چۆنکە ئەو تاقیکردنەوانەی ئێمە هەمانە لەبارەی ئەو شتانەوە کە لە دەرەوەن، هەر تەنێ ئەو رووداوانە (ظاهرة) دەگرێتەوە کە دەتوانین بە هەستی خۆمان پێ ببەستین پێیان و، ئێمە لە جیهاندا بە دەزگەی هۆشی خۆمان، تەنێ دەتوانین لەو رووداوانە بگەین. بەلاّم ئەوەی لەپشت ئەو رووداوانەوەن بەهیچ جۆرێ ناتوانین بەهۆشی پەتی (العقل المجرد) بزانین چین».

کانت دەبێژێ: گەڕان بەدوای راستینەکان (حقائق) دا بە هۆی هۆشەوە، مرۆڤ دەخاتە دۆخی ناتەبایی (تناقض) ەوە. بۆوێنە: گەڕان بەدوای کات و جێ دا، دەمانباتەوە سەر ئەوەی کە هەردووکیان کۆتاییان دێ و، کۆتاییشیان نایێ. گەڕان بەدوای ڤین (ارادة) ی مرۆڤدا دەگاتە ئەوەی مرۆڤ ڤینی خۆی بەدەست خۆیەتی (مخیر) و هاوکات بەدەست خۆی نییە (مسیر) ە. گەڕان بەدوای خودێ دا دەگاتە ئەوەی هەیەو نیشە».

نوێنەرێکی دی ئەم قوتابخانەیە **فەیلەسووفی فەرەنسی ئۆگۆست کۆنت Auguste Conte** (١٧٩٨ ــ ١٨٠٧) بوو کە بە داهێنەری **«فەلسەفەی چۆنێتی»** دادەنرێ.

کۆنت، هەوڵدەدا بۆ چاککردنی کۆمەڵگە بەپێی پەنابردنە بەر ئەو ئەنجامەی کە زانستە خۆڕسکییە شارستانییەکان پێیگەیشتوون. کۆنت دژی میتافیزیك بوو.

میتافیزیك بەدوای بوونی پەتی (الوجود المطلق) دا دەگەڕێ، واتە بوون بەتەنێ، بێ هیچ تایبەتکارێك، تایبەتکاری بوونی خۆی نەبێ. بەپێی کۆنت بیری مرۆڤ لە پرۆسەی دۆخگۆڕیدا بە سێ پلە تێپەڕ بووە:

**١ ــ پلەی ئێزدباوەڕی (لاهوتی) کە هەموو شتێك بەبوونی هێزێکی سەراسا (خارق العادة) لێکدەداتەوە.**

**٢ ــ پلەی میتافیزیکی کە هەموو شتێك بە بنچینەیەکی تاك و تەنێ لێکدەداتەوە.**

**٣ ــ پلەی چۆنێتی کە هەموو وادانانێك (فرضیة) لە ئەنجامی تەماشاکردن و ئەزموونەوە دیاریدەکا، نەك بە خەیاڵ.**

فەیلەسووفێکی دیکەی ئەم مەیدانە، **فەیلەسووفی ئینگلیز هێربەرت سپێنسەر Herbert Spencer** (١٨٢٠ ــ ١٩٠٣) بوو. بەپێی سپێنسەر فەلسەفە بریتییە لەوەی تۆ لە گۆشەنیگای دۆخگۆڕییەوە (تطور) بڕوانیتە زانیاری (معرفة). بەپێی سپێنسەر ئەوەی کە دەتوانرێ بناسرێ، ئەوە هەر ئەو شتەیەکە دەتوانرێ بەراورد بکرێ بە شتی دیکە. جا لەبەر ئەوەی پەتی (مطلق) بە هیچ جۆرێك شێوای بەراوردکردن نییە، لەگەڵ خۆی نەبێ، دیارە بە هیچ جۆرێك نازانرێ چییە. کە واتە سنووری زانیاریی مرۆڤ، تەنێ ئەو دیاردانەیە کە روو دەدەن و پێوەندییەکانی نێوانیانە.

شایانی باسە کە سپێنسەر ماوەیەکی کورت پێش ئەوەی کۆچیدوایی بکا، چاوی **بە فەیلەسووف و تێکۆشەری کورد شێخ محەمەد عەبدو (١٨٢٥ ــ ١٩٠٥) کەتبوو، کاتێ کە شێخ لە ئەورووپا دەربەدەر بوو. شێخ بیرکەرەوەیەکی مەزنی رۆژهەلأت بوو، داوای چاککردنی باری کۆمەڵگە و مافی گەلان و هاوئاهەنگکردنی زانست و ئاینی دەکرد.**

فەلسەفە هەرچەندە بەدوای بنکەبنەڕەتییەکانی «بوون» دا دەگەڕێ و دەیەوێ لەو رێیەوە بگاتە «راستی»، بەلأم لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێشێ، ئایا «راستی» چییە؟ ئایا «راستی پەتی» هەیە؟ ئەگەر هەیە بەچی و چۆن دەتوانین پێیبگەین؟. قسە لەسەر ئەوە نییە کە فەلسەفە بە یارمەتیی ژیربێژی و کوور (قووڵ) خوێندنەوە، دەیەوێ بگاتە «راستی». بەلأم ئەوەی کە ئەو پرۆسەیە دەبا بەڕێوە مێشکی مرۆڤە. مێشکی مرۆڤ وەك فەیلەسووفەکانی بەرەی «نەزانینی راستی پەتی» دەبێژن، تەنێ

ڕووەدەر (ظواهر) ی شت دەبینێ، نەك ئەو شتانەی لە نێوەوەن. چۆنکە مێشکی مرۆڤ ناتوانێ دیوی نێوەوەی ئەو شتانە ببینێ. بێجگە لەمەش فەلسەفەیەکی یەکگرتوو نییە، بەڵکو سەتان و پتر قوتابخانەی فەلسەفەیی هەیە. هەر لەبەر ئەوەیە مرۆڤ، لە لایەکەوە، لەڕێی فەلسەفەوە

گەیشتووەتە گەلێك شتی بەکەڵك کە خزمەتی مرۆڤیان کردووە، لەلایەکی دیکەوە هەر لەڕێی فەلسەفەوە گەلێك ئیدیۆلۆژیای واش هاتوونە پێشەوە کە دژی ئازادیی مرۆڤ بوون. بەپێی **فەلسەفەی کۆنی یۆنان**، کۆمەڵگە بەچەند چینێك بەشکرابوو، یەکێك لەوانە «ڕاستە خەڵك» بوون کە هیچ مافێکیان نەبوو، نۆکەریکردن نەبێ. ئەو دەستوورە دەیگوت: «خواستی خۆڕسك (طبیعت) ە کە **بارباروکان** بەندەی یۆنانەکانن». نموونەی دی **فەلسەفەی «هیگل» Hegel**ی (١٧٧٠ ــ ١٨٣٠) ئەڵمانییە کە لەوەوە دووڕێبازی **«مارکسیێتی» و «نازیێتی»** لە دایکبوون، کە لە **سۆڤیێت و چین و ئەڵمانیا و ئەلبانیا** خرانە کار و ئەوپەڕی دوژمنایەتییان بەرامبەر ئازادیی مرۆڤ لێدەرکەوت.

بەکورتی، ئازادیی مرۆڤ ناتوانێ ڕەوایەتیی خۆی هەموو کاتێك لە فەلسەفەوە وەربگرێ. لەبەر ئەوە، هەر زانست دەمێنێ کە ئازادی بتوانێ بیکاتە پاڵپشتی خۆی. چۆنکە زانست لە بابەتەوە دەردەچێ و لایەنگری بابەتە. بابەتەکە لێرەدا مرۆڤە کە ئازادی بنچینەی هەموو مافەکانێتی.

— — —

* ــ ئەم وتارە لەنێوەڕاستی هەشتاکاندا نووسراوە وەك بەشێکی بەرگی دووەمی **«هێندێك لە کێشە بنەڕەتییەکانی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم»**، کە بەرگی یەکەمی لە سوێد لە ١٩٨٥ دا لە چاپدرا و، لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠١ دا چاپی دوەمی ئەم بەرگی یەکەمە لە هەولێر لەلایەن ڕۆژنامەی «میدیا» وە دەرچوو.

**(١)** ــ گەلێك گوند و باژێری کوردستان هەن کە بە «با» دەستپێدەکەن وەك **«بامەڕنی»، «باپشتیان»، «باقووبە»، «بانە»، بالیسان»، «بایەوا»، «باینجان»** و ... هتد.

(٢) ــ **محەمەد لەیلا**، وەك لەنێوەكەی دیارە، بەنێوی دایكییەوە «لەیلا» نێونراوە، وەك گەلێكماڵباتی كورد كە نێوی دایكیان هەڵدەگرن، نەك نێوی باوكیان. محەمەد لە تاخی كوردان (حی الاكراد لە دیمەشق) لە دایكبووە و لەوێ چووەتە قوتابخانە و لەبەر هەژاری، زۆر درەنگ قوتابخانەی تەواو كردووە. وەك جۆتكار و دارتاشیش كاریكردووە. پاش ئەوە لەلایەن كاربەدەستانی سووریاوە لەسەر كوردایەتی تەنگی پێهەڵچنراوە و، وەك پەنابەر هاتووە بۆ ئەورووپا و بووە بە پەنابەر لە ئەڵمانیا. لە شاری **براون شفایك** لە زانستگەی تەنكۆلۆژی خوێندنی هەندازیاری تەواو كردووە. هەرلە سەرەتای دامەزراندنی **«ئەكادێمیای كوردی بۆ زانست و هونەر»** لە ساڵی ١٩٨٥ دا بووە بە ئەندام. بەرەنجامی لێكۆڵینەوەكانی لەبارەی بارستایی Massismus یەوە نارد بۆ گەلێك لە پرۆفیسۆرەكانی ئەورووپا. نەزاتی ئەوەیانكرد كە بێژن «نەڕاستە» و نەهێندە ئازابوون كە بێژن «ڕاستە». **ڕاستییەكەی ئەگەر محەمەد لەیلا كورد نەبوایە، چەند جارێك خەڵاتی نۆبلی وەردەگرت.**

# حیزبحیزبێنەی کورد و،
# هەڕەشە ڕەشەی گورگەبۆر

ئەوی سەرنجی مێژووی کوردی دابێ لەم پەنجاساڵەی دواییدا ، تەنانەت سەرنجێکی سەرپێییش، نەك سەرنجێکی کوور (قووڵ) و هورد ، بەهاسانی بۆی دەردەکەوێ کە حیزبحیزبێنە دەورێکی بنچینەیی گێڕاوە لە سەرلێشێواندن و بەهەڵەبردنی جەماوەری کورد و، ناکۆکیدروستکردن لەنێوان ریزەکانی خەڵکی کوردستان و، لە ئەنجامدا پەنابردن بۆ داگیرکەرانی کوردستان و، کردنیان بە کوێخا بەسەر ماڵی کوردەوە و، دابەستن و گەشەدان بە کلك و دەستوپێوەندەکانی ئەم داگیرکەرانە لە کوردستاندا. ئەم رەوشەڕەشە، کارێکی وایکردووە کە حیزبێکی کوردستانی، ئامادەی هەموو جۆرە دەستبەردان (تنازلات) و بەرتیلدان و سەرشۆڕییەك بێ بۆ داگیرکەرانی کوردستان، هەربۆ ئەوەی بەسەر حیزبە کوردستانییەکانی دیکەدا زاڵ ببێ، ئەمەش لە ئەنجامدا بووەتە هۆی ئەوەی کە حیزبێکی کوردستانی ژێردەستەی دەوڵەتێکی داگیرکەر، شەڕی حیزبێکی کوردستانیی ژێردەستەی داگیرکەرێکی دیکە بکا و، دەوڵەتە داگیرکەرەکەی دراوسێی، بە (هاوپەیمان) و (هەڤاڵبەند) و (دۆستی کورد) بداتە قەڵەم و، حیزبە کوردستانییەکانی دیکەش بە (جاش) و (خاین) و دوژمنی خوێنیی خۆی بزانێ.

شەڕ و بەیەکدادان و خوێنڕێژیی نێوان پارتی و یەکێتی و پی کی کێ و کۆمەڵە و دێمۆکرات و سۆسیالیست و ئیسلامییەکان، لەسەر بردنەوەی پێشڕەوێتیی درۆزنە و خۆبەزلگرتن و خۆسەپاندن بەزۆری چەك بەسەر هەژار و رەشورووتی کورددا، کەرەسەی داستانێکی سامناك و فیلمێکی دراماتیکە. ئەوجا ئەگەر ئەم فیلمە لەکاتی شەڕی نێوچیا و دوورەشاری و خۆحەشاردان لەودیو سنوورەدەستکردەکانەوە بەلای خەڵکەوە باش نەبینرابێ، ئەوا ئەورۆ پاش دوانزەساڵ سەربەخۆیی و فەرمانڕەواییی دوو زلحیزب، تەنانەت هەموو رەنگکوێر (عمی الالوان) و شەوکوێرێکیش دەیانبینێ و، ئەوی خودێ پیچێك تیشکی لێکدانەوەی پێدابێ، دەبێ بەخوێدا بێتەوە و، سەربوردەی ئەو دوانزەساڵە بەبەرچاوی خۆیدا بێنێتەوە و، خەتونیشانێك بۆ سەرەنجامی ئەم هەڕەشەوگوڕەشەیە بنێتەوە، کە رژێمی ترك

بەوپەڕی سەربەستییەوە لە کوردی دەکا و، ترکمانەکانیشی کردووە بە بیانوویەك بۆ دەستوەشاندن و پەلاماردان و، ئەو دەمە دەبێ مرۆڤ رادەی ئامادەییی ئەم حیزبانە بۆ بەرەنگابوونەوەی ئەو مەترسییە گەورەیەی کە لەم بارودۆخە ئالۆزە دەکەوێتەوە، بەباشی و هەر لە ئێستەوە هەڵبسەنگێنێ.

ئەوەی هەمووومان دەیزانین ئەمەیە، کە هەر پاش دامەزراندنی "هەرێمی نەفرین" و هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان و، داخویانیکردنی حکوومەتی کوردستان، دەستبەجێ کاربەدەستانی کورد، هەموو مافە دێمۆکراتییەکانی **ترکمان و ئاشووری و کلدانی** و مافی هەموو ئاینە کوردییەکانی وەك **کاکەیی و ئێزدی و هەقەقە** و، ئەو ئاینانەی کە لە کوردستاندا هەن، وەك دیان و جوو، ... هتد، بەڕەسمی ناسی، ئەمەش پێڕەویکردنێکی رێسا (تقالید) ییی فەرهەنگی مرۆڤدۆستانە و پێشکەوتنخوازی کۆمەڵگەی کوردەواری بوو و، هەنگاوێکی پیرۆز بوو، کە لە لایەن نەتەوەییەکانی کوردەوە پشتگیریلێکرا، **چۆنکە کۆمەڵگەی کورد، جەودەت نەجارێك کە کوردستان بە نیشتمانی خۆی دەزانێ و، لەو سنوورەدا بۆ پارێزگاریی مافی رەوای گەلی ترکمان تێدەکۆشێ، لە سەنعان قەسابی کۆنەبەعسی و نانخۆری ئەوروپی رژێمی ترك، جیا دەکاتەوە و، دیارە بۆنی گوڵ و بۆنی پیوازی بەلاوە وەکیەك نییە.**

کە ئاگری شەڕی نێوان پارتی و یەکێتی هەڵگیرسا و، پەرلەمانی کوردستان لەکار کەوت و، حکوومەتی هەرێمی کوردستان بوو بە دوو لەتەوە و هەزاران چەکداری حیزبەکان خوێنیان لەو شەڕە چەپەڵەدا رژا، زلحیزبەکان، لەباتی ئەوەی بەدەم هاواری جەماوەری ئاشتیخوازی کوردەوە بێن و، لە کوێرەگوندێکی کوردستاندا پێکەوە دانیشن و ناکۆکییەکانیان کە هەمووی لەسەر دەسەڵاتە، بە هەستی بەرپرسارێتیی کوردانەوە باسبکەن و، چارە بدۆزنەوە بۆی و، تۆبە لە هەموو شەڕ و شۆڕ و کوشتوکوشتارێکی نێوخۆیی بکەن و میلیشیاکانیان هەڵوەشێننەوە و، لەشکری یەکگرتووی کوردستان دروستبکەن، کە بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستە پیرۆزەش سالانی ساڵ و بێوچان و بەدەمی و بەنووسین پێمراگەیاندن، رووپانکردە پێتەختەکانی داگیرکەران و، داگیرکەرانیان کردە سەرپشکی کێشەی کورد و، ئەنجامی ئەم رێبازە چەوتوچەوێڵەش ئەوە بوو دەوڵەتی ترك خۆی کردە "دەمڕاست" و "کۆتری ئاشتی" و

نێوبژیکەری دووزلحیزبەکە و، چەکداری ترك بەڕازیبوونی هەردوولا، لەشێوەی PFM دا هاتنە کوردستانەوە و، ئیدی ئەوەی نێویاننناوە "بەرەی ترکمانی" خرایە گەڕ و، ئەوجا لەبەر ئەوەی لەوکاتەدا برسێتی و بێنانییەکی جەرگبڕ نە باشووری کوردستاندا هەبوو و، پارە و پوولی کوردیش دەدرا بە چەك و گوللە بۆ کوشتنی یەکدی، سەنعان ئاغای کۆنەبەعسی و نانخۆری ئەوڕۆی ڕژێمی ترك، کردی بە جێژنی تۆرانێتی و نێوی هەزاران کوردی هەژار و رووت و ڕەجاڵی بە **"ترکمان"** تۆمار کرد، بەرامبەر بە چەند ژەمەنانێك. لەسەرێکی دیکەشەوە هەلومەرجی شەڕوشۆری دوو زلحیزبەکە و، نەبوونی ئاسایش و بێکاری لە «هەرێمی نەفرین» دا قۆزتەوە و، بە سووتوەرگرتن لە ڤیزەی دەوڵەتی ترك، بە ملیۆنان دۆلاری لە کورد کێشایەوە و، هەزاران هەزار کوردی لە کوردستان هەڵکەند و ڕەوانەی ئاوارەییکردن، کە هێندێکیان هەر لەسەر سنووری دەوڵەتی ترك لەلایەن ژەندرمەی ترکەوە کوژران و، گەلێکیشیان درانە دەست قاچاخچی بێویژدان و لە ڕێ شوێنەون کران، یان لەنێو زەریادا خنکان. سوپاس بۆ ئەو پڕۆژەی «نەوت بە نان» ە، خۆئەگەر ئەوە نەبوایە، دڵنیام لەوەی سەرژمێری ئەوڕۆی ترکمانەکان دەگەیشتە پێنج ملیۆن و نیو لە دەفتەری سەنعان قەسابدا و، ئەوی نەیویستایە ببێتە ترکمان، ئەوا وڵاتی بەجێدەهێشت بەرەو دوارۆژێکی تاریکونووتەك.

پاش ئەوەی پارتی و یەکێتی لەژێر گوشاری ئەمریکادا، پەیماننامەی واشنتۆنیان لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٨ دا مۆرکرد و، ساڵانی ساڵ لەچاوەمێزدا مایەوە، پارتی و یەکێتی بەرامبەر بە بەرەی ترکمانی و پێ کێ کێ، سیاسەتێکی زۆر لەیەکجیاوازیان گرتەبەر. تائەو هەندازەیەی کە بابەتەکە پێوەندیی بە "بەرەی ترکمان"ەوەیە، ئەوا پارتی دانی بەهەموو مافێکی ترکمانەکاندا نا و، بەکردەوەش ڕۆژنامە و ڕادیۆ و تەلەفیزیۆن و حیزب و وەزیر و مافی کەلتووری داپێیان، لەگەڵ ئەوەشدا "بەرەی ترکمانی" دانی بەبوونی کوردستان و حکوومەتی کوردستاندا نەدەنا و سەرپێچی لە قانوونەکانی «هەرێمی نەفرین» دەکرد. بەڵام زۆر زیرەکانە ناکۆکیی نێوان پارتی و یەکێتی، بەکاردەهێنا بۆ ئاژاوەنانەوە و کردنەوەی جێپێی خۆی لە باشووردا. "یەکێتی" زۆر بەداخەوە، لەباتی ئەوەی کردەوەی کورددوژمنانەی "بەرەی ترکمانی" و شکاندنی قانوونەکانی «هەرێمی نەفرین» و گوێڕایەڵیی ڕژێمی ئەنقەرە،

بەنەعلەت بکات و، سەرکردەکانیان بداتە دادگە، گەلێك "تنازلات"ی کرد بۆ "بەرەی ترکمانی"، وەك ئەوەی لە سلێمانی و گەلێك شوێنی دیکەی ژێردەسەلاتی یەکێتی، نیشتەجێیکردن و، گەڕەکی دروستکرد بۆیان و، زەوی و زارەکی فراوانی لەسەر تاپۆکردن، وەك ئەوەی زەوی و زاری کوردستان، مالی باوك و باپیری سەرکردەکانی یەکێتی بووبێ و، بەخشیبێتیان بە "هەژاران و لێقەوماوان"ی "بەرەی ترکمان" (کە لە قوتابخانەکانیاندا بەکارهێنانی زمانی کوردییان لە منداڵەکانیان ڕێبەند/ممنوع کردووە). ئەم هەڵوێستەی یەکێتی هەمووی لەدژی پارتی بوو، وەك چۆن پشتی پێ کێ کێ ی گرت و سەتان چەکداری خۆی بەدەستی ڕژێمی ترك دابەکوشت، هەر بۆ بێهێزکردنی پارتی. لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە لەسەر پارتی بکەمەوە، بەڵکو دەمەوێ قسەی ڕاستبکەم.

"بەرەی ترکمانی" و کاربەدەستانی ڕژێمی ئەنقەرە، بەرامبەر بەم پێهەڵخلیسکانەی یەکێتی، کەوتنە پەسندانی مام جەلال و دانانی بە «سیاسەتکارێکی گەورەی عێراق»، بێئەوەی بەیەك وشە نێوی کوردستان و حکوومەتەکەی یەکێتی بهێنن. تەنانەت سەنعان قەساب دەیگوت، هەردوو حکوومەتەکەی پارتی و یەکێتی، هیچیان ڕەوایەتییان نییە، بۆیە ناچێ داوای "ئیجازە" بکا لێیان. کەچی کاربەدەستانی یەکێتی پتر نازی داروودەستەی سەنعان قەسابیان دەکێشا و پارتییان گوناهبار دەکرد بەوەی "مافی ترکمانی نەداوە"!

پاش ئەوەی پارتی و یەکێتی لەمڕۆژانەی دواییدا و لەژێر شەقی ڕۆژگار و هەڕەشەی چەککردنیان لەلایەن ڕژێمی ئەنقەرەوە، بەپەلە سەرکردەیەتییەکی یەکگرتوویان دامەزراند و، وەك کوردەکە دەبێژێ و، لە یەکێك لە وتارەکانمدا لە «میدیا» باسمکردبوو، هەوڵدەدەن ئەوەی بە (کچێتی) نەیانکردووە، ئێستە بە بێوەژنی بیکەن. ئالەو کاتەوە هەڵوێستی دوژمنانەی "بەرەی ترکمانی" بەرامبەر بە کورد ،گەلێك لەجاران ئاشکراتر بووە، بەپێی هەواڵێك کە «کوردیش میدیا» لەڕۆژی /۳/۸ دا بلاْویکردبووەوە، "بەرە" داوای لە ڕژێمی ئەنقەرە کردووە کە "ترکمانەکان بپارێزن لە دەستدرێژیی پارتی و یەکێتی کە بە دزییەوە دەیانەوێ دەوڵەتێکی کوردی لە باکووری عێراقدا دابمەزرێنن و، خەڵکی ترکمان لە هەرێمەکە دەربکەن". ئەمە دەقی قسەی مستەفا زیا "نوێنەری بەرەی ترکمانی" یە کە لە ئەنقەرە لەڕۆژی

پێنجشەمەی ٦/٣/ دا کـــردی. مـــســـتـــەفـــا زیا گـــوتی: "ژیانی **تـرکـمـانـەکـان لە مەترسیدایە لەلایەن سەرکردەی یەکێتی، جەلال تاڵەبانی و سەرکردەی پارتی، مەسعوود بارزانی، کە ئەم دوانە لە کۆنەوە کوردەکانی هەرێمیان تیژکردووە دژی خەڵکی ترکمان لە هەرێمەکە". هەروەها گوتی: "ئێمە داوامان لە کاربەدەستانی ترك کردووە، کە لەباری رامیاری و سەربازییەوە، بمانپارێزن دژی بڕیارەکانی تاڵەبانی و بارزانی لە سەردەمی دوای سەددامدا لە باکووری عێراق"**. شایانی باسە، کە لە کۆبوونەوەی **سەلاحەدین دا سەنعان قەسابیش هەروا بەئاشکرا داوای ئەوەیکرد کە لەشکری ترك پەلاماری باشووری کوردستان بدا.**

ئەوجا ئەگەر هاوولاتییەك ئاوا بە ئاشکرا و بێپەردە داوای هاتنی لەشکرێکی بێگانە بکا بۆنێو ولاتەکەی، ئایە دەبێ هەروا بە ئازادی بە کوردستاندا بگەڕێ، یان دەبێ دەستبەجێ لەلایەن پۆلیسەوە بگیرێ و بدرێتە دەست دۆزگری گشتی و دادگەی کوردستان؟ دوای ئەوە، ئەم قسانەی **سەنعان قەساب** مانای وانییە کە خۆی و هاودەستەکانی لەکاتی پەلاماری لەشکری ئەنقەرەدا بۆسەر باشوور دەکەونە کوردکوشتن لە پاداشتی «**چاکە**»ی سەرکردەکانی یەکێتیدا؟؟

ئەمەیان وا، پاش ئەوەی رەجەب ئەردۆگان بەتاوانی هاندانی ئاینپەروەریی بنچینەگرانە، رێنەدرا پێی ببێتە سەرۆکوەزیرانی رژێمەکەی، هەرچەندە حیزبەکەی لە هەڵبژاردندا پلەی یەکەمی بردبووەوە، چەند رۆژێك لەمەوبەر کاتێك کە هەڵبژاردن لە **شاری سرت کە شارێکی کوردە**، تازەکرایەوە و، ئەردۆگان بەدەنگی لێقەوماوانی کورد، بوو بە سەرۆکوەزیران، لەبەردەم ئەندامانی حیزبەکەیدا گوتی: «**ئێمە ناتوانین بچینە شەڕێکەوە کە شەڕی ئێمە نییە. لەبەر ئەوە دەبێ ئەمریکا داخوازییەکانمان جێبەجێ بکا، کە یەکێکیان ئەوەیە، مافی ترکمان هەقە لە دەستووری بنچینەیی عێراقدا بچەسپێ، کە ئەوانیش وەکو کورد و عەرەبن». ئەردۆگان** باسی **ئاشووری و کەلدانییەکانی** نەکرد و، دیارە مەبەستی وی، ترکمانی کوردستان نییە، بەڵکو مەبەستی **"بەرەی ترکمان"ی** دەسکەلای دەستی رژێمەکەیەتی. سەیر ئەوەیە، ئەردۆگان بەڕووەقایمیەوە باسی مافی ترکمان دەکا کە بچێتە دەستووری عێراقەوە، پاش سەردەمی سەددام، بەلام باسی مافی ٢٠ــ ٢٥ ملیۆن کوردی ژێردەستەی خۆی ناکا. ئەمە ترکەموسلمانەکەیە، ئەوجا دەبێ

ترکەناموسڵمانەکە چۆن بێ؟ ئەمە لە کاتێکدا کە ترك و ترکمان یەك شت نین و ترك و ترکمان یەك گەل نین و، گەلی ترکمان گەلێك کۆنترن لەمانەی کە بە ترکی عوسمانی نێویانڕۆیوە. بەداخەوە ئەم وتارە جێی ئەوەی تێدا نابێتەوە کە بە دووروودرێژی لەسەر ئەم باسە بڕۆم. بەپێچەوانەی قسەکانی سەنعان قەسابەوە کە دەبێژێ: "ئێمە بەشێکین لە نەتەوەی ترك"، ترك و ترکمان دووگەلی زۆر لەیەکجیاوازن.

هەڕەشەی ڕژێمی ترك بۆ هاتنە کوردستان بەداری زۆری، بەهیچ بیانوویەك پاساو نادرێتەوە. چۆنکە لەشکری ترك نایەوێ بچێتە شەڕەوە دژی سەددام و، ئەمەش بەڕۆژی نیوەڕۆ دەبێژن. لەبەر ئەوە لەشکری ترك مافی ئەوەی نییە بێتە کوردستانەوە. ئەوجا ئەگەر سەربازی ترك مافی ئەوە بەخۆیان بدەن بڕژێنە خاکی باشووری کوردستانەوە، گوایە بۆ "پاراستنی ترکمانەکان"، کە هیچ هەڕەشەیەك نەکراوە لێیان و، هەموو مافێکیان هەیە، دیارە خەڵکی باشوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای کوردستان و هەموو کوردێکیش، مافی ئەوەیان هەیە بچنە باکوری کوردستان بۆ هێنانەدی مافی ٢٠ ــ ٢٥ ملیۆن کورد کە ئەمە هەشتاساڵە لە هەموو مافێکی مرۆڤانە بێبەشن.

کاربەدەستانی ترك زۆرجار منەتدەنێن بەسەر کورددا کە دوانزەساڵە کوردی باشووریان پاراستووە، ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەم دوانزەساڵە ڕێیان بەهێزەکانی ئەمەریکاو بەریتانیا داوە، سەرپەرشتیی «هەرێمی نەفڕین» بکەن. ئەمەش لەلایەکەوە، بەرامبەر یارمەتییەکی یەکجار زۆر کە لە ئەمریکا وەریانگرتووە و، لەلایەکی دیکەشەوە، بۆ بەربەرەکانێی هێزەکانی پێ کێ کێ، بە یارمەتی پارتی و یەکێتی. هەموو جارێکیش، شەش مانگ شەش مانگ، ماوەکەیان درێژ کردووەتەوە و، ئەگەرچی پەرلەمانەکەیان ڕازینەبووە، بەڵام "ئەنجومەنی ئاسایشی ناسیۆناڵ" زۆریکردووە لێیان لەبەر "خاتری ئاسایشی ناسیۆناڵ" درێژیبکەنەوە. خۆئەگەر دەوڵەتی ترك سەرەڕای مەترسیی پێ کێ کێ، ماوەی ئەمریکای نەدایە بۆ پاراستنی «هەرێمی نەفڕین»، ئەوا ڕژێمی ترك هەرخۆی لەبەردەم چەکدارەکانی پێ کێ کێ دا نەدەدی، بەڵکو لەبەردەم چارەکە ملیۆنێك پێشمەرگەی مەشقپێکراودا دەدی کە بەرگەی نەدەگرت. ڕژێمی ترك دەبێ سوپاسی پارتی بکا کە ڕێنەداوە، جێیخۆی

بکاتەوە لە نێوچەکەدا.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بۆ ڕاستییەك بکەم، ئەوەش ئەوەیە کە پارتی هەستی بەوە نەدەکرد کە ئەگەر **پی کی کی** لاواز بوو، سەرە دێتە سەر پارتیش، ئەم قسەیەش بۆیە ناکەم لەسەر پی کی کی بکەمەوە، چونکە پی کی کی کردەوەی خراپیان یەکجار زۆرە و، هەر لەژێر ئەو کردەوە خراپانەدا بوو کە ڕۆژیان گەیشت بەمرۆژە. بەڵام بۆ مێژوو دەبێ بڵێم، کاتێك کە **ئۆجەلان** بە کەینویەینێکی نێونەتەوەیی، کە لەمەدا **ئەمریکا و ئیسرائیل و ڕووسیا و یۆنان و کینیا و سووریا** بەشداربوون، لە کینیاوە فڕێنرا و، ورەیبەردا و، پی کی کی بەو شێوەی جارانی نەما، نامەیەکم نووسی بۆ **کاك مەسعوود بارزانی لەگەڵ وێنەیەك بۆ مام جەلال** و تکامکرد لێیان کە کێشەی پی کی کی، کە کێشەیەکی کوردە، پێویستە لەلایەن کورد خۆیەوە چارەسەر بکرێ و، لە نامەکەدا بەڕۆنی نووسیبووم کە ئەگەر پی کی کی لەنێو چوو، ئەوسا ڕژێمی ترك بوونی کوردی دیکە، نەك هەر بە پێویست نازانێ، بەڵکو بوونیان بە مەترسی دەزانێ بۆخۆی.

ئێستەش پاش شەش ساڵێك دەرکەوت کە پێشبینییەکە ڕاستبوو و، ئەوەتە ئەوڕۆ **ڕژێمی "گورگەبۆر"** دەیەوێ چەکدارەکانی پارتی و یەکێتی کە خاوەنی چاکەن بەسەر ئەو ڕژێمەوە چەکداماڵبکا. ئەوجا ئێستە بۆ وەرامدانەوەی ئەو، پارتی و یەکێتی هاتوون «سەرکردەیەتییەکی یەکگرتوو»یان پێکهێناوە، کە بێگومان کارێکی باشیانکردووە. کە ئەمەش یەکەمجار نییە، پارتی و یەکێتی یەکبگرن و بەرە دروستبکەن و هەڵیوەشێننەوە. لەبەر ئەوە بەبیرورای من پێویست بوو، بنەمایەکی قانوونی بدەن بە کارەکەیان. ئەمەش بەوەی حکوومەتەکەی هەردوولایان قانوونێکیان چێبکردایە بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەموو میلیشیاکان و، هاوکات قانوونێکی دیکەیان چێبکردایە بۆ دامەزراندنی «لەشکری بەرگریی کوردستان» ئەوسا هەردوو قانوونەکەیان بخستایەتە بەردەم پەرلەمانی کوردستان بۆ پشتڕاستکردنیان. بۆ پشتگیریی ئەم هەنگاوەش بەڵگەی باشیان بەدەستەوە بوو. یەکەم: لە «هەرێمی نەفرین» دا لەشکرێکی عێراقی نییە. دووەم: خەڵکی «هەرێمی نەفرین» لەگەڵێك لاوە هەڕەشە دەکرێ لە ژیان و سەروماڵ و بوونیان. پەرلەمانیش دەزگەیەکە بەشێوەیەکی دێموکراسی هەڵبژێردراوە و، مافی ئەوکارەی هەیە.

ڕاستییەکەی میلیشیا ، هەرچەندە بەژمارە زۆر و بەهێزبێ، هەر لەباری قانوونییەوە، مافی ئەوەی نییە وەك لەشکرێك تەماشا بکرێ. هەر لەبەر ئەوەشە گەلێك لە بزووتنەوە رزگاریخوازەکان میلیشیا دروستناکەن، بەڵکو لەشکر دروستدەکەن. "لەشکری رزگاریی باشووری سۆدان" نموونەیەکە بۆ ئەمە.

**بەرلین - ۲۰۰۳/۳/۱۲**

# کۆچیدوایی زانایەکی کورد لە تاراوگە

پاش ئەوەی **فەیلەسوف و فیزیکزانی گەورەی کورد و خەڵکی ڕۆژاوای کوردستان، هەندازیار محەمەد لەیلا، خاوەنی تیۆری بارستایی**، دوور لە وڵات، سەری پڕ لە خەموخەفەتی نایەوە، ئەوا **دوکتۆر یۆسف مارف** زەندیش لە تاراوگە کۆچیدواییکرد و، بەوە سۆیەکی تیژی کردە دڵی هەموو دۆست و برادەرەکانییەوە.

یۆسف لە نێوچەی **مەریوان** لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە دایکبووبوو و، هەر لە منداڵییەوە حەزی بە خوێندەواری کردبوو. ئەمەش وایکردبوو لێی کە ڕوویکاتە **بیارە** و، لەلای زاناکانی ئەوێ دەستبەخوێندن بکا. بەڵام هەڵوێستی بنەماڵەی **مەلا عەبدولکەریمی مودەریس**، کە خۆی هەر لە کۆنەوە ماستاوساردکەرەوەیەکی ڕژێمی **عێراق** بووە، دواییش بوو بە زوڕناژەنی سەددام، هەروەها عێراقچێتیی کوڕەکانی مەلا عەبدولکەریم، وایلە یۆسف کردبوو کە بە دزییەوە بچێتە **سلێمانی** و، پەساپۆرتێکی عێراقی پەیدا بکا و، لەوێشەوە لەنیوەی پەنجاکانی سەتەی رابردوودا، لە عێراق رابکا و، خۆی بگەیەنێتە **قاهیرە** و، لەوێ خەریکی خوێندن و چالاکیی رامیاری بێ.

ئەو سەردەمەی یۆسف چووبووە قاهیرە، سەردەمی فەرمانڕەواییی **جەمال عەبدولناسر** بوو، کە بووبوو بە ئاڵاهەڵگری ناسیۆنالیزمی عەرەب و، دوژمنی ڕژێمەکانی **عێراق و ترك و ئێران، کە لە پەیمانی بەغدادا** یەکیانگرتبوو و، دژایەتیی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی کوردیاندەکرد. ئەم ڕێبازەی ناسر، لە هێندەك ڕووەوە، وەکیەکییەکی لەگەڵ ڕێبازی رزگاریخوازانەی کورددا پێکهێنابوو و، بۆ کوردی نەتەوەیی سەرنجراکێش بوو.

ئێمە ئەوکاتە چەند گەنجێکی بەژمارە یەکجار کەم بووین کە دژی عێراقچێتی و سۆڤێتچێتی و پاراستنی سنووری دەستکردەکانی کوردستان بووین و، لەبەر ئەوە لە ساڵی ١٩٥٦ دا و، پاش وتوویژ لەگەڵ هاوبیرانی ئەوسەردەمەم، چووم بۆ شام **(دیمەشق)** و لەوێ نامیلکەیەکم بە عارەبی بەنێوی **"کفاح الاكراد" (خەباتی کورد)** دوە نووسی و، لەوێدا پێویستیی هاوکاریی کورد و عەرەبم باسکردبوو، نامیلکەکەم بەدیاری پێشکێش بە ناسر کرد. ئەم کارە پێوەندییەکی لەنێوان کورد و ناسردا

دروستکرد، کە دوایی بەهۆی **نەجمەدین عەونییەوە (کە برای محەمەد عەلی عەونی و، هەردووکیان کوردی میسر بوون)**، هێندەك داخوازیمان گەیاندە ناسر، یەکێك لەوانە دانانی رادیۆیەك بوو بە کوردی. ناسر لە هاوینی ١٩٥٧ دا فەرمانی بە تەرخانکردنی پرۆگرامێکی کوردی لە رادیۆی قاهیرەدا دا، بە سەرپەرشتیی عومەر وەجدی کە کوردێکی میسری و، سەرۆکی «رەواقی کورد» بوو (*).

**یۆسف** یەکێك بوو لەو کوردانەی کە هەرلە سەرەتای دامەزراندنی ئەو پرۆگرامەوە، وەك بوێژ و وەرگێڕ هاوکاریی کرد، ئەو رادیۆیەش رۆڵێکی بەرچاوی نواند لە زاتنانە بەر کورد و تەنگاوکردنی رژێمەکانی ئێران و عێراق و ترك. ئەم پرۆگرامە، هەتا سالی ١٩٦٤ لەکاردا بوو. لەم ساڵەدا لەژێر گوشاری **عەبدولسەلام عارف دا داخرا**. ئەوجا یۆسف روویکردە ئەڵمانیا و لە شاری کیل گیرسایەوە و، لەو کاتەوە دۆستایەتیمان دەستپێکرد.

کە **یەکێتیی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا (نوکسە)** لە نەورۆزی سالی ١٩٦٥ دا لەلایەن **هاوبیرانی هێژا، هەندازیار بروسك ئیبراهیم و پێشمەرگەی کاژیك لەتیف عەلی و نووسەری ئەم چەند دێرەوە دامەزرا**، یۆسف یەکێك بوو لەوانەی بە دڵەوە لەسەر بیروبۆچوونی نوکسەی دەکردەوە و لە گەلێك کۆبوونەوەدا بەشداریکرد لە گەڵمان.

یۆسف، بێجگە لە فارسی و عەرەبی و ئەڵمانی، زانیارییەکی فراوانی لە زمانی کوردی و شێوە و زارەکانیدا هەبوو. لە زانستگەی **کیل (ئەڵمانیا)** لە بەشی زمانەوانیی هێند و جەرمەنی خوێندبووی. زانینی زمانی کۆنی یۆنانی و لاتینی مەرجە بۆ ئەوانەی ئەم بابەتە دەخوێنن. خوێندنەکەشی بە دوکتۆرنامەیەکی گرنگ لەبارەی باسێکی رێزمانی کوردییەوە بە کۆتاییگەیاندبوو. گەلێك وتاریشی بە کوردی و عەرەبی و ئەڵمانی بەنێوی خواستەمەنییەوە نووسیبوو بۆ بەرگریکردن لە کورد و مافەکانی.

یۆسف کوردێکی سەربەرز و قسە لەڕوو بوو. بۆ دەستکەوتنی مالی دنیا خۆی سووك نەدەکرد. پاش دامەزراندنی **«هەرێمی ئاسایش»** گەلێك کەس پێیانگوتبوو کە بچێ داوای کار بکا لە زانستگەکانی «هەرێم»، ئەویش گوتبووی: «ئەو زانستگانە هی هەردوو زلحیزبەکەن، بۆ من ناشیرینە بچم دەستپانکەمەوە لێیان.

ئەگەر ئەوان پێویستیان بە خزمەتی منە، فەرموو با ئەوان روو بنێن لێم، ئەوسا منیش بۆ هاوکاری لە گەڵ زانستگەکان، چەند مەرجێکم هەیە، ئەگەر بەو مەرجانە رازیبوون، ئەوا بەسەر چاو»

دەسا ئافەرینی لێبێ و ئەو بیروڕایە بیروڕای منیشە. هەردوو حیزبەکە پێویستە دەنگوەرگرتنێکی گشتی رێکبخەن و سەر شۆڕ بکەن بۆ ئەنجامی گشتپرسییەکی ئازادانە.

.................................

(*) - **"رەواق"** وشەیەکە کە لە بنەڕەتدا **یۆنانییە**. یۆنانییە کۆنەکان بەو شوێنەیان دەگوت «رەواق» کە زاناکانیان تێیدا کۆدەبوونەوە. ئەو وشەیە لەڕێی زانستگەی **«حەڕان» ەوە کە گەورەترین زانستگەی کوردستان و رۆژهەڵات** بوو کەوتە زمانی کوردییەوە. کە **سەلاحەدین بوو بە سوڵتانی میسر**، لە زانستگەی ئەزهەر رەواقێکی کردەوە بەنێوی **«رواق الاكراد» (رەواقی کوردان)** بۆ پێگەیاندنی زانستکاری کورد. ئەم رەواقە هەتا ئەم دواییەش مابوو تا **ئەنوەر سادات** جێی ناسری گرتەوە، ئەوجا دایخست.

(**) - رژێمی عێراق رێیدا بەدەرکردنی چەند گۆڤارێك بەزمانی کوردی. رژێمی ئێران بەشێکی بەزمانی کوردی لە رادیۆی تاراندا کردەوە. سەفیری ترك لە قاهیرە بە هەڵەداوان چووبووە لای ناسر و پێیگوتبوو، «ئەم کارەی میسر (دانانی پرۆگرامی کوردی) کارێکی زیانبارانەیە بەرامبەر ترکیا». ناسریش پێیگوتبوو، «ئێمە دەمانەوێ سیاسەتی دەرەوەی میسر بەزمانی کوردی بڵاوبکەینەوە». جەنابی سەفیر گوتبووی «لە ترکیا کورد نییە». ناسریش لە وەرامدا گوتبووی: **«باشە، کە کورد نییە لە ترکیا، بەڕێزتان لە چ دەترسن؟»**. سەفیر وەرامی بۆ ئەمە پێنەبووە و، ناسر کۆتایی بە وتووێژەکە هێنابوو.

۲۰۰۳/٦/۲۱

# هەلومەرجی لەبار
# و
# کاربەدەستی هەرزانفرۆش و نالەباری کورد

بەڕاستی، هەرچەند سەردەهێنم و سەر دەبەم، لە تەواوی مێژووی کورددا، هەلومەرجێکی لەوەی ئەوڕۆ لەبارتر نابینم، کە وا گەورەترین زلهێزی ئەم جیهانە بووبێتە هەڤالبەندی کورد و، دەوڵەتێکی داگیرکەری کوردستانی لە بنج و بێخەوە رووخاندبێ و، هەڕەشەی توندوتیژ لە داگیرکەرانی رۆژهەلات و رۆژاوای کوردستان بکا و، بە هاوکاری تێرۆریستیان بداتە قەڵەم و، دانە جێڕێ لە داگیرکەری باکووری کوردستان بکا و، تەنانەت ژمارەیەك لە سەربازەکانی بگرێ و، بەوپەڕی سووکایەتیپێکردنەوە رەوانەی زیندانیان بکا. ئەمە لەکاتێکدا کە ئەو داگیرکەرەی باکوور، هەڤالبەندی نیوسەتەی ئەو زلهێزە جیهانییە بێ.

ئالەم بارودۆخە لەبارەدا، کە چەرخی رۆژگار، بەڕێکەوت، وەك دیارییەکی لەنرخنەهاتوو، پێشکێشی کوردی پێخوست و بەشخوراوی کردووە، کاربەدەستانی کورد، لەباتی ئەوەی هەستی بەرپرسیاری وا بکا لێیان، پێ لەسەر ئەوە دابگرن کە عێراق دەوڵەتێکی دەستکردە و، کاتی خۆی بەزۆری زۆردارەکیی بەریتانیا، باشووری کوردستانی پێوە بەستراوە و، کورد بەزۆری چەك کراون بە عێراقی و، بۆ سەپاندنی «عێراقێتی» بەسەریاندا، لەم هەشتا ساڵەی رابوردوودا، ملیۆنێك کەسیان لێکوژراوە و، هێندەی ئەوەش دەربەدەر کراوە و، هەزاران گوندیان سووتێنراوە و، وڵاتیان عەرەباوی کراوە و، ئەنفالیان لێکراوە و، شار و گوندیان کیمیابارانکراوە و، کچ و ژنیان وەك کۆیلە فرۆشراوە و، ماڵ و مڵکیان بە تالان براوە، کەچی ئەوان کەوتوونەتە هەرزانفرۆشی و ماستاوکردن بۆ داگیرکەران و، پتر لە عەرەبەکانی عێراق، خۆیان بە عێراقی دەدەنە قەڵەم و، سەری زمان و بنی زمانیان ئەوەیە **«کورد دەوڵەتی سەربەخۆی ناوێ»** و، **«کورد لە گەڵ برا عەرەبەکانی عێراقێکی یەکگرتووی فیدەراڵی دەوێ»**. ئەمە لە کاتێکدا کە هیچ گشتپرسییەك نەکراوە تا بزانرێ کورد چی دەوێ و چی ناوێ و، دوو زلحیزبەکەش نوێنەری ٧ــ٨ ملیۆن کوردی ژێردەستەی عێراق نین، تا مافی ئەوەیان هەبێ بەنێوی کوردەوە قسە

بکەن. پەرلەمانەکەش و حکومەتەکەشیان حەوت ساڵە رەوایەتیی نەماوە. سەیرەکەش لەوەدایە کە هەموو منداڵێکی ساوا دەزانێ کە گۆڕینی سیستەمی عێراق، لە دیکتاتۆرێتیی عەرەبچێتییەوە بۆ دێمۆکراسییەکی فیدەراڵی، هەروا هاسان نییە کە بە فەرمانێکی سەرەوە بێتە دی، بەڵکو پێویستی بە تێپەڕبوونی ساڵانێکی دوورودرێژ هەیە و، ئەوەش لەپاڵ بوونی دەسەلاتێکی ژێری ئازادیخوازانە و، پەروەردەیەکی دێمۆکراتانەی ئاشتیخوازانەدا. دیارە ئەمەش کاری پیاوە چەقۆوەشێنەکان و ژنە لەچکبەسەرەکان نییە، بەڵکو بەرهەم و دیاردەی کۆمەڵگەیەکی شارستانانەیە، کە رژێمە تێرۆریستە داگیرکەرەکانی کوردستان و، رژێمە دیکتاتۆرە شەڕخوازە دەربەگەکانی دیکەی دەوروبەری عێراق، پێکهاتنی ئەو کۆمەڵگەیە، بەمردنی خۆیانی دەزانن و، بەهەموو شێوەیەك بەربەرەکانێی دەکەن.

بەڵام با ئێمە لێرەدا کەمێك خەیاڵپلاوی بخەینە کار و، وا دابنێین کە عێراق، بە فەرمانی خودێ و، تکا و نزای **زەردەشت و تاوسی مەلەك و سوڵتان سەهاك و شێخ عەبدولقادری گەیلانی و شەخسە فەقیرە و شێخی شەدەلە** و گشت چاکان، بەدەستوپرد، یان پاش ماوەیەك، دەبێتە دەوڵەتێکی دێمۆکراتی و، ئەوجا ئەو پرسیارە لە خۆمان بکەین، ئایە ئەم دێمۆکراسییە بایی ئەوەیە کە بتوانێ دۆزی کورد چارەسەر بکا؟ بۆ وەرامی ئەم پرسیارە ئەوەندە بەسە کە بگەڕێینەوە بۆ سەرپەڕەی تایبەتکارەکانی دێمۆکراسی لەکاتی خستنە کاردا. **دێمۆکراسی بریتییە لە هێنانەدی بڕیاری زۆربەی زۆر (نیوە + ١) ی پێوەندداراني دەوڵەتێك، یان کۆمەڵگەیەك لە دەنگدانێکی سەربەستدا. ئەوجا ئەگەر کاربەدەستانی کورد، یان هێندەك لە سیاسەتکارانی عەرەب، داوای ئەوەیانکرد کە عێراق ببێتە دەوڵەتێکی فیدەراڵی ــ وەك ئێستە "مجلس الحكم الانتقالي" داوایدەکا، دەبێ جارێ چوارچێوەی ئەو سیستەمە فیدەراڵییە دیاریبکرێ و، ئەوجا بخرێتە دەنگدانەوە و، لەم دەنگدانەشدا هەر کورد بەشدار نابن، چۆنکە سیاسەتکارەکانی کورد، ئەوەیان نەکردووە بە مەرجێك، کە هەر هەرێمێك بۆخۆی و بەجیا دەنگبدا، بەڵکو خەڵکی عێراق هەموو پێکەوە لە دەنگدانەدا بەشدار دەبن، ئەو دەمە، ئەگەر زۆربەی زۆری خەڵکی عێراق کە عەرەبن، دەنگیان بۆ سیستەمی فیدەراڵی نەدا، ئەوا ئەو حەڵە، کورد ناتوانێ لە دژی بوەستێ. خۆ ئەگەر لەدژی وەستا، ئەوا دژ بە سیستەمی دێمۆکراسی و "یەکێتیی**

**خاکی عێراق" دەوەستێ، کە کاربەدەستانی حیزبەکانی کوردستان، کردوویانە بە بنێشتە خۆشەی بندانیان. کە ئەمەش وابڵێهات، ئەوکاتە دەگەڕێینەوە سەر سفر و دەست لە گۆنان درێژتر و، دوژمنانی کوردیش چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەن، بۆیە بە جەختەوە داوا لە ئەمریکا دەکەن کە «بەزووترین کات چارەنووسی عێراق بداتە دەست عێراقییەکان خۆیان». چونکە ئەوان، جۆری بیرکردنەوەی کۆمەڵگەی خۆیان باش ناسیوە و دەزانن ئەنجامی دەنگدانەکە ئەگەر بەمزووانە بکرێ، چۆن دەبێ.**

شایانی باسە، کە دوو زلحیزبە کوردییەکەی باشوور، کاتی خۆی کە پەرلەمانەکەیان بڕیاریدا، پێوەندیی کورد و دەسەڵاتی نێوەندیی عێراق لەشێوەی فیدەراڵیدا بێ، ئەوێ ڕۆژێ، بۆ ئەمە، بەڵگە و بیانوویان هەبوو. چونکە هەلومەرجی ئەو ڕۆژە، وەك هەلومەرجی ئەوڕۆ نەبوو. سەددام بەوپەڕی دەسەڵاتەوە هەڕەشەی لە کورد دەکرد و، سێ ڕژێمە داگیرکەرەکەی دیش، بە هەموو فرتوفێڵێك هەوڵی نەهێشتنی «هەرێمی نەفرین» یان دەدا و، لەڕێی دەسکەلاکانیانەوە تۆوی ئاژاوە و ناتەناهییان لە "هەرێم" دا دەچاند و، **لەپاڵ ئەمانەشدا شەڕە قۆچی پارتی و یەکێتی، لەسەر فشە دەسەڵات، کە بە قسەی مام جەلال، «تەنێ،» سێهەزار پێشمەرگەی تیا کوژرا، هیوای نەمانی "هەرێم"ی دەبەخشی بە داگیرکەران،** بەڵام لە بەختی کوردان بارودۆخێکی واهاتە نێوناوان، کە بە ڕێکەوت، لە بەرژەوەندیی کوردستان و زیانی ملهوڕانی بێگانە بوو. لەبەر ئەوە، دەبوو، کاربەدەستانی کورد، داخوازیی کۆنی خۆیان کە "فیدەراڵی" بوو، پێبەپێی گۆڕانی هەلومەرجەکە بگۆڕن و، پاش ڕووخانی ڕژێمی سەددام و، بەپەندبوونی نەخشەی ڕژێمی ترك، بۆ پاراستنی ڕژێمی سەددام و، تەفرەدانی ئەمریکا و هاوپەیمانان، پێ لەسەر ئەوە دابگرن، کە کورد ئامادەنییە بەهیچ جۆرێك بچێتەوە ژێر باری دەوڵەتی لە بنەڕەتەوە نارەوا و دەستکردی عێراق و، بۆ هەر شتێك کە پێوەندیی بە کوردەوە هەبێ، سائیدی "مجلس الحکم" بێ، یان هەر دەزگەیەکی دی و، دەبێ کورد مافی ڤیتۆی هەبێ و، بڕینەوەی چارەنووسی باشووری کوردستان، کە دەست لە هیچ بەشێکی هەڵناگیرێ، دەبێ لەڕێی گشتپرسییەوە دەستنیشانبکرێ، کە تەنێ خەڵکی باشووری کوردستان مافی دەنگدانیان هەبێ، چونکە هیچ گەلێك ئامادە نییە، ڕێبدا بەگەلێکی دیکە، بڕیار لەسەر مافی چارەنووسی بدا و، ئەمەشیان لەگەڵ ئەمریکا و بەریتانیا و عێراقییەکان، بەمۆر و

ئیمزا، کۆتایی پێبهێنایە، نەك بە بەڵێنی دەمی و، هەموو وتوویژێکیشیان رەپوڕاست، بە نەتەوەی کورد بگەیاندایە کە دیارە ئەمەیان نەکردووە.

بەلام کە کاربەدەستانی دوو حیزبە دەسەلاتدارەکە، هەروا بە هاسانی دەستیان لە مووسڵ هەلگرت و، لە پەرلەمانەکەیاندا، هەروا بە ئاشکرا و، لە بەردەم عەرەب و ناعەرەبدا، باسی ئەوەیانکرد کە برایەتیی کورد و عەرەب لە «سەرووی هەموو ئەنفال و کیمیابارانێك» ەوەیە، واتە، ئەو کاربەدەستانە داوای ئەوە ناکەن کە عەرەب پێویستە بەرەسمی داوای لێبوردن بکەن لە نەتەوەی کورد، بەرامبەر گەلکوژی لە کورد و، ئامادەیی خۆیان دەربڕن بۆ بژاردنەوەی زەرەروزیانی کورد، ئەم پێشنیازەش سالانی سالە دەیدەم بە گوێیاندا و، لەباتی ئەوە و، بە کوێرایی چاوی نیشتمانپەروەران، رۆژی دامەزراندنی لەشکری عێراقی کوردکوژیان کردە رۆژی «جێژنی کورد»، ئەمە لەکاتێکدا کە ئەوان زۆرباش دەزانن کە **«برایەتیی کورد و عەرەب» درۆیەکی شاخدارە، چۆنکە لەنێو ٢٣ دەولەتی عەرەبدا، تاکە یەك دەولەت نەبوو، بێزاریی خۆی، نەك بەرامبەر ئەنفال و چەکی کیمیایی و بە عەرەبکردنی کوردستان و فرۆشتنی ژن و کچی کورد، دەربڕێ، بەلکو بەرامبەر بەو هەموو گۆرە بە کۆمەلانەی کە رۆژ نییە نەدۆزرێنەوە، لەنێو دووسەت ملوێن عەرەبدا، دووسەت عەرەب، تا ئێستە پەیدانەبوون کە لەدژی ئەنفال و کیمیابارانی کوردستان و بە عەرەبکردنی باشوور و رۆژاوای کوردستان، یەك خۆپێشاندان سازبکەن.** تەنانەت ماوەیەك لەمەوبەر، کاربەدەستانی رژێمی سووریا، کە سەرکردەکانی دوو زلحیزبە کوردییەکە، زووزوو دەبنە میوانیان و، بەشانوبالیاندا هەلدەدەن، چەند منداڵێکی کوردیان خستە زیندانەوە، چۆنکە ئەو زارۆکانە داوای ئەوەیاندەکرد بەزمانی خۆیان بخوێنن و، دەیانویست ئەم داخوازییەیان بگەیەننە دەزگەی یۆنیسێف لە دیمەشق. کە **مام جەلال**، چەند رۆژێکی کەم پاش ئەوە، چوو بۆ سووریا، دەمی هەلنەپچڕا بەکوڕی حافز ئەسەد بێژێ: «کاکی برا! ئاخەر تۆ دەزانیت ئەز بە ئاشکرا و چەند جار گوتوومە، سووریا نیشتمانی یەکەمە و، عێراقیش نیشتمانی دووەمم و، ئێمە هەردەم سوپاسبێژی سووریاین کە هەین و، ئەگەر سووریا نەبووایە ی.ن.ك.. لەدایك نەدەبوو، دەهیچ نەبێ تۆیش ئەو منداڵەکوردانە بەریدە. تۆ بزانە ئەز چەند خۆم بە براگچکەی عەرەب دەزانم. تۆ

ئەوەتە بیرۆزت بێ، ئەم سەرکۆمارییەت لە باوکتەوە بێزەحمەت و ئازار بەمیرات بەرکەوتووە. ئەوەی بەر من کەوتووە لە شێخ حیسامەدینی باوکمەوە نییە، خۆم چل ساڵە لەو چیایانە خەریکی شەڕەشەقم و، گەلی کورد لە سووریا چاوەڕوانییان لەمن ئەوەیە، لەسەر مافەکانیان هەڵبدەمێ، لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستە، بەخەونی شەوانیش، باسی دوومليۆن کوردی لای ئێوەم نەکردووە، کە چارەکە مليۆنێکیان نێزیکەی چل ساڵە، تەنانەت لە هەموو مافێکی مرۆڤ بێبەشن».

ئەرێ، مام جەلال ئەم قسەیەی نەکردووە، هەروەها **بەرهەم سالحی سەرەکوەزیرانی یەکێتی**، ئەویش کە چووەتە **میسر** و، **عەمروموسا**، بەوپەڕی رووهەڵماڵییەوە لەبەردەمی ویدا گوتوویەتی: «عێراق بەشێکە لە ولاتی عەرەب»، دەمی هەڵنەپچڕاوە بێژێ: «ببوورە. ئەوە راست نییە و تکایە دەست مەخەرە کاروباری خەڵکەوە و، لەباتی ئەوە ئەو کچەکوردانە بدەرەوە دەستم کە رژێمی سەددام لەسەر داخوازیی کاربەدەستانی ئێوە، وەك «کەنیژەك» (**جاریة**) ناردنی بۆتان، بۆ ئەوەی پێیانڕابوێرن. بێجگە لەوەش، دەبێ ئەمانەی دەستیان لەم تاوانەدا بووە، بیاندەیتە دەستمان، بۆ ئەوەی لە کوردستان بیانخەینە بەردەم دادگە».

ئەرێ، کاك بەرهەمیش، هەروەك مام جەلال، پێویستیی سەرشانی خۆی وەك کاربەدەستێکی بەڕێوەبەرێتیی سلێمانی بەجێنەهێنا و، ئەو قسەیەی نەکرد، بەڵکو میسری بە «دۆستی کورد و گەلی عێراق» دایە قەڵەم. بەرهەم سالح و مام جەلال هەردووکیان باش دەزانن کە رژێمی میسر لە هەموو رژێمێکی "عەرەبی" ی دیکەی پتر هەوڵیدا بۆ پاراستنی سەددام و، رێگرتن لە پەلاماری ئەمریکا بۆ سەر عێراق و، هەتا ئێستەش کە ئێستەیە، هیچ سەرکردەیەکی کورد، داوای لە «**جامعة الدول العربیة**» نەکردووە کە داوای لێبوردن بکا بەرامبەر بە گەلکوژی لە کورد، و دەستەبەربێ بە بژاردنەوەی ئەو زەرەروزیان و ماڵوێرانییەی لە کورد کەوتووە.

ئەوی سەرنجی بارودۆخی ئێستەی عێراق بدا، دەبینێ زۆربەی عەرەبەکان (شیعەکان و سونییەکان) کە پێکەوە نێزیکەی ٦٠٪ی خەڵکی عێراق دەبن، بەپشتی رژێمی ئێران و رژێمە عەرەبییەکان و رژێمی ترك و، لەژێر کارکردی پرۆپاگەندەی دژ بە ئەمریکایی هێندەك دەوڵەتی ئەوروپایی، کە هەرلە سەرەتاوە دژی ئەوەبوون سەددام لابیرێ (وەك ئەڵمانیا و فەرەنسا و رووسیا)، بەتەواوی، دان بە

"مجلس الحكم الانتقالی" دا نانێن و، تەنانەت هێندەك لەوانەی کە حیزبەکانیان ئەندامن لەو "مجلس" ەدا، رەخنە لە "مجلس" دەگرن و، دەیانەوێ بەزووترین کات، دەنگدانێك بکرێ لە عێراقدا و، ئەو حەلە بەدڵنیاییەوە، عەرەبە کۆنەپەرستەکان دەیبەنەوە و، هەرلە ئێستەوە، گەلێك کۆمەڵ وەك قارچك هەڵتۆقیون و، بەنێوی ئیسلامەوە کەوتوونەتە چالاکی. **لێرەدا باشە کە بزانین، کۆمەلگەی عەرەب و ترك و فارس، کۆمەڵگەیەکی کۆنەپەرستی داخراوی پیاوفەرمانی و پاشکەوتووە و، هەروا بە هاسانی نابێتە کراوە و ئازادیخواز. ئەوەتە وڵاتێکی وەك کوێت، کە گوایە لەهەموو وڵاتە عەرەبەکانی دی «پێشکەوتووتر»ە، ژنانی کوێتی بەبڕیاری پەرلەمان، لە بەشداریکردن لە دەنگداندا رێبەند (منع) کران. تەنانەت میری کوێت کە دەیویست ژنانیش مافی دەنگدانیان هەبێ، بەرامبەر بەم «دێمۆکراسی» یەی عەرەب، هیچی پێنەکرا.**

لەبەر ئەوە، لەسەر جەماوەری لێقەوماوی کورد پێویستە بکەوێتە خۆی و، نەهێڵێ ئەم دەرفەتە زێرینەی لەدەست بچێ و، چارەنووسی خۆی بگرێتە دەست خۆی. بە خۆپێشاندانی گەورە گەورە و چڕوپڕ هەر لە کوردستان و دەرەوەی کوردستاندا و، داواکردن لە ئەمریکا کە لەرێی گشتپرسییەکی دێمۆکراتانەوە، چارەنووسی باشووری کوردستان دیاریبکرێ و، هەر لەو گشتپرسییەدا، نوێنەری راستینەی کوردستان هەڵبژێرن، بۆئەوەی وتووێژێك لەگەڵ ئەمریکا سازبکرێ لەبارەی ئەوەوە کە ئایە دەکرێ لە باشووری کوردستاندا نێوچەیەك تەرخانبکرێ بۆ بنکەیەکی سوپایی ئەمریکا و، بەستنی پەیمانێك لەگەڵ ئەمریکا بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ، یان زێتر. ئەز دڵنیام لەوەی، ئەمە تاکە رێیەکە بۆ پاراستنی باشووری کوردستان و، بناخەدانان بۆ رزگارکردنی پارچەکانی دیکەی کوردستان، **چونکە ئەوەی دەتوانێ کورد بپارێزێ، «هێز» ە، نەك دەستوورێکی دێمۆکراتی، یان بەشداریی چەند هەزار پێشمەرگەیەك لە لەشکر و پۆلیسی عێراقدا**. لەکاتێکدا کە کوردستان لەهەموو لایەکەوە بەدوژمن دەورە دراوە و، ئەفسەری سەرچڵ و خەڵکی تیرۆریست و مرۆڤی تەنگەتیلکە لەنێو عێراقدا زۆر زۆرە، کە هیچ رێزی قانوون و مافی مرۆڤ ناگرن و، تەنێ لەزمانی «هێز» دەگەن. لەبەر ئەوە مانەوەی سوپایەکی ئەمریکایی لە کوردستاندا بەشێوەیەکی قانوونی و، بۆ ماوەیەکی درێژ پێویستییەکی ژیارییە بۆ کورد.

شایانی باسە کە ژمارەی کورد لە "مجلس الحکم الانتقالی" دا کە پێنج کەسە، کەمە. کورد لە عێراقدا ٧ــ٨ ملیۆن دەبن. ئەو کوردانەی کە سەددام دەربەدەریکردوون لەماوەی ئەم ٣٥ ساڵەدا، لەنیو ملیۆن بەرەوژوورترە. هەر لە عێراقدا ژمارەیەکی زۆر عەرەبی میسری و فەلەستینی و ...هتد هەن، کە سەددام پێوەندداریێتیی عێراقی داونەتێ بۆ زێترکردنی ژمارەی عەرەب و کەمکردنی ژمارەی کورد. ئەم کێشانە دەبێ چارەسەر بکرێن. شوێنەواری بەعەرەبکردنی کوردستان، هەتا ئەورۆ لانەبراوە. بێجگە لەوەش، بۆچی دەبێ لە "مجلس الحکم الانتقالی" دا پێنج عەرەبی موسڵمانی سوننی هەبێ، بەڵام یەك **ئێزدی و یەك کاکەیی** نەبێ؟ بۆچی دەبێ پێنج «ابولریش» ی کورد هەبێ و تاکە یەك ژنیش، بۆ خوێی چێشت، نەبێ؟ بۆچی دەبێ لەنێو ١٣ شیعەدا تاکە یەك کوردی شیعە نەبێ، لە کاتێکدا کە سەتهەزاران کوردی شیعە هەن (نەك تەنێ فەیلییەکان)؟ بۆچی دەبێ هیچ نرخێك بۆ چارەکە ملوێنێك ماندایی (سوبیە) دانەنرێ و لە "مجلس الحکم الانتقالی" دا تاکە یەك نوێنەریان نەبێ؟ سوبیەکان، بەگشتی مرۆڤی رۆشنبیر و ئازادیخوازن و لەنێویاندا گەلێك زانای وەك **دوکتۆر عەبدولجەبار عەبدوڵڵا و هونەر عەبدولڕەزاق عەبدولواحید** هەڵکەوتووە. حیزبەکانی کوردستان (هەموویان، نەك هەردوو زلحیزبەکە) دەبێ بزانن کە رۆژ رۆژی حیزبحیزبێنە و شەڕە پەڕۆ و پاشقول لە یەکگرتن و لەخۆباییبوون و شاردنەوەی راستیی لەگەڵ نییە. رۆژ رۆژی یەکگرتن و ئاشتیی نەتەوەیی و پێداگرتنە لەسەر مافە بنچینەییەکانی نەتەوەی کورد، کە ئەوەش ئازادی و یەکسانی و سەروەریی نەتەوەییە. رۆژ رۆژی عێراقچێتی و خۆبەکەمزانین نییە. رۆژ رۆژی ئەوەیە، وا لە دەسەڵاتدارانی ئەم جیهانە بکەین کە کۆنفرانسێکی نێونەتەوەیی ببەستن بۆ باسی چارەسەرکردنی کێشەی چل ملیۆن کورد.

شایانی باسە، کە دوورنییە کە کاربەدەستانی ئەمریکا بیر لەوە بکەنەوە کە مەرجەعییەت (مرجعیة) یێك بۆ شیعەکانی جیهان لە عێراقدا دروستبکەن. بەتایبەتی چونکە چەند زانایەکی گەورەی شیعە وەك **ئایەتوڵڵا سیستانی** لە عێراق دەژین و پیرۆزترین مەڵبەندی شیعەکانی جیهان لە نەجەف و کەربەلان و، ئەمەش گوایەدەبێتە هۆی ئەوەی شیعەکانی ئێران بە عێراقەوە ببەستێ، نەك بە پێچەوانەوە. بەڵام دەمەوێ جەخت لەسەر ئەوە بکەم کە ئەم رێیە رێیەکی چەوتوچەوێڵە و،

ئەنجامەکەشی لە ئەنجامی پشتگیریی ئەمریکا لە ئیسلامییەکانی ئەفغانستان دژ بە سۆڤێت و "کۆمۆنیستان" باشتر نابێ. کاربەدەستانی ئەمریکا، دەبێ لە هەڵەکانی خۆیان پەند وەربگرن. شتێك بەنێوی **«ئیسلامی دێمۆکراتی»** یەوە نییە، وەك چۆن **"ئیسلامی مارکسی"** و **"ئیسلامی سۆسیالیستی"** نییە و نابێ. **ئیسلام ئیسلامە و هیچی دی. بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی دێمۆکرات دەبێ پەروەردەیەکی دێمۆکراتی هەبێ، تا کۆمەڵگەیەکی دێمۆکرات بێتە کایە.**

**بەرلین: جەمال نەبەز**

**٢٠٠٣/٧/١٧**

# کاتژمێری چارەنووسی کورد
# چەند تاوێکی ماوە بۆ نیوەشەو
# مەرگەساتی مارتی ١٩٧٥ نابێ دووبارە بێتەوە

کورد، بەوکەسانەی بەڕوو تەنکن و، ئەوەی لە دڵیاندایە دەرینابڕن، دەڵێن "شەرمن". شەرمنی، دۆخێکی ڕەوانی و دەروونییە و، جیایە لە ترسنۆکی و درۆونی و شاردنەوەی ڕاستی، بەنیازی هەلپەرستی و گەیشتنە دەسکەوتی تایبەتی. لەنێو ئەم دوو دۆخەشدا، جۆرێکی دیکە هەیە، کە بەزۆری، مرۆڤی رامیار و دیپلۆماتی بەتەنگەوەهاتوو بۆ بەرژەوەندیی دەوڵەتێك، یان بەرژەوەندییەکی گشتی، نەك تایبەتی، جارویار هێندەك ڕاستی نایەننە سەرزمان، بەڵکو کورد گوتەنی، وەك "کنگر و ماست بۆ کاتی خۆی" هەڵیدەگرن، واتە بۆ بارێکی گونجاو، ئەوجا دەریدەبڕن، بەڵام کە مافێك لەبەردەم پێشێلکردندا بێ، یان تاوانێك قەومابێ و، پێویستی بەزڕاندن و خستنەڕوو هەبێ، ئەودەمە بێدەنگبوون، وەك بەشداریکردنە لە پێشێلکردنی ماف و تاوانکاریدا.

هەتا ئەو رادەیەی ئەم باسەی سەرەوە پێوەندیی بە کورد و کێشەی کوردەوە هەیە، ئەوا ئەو هەلومەرجەی کە لە سەردەمی فەرمانڕەواییی سەددامدا لەکاردا بوو، ئەوڕۆ لە بنەڕەتەوە گۆڕاوە و، هەلومەرجێکی دیی وا هاتووەتە کایەوە، کە چارەنووسی کوردی پێوە بەستراوە، لەبەر ئەوە، ئەگەر تا ئێستە، لە هێندەك کەموکورتی، چاوماِن دەپۆشی، لەبەر خاتری تەناهیی نەتەوەیی، ئەوا لەم ڕۆژەدا، نابێ بەهیچ جۆرێك، چاو لە هەڵە و گوناه و تاوانی هیچ لایەنێك بپۆشین، ئەوجا هەر لایەنێك دەبێ با ببێ، خۆ ئەگەر کەمتەرخەمیمانکرد، ئەوا خۆشمان تاوانبارین.

بۆئەوەی بچینە نێو جەرگەی باسەکەوە، حەزدەکەم بەکورتی چیرۆکی "هەرێمی نەفرین"، یان "نەوای ئارام" کە پتر لە دەساڵ لەمەوبەر باسمکردووە و، لە گەلێك وتار و سەمینار و، وتووێژی رادیۆیی و تەلەڤزیۆنیدا دووبارەمکردووەتەوە، سەرلەنوێ بیخەمە بەرچاو.

پاش ئەوەی سەددام بۆی دەرکەوت کە جەنگی هەشت ساڵەی دژ بە ئێران،

سەرەڕای ئەو هەموو یارمەتییەی کە لە رۆژهەڵات و رۆژاوا وەریدەگرت، نەیبردووەتەوە و، خەزێنەکەشی والأیە، کەوتە سەر بیری داگیرکردنی کوێت و، ئەمەش دوای ئەوەی کوێت لە سالأنی جەنگدا، بە سەتان ملوێن دۆلاری بە سەددام بەخشیبوو، کە بەشێکی زۆری ئەو پارەیە، ئەو چەکانەی پێکڕا کە کورد و عێراقییەکان و ئێرانییەکانی پێکوژران. ئالەو کاتەدا، چەکدارەکانی حیزبەکانی باشووری کوردستان، هەموو لە ئێران بوون و، چەکدارەکانی حیزبەکانی رۆژهەلأتی کوردستانیش لە عێراق بوون و، چەکدارەکانی حیزبەکانی باکووری کوردستان (واتە پێ کێ کێ) بەژمارەیەکی کەم، لە شوێنی خۆیان، خەریکی دەستوەشاندن بوون لە بنکەی پۆلیس و سەربازی ترک و، پەلاماردانی ئەو کوردانەی لە حیزبەکانی دیکەدا بوون، سەرکردەیەتییەکەشیان لە سووریا بوو. سەددام بەهۆی هەڵەکردنەوە لە لێکدانەوەی هەلومەرجی رامیاری (نێوچەیی و جیهانی) و، خۆبەزلزانین و گوێنەگرتن لە قسەی کەس، بڕیاری هەڵکوتانە سەر کوێتی دا. ئەوەشی نەگرتە بەرچاو، کە جیهان لە سالّی ١٩٩٠، دا لەشێوەی دوو بەرەییدا نەمابوو. سۆڤێت پووکابووەوە و، ئەمریکا وەك تاکە زلهێزێك لە جیهاندا مابووەوە کە ئەویش دژی داگیرکردنی کوێت بوو. بێجگە لەمەش هەموو ولأتانی جیهان تێکڕا، بەلأم هەریەکە لەبەر هۆیەکی دی، دژی داگیرکردنی کوێت بوون. ئەوە بوو لە ئەنجامدا لەشکری عێراق بەزۆر لە کوێت دەرپەڕێندرا، بەلأم ئەمریکا لەبەرخاتری "هەڤالبەند"ە ساختەکارەکانی وەك، **حوسنی موبارەکی میسر و شاحسەینی ئەردەن و شافەهدی حیجاز،** وازی لە سەددام هێنا و، دەستیشی بەرەڵلاّ کرد بۆ لێدانی کورد و شیعە و، لەوەوە ئەو گەلڕەوە دروستبوو، کە ملوێن و نیوێك تا دوو ملوێن کورد، لە شوێنی خۆیان هەلأتن و ڕوویانکردە سەر سنوورەکانی ئێران و دەوڵەتی ترك و، ئەوە بوو دەزگەی راگەیاندنی گشتی لە هەموو جیهاندا و، هەموو رۆژێك ئەو مەرگەساتەی کوردی هەلأتووی پێشانی خەڵك دەدا و، لەمەوە جۆرە بەزەییەك لەدڵی خەڵکدا پەیدا بوو بەرامبەر بەکورد. **بەرێککەوت لەو سەردەمەدا فەرانسوا میتران سەرۆککۆماری فەرەنسا و تورگوت ئۆزاڵ سەرۆکوەزیرانی دەوڵەتی ترك بوو. جۆن مەیجەریش سەرۆکوەزیرانی بەریتانیا بوو، ئەوە بوو بە هەوڵوتەقەلای میتران و گەلێك لایەن، کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان، بڕیاری دامەزراندنی هەرێمێکی نەفڕینی دا کە بە**

**«نەوای ئارام» نێوی رۆیی.**

بەڵام کاربەدەستانی حیزبەکوردییەکان رانەوەستان، تا کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیارێکی باشتر بدا بۆ کورد، چوون بۆ لای سەددام و دەستیانکردە ملی. ئەم کردەوەیە لەو ڕۆژەدا، تەرمۆمەتری بەزەییهاتنەوەی خەڵکی بە کورددا، زۆر هێنایەخوارەوە. گەلێك لەو پارەیەی کە بۆکوردستان کۆکرابووەوە، ئیدی نەدرا بە کورد.

کورت و کرمانجی، دامەزراندنی ئەم هەرێمە، لە ئەنجامی شەڕی چەکداریی حیزبە کوردییەکانەوە، یان لەئەنجامی دیپلۆماسیّتی و وتووێژی سەرکردەی حیزبەکانەوە لەگەڵ رژێمی عێراق، یان کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان نەبوو، بەڵکو لەئەنجامی گەلڕەوەکە و، ئەو بارودۆخە نێونەتەوەییەوە بوو کە باسمکرد. واتە رۆڵی حیزبەکانی تێدا نەبوو. حیزبەکان هاتنە سەرخوانی ئامادەکراو. ئەمەش قسەی ئەورۆم نییە، قسەی دەساڵ لەمەوبەرمە کە بۆ رۆژنامەی "کوردنامە" م کردووە (کوردنامە، ژمارە ٢٣، مایسی ١٩٩٣). مەبەستیشم لەمە ئەوە نییە کە بێژم کورد خەباتی نەکردووە، یان حیزبەکان هیچیان نەکردووە، کردوویانە، بەڵام ئەم "نەوای ئارام" ە، ئەنجامی ئەو خەباتە نەبووە.

پاش ئەوەی دوو زلحیزبەکە کەوتنە گیانی یەکدی و، پەرلەمانی کوردستان درایە بەر تۆپ و، گەلێك کەس کوژران و، نێوونێویانگی کورد خراپ بوو، لەگەڵێك لاوە و، چەند جارێك، پێوەندیکرا پێمەوە بۆ دامەزراندنی "حیزبێکی نەتەوەیی". بەڵام بە هەموو لایەکم راگەیاند کە ئەوکارە بەڕاست نازانم. گوتیان: "لە کوردستان دەبێ جێگرەوە (بدیل) یەکی نەتەوەیی هەبێ بەرامبەر بەم حیزب و حیزبۆڵکە نانەتەوەییانە، کە ئەمە پەنجاساڵە چەپڵە بۆ رژێمی تاوانباری سۆڤێت و، برایەتیی درۆونەی کورد و عەرەب و کورد و فارس و کورد و ترك لێدەدەن و، زورنا بۆ ئۆتۆنۆمی لێدەدەن و، خۆشت ئەوە زۆر باش دەزانیت". گوتم ئەوە راستە، بەڵام ئەگەر رێکخراوێکی نەتەوەیی هەبێ، لەم کاتەدا ناتوانێ بە سەربەخۆیی کاربکا و پەلبهاوێ و بژی، چۆنکە ئەو حیزبانە باوەڕیان بە ئازادیی بیروڕا و دێمۆکراسی نییە، ئەوجا، یان ئەوەتە دەبێ ببێتە دەسکەلای دەستی یەکێك لە زلحیزبەکان و، بکەوێتە فشەکوردایەتی، یان ئەوەتە بەچەك بەربەرەکانێیدەکەن و لەنێوی دەبەن".

گوتیان: "ئێمەش دەتوانین هێزێکی چەکدار دروستبکەین و لەسەر خۆمان بکەینەوە". گوتم: "دوور نییە بتوانن هێزێکی چەکدار دروستبکەن، بەڵام یەکەم،، ئەو هێزەی ئێوە، هەر لە شەو و ڕۆژێکدا نابێتە هێزێکی وەك ئەوەی ئەوان، چۆنکە ئەوان چەند ساڵە لەلایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە پشتگیریدەکرێن و، لەلایەکی دیکەشەوە، دەبێتە بەیەکدادان و خوێنڕژان و ئەزیش ئەوە زۆر بەخراپ دەزانم، کە کورد کورد بکوژێ لەسەر حیزبحیزبێنە". گوتیان: "ئەی چار چییە؟" گوتم: چار ئەوەیە هەوڵبدرێ کە جەماوەری ئەم حیزبانە بەبیری نەتەوەیی ئاشنا بکرێن و تێبیانبگەیەندرێ کە حیزب بووەیەکی پیرۆز نییە، بەڵکو هۆیەکە بۆ گەیشتنە ئامانجێك. هەرکوردێك کە خاین نەبێ، مافی سەربەستیی رادەربڕین و کارکردنی رامیاری هەیە، نابێ کورد دەست لە کورد بوەشێنێ". لەدواییدا، هەموو جارێك، ئەوەشم دەگوت پێیان: "کە ئەمە بیروبۆچوونی منە و بەس. ئەز نابێژم حیزب دروستمەکەن، یان دروستبکەن. ئێوە سەربەستن، خۆتان چۆنی بەباشدەزانن وابکەن". گوتیان: "باشە، ئەگەر شتێك دروستبوو، تۆ لەدژی ناوەستی؟" گوتم: "ئەگەر کاری باش بکا، ئافەرین دەکەم لێی و، ئەگەر کاری خراپ بکا، رەخنە دەگرم لێی. بەڵام بەهیچ جۆرێك ناچمە ناوی". گوتیان: "بۆچی؟" گوتم: "چۆنکە باوەڕم بە حیزبایەتی نییە، لەگەڵ ڕێزمدا بۆ ئەوانەی باوەڕیان پێیەتی".

ئەوجا، لەوکاتەوە، دەستمکرد بە هەوڵدان بۆ نێزیککردنەوەی حیزبەکان لەیەك و، هەوڵدان بۆ رازیکردنی ژمارەیەکی زۆر لە هەموو لایەك، بەتایبەتی پارتی و یەکێتی، بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ یەك، لەجیاتی لەیەکدی کوشتن و، خراپەکاری لەگەڵ یەك. دیارە هەموو راهێنان و فێربوونێکیش پێویستی بە کات و بەردەوامیی هەیە، هەتا بۆچوونەکانی لە مێشکدا دەچەسپێن و، جێی خۆیان دەگرن. پێشموایە ئەم هەڵوێستەی من کەڵکی هەبوو. بەڵام وەك هەموومان دەزانین، زلحیزبەکان، بەتایبەتی یەکێتی و پیّ کیّ کیّ و پارتی، وازیان لەڕەوشی تۆتالیتێرانە و "پێشڕەوانە" و "تاکپەرستانە" نەهێناوە، کە ئەوەش پاشماوەی زەلکاوی بیری چەپەڵی ستالینیستییە و، ئەم حیزبانە پەنجاساڵە مێشکی جەماوەری کوردی پێ بەنچ دەکەن.

لەئەنجامی شەڕەقۆچ و بەیەکدادانی حیزبەکاندا، ژمارەیەکی زۆر چەکداری هەردوولایان و هەموو لایەکیان کوژران، کە ئەمانە بێگومان ناچنە خانەی

شەهیدانەوە. بێجگە لەوەش داگیرکەرانی کوردستان توانیسیان جێپێیی خۆیان لە "هەرێمی نەفرین" دا بەباشی بکەنەوە. چۆنکە پارتی و یەکێتی بۆ رێککەوتن لەگەڵ یەك، پەنایان نەبردە بەر نەتەوەی کورد. بەڵکو چوونە سلاوی داگیرکەران.

شایانی باسە، زۆرجار لە کاربەدەستانی هەردوو زلحیزبەکە دەبیسین کە سوپاسی رژێمی ترك دەکەن کە گوایە "کورد و هەرێمی نەفرینی" پاراستووە. راستییەکەی ئەوەیە، ئەگەر ئەمریکا و بەریتانیا لە پشت پاراستنی ئەو هەرێمەوە نەبوونایە، بێجگە لەوەش، ئەگەر رژێمی ترك نەیارێکی بەهێزی وەك پیٚ کیٚ کیی نەبوایە، کە لەشکری ترکی هێنابووە هەلەکەسەما ، هەروەها دوو زلحیزبەکەی باشوور، بەتایبەتی پارتی، ئالیکاریی لەشکری ترکیای نەکردایە بۆ بەربەرەکانێی پیٚ کیٚ کیٚ، ئەوا رژێمی ترك، پاش نەمانی ئویزال، رێی بەبوونی هەرێم نەدەدا. ئەگەر بیرتان مابێ، هەر شەش مانگ جارێك پاراستنی هەرێم تازەدەکرایەوە و، ئەنجومەنی ئاسایشی ناسیۆنالی ترك، هەموو جارێك دەیگوت "لەبەر خاتری ئاسایشی ناسیۆنالی ترك" درێژکرایەوە و، ئەمەش شتێکی زۆر رۆن و ئاشکرایە کە لەبەر خاتری چاوی کاڵی کورد نەبووە. لەمەش بترازێ ئەو قسەیەش کە رژێمی ترك دەیکا کە گوایە، زیانی پارەی لێکەوتووە راست نییە، هەموو رۆژێك بە هەزاران لۆری لە عێراقەوە بۆ نێو دەوڵەتی ترك و لەوێوە بۆ عێراق بە قاچاخی لە هاتوچۆکرندا بوون و، رژێمی ترك و کاربەدەستانی هەرێم، سووتەکەیان لە خۆیان بەشدەکرد ، زیانی چی؟

شایانی باسە، کە رژێمی ترك باوەڕی نەدەکرد کە ئەمریکا و بەریتانیا ، بێ هاوکاریی ترك، بتوانن لە سەددام بدەن، یان بچن لەگەڵ کورد رێکبکەون. سەددامیش باوەڕی نەدەکرد بەوەی ئەمریکا و بەریتانیا پەلاماری عێراق بدەن، ئەگەر رژێمی ترك رازی نەبێ، رێ بە لەشکرەکانیان بدا و، هەر لەو کاتەدا ئەڵمانیا و فەرەنسا و رووسیا و چین و تەنانەت پاپاش، دژی جەنگ بوون و، بە ملوێن خۆپێشاندەر لە هەموو جیهاندا دژی جەنگ دەهاتنە سەر شەقامەکان. بەلاّم کە کار لە کارترازا ، ئەودەمە ترك پەژیوان بوونەوە و، ئێستەش دەیانەوێ، ئەمجارە، ئەوەی دەبوو بەشەڕ دەستیان بکەوتایە، زۆر بە هەرزان دەست خۆیانی بخەن و ١٠ ـــ ١٥ هەزار سەرباز رەوانەی عێراق بکەن و بە ملیار پارە وەربگرن و بکەونە فرتوفێڵ دژی کورد. لەم ماوەیەدا ، دەنگۆ هەبوو کە پارتی و یەکێتی دژی ئەوە بوون کە لەشکری

ترک لەرێی باشوورەوە بکشێتە نێو عێراقەوە. بەڵام کاربەدەستێکی سوپای ترک گوتی: "ئێمە گومانمان هەیە لەوەی کوردەکان وایانگوتبێ، چۆنکە هیچ ناشێ کورد قسەی وابکەن" (الزمان ٢٠٠٣/٨/١١)، وایە، خاڵۆی خۆیان باش ناسیوە.

بەڵام دوو زلحیزبەکە، هەتا ئێستە قوروقەپیانکردووە لە رۆنکردنەوەی هەڵوێستیان، کە لێرەدا داوادەکەم لێیان، هەڵوێست پێشانبدەن.

ئەوجا ئێستە، ئەم پرسیارانەی خوارەوە لە کاربەدەستانی دوو زلحیزبەکە دەکەم:

**١- کەسێك ئەلفوبێی زانستی رامیاری بزانێ، دەبێ ئەوە بزانێ کە فیدەراڵیزم لە دەوڵەتێکدا، سیستەمێکە بۆ هەموو دەوڵەتەکە و بڕیاردان لەسەری، بەدەست بەشێکی خەڵکی ئەو دەوڵەتە نییە، بەڵکو بەدەست هەموو خەڵکی ئەو دەوڵەتەیە. واتە، کورد، ئەگەر خۆیان بە عێراقی بزانن (کە ئەوەتە دوو زلحیزبەکە، نەك شانازی بە عێراقێتی خۆیانەوە دەکەن، بەڵکو ئاڵاکەی عێراق کە لەڕاستیدا ئاڵای سەددامە، بێ شەرمانە هەڵدەکەن و شایەرەکانیان، هەڵەبجە دەبەنە بەغدا بۆیان) بەتەنێ بۆیان نییە دەنگ بۆ فیدەراڵزم بدەن. بەشە، ئایە گەرەنتی چییە کە زۆربەی زۆری عێراق کە کورد نین، دەنگ بدەن بۆی؟ خۆئەگەر دەنگیان نەدا بۆی، دەبێ کورد رازی بێ بەوە، چۆنکە دوو زلحیزبەکە، هیچ مەرجێکیان دانەناوە بۆ ئەو دۆخە. باشە، ئەگەر کورد رازی نەبوو و سەرکێشی کرد، ئایا بەخەیاڵی حیزبەکان دەبێ چی بکرێ، چی ئامادەکراوە بۆ ئەو رۆژە؟ لێرەدا ئەو پرسیارە رەوایە خۆی دێنێتە پێشەوە، ئایا ئەم دووزلحیزبە کە بە دوانزەساڵ نەیانتوانی بەڕێوەبەرێتی لەو دوو شارەدا بکەنە یەك، تۆ بڵێت بتوانن ئەودەمە کورد لەو کوێرەوەرییە رزگاربکەن، کە ئەورۆ پێشبینی دەکەن، بەڵام پێشگیری ناکەن؟**

**٢**ـ با وادابنێین، کە زۆربەی زۆری خەڵکی عێراق، دەنگ بۆ فیدەرالیزم دەدەن، بەڵام فیدەرالیزم چەشنی زۆرە، یەکێك لەوانە ئەوەیە: هەر پارێزگەیەك بەتەنێ، یەکەیەکی فیدەرالی بێ، یان چەند پارێزگەیەك پێکەوە بدرێن لەیەك، بۆوێنە نێوی بنرێت "هەرێمی باکوور"، واتە نێوی کوردستانی لەسەر نەبێ. دوو زلحیزبەکە چ دەفەرموون؟

**٣**ـ زۆرجار باسی دەستوور و "شەڕی دەستوور" دەکرێ. دەستوور

ئەمریکاییەکان داینانێن، کۆمەڵێك پسپۆڕی عێراقی، ڕەشنووسی دەستوورەکە ئامادە دەکەن. کێ دەڵێ ئەو کۆمەڵە، دەستوورەکە بەدڵی کورد دەنووسنەوە. ئایا پێویستی نەدەکرد داخوازییەکانی کورد وەك سنووری باشووری کوردستان و نێوی هەرێم و دەسەڵاتەکانی هەرێم، لە کوبوونەوەکانی سەلاحەدین و لەندەن و ناسرییەدا بخەنە بەردەم بەرهەڵستکاران و ئەمریکا و هەموو عێراقییەك و، بێژن ئەمە داخوازیی ئێمەیە و بەم مەرجە نەبێ، ئێمە هاوکاری ناکەین؟ یان بۆ ئەو کۆبوونەوانە چەند کوردێکی لێزانیان بانگێشت بکردایە، کە نەیانکرد.

پاش ئەمە، ئایا دەستوور لە وڵاتە ڕۆژهەڵاتییەکاندا نرخی هەیە؟ فەرموون ئەوەتەی عێراق هەیە، چەندجار دەستوورەکەی گۆڕا، پاش هەر کودەتایەکی سوپایی؟ ئایا ئەمریکییەکان هەتا ڕۆژی قیامەت لە عێراقدا دەمێننەوە بۆ پاراستنی ئەو دەستوورە؟

٤ـ با وادابنێین کە عێراق بوو بە دەوڵەتێکی کۆماری و فیدەرالی و، کوردستانیش بووە هەرێمێك، ئایا گەرەنتی چییە بۆئەوەی کە هەموو ساڵێك بەهەزاران عەرەب نایەن لەو هەرێمەدا نیشتەجێ بن؟ هیچ هەرێمێکی فیدەرالی ناتوانێ ڕێ لە خەڵکی تەواوی دەوڵەتەکە بگرێ و، نەهێڵی لەو هەرێمەدا بژین. گەرەنتی چییە بۆ ئەوەی، ڕۆژێ لە ڕۆژان، زۆربەی زۆری خەڵکی هەرێم نابنە عەرەب؟ ئەوەتە دەوڵەتە عەرەبەکان خەریکی دامەزراندنی یەکێتیی بازرگانی و بازاڕی ئازاد و، یەککردنی پارەکانیانن (وەك یورۆی ئەورووپا). ئایە پێویست نەبوو، هەر لەسەرەتاوە، مەرجێك بخرێتە پێش: "نابێ لە دەستووردا بنووسرێ کە عێراق بەشێکە لە نیشتمانی عەرەب"، هەروەها مانەوە (اقامە) بۆ ئەوانەی خەڵکی کوردستان نین، لە کوردستاندا، بەپێی قانوونێکی تایبەتی دەستنیشانبکرایە؟

٥ ـ پارێزگاری بەعقوبە، لەم ڕۆژەدا، کە ئەمریکاییەکان دایاناوە و، هیچی بەدەست نییە، دەفەرموێت: "خانەقین کوردستان نییە و نابێ پەروەردەی کوردی تێدا بێ (کوردستانی نوێ)". ئایا سەربەرزییە بۆ ئەندامە کوردەکانی "مجلس الحکم الانتقالی" بێدەنگ بن و نەڵێن "ئەگەر ئەو کابرایە دەستبەجێ دەرنەکرێ، ئێمە لەم مجلس"ە دەکشێینەوە؟

٦ـ ئالەم ڕۆژەدا کە هێشتا عێراق نەبووە بە دەوڵەت و، جارێ لەشکر و

حکوومەتی نییە و، کورد جارێك هێندەك دەسەلاٚتیان هەیە و، تا هەندازەیەك قسەیان دەڕوا، ئایا پێویست نییە کە هەردوو زلحیزبەکە، تازووە هەوڵی گشتپرسییەك بدەن لە هەموو نێوچەکانی کوردستاندا و پرسیارێك لە خەڵك بکەن: ئایا سەربەخۆییان دەوێ، یان یەکگرتن لەگەڵ عێراق لەشێوەی کۆمارێکی کوردستانیی فیدەراڵدا کە، ناسنامەیەکی تایبەتی و دەستوورێکی تایبەتی هەبێ و بەزووترین کات ئەنجامەکەی، وەك بەڵگەنامەیەکی قانوونی بەکاربهێنن لە سنوورێکی نێونەتەوەییدا؟ ئەم پێشنیازەم لەکاتی خۆیدا لە "میدایا" دا بلاٚوکردەوە لەژێر سەرنێوی «ئەی گەلی رووت و برسی، لە زۆرداران نەترسی، بێژە بە خاوەن کورسی، رێ چۆلکەن بۆ گشتپرسی" (میدیا ١/٢/٢٠٠٣). بەلاٚم دوو زلحیزبەکە، بەداخەوە لەدژی وەستان و، سەیر ئەوەیە خۆشیان و هەموو کەسێك دەزانێ، کە پەرلەمانەکەیان هەشت ساڵە رەوایەتی نەماوە. بەچ مافێك، باسی پەرلەمان دەکەن و، بەچ مافێك رێ لە هەڵبژاردنێکی نوێ دەگرن؟ ئایە رێگرتن لە مافی رەوای خەڵکی باشووری کوردستان بۆ دەنگدان بە ئازادی، لەترسی ئەوەی کە دەزانن ئەمجارە لە هەڵبژاردندا زۆر ناهێنن، کەڵەگایی نییە بەسەر رەشورووتی کوردەوە؟

**٧ـ** کە ئەمریکا لە ناچاری و، پاش ئەوەی رژێمی ترك دەستی بری، روویکردە پارتی و یەکێتی و، ئەوە بوو لە رۆژێکی تایبەتیدا و کاتێکی تایبەتدا، دەبوو هەرسێ لایان لەیەك کاتدا، بگەنە کەرکووك، بەلاٚم چەکدارەکانی یەکێتی لە چەمچەماڵەوە و، چەند دەمژمێرێك لەوەبەر، کەوتنەرێ و بەرلە دوانەکەی دی، بە پەرۆکەسکەوە چوونە نێو کەرکووك، بەگەیشتنیان تالاٚن و برۆیی دەستپێکرد، کە پارتی دوای ئەوان گەیشتە ئەوێ و، ئەوانیش بە پەرۆ زەردەکەوە، دەمێك بوو، یەکێتی، کوردی کەرکووکی کردبووە چواریەکی دانیشتووانی ئەوێ. ئەمە لەکاتێکدا کە کوردی کەرکووك ئالاٚی کوردستانیان بەرز کردەوە. بەلاٚم چەکدارەکانی پارتی و یەکێتی بە فەرمانی ئەمریکا و، هەڕەشەی ترك، لە کەرکووك چوونە دەرەوە. ئەوجا لەبەر ئەوەی پارتی و یەکێتی نەیانتوانی لەسەر دانانی پارێزگارێك رێکبکەون، کوردێکی سەربەخۆ بوو بە پارێزگار و، ئەو چاتر. بەلاٚم هەتا ئەورۆکە زۆربەی زۆری کوردە دەرکراوەکانی کەرکووك، نەیانتوانیوە بگەڕێنەوە سەر ماڵ و ملکی خۆیان. بێجگە لەوەش، ئەگەر کوردێك لەسەر کارێك دابمەزرێ، دەبێ ئاشوورییەك و

ترکمانێك و عەرەبێکیش دابمەزرێنن. وادیارە ئەمریکاییەکان بەتەمانین، عەرەبە داگیرکەرەکان بەزۆر لە کەرکووك دەربکەن، بەڵکو ئەوەی بە ئارەزوو بگەڕێتەوە شوێنی خۆی، پارەی دەدەنێ، ئەوەش لەکاتێکدا کە ئەو عەرەبانە لە کەرکووکدا بمێنن، دێمۆکرافیای باشووری کوردستان تێکدەچێ. دوو زلحیزبەکە چ دەفەرموون لەوبارەوە؟

٨ - **"جامعة الدول العربية"** و لە پێش هەموویانەوە، **میسر و سووریا و حیجاز**، دان بە رەوایەتیی "مجلس الحکم الانتقالی" دا نانێن، بەبیانووی ئەوەی کە هەڵنەبژێردراوە لەلایەن "گەلی عێراق" ەوە، لەراستیشدا لەبەر ئەوەیە کە دەترسن "عروبة العراق" یان لەدەست بچێ. ئەم سێ دەوڵەتە، هەر ئەو سێ دەوڵەتەن، کە کاربەدەستانی کورد، هەر ساتە نەساتێ دەچوونە سلاویان و پەسنی رژێمەکانیان دەدا. ئایا ئێستە کاتی ئەوە نەهاتووە کە (٥) ئەندامەکوردەکەی "مجلس"، داوا لە "جامعة الدول العربية" بکەن، داوای لێبووردن بکات لە کورد و، ئامادەبێ زیانەکانیان بیژێرێتەوە و، داوا لەو دەوڵەتە عەرەبییانە بکەن کە ئەوانیش رەوایەتیی خۆیان لەرێی هەڵبژاردنی ئازادەوە بە سەرپەرشتیی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان بە ئیسپات بگەیەنن، چۆنکە هیچ رژێمێکی عەرەبی رەوایەتی نییە؟ رژێمی سووریا دەستوورەکەی خۆی گۆڕی، لەبەر خاتری ئەوەی کوڕی حافیز ئەسەد بکەنە "سەرکۆمار". ئەمانە باسی دێمۆکراسی و هەڵبژاردن دەکەن!

٩ ـ کچی کورد هەر بە کاربەدەستانی میسر نەفرۆشراون، بەڵکو بەگەلێك دەوڵەتی عەرەبی فرۆشراون. ئەو بەڵگەنامەیەی کە «میدیا» بۆ یەکەمجار بلاویکردەوە، بەڕۆنی دەریدەخا کە ئەو کچەکوردانە بەکاربەدەستانی رژێمی میسر فرۆشراون، نەك بە بازرگانانی ژن. ئایا ئێستە پێویست دەکا کە بەرێز سەلاح رەشید وەزیری مافی مرۆڤی "یەکێتی"، پاکانە بۆخۆی بکا کە ئەو نەیگوتووە شتی وابووە. بەڵکو تەنێ پرسیاری کردووە لە کاربەدەستانی میسر، تا بزانێ ئاگایان لەمە هەیە یان نا. مەبەستی زانیاری بووە لەسەر ئەو بابەتە. ئایا لەباتی ئەوە نەدەبوو حیزبی "یەکێتی" چەند خۆپێشاندانێکی گەورە سازبکا لە باشووری کوردستان و، بەغدا و ئەورووپا و ئەمریکا و، داوای لە نوێنەرێتیی میسر و دەوڵەتە عەرەبییەکانی دی بکا، کچەکوردەکان بگێرنەوە بۆ کەسوکاری خۆیان؟ وادیارە ئەم کچەکوردانەش دەچنە

ریزی ئەو چەند هەزار ژنەکوردەی کە لەم ١٠ ـ ١٢ ساڵەی دواییدا لە "هەرێمی نەفرین" بەدەستی کەرپیاوان و تاوانباران کوژران، بێ ئەوەی هیچ کاربەدەستێکی ئەم دوو حیزبە لێیان بپرسێتەوە.

بەڕاستی، کەشوهەوای ئەم رۆژانە لە کەشوهەوای سەردەمی رێککەوتننامەی مارتی ١٩٧٠ دەچێ، کە یەکێتیی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا (نوکسە) یەکەمین و تاکە رێکخراوی کوردی بوو کە گومانی خۆی بەرامبەر بەو رێککەوتننامە کاڵوکرچە بلاوکردەوە. خۆئەگەر ئەو رێککەوتننامەیە لەهەموو روویەکەوە بێ گرێ و گوڵ و کەلەبەر بوایە و، کێشەی **کەرکووك و خانەقین و مەندەلی و فەیلییەکانی** ببڕاندایەوە و، جێبەجێکردنی رێککەوتننامەکەش دەستبەجێ داوابکرایە و نەخرایە پاش چوارساڵ، بەدڵنیاییەوە کارەساتیماڵوێرانکەری مارتی ١٩٧٥ نەدەقەوما.

ئەورۆ ٢٠٠٣/٨/١٠، کە سەت رۆژ تێدەپەڕێ بەسەرکەوتنی رژێمی سەددامدا، تا ئێستە نەکوردەکانی کەرکووك چوونەتەوە جێی خۆیان و، نە ئەوانەی زیانیان لێکەوتووە، هیچ پارە و پووڵێکیان وەرگرتووە و، **کەرکووك و مووسڵ و خانەقین و مەندەلی و کووت و شارەبان و جەلەولا و شوێنە داگیرکراوەکانی باشوور، هێشتا نەخراونەتە سەر "دوو بەڕێوەبەرێتییەکە" و ئەو دوو بەڕێوەبەرێتییەش تا ئەورۆ نەبوونەتە یەك. بەڕاستی، ئەگەر جەماوەری کورد نەکەونە خۆیان، هیچ دوورنییە مارتی ١٩٧٥ جارێکی دی، بەڵام بەجۆرێکی دی، دووبارە بێتەوە. لەبەر ئەوە رۆژ رۆژی کارە و رۆژی قسەلەڕوویی و راستگۆیی و شەرمنەکردن و هەستی خۆدەربڕینە. کێش دڵی دێشێ با بیەشێ، چش و هەزارجار چش!!**

**بەرلین: ٢٠٠٣/٨/١٣**

رۆژنامەی "میدیا" هەولێر

گۆڤاری کۆنگرە - ژمارە ٢٩ (سەرماوەزی ٢٠٠٣)

رۆژنامەی ئەلێکترۆنی «نیشتمان» گەلارێزانی ٢٠٠٣

# کوردستان لەنێو بازنەی ئاگردا

خوێنەرەوەکانی ڕۆژنامەی سەربەرزی «میدیا»، ئەگەر لەبیرتان مابێ، ساڵێك پێشی پەلاماردانی ئەمریکا و هاوپەیمانانی بۆ سەر عێراق، باسی ئەوەمکرد کە ئەوەی ئەمریکا بە «کچێنی» لەساڵی ١٩٩١ دا دەیتوانی بیکا، پاش تێپەڕبوونی ١٢ ساڵ و لە سەردەمی «بێوەژنی» دا ناتوانێ بیکا. هەروەها، ئاماژەم بەو کارەساتە جەرگبڕ و نامرۆڤانەیەش دا، کە ئەمریکا لەساڵی ١٩٩١ دا بەسەر نەتەوەی کورد و شیعەکانی عێراقی هێنا، کاتێك کە جۆرج بوش (باوك) داوای لە خەڵکی عێراق کرد بەڕووی سەددامدا ڕاپەڕن، کەچی کە کورد و شیعە ڕاپەڕین، چوو دەستی سەددامی بەرەڵلاَ کرد بۆ قەلاَچۆکردنی کورد و شیعە. ئەم ڕاستینەیەش ئەوەتا ئەوڕۆ هاتووەتەدی و، بەچاوی خۆمان دەبینین کە ئەمریکا کەوتووەتە زەلکاوێکەوە تا بناگوێی هاتووە. هۆی ئەمەش ئەوەیە کە هەلومەرجی جیهانی ٢٠٠٣، وەك هی جیهانی ١٩٩١ نییە. دەرفەت لە دەستچووە و ناگەڕێتەوە. بەکورتی، هێندەك لە هەڤاڵبەندەکانی ئەمریکا، بەتایبەتی فەرەنسا و ئەڵمانیا و دەوڵەتی ترکان، پێیانوایە ترسی سۆڤێتی زلهێز نەماوە بەسەریانەوە، لەبەر ئەوە خۆیان ناچار نابینن، لەهەموو شتێکدا پشتی ئەمریکا بگرن، بەڵکو بەپێچەوانەوە، دەیانەوێ بلوکێکی ئابووری و ڕامیاری و سوپاییی سەربەخۆی دژ بە ئەمریکا پێکبهێن و، ئەم ڕێبازەش زۆر بە ئاشکرا، لەلای دەسەلاَتدارانی فەرەنسا و ئەڵمانیا دیارە و، نیوە ئاشکراش لای کاربەدەستانی ڕژێمی ترك بەرچاو دەکەوێ. ئەوەتە ئەڵمانیا و فەرەنسا سەرەڕای دوژمنایەتیی خەستوخۆڵی مێژوویان لەگەڵ یەك، وا لەیەك نێزکبوونەتەوە، وەك ئەوەی کە تۆ بڵێیت، ئەڵمانەکان لە جەنگی جیهانیی دووەمدا، فەرەنسایان داگیرنەکردبێ و، ئەمریکاش هیچ کاتێك، فەرەنسا و ئەڵمانیای لە ڕژێمی نازی ڕزگارنەکردبێ و، ئەمریکا لە مانی گەلی ئەڵمان و یەکگرتنەوەی هەردوو پارچەکەی ئەڵمانیادا، هیچ یارمەتییەکی نەدابێ و، ئەمریکا پەنجاساڵی ڕەبەق، دەوڵەتی ترکانی نەپاراستبێ و بەخێوی نەکردبێ. ئەمەش وەنەبێ شتێکی سەیربێ، بەڵکو ڕامیاری (سیاسەت) خۆی وایە. ڕامیاری نە هاوڕێیەتی و دۆستایەتی دەخوێنێتەوە و، نە هەتاهەتا لەیەك باردا دەمێنێتەوە. ڕامیاری، وەك ئەز تێگەیشتبم، بریتییە لە هەوڵدانێکی وەستایانە بۆ پێکەوە ڕاگرتنی کاتیی (موقت) بەرژەوەندییە

لەیەکچووەکان. بەرژەوەندییەکانیش شتێکی پیرۆز و هەمیشەیی نین، کە بە هیچ جۆرێك نەیەنە گۆڕان، بەڵکو بەپێی کات و شوێن، شێوەی جیاوازجیاواز وەردەگرن. ژەنەراڵ دیگۆل، کەلە سەردەمی نازییەکاندا لە فەرەنسا هەڵاتبوو و، پەنای بردبووە بەر بەریتانیا و، بەسایی لەشکری ئەمریکا و بەریتانیاوە، فەرەنسای داگیرکراوی بۆ رزگارکرا و، کرا بە سەرکۆمار، کاتی خۆی دەیگوت: «پەیماننامە، وەك گوڵ و کچی گەنجی جوان وایە». قسەکەش راست بوو. گوڵ کە زۆر مایەوە سیس و هیشك دەبێ و، کچی گەنجی جوانیش، کە پیر بوو، ئەو شۆخوشەنگییەی نامێنێ. دیارە، رۆژژمێری پار بەکاری ئەمساڵ نایەت و، پەیماننامەش هەر شتێکە وا... چۆنکە ئەوەتە جێگرەوەکەی دیگۆل، واتە جاك شیراك کە بە (جاك ئیراك نێوی رۆیوە و، بەیەکێك لە هاورێ نێزیکەکانی سەددام دادەنرێ)، فەرەنسای "هەڤاڵبەند" ی ئەمریکای گەیاندووەتە رادەیەك، کە بە قسەی تۆماس فریدمانی رۆژنامەنووسی ئەمریکایی، "فەرەنسا تەنێ رەخنە لە ئەمریکا ناگرێ، بەڵکو دوژمنایەتیی ئەمریکاش دەکات".

ئەوجا ئەو زەلکاوە قووڵەی کە ئەورۆ ئەمریکا تێیکەوتووە، کوردیش هەر تێیکەوتووە، هۆی ئەمەش حیزبحیزبێنەی ساویلکانە و کورتبینیی رامیاری و خۆپەرستیی سەرکردە حیزبییەکانە، کە بەشێکی گەورەی ئەو دەرفەتەی رووخانی رژێمی سەددام هێنایە پێشەوە، لە دەستچوو و، وا خەریکە ئەوەی ماویشە لە دەستبچێ. لێرەدا دەبێ ئەوە بخەینەڕوو، کە بەهەڵەچوونی زلهێزێکی وەك ئەمریکا، لە پێشبینیکردنی رووداوەکان و، هەڵبژاردنی هەڤاڵبەندەکانیدا، وەك بەهەڵەچوونی کوردی بێدەوڵەت و دابەشکراو و، لەهەموو لایەکەوە بە ئاگری دوژمن گەمارۆدراو نییە، چۆنکە رێژەی دەسەلاتی ئەمریکا و دەسەلاتی کورد، وەك رێژەی هێزی فیلێك و کەروێشکێك وایە. ئەمریکا کە لە جەنگی ڤیتنامدا شکا، لە ئەمریکایەتی خۆی نەکەوت، هەرچەندە زیانی بەرکەوت، بەلاّم هەرزوو خۆی گرتەوە، لەکاتێکدا کە کوردشۆرشی ئەیلوولی دۆڕاند، کۆرەوەریی بەعەرەبکردنی بەشێکی گەورەی باشووری کوردستان و، ئەنفالێکردن و، چەکی کیمیایی بوو بە تووشەوە، کە ئەوەتە پاش تێپەڕبوونی چارەکە چەرخێکیش، هەر بە دەستیانەوە دەناڵێنێ. کاربەدەستانی رژێمی ترك کە پێیانوابوو، ئەمریکا بێ رازیبوونی وان، پێناکرێ

پەلاماری سەددام بدا و، بەهەموو جۆرێك هەوڵیاندا سەددام لە کەوتن رزگار بکەن، ماوەی چەند مانگێك دەستیدەستییان بە ئەمریکا کرد و، ئەوجا لووس و باریك و، بەوپەڕی سووکایەتیپێکردنەوە چەمۆڵەیەکیان نا بەڕوویەوە. تەنێ ئەمە بوو وای لە ئەمریکا کرد، بەناچاری رووبکاتە کورد. ئەگەرنا بەدڵنیاییەوە دەبێژم، کە ئەمریکا لەوە پێش هیچ حسێبێکی بۆ "هەڤاڵبەندێتی" ی کورد نەکردبوو. بەڵام هەڵوێستی ناشییانە و خۆبەزلزانانەی ترك، پڕبە پێستی بەرژەوەندیی نەتەوەییی کورد بوو، کە مخابن حیزبحیزبێنەی پارتی و یەکێتی، رێینەدا کە کورد سووتێك لەم دەرفەتە زێڕینە ببینێ. ئەوەش هەرلە یەکەم هەنگاوی هاوبەشکاریی ئەمریکا و ئەم دوو حیزبەوە دەرکەوت، کاتێك کە ئەمریکا داوای لە چەکدارەکانی ئەم دوو حیزبە کرد، بەپێچەوانەی ئارەزووی رژێمی ترکەوە، پێکەوە لەیەك کاتدا و لەگەڵ هێزەکانی ئەمریکا، رووبکەنە کەرکووك و مووسڵ. هەرچی دووزلحیزبەکە بوو، لەباتی ئەوەی هەردوو بەرێوەبەرێتییەکەیان بکەنە یەك حکوومەت و، چەکدارەکانیشیان بکەنە یەك لەشکری کوردستانی و، پێش هەڵکوتانە سەر لەشکری عێراق، بەنووسین و مۆر و ئیمزا، پەیماننامەیەك لەگەڵ ئەمریکاییەکان سازبکەن بۆ دیاریکردنی دوارۆژی باشووری کوردستان، بە کەرکووك و مووسڵ و نێوچەکوردییەکانی دیالە و کووت و سەلاحەدینەوە و، ئەوجا لەژێر ئالای کوردستاندا بکشێن بەسەر کەرکووك و مووسڵدا و، هەر لەگەڵ رزگارکردنی ئەم دوو پارێزگەیەدا، داگیرکەری عەرەب دەربکەن و، کوردە دەرکراوەکان بهێننە جێی خۆیان و دەستبگرن بەسەر بەڵگەنامەکانی رژێمی بەعسدا و، ماڵ و موڵکی خەڵك بپارێزن، هەستان بێ حسێب و کتێب و، وەك کوردە دەبێژێ، بەکراسی بەری خۆیانەوە، روویانکردە کەرکووك و مووسڵ، ئەوجا چۆن چۆنی؟ نەك پێکەوە و، لەیەك کات و ساتدا، وەك ئەمریکا پێیراگەیاندبوون، بەڵکو یەکێتی لە پێش پارتییەوە بەچەند دەمژمێرێك و بە پەرۆی کەسکەوە و، ئەوجا پارتیش دوای ئەوان و بە پەرۆی زەردەوە، هەر بە گەیشتنیان، لەشکر و پۆلیسی عێراق، بەپێی پیلانێکی لەوەپێش نەخشەکێشراو، خۆیان شاردەوە، و ئەوجا تالان و برۆیی لە کەرکووك و مووسڵ، وەك شاری بێکەسان، دەستیپێکرد و، ئەمەش یەکەمین ئەزموونی ئەمریکا بوو لەگەڵ ئەم دوو حیزبە و، بیانوویەکیش بوو بۆ رژێمی ترك و دەسکەلاکانی کە لە "بەرەی ترکمانی" دا مۆڵیان بەستووە، بۆ

بوختـان و هەڕەشەکـردن و، هاندانی ئەمریکا دژی کـورد و، ئەوە بوو ڕژێمی ترك، بێشەرمانە، داوای لە ئەمریکا کرد کە چەکدارەکانی دوو حیزبەکە لە کەرکوك بکشێنێتـەوە و، ئەمـریکاش بەقـسـەی ترکی کـرد و، لە ئەنجـامی ئەم کـارە ناپەسندانەیەدا، کورد کرا بە چواریەکی کەرکووك و، تۆرانییەکان کە بەهێزبوونیان بەروبووی ڕاستەوخۆی حیزبحیزبێنەی پارتی و یەکێتییە، سەریان بەرزکردەوە و، عەرەبە داگیرکراوەکانیش لەجێی خۆیان مانەوە و، ئەمریکاییەکانیش پاش ئەوەی تەنگ بە لەشکرەکەیان هەڵپێچرا لەنێوچە سوونەنشینەکاندا، ئەو سەختگیرییەی پێشوویان بەرامبەر "گورگەبۆر" نەما، بەڵکو چوونەوە سلاوی ژڕێمی ترك و، "کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان" کە بەراستی "کۆمەڵی دەوڵەتە نایەکگرتووەکانە".

وەك لە ژمارەی ڕۆژی ٢٠٠٣/٩/٩ی "مـیـدیا" دا پەنجـەم ڕاکێـشـابوو بۆی، ئەمــریکاییــەکـــان لەوانەیە هێندەك "تەنازولات" بکەن بۆ ڕژێمی ترك و بۆ ئەملاوئەولا، کە لە بەرژەوەندیی کورد نەبێ، ئەوا دەبینین دەستیانپێکردووە. ئەوەتا ئالای کوردستان لە کەرکووك دەهێننەخوارێ و، ئالای سەددام هەڵدەکەن لەجیاتی وی، کە یەکێکیش لە کەرکووك لە کاربەدەستێکی ئەمریکایی پرسیبوو، بۆچی وادەکەن، گوتبووی: «ئەوە نییە لە سلێمانیش هەر ئالای عێراقیان هەڵکردووە!». شایانی باسە ئەمریکاییەکان، عەرەبە داگیرکەرەکانیش لە کوردستان دەرناکەن و دەبێژن: "ئەوە کاری ئێمە نییە، دەبێ دادگەیەکی عێراقی بڕیاربدا". لەم ماوەیەشدا چەکیان لە کوردەکان سەندووەتەوە و، نێزیکەی ٦٠٠ پۆلیسی کوردیان لەسەرکار لابردووە، لە پاداشی ئەوەدا کە ئەو پۆلیسانە چەند مانگێك کەرکووکیان لە دز و جەردە پاراست. ئەمە لەکاتێکدا "بەرەی ترکمانی" ی دەسکەلای ڕژێمی ترك، ڕێپێدەدرێ کە لە کەرکووك "کۆنگرە" بگرێ و، سەربازی ئەمریکا کۆبوونەوەکەیان دەپارێزێ و، نوێنەری هێزی ئەمریکا لە کەرکوك پیرۆزبایی دەکا لێیان و، کە لە سەرکردەی ئەم "بەرە" یەی کە بەناڕەوا بەنێوی گەلی ترکمانەوە قسە دەکات، دەپرسرێ، "بیروبۆچوونی چییە لەبارەی هاتنی لەشکری ترکەوە بۆ عێراق"، نابێژێ "ئێمە لەدژین"، بەڵکو دەفەرموێ "ئەوە کاری کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکانە". ئەمە لە کاتێکدایە کە هەموو ترکمانە نیشتمانپەروەرەکان و، هەموو کورد و عێراقییەکی ئازادیخواز، بەئاشکرا دژی هاتنی لەشکری ترکن، چۆنکە دەزانن هاتنی سەربازی

ترك بۆ پاراستنی خەڵکی عێراق و جێگیرکردنی ئاسایش نییە، بەڵکو بۆ سەرکوتکردنی کورد و ئاژاوەنانەوەیە، کە دیارە ئەوەش زیانێکی پشتشکێن بە ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی دەگەیەنێ و، هەڵەیەکی دیکەش دەخاتە سەر هەڵەزلەکانی دیکەی ئەمریکا.

رژێمی ترك، کە هەتا ئەورۆ خوێن لە لووتی سەربازێکی نەهاتووە و، بەرامبەر بە هیچ، هەشت ملیار و نیو دۆلار لە ئەمریکا وەردەگرێ، دەیەوێ بە خشکەیی باشووری کوردستان بگرێ و، لە نەخشەکێشانیشدا بۆ چارەنووسی عێراق، خاوەن بڕیاربێ و، شان بەشانی رژێمی ئیسرائیل، ئاغایەتی و کەڵەگایەتی بەسەر خۆرهەڵاتی ناڤیندا بکا. دەنگوباسەکانی پشتی پەردەی رامیاری، وارادەگەیەنن کە بەپێی ئەو پەیماننامە سوپاییەی لەنێوان رژێمی ترك و ئیسرائیلدا هەیە، لەگەڵ هاتنی لەشکری ترك بۆ کوردستان و عێراق، بەتایبەتی بۆ سەرسنووری سووریا و ئێران، پێنجهەزار (٥٠٠٠) سەربازی ئیسرائیلیش تێکەڵ بە سەربازی ترك، دێنە ژوورەوە. سەفیری تازەی ئەمریکا بۆ ئەنقەرە، کە خۆی ترکێکی جوولەکەیە، هەرلە یەکەم رۆژەوە بەکوڵ و دڵ خەریکی رازیکردنی کاربەدەستانی ترکە کە لەشکر بنێرن بۆ کوردستان و عێراق، مەلا فەرمانبەرەکانی ئێران بە بیستنی ئەم هەواڵە خورپە کەوتووەتە دڵیان و، بیر لەوە دەکەنەوە، کە بە زووترین کات، کارکردن لەسەر تاقیکردنەوەی چەکی ئەتۆمی و کیمیایی و راکێتە دوورهاوێژەکانیان پێشبخەن و، پرۆژەی ئەوەشیان لەبەر دەستدایە، کە ئەگەر لەشکری ترك کشایە باشووری کوردستان و عێراقەوە، ئەوانیش هێزێکی دەستوەشێن، بە ئاشکرا یان، بە نهێنی، بنێرنە باشووری کوردستان و باشووری عێراقەوە، ئایەتوڵڵای خەزعەلی، کە یەکێکە لە سەرکردە ئاینییە بەنێوبانگەکانی ئێران، لەنێوەڕاستی ئەم مانگەدا لە "مزگەوتی گەورە" (مسجد اعظم) لەشاری قوم (قم) لەنێو کۆمەڵێك لە "ئیعتیکافکەران" دا گوتی: "دۆخی عێراق، دۆخێکی لەبار نییە. ئیسرائیل دەیەوێ پەنجاهەزار سەرباز بنێرێتە عێراق. دەبێ ئاگامان لەخۆمان بێ".

سەرۆکوەزیرانی ترکیش، کە گوایە موسڵمانێکی خەستە، چەند رۆژێك لەمەوبەر و، بۆ شاردنەوەی ئەم راستییە و، شوێنەونکردنی، قسەیەکی کرد کە پەیامنێری رادیۆی "العراق الحر" "جان لوتفی" (کە ئێستە بووە بە "جان لەتیف) لە رۆژی ٢٢/

٩ دا لە ئەستەمووڵەوە ناردی، ئەردۆغان گوتی: "ئێران و ئیسرائیل هەردووکیان دەستیانکێشاوەتە کاروباری عێراقەوە، ئیسرائیل لە باکوور و ئێران لە باشوور و هەریەکەش دوای بەرژەوەندیی خۆی کەوتووە".

هەرلەم رۆژانەشدا، سووریا کەدان بە "مجلس الحکم الانتقالی" دا نانێ و عێراق بە داگیرکراو دەزانێ و دژی بوونی ئەمریکایە لە عێراق، کەچی ئامادەیی خۆی دەربڕی، لەگەڵ ئەمریکا هاوکاری بکا بۆ "پاراستنی یەکێتیی عێراق". رژێمی ئێرانیش کە ٢٣ ساڵە ئەمریکا بە "شەیتانی گەورە" نێودەبا، ئەویش لەترسی هەرەسهێنانی رژێمەکەی و دوژمنایەتیکردنی کورد، ئامادەیی خۆی دەربڕی، لەگەڵ ئەمریکا هاوکاری بکا، بۆ "پاراستنی یەکێتیی خاکی عێراق". هەرچی دووزلحیزبە کوردییەکەشە، ئەوەتە ئامادەن چەکدارەکانیان لە تەنیشت ئەو سەربازە عەرەبانەوە ریزبکەن، کە تا دوێنێ بوو ئەنفالیان لە کورد دەکرد و، "یەشماغ"ی عەرەبی بکەنە سەر و، مارینزەکانی ئەمریکا بپارێزن. ئەمەش هەر خەم ناکا، بەڵام بۆچی دەبێ بە "یەشماغ"ی عەرەبییەوە لەگەڵ ئەنفالکەران بچنە یەك بەرەوە. بەڵام پێکەوە کە هەردوو کورد و هاووڵاتی یەکن، نەچنە لەشکرێکی کوردستانیی یەکگرتووەوە؟ بۆچی دەبێ هەردوولایان ئامادەبن تاوەك کەمینە بچنە "مجلس الحکم الانتقالی" یەوە بێ مافی ڤیتۆ و بێ گەرەنتی و، ببنە وەزیری دەوڵەتی عێراق، بەڵام ئامادەنەبن پێکەوە یەك حکوومەت و یەك کابینەی وەزیران دابمەزرێنن؟ تکایە برایانی بەڕێز مام جەلال و کاك مەسعوود ئەم نهێنییەم تێبگەیەنن!

**ئەمریکا، زوو یان درەنگ، عێراق بەجێدەهێڵێ. هیچ هومێدی ئەوەش نییە کە رژێمی ترك و ئێران و سووریا تا ئەوکاتە بگۆڕێن و ببنە رژێمی دێموکرات و ئازادیخواز. ئێستە دەمێنێتەوە سەرئەوەی، ئایا کورد کە لەلایەن دەوڵەتانی دەوروبەر و خەڵکانی دواکەوتووەوە، بە نۆکەر و دەسکەلای ئەمریکا ناویان رۆیوە، دەتوانن خۆیان لە ئەنفالێکی هاوبەشی ترك و عەرەب و فارس بپارێزن؟ بێگومان نە .. کەواتە، کوردستان وا لەنێو بازنەی ئاگردا ... ئەی چارە چییە؟**

**چارە**، بەرلە هەموو شتێك، یەکگرتن و، هەڵوەشاندنەوەی هەردوو بەڕێوەبەرێتییەکەی پارتی و یەکێتییە و، دامەزراندنی بەڕێوەبەرێتییەکە کە هەموو لایەنە رامیاری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەکانی کوردستان بگرێتەوە، بەژن و پیاو

و، خەڵکی کەرکووك و مووسڵ و دیالە و کووت و هەموو نێوچەکانی دیکەی باشووری کوردستانەوە.

**چارە ئەوەیە،** حیزبحیزبێنە هەتاهەتا بە نەحلەت بکرێ و، نیشتمانپەروەری و لێوەشاوەیی هاووڵات، بکرێتە پێوانە، لەجیاتی پێوەنداریتیی حیزبایەتی و نێوچەیی و بنەماڵەیی، ئەمەش مانای ئەوە نییە نابێ حیزب بێ، بابێ، بەڵام بەرژەوەندیی حیزبایەتی لە خوار بەرژەوەندیی نەتەوەیی و نیشتمانییەوە دابنرێ.

**چارە ئەوەیە،** کە دێموکراسی و ئازادی و خۆهەڵکێشان پێیانەوە، هەر بە قسەنەبێ، بەڵکو هەردوو زلحیزبەکە بەکردەوە بیهێننە سەرپێ. هەربۆ نموونە، کە یەکێك تەلەفۆنێك دەکا بۆ تەلەڤیزیۆنی یەکێك لەو دووحیزبە و لە بەرنامەیەکی زیندوودا باسی سەربەخۆیی کوردستان دەکا، وەرامی بدەنەوە و، باسەکە مەخەنە پشتگوێ، یان قسەکەی نەبڕن، هەر لەبەر ئەوەی زلحیزبی خاوەن تەلەڤزیۆن باسی سەربەخۆیی ناکا و عێراقچێتی دەکا و، هەتا ئێستەش هەر ئالای سەددام هەڵدەواسێ.

**چارە ئەوەیە،** دووزلحیزبەکە رێبدەن بە جەماوەری کوردستان کە بێنە سەرشەقام و بە خۆپێشاندان بیروڕای خۆیان دەربڕن. هێندەك جار خۆپێشاندانێکی چەند هەزارکەسی سەرشەقام، دەبێتە کەرەسەی چەند رۆژێکی دەزگەی راگەیاندنی گشتی لە هەموو جیهاندا. دەبێ کورد خۆی بە خۆپێشاندانی جەماوەریی شارستانییانە رابهێنێ. پشتگیریی جەماوەری کوردستان بۆ سەربەخۆیی کوردستان، پشتگیرییە بۆ حیزبەنیشتمانپەروەرەکانیشی. ترسی پێناوێ.

**چارە ئەوەیە، کە پەرلەمانەکە، هەرچەند حەوت ساڵ تێپەڕیووە بەسەر تازەکردنەوەیدا، بەڵام دەزگەیەکە کاتی خۆی هەڵبژێردراوە، کۆبوونەوەیەکی تایبەتی سازبکا لەگەڵ نوێنەرانی ئەمریکاییەکان و "مجلس الحکم الانتقالی" دا و پێیانڕابگەیەنێ کە درێژەکێشانی هاوکاریی کورد و کوردستان، چ لەگەڵ ئەمریکا و، چ لەگەڵ "مجلس" دا لەسەر رێزگرتن لە مافەنەتەوەییەکانی کورد و کوردستان وەستاوە، ئەم خاڵانە بخاتە بەرچاو:**

١ــ کورد و خەڵکی باشووری کوردستان دژی هاتنی سەربازی وڵاتە دراوسێکانن، زۆر بەتایبەتی سەربازی ترك، ئەوجا ئەگەر کۆمەڵی نەتەوە

یەکگرتووەکان، ڕێ بەمە بدا یان نەیدا، ئەوە هەر یەکە، چونکە خەڵکی کوردستان لەهاتنی نەو سەربازانەدا دوژمنایەتیکردنی کورد و ئاژاوەنانەوە و تێکدانی ئاسایشی نەتەوەیی کوردستان دەبینن. لەبەر ئەوە لێی بێدەنگ نابن و، بەربەرەکانێیدەکەن و، ئەودەمە شەڕ و بەیەکدادان دەکەوێتە نێوان کورد و هێزەکانی ئەمریکاوە و، ئەمەش لە بەرژەوەندیی کورد و ئەمریکا و عێراق نییە و نابێ. ئەم لێشاوەش بەهیچ حیزبێك ناوەستێندرێ.

٢ـ خەڵکی باشووری کوردستان داوای سەربەخۆیی دەکەن، خۆئەگەر ئەوەش نەبێ، ئەوا بەلایەنی کەمەوە، یەکگرتنێکی وایان دەوێ لەگەڵ عێراق، کە هەر کاتێك خەڵکی باشوور ویستیان، بتوانن مافی چارەنووسی خۆیان لە ئازادیدا و بۆ ئازادی، واتە بەجیابونەوە لە عێراق، دەستنیشان بکەن. ئەمەش دەبێ بە ئاشکرا لە دەستووردا بنووسرێ و، سنووری باشووری کوردستان بە ئاشکرا و بێ پێچوپەنا دیاریبکرێ. ئەمەش دەبێ ئێستا بێ.

٣ـ هەموو داخوازییەکی دەوڵەتی ترك و سووریا و ئێران لە دەوڵەتی عێراقی دوارۆژ، بەستراوە بە هەندازەی ئامادەیی ئەو دەوڵەتانە بۆ داننان بەمافی ڕەوای کوردەکانی ژێردەستی ئەو دەوڵەتانە. ئەو مافەش دەبێ بەرەسمی دانیپێدابنرێ و، بەگۆڕینی حکوومەتەکانیان نەیەنە گۆڕان. ئەگەر دەوڵەتی ترك باسی مافی ترکمانی باشووری کوردستان و عێراق بکا، کە هەموو مافێکیان لەلایەن حکوومەتی کوردستانەوە پێدراوە، شەرم و شوورەییە، کاریەدەستانی کورد باسی مافی ٢٠ـ ٢٥ ملیۆن کوردی ژێردەستەی دەوڵەتی ترك نەکەن.

٤ـ دەبێ کێشەی تیرۆریزم لەگەڵ ئەمریکا و هاوپەیمانان یەکئالی بکرێتەوە و، تیرۆر وەك ئیدیۆلۆژییەك بۆ دەسەڵاتگرتنە دەست، جیابکرێتەوە لە بەرگریکردن لەمان و ژیان و ماڵ و نامووسی خۆ، لەلایەن کەسێکی بەشخوراو، یان نەتەوەیەکی ژێردەستە و هەڕەشەلێکراو و، مافپێشێلکراوەوە، بەرامبەر بەدەسەڵاتدارێکی دەستوەشێن. ئەوجا ئەو دەسەڵاتدارە، دەوڵەتێك بێ، یان دەستەیەك بێ، یان تاکەکەسێك بێ، ئەوە هەریەکە. ئێمەی کورد، بەرخۆدانی کورد، بەرامبەر داگیرکەرانی کوردستان، کە هەموو شێوە تیرۆرێکیان بەکار هێناوە و بەکاری دەهێنن بۆ لەنێوبردنی کورد، بەتیرۆر نازانین، بەڵکو بە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانە و

ڕەوای دەزانین. ڕەنگە لەنێو ئەم کۆمەڵ و، ئەم حیزب و ئەو حیزبی کوردستانیدا، کەسانێکی دەستوەشێن هەبن، بەڵام ئەوانە تاوانباری ئاساییـن و، ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو کۆمەڵ و حیزبانە تیرۆریستن. لەسەر داگیرکەرانی کوردستان پێویستە، دەست لە تێرۆری نەتەوەی کورد هەڵبگرن و، ڕێبدەن پێی، وەك نەتەوەیەکی ئازاد لە کوردستانی خۆیدا بژی.

**٥ــ** دەبێ مافی ژن، کوردستانی بێ، یان عێراقی، لە دەستووری نوێدا، بەزەقی دەربکەوێ، واتە: دەبێ ژن لە هەڵبژاردنی هاوڕێی ژیان و کاروجلك و، بڕیاردان لەسەر چارەنووسی خۆی ئازادبێ و، هەموو ڕێز نەگرتنێکی ئەم مافانەش لەلایەن پیاوەوە، وەك تاوان، سزای لەباری لەسەر بێ.

**٦ــ** دەبێ لە دەستووردا بەزەقی ئاین لە ڕامیاری، واتە لە دەوڵەت و حکوومەت، جیابکرێتەوە و، چۆنکە ئاینەکان، هەموویان لە ئێزدانەوە هاتوون، دیارە هەموویان پیرۆزن و، هەریەکەش بەپێی باوەڕی خۆی، هیچ ئاین و باوەڕێك نابێ لەسەروو ئاین و باوەڕێکی دیکەوە ڕابگیرێ، بەڵکو هەموویان دەبێ جێی ڕێزبن. ئەم خاڵە بەتایبەتی بۆ کورد زۆر گرنگە، چۆنکە لەنێو کورددا، سوننی و شیعە و ئێزدی و کاکەیی و ئەلەوی و شەبەك و هەققە و دیان و جوو و بەهایی و ... هتد هەیە.

**٧ــ** پێویستە، ئەگەر عەرەبەکان لەسەر ئەوە سۆربوون کە "عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب"، یان جارێ سۆر نەبوون لەسەری، هەر لە دەستووردا بنووسرێ، "گەلی کورد لە عێراقدا بەشێکە لە نەتەوەی کورد و، باشووری کوردستانیش بەشێکە لە نیشتمانی کوردستان". چۆنکە دەوڵەتی عێراق سەرلەنوێ دروستدەکرێتەوە و، عێراقی کۆنیش ئەنفالی لە کورد کردووە و ویستوویەتی لەڕێی گەلکوژییەوە کورد نەهێڵێ و، گەلان و دەوڵەتانی عەرەبیش، یان پشتی ڕژێمی عێراقیان گرتووە، یان بێدەنگ بوون. بێجگە لەوەش پێویستە هەموو زەرەروزیانێکی کورد، چ لەگەڵ، چ لە ماڵ و سامان، چ لە کولتوور، چ لە خاك ببژێردرێتەوە، کە بەپێی لێکۆڵینەوەی من دەگاتە (٢٥٠) ملیارد پاوەنی ئینگلیزی. ئەڵمانیا بەرامبەر بە گەلکوژی لە جوولەکەکان لەسەردەمی نازێتیدا (٥٠) ساڵ قەرزی ئیسرائیلی بژاردووە.

ئێستە لەبەرئەوەی باسی ئیسرائیل هاتە پێشەوە و، عەرەبەکان و ئێرانییەکان و

ترکەکانیش کوردستان بە "ئیسرائیلی دووەم" لە قەڵەم دەدەن و، دەبێژن ئیسرائیل دەیەوێ کوردستانێکی سەربەخۆ هەبێ". دەمەوێ بێژم ئەو قسەیە، یان لە نەزانینەوە دێ، یان بۆختان و درۆهەڵبەستنە بۆ کورد. ئیسرائیل لەگەڵ ترکدا لەسەر گەلێك شت رێککەوتووە و، ئەویش وەك رژێمی ترك، دژایەتیی کورد دەکا. پاڵپێوەنەرێکی ناردنی سەربازی ترك بۆ عێراق و کوردستان ئیسرائیلە. کاربەدەستانی ئیسرائیل بوون کە لە بەرلین چوار کوردیان لە پشتەوە کوشت، کە یەکێکیان کچێکی گەنج بوو، هەر لەبەر ئەوەی لەبەردەم سەفارەتخانەی ئیسرائیلدا خۆپێشاندانیان سازکردبوو بۆ بێزاریدەربڕین بەرامبەر بەوەی ئیسرائیل لەگەڵ ئەمریکا و ترك و یۆنان و کینیا، پێکەوە پیلانیان دانا بۆ رفاندنی عەبدوڵڵا ئۆجەلان، سەرکردەی پی کێ کێ. ئەمە لە کاتێکدا کە پی کێ کێ و ئۆجەلان، چەند ساڵێك لە بیقاعی لوبنان بوون و لەوێوە، بەردێکیان نەگرتە ئیسرائیل. کاتی خۆی سەرۆکوەزیرانی ئیسرائیل، نەتەنیاهوو بە رۆژنامەی "الحیاة"ی گوتبوو کە "ئەو دژی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردییە". هەروەها سەرۆکوەزیرانی ئێستەی ئیسرائیل "ئەریل شارۆن" کە کاتی خۆی چووە ئەنقەرە کوردی وەك فەلەستینی بە "تیرۆریست" دابووە قەڵەم. ئەمە لە پاداشی ئەوەدا کە بەهۆی نێوچەی رزگارکراوی کوردستانەوە لەم چل ساڵەی دواییدا، هەزاران جوولەکەی عێراقی و ئێرانی لەمردن رزگاریان بوو و، لەرێی کوردستانەوە رایانکردە دەرێ. بێجگە لەوەش، بەپێی هەواڵێك کە رۆژنامەی "هانارێتس"ی ئیسرائیلی بڵاویکردووەتەوە، وادیارە ئیسرائیل بازرگانییەك دەکا بەخوێنی کوردەوە. شایانی باسە کە دادگەی بەرزی بەرلین لەرۆژی ١٩٩٧/٤/١٠ دا رژێمی ئێرانی تاوانبار کرد بەوەی فەرمانی تیرۆرکردنی سادق شەرەفکەندی و هەڤاڵەکانی داوە کە لە مانگی ئەیلوولی ١٩٩٢ دا لەلایەن چەند ئێرانییەك و چەند لوبنانییەکەوە لە چێشتخانەی "میکۆنۆس" بەدەستڕێژی گوللە شەهیدکران. دادگەی نێوبراو، ئێرانییەك و لوبنانییەکی حوکم دا بەدرێژایی ژیان و، یەکێکی دیکە کە لوبنانی بوو بە پێنج ساڵ زیندان و یەکێکی دیکە کە ئێرانی بوو رایکرد. ئێستە دەنگۆ هەیە کە ئەڵمانیا بەتەمایە لەبەر خاتری ئیسرائیل، ئەو دوو کوردکوژە ئازاد بکا (کە هەردووکیان سەربە حیزبوڵڵای لوبنانن)، بۆ ئەوەی حیزبوڵڵا فڕۆکەوانی

ئیسرائیلی ڕوون ئاراد کە دەڵێن لای حیزبوڵڵا دیلە بەرەڵڵا بکا.

**بەڕاستی، کوردستان وا لەنێو بازنەی ئاگردا.**

**بەرلین: ٢٠٠٣/٩/٢٦**

**ڕۆژنامەی «میدیا» - هەولێر ٢٠٠٣/١٠/١**

**گۆڤاری «کۆنگرە» ژمارە ٢٩ سەرماوەزی ٢٠٠٣**

**برایانی بەرێز کاک مەسعوود بارزانی و مام جەلال تالەبانی سڵاوێکی برایانەتان لێبێ و هیوام وایە تەندروست و بێ وەی بن.**

ئەوەی پاڵی بە منەوە نا ، ئەم نامەیە بۆ هەردووکتان بنووسم، یەکەمیان ئەو وتارە بوو کە **کاک مەسعوود لە "خەبات"** دا بڵاویکردبووەوە و دڵراوکەی خۆی بەرامبەر بە بیروبۆچوونی **"فیدرالیزم لەسەر بنچینەی پارێزگەکان"** نووسیبوو، داواشی لە خەڵك کردبوو کە لێدوانی خۆیان لەو بارەوە دەرببڕن و دووەمیشیان ئەو ڕێککەوتننامەیە بوو کە **مام جەلال بەنێوی "مجلس الحكم الانتقالي" یەوە، لە ١١/١٥ دا لەگەڵ پۆل بریمەری فەرمانداری شارستانێتیی ئەمریکا لە عێراقدا، ئیمزای کردبوو و، فیدرالیزمی لەسەر بنچینەی پارێزگەکان (محافظات) دەستنیشانکردبوو.**

ئەز، بەش بەحاڵی خۆم، چەند مانگێك بەر لە نووسینەکەی کاک مەسعوود ، لە ڕۆژنامەی **«میدیا»** دا باسی ئەوەمکرد کە ڕێبازێکی وا لەنێو عەرەبەکان و بێگانەکانی دیکەدا هەیە کە فیدرالیزم لەسەر بنەمای پارێزگەکان دابمەزرێنرێ، بۆئەوەی پارێزگەکانی باشووری کوردستان لەیەك جیابکرێتەوە و، نێوی کوردستانیش بە فەرمی (ڕەسمی) کوێر بکرێتەوە و، بەو هۆیەوە دڵی داگیرکەرانی ترك و عەرەب و فارس ڕابگیرێ. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ، باوەڕم نەدەکرد بەوەی کە مام جەلال ئیمزای ڕێککەوتننامەیەکی وا بکا کە ئەگەر سەربگرێ، ئەوا دەبێتە دەستاوێژی بەبادانی ڕەنجی هەشتاساڵەی کورد لە باشووری کوردستاندا.

ئێستە بۆ ئەوەی ئەو شتانەی کە لە ڕابوردوودا لەم بارەیەوە گوتوومە و نووسیومە و، بەئێوەی بەرێزم ڕاگەیاندووە و، بەتاقیکردنەوە و تێپەڕبوونی ڕۆژگار، ڕاستییان دەرکەوتووە، جارەکی دی دووبارە نەکەمەوە، وا یەکسەر دێمە سەر باسەکەی ئەوڕۆ.

ئەوەی کە کاك مەسعوود دەفەرموێ "یەکگرتنی کورد و عێراقییەکان دەبێ بە دڵخوازی بێ" قسەیەکی بەجێیە، چۆنکە یەکگرتن بە دڵخوازی، مافی جیابوونەوەش بەدڵخوازی دەخاتە دەست، بەڵام ئەوەی کرداری ئەم قسە بەجێیە، دەستبەجێ دەهێنێتەوە سەر سفر، ئەوەیە کە ئێوەی بەرێز خۆتان بە دڵخوازی خۆتان و، بەبێ هیچ

پێشمەرجێك، لەگەڵ عێراق و لەنێو عێراقدا و، وەك پارچەیەك لە عێراق یەکتانگرتووە. بێ ئەوەی جارێ بزانن، ئایە عێراقییەکان بەو مەرجی "دڵخوازی" یە رازی دەبن یان نا! چونکە ئەگەر وا نەبووایە، ئێوە هەر لە سەرەتاوە، نەتاندەگوت **«ئێمە عێراقین و یەکێتیی عێراقمان دەوێ و سنووری عێراق دەپارێزین»** و، هەوڵتان نەدەدا کە **"سەروەرێتیی"** بۆ عێراق بگێڕنەوە، ئەو "سەروەرێتی" یەی کە ئاشەکەی هەشتاساڵە هێسقانی کورد هورد و خاش دەکا، بەڵکو دەتانگوت «عێراق دەوڵەتێکی دەستکردە و، بە پێچەوانەی رازیبوونی کوردەوە و، بەزۆری چەکی بەریتانیا، باشووری کوردستانی پێوە لکێنراوە" و، بە عەرەبەکانتان دەگوت ئەگەر دەتانەوێ پێکەوە دەوڵەتێك دروستبکەین، سا بەنێوی عێراقەوە بێ، یان بەهەر نێوێکی دیکەوە کە لەسەری رێکبکەوین، ئەوا مەرجەکانی ئێمە ئەمەیە:

**١ـ باشووری کوردستان بریتییە لە موسڵ و کەرکووك و دیالە و کوت و هەولێر و دهۆك و سلێمانی و، ئەو کەمەگەلانەی لەم سەرزەوییەدا دەژین،** لە سنووری قانوونێکی بنچینەیی باشووردا، مافی خۆبەڕێوەبردنیان دەبێ.

٢ـ ئەو دەوڵەتەی دادەمەزرێ لە ٣ یان ٤ کۆمار پێکدێ کە بەرامبەر بەیەك و بەرامبەر بە دەرەوە مافی وەك یەکیان دەبێ.

**٣ـ** سنوورەکانی **کۆمارەکان نایەنە گۆڕان.**

**٤ـ ... کۆمارێك لەم کۆمارانە مافی جیابوونەوەی هەیە، ئەگەر هاتو زۆربەی گەلەکەی دەنگیان بۆ ئەوەدا.** خۆ ئەگەر عەرەبەکان رازی نەبوونایە بەمە، ئەوا داوای ئەوە بکرایە کە باشووری کوردستان ببێتە پرۆتێکتۆراتی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان بە گەرەنتی ئەمریکا. ئەوەشم هەر کاتی خۆی لە «میدیا» دا باسکرد، بەڵام ئێوە گوێتان نەدایە، ئەوجا ئێستە هەرچەندە زۆر درەنگە، هێشتا هیوایەك هەیە، بەڵام کە دەوڵەتی عێراق دامەزرایەوە و "سەروەرێتیی" دەستکەوتەوە، ئەودەمە دەبێ "فاتیحا"ی مافی کورد بخوێنین. **داخی گرانم مام جەلال ئیمزای پەیماننامەیەکی کردووە کە بەیەك وشە نێوی کورد و کوردستانی تێدا نییە و، باسی فیدەراسیۆنی پارێزگەکان دەکا،** وەك سەردەمی شانیشینی عێراق. **کاك هۆشیار زێباریش چەند جار و چەند جار دەفەرموێ: "العراق جز من بئتة**

**العربیة" و لە عەمرو مووسا دەپاڕێتەوە کە سەرێکی عێراق بدا و، عێراق وەربگرێ بە ئەندام لە "جامعة الدول العربیة" دا. بەڵام عەمرو مووسا، وەك کاربەدەستانی دەوڵەتە عەرەبەکانی دیکە، هۆشیار زێباری بە وەزیر نازانێ، چۆنکە کوردە.** عەمرو مووسا نوێنەرێك دەنێرێ بۆ عێراق کە دەبێژێ یەکێك لە ئامانجەکانی "جامعة الدول العربیة" ئەوەیە "التاکید علی الهویة العربیة للعراق". **دوکتۆر مەحموود عوسمانیش کە کراوە بە ئەندامی "مجلس الحکم الانتقالي"** داوای فراوانکردنی "مجلس الحکم الانتقالي" دەکا، بەهێنانە نێوی "القومیون العرب و تجمع العلما السنة"واتە، ئەوانەی کە نەك هەر دان بەو "مجلس" ەدا نانێن کە دوکتۆر مەحموود کراوە بە ئەندامی، بەڵکو دان بەمافی کورددا نانێن و، هێندێکیشیان کورد بە "کافر" دادەنێن. **ئەرێ برایینە، کاك مسعوود و مام جەلال، دوکتۆر مەحموود نوێنەری کێیە، کە وا زاتی ناوەتە بەرخۆی و دەبێژێ "دەبێ ئالای عێراق کە ئالای بەعسییەکانە لە کوردستاندا هەڵبکرێ" و دەبێژێ "ئەوانەی لە کەرکووك لە خۆپێشاندانەدا باسی سەربەخۆیی کوردستانیان کردووە، بیروبۆچوونی رەسمی کورد دەرنابڕن" (ایلاف ۲۰۰۳/۱۲/۲۲).**

بەڕاستی دەبێ بڵێین **"قوڕ بەسەر کورد بۆخۆی و نوێنەری رەسمی".** دوکتۆر مەحموودی "سۆرانی" زۆرباشدەزانێ کە کورد نەیانخستووەتە ئەو "مجلس" ەوە و لەبیریشی ماوە کە لە هەڵبژاردنی ئازاددا لە کوردستان، چەند دەنگی هێنا. برایینە، کاك مەسعوود و مام جەلال! ئەگەر ئێوە هەتا ئەم دەرفەتە بەجارێك لەدەست دەرنەچووە، بەزووترین کات هەردوو بەڕێوەبەرێتییەکە نەکەنە یەك، و کاتێك دانەنێن بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمان و، پێکەوە لەگەڵ سیاسەتکارانی دیکەی کورددا نەچن بۆ ئەمریکا و، نەخشەی دوارۆژی باشووری کوردستان نەخەنە بەردەم سەرۆك بوش و هاوکارەکانی و تێیانەنەگەیەنن کە دروستکردنەوەی عێراق بەشێوەی جارانی خەون و خەیاڵە و لە بەرژەوەندیی ئەمریکا و رۆژهەڵاتی ناڤین و رێبازی دێموکراسی و ئاشتی نییە، ئەگەر کوردستانێك دروست نەبێ، ئەوا دەبێ بزانن کە وا رەنجی نەتەوەی کورد بەفیڕۆ دەڕوا و، ئەو دەمە خەڵکی کوردستان ناچار دەبن، خۆیان یەکسەر کاری خۆیان بگرنە دەست و ئێوەش ئەو دەمە پەژیوان دەبنەوە.

شایانی باسە کە **سوننییەکان لە لایەکەوە و، بەعسییەکان و ناسرییەکان** لەلایەکی دیکەوە خۆیان تەیار دەکەن لەدژی کورد. ئەوەتا سوننییەکان حیزب دروستدەکەن بەنێوی "مرجعیە" وە و بە ئاشکرا لەدژی کورد و شیعە قسە دەکەن. هەموو دەوڵەتە عەرەبەکانیش دانەجێرێ دەکەن لە کورد و بە نۆکەری ئەمریکایان دادەنێن، تەنانەت فەلەستینییەکان بانگەوازی شەڕیان داوە دژی "مجلس الحكم الانتقالي" و هەرەشە لە کورد دەکەن. فەلەستینییەکان کە دەسکەلای دەستی سەددام بوون، ئەوڕۆ باسی "مافی ترکمان" دەکەن. وەرن بزانن بەدبەختی گەیشتووەتە کوێ. بەڕاستی دەورودەری کوردستان هەموو بە ئاگر تەنراوە، کوژاندنەوەی ئەو ئاگرە بەدەستی لەرزۆکی سیاسەتبازان نایەتەدی.

**لێرەدا دوو پرسیار خۆی دەسەپێنێ بەسەر هەردوو بەڕێزدا:**

**(١) - ئەگەر ئێوە پاش نێوبژیکردنی هەموو کورد و ئەمریکا، لەماوەی پێنج ساڵدا، پاش هەزار کۆبوونەوەی دووقۆڵی نەتانتوانیبێ دوو پارێزگە بکەن بەیەك، چۆن دەتوانن هەرێمێکی فیدەراڵی ببەن بەڕێوە؟ ئەز باسی سەربەخۆیی ناکەم.**

**(٢) - ئەگەر ئەمریکا شەش مانگی دی، سەروەریی دایەوە بە عێراق و، عێراقی بەجێهێشت، کە ئێوە بۆ گێڕانەوەی ئەو سەروەرێتییە زۆر بە پەلەن، ئایا ئەو ڕۆژە نابێتە مەرگەساتی کورد؟ ئایا ئێوە کارێکی واتان کردووە کە کورد بەرەنگاری ئەو مەترسییە ببێ و کوردستان نەبێتەوە گۆڕستانی کورد؟**

ئەز چاوەڕوانی هەوڵ و کۆششی لەبار و ژیرانەتانم و،
ساڵی نوێتان پیرۆزبێ.

**تێبینیی:**

هەموو کورد و کوردستانییەك، مافی ئەوەی هەیە ئەم نامەیە بەهەر جۆرێك بۆی دەستدەدا، بلأو بکاتەوە. بەلأم بەتەواوی وەك خۆی و، بێ هیچ دەستکاری و گۆڕینێك. تکام لە ئەندامانی پارتی و یەکێتی ئەوەیە، بکەونە خۆیان و، گوشار بخەنە سەر سەرکردەکانیان بۆ یەکگرتنەوە و پێداگرتن لەسەر مافی سەربەخۆیی کوردستان و، ئەگەر سەرکردەکانیان گوێڕایەڵیان نەکرد، ئەندامان بکەونە نافەرمانیی شارستانی (عدم الطاعة المدنیة) کە مافی ڕەوای خۆیانە.

# ئەگەر حیزبەکان بەر بە جەماوەر بگرن، جەماوەر پشتیانتێدەکا

ئەورۆژەی دەستمکرد بەنووسینی ئەم وتارە، بەرێکەوت رۆژی ١١ی مارتی ٢٠٠٤ بوو، واتە، ٣٤ سالی تەواو تێپەربوو بەسەر ئەو رۆژەدا کە سەرکردەی بەعسییەکان، ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر، ئەوەی نێویاننابوو "بەیانی ١١ی مارت"، لە رادیۆ و تەلەفیزیۆنی بەغداوە خوێندییەوە و، بەوە داننانی بەعسییەکانی بە مافی "ئۆتۆنۆمیی کوردستانی عێراق" دا، بەخەلکی راگەیاند. هەر لەگەل کۆتاییهاتنی داخۆیانیکردنی بەیانەکە، کورد لەهەموو لایەکەوە دەستیانکرد بە هەلپەرکێ و چەپلەرێزان و دەربرینی هەستی شادی. ئێمە، ژمارەیەك خوێندکاری کوردی ئەو سەردەمە، رێکخراوێکمان هەبوو بە نێوی "یەکێتیی نەتەوەییی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا"، کە کورتەنێوەکەی بە ئینگلیزی و ئەلمانی "نوکسە NUKSE" بوو. ئەو رێکخراوەیە لەرۆژی ٢١ی مارتی ١٩٦٥ دا لە میونشن لەلایەن **هاوبیری هێژا هەندازیار بروسك ئیبراهیم و، هاوبیری کۆچکردوو لەتیف عەلی و، نووسەری ئەم وتارەوە دامەزرێنرا**. بەپێچەوانەی "کۆمەلەی خوێندکاری کورد لە ئەوروپا NKSSE" ەوە، کە بە قەوارە زل و بەکردەوەش زورناژەنی رژێمی سۆڤێتی تۆتالیتێر و دوژمن بە ئازادی و کورد بوو، هەرلەو کاتەشدا، گۆرەپانێك بوو بۆ ململانێی حیزبحیزبێنە و دژایەتیکردنی شۆرشی ئەیلوول بە سەرۆکایەتیی مستەفا بارزانی، رێکخراوەکەی ئێمە (نوکسە) کۆمەلێکی بەژمارە بچووك، بەلام سەربەخۆ و چالاك بوو و، بەرگریی لە شۆرشی کورد و مافی نەتەوەی کورد بۆ برینەوەی چارەنووسی خۆی دەکرد. هاوبیر بروسك ئیبراهیم سکرتێری گشتیی "نوکسە" بوو. ئێمە ناوبەناو رۆژنامەیەکمان بەزمانی ئەلمانی دەردەکرد بەنێوی "کوردستان ئینفۆرماسیۆن" ەوە. هەرپاش بەیانی ١١ی مارت بەچەند رۆژێك، هەلوێستی خۆمان لەو رۆژنامە، یان "کاتنامە" یەدا، بەرامبەر بەو بەیانە نەزۆکە خستەروو. بەکورتی نوکسە تاکە رێکخراوێکی کورد بوو، کە لەپال دەربرینی هیوای سەرگرتنی ئەو رێککەوتننامەیەدا، گومانێکی خەستی خۆی بەرامبەر بەیانەکە باسکردبوو.

ئەنجامەکەشی دەرکەوت کە ئەو گومانە لەجێی خۆیدا بوو. لەبەر ئەوە بوو کە ئێمەی سەربە ڕێبازی "نوکسە" دڵی خۆمان بەو بەیانە خۆشنەکرد و نەکەوتینە چەقەنەلێدان و گوێزەبانە بەشینەوە، وەك چۆن ئەورۆ، پاش ٣٤ ساڵ، دڵمان بە"دەستووری کاتی" خۆش نییە.

**ئێستە، دەشێ ئێمە لێرەدا ئەو پرسیارە لە خۆمان بکەین، بۆچی ئێمە دڵمان بە بەیانی مارت خۆش نەبوو و، ئەورۆش دڵمان بە "دەستووری کاتی" خۆش نییە، ئایا بەعسییەکان، وەك لەنێو خەڵکدا باوە، لە بەیانی یانزەی مارت پەژیوان بوونەوە؟**

ڕاستییەکەی، بەعسییەکان لەو بەیانەی ١١ی مارت پەژیوان نەبوونەوە، بەڵکو هەر لە سەرەتاوە باوەڕیان پێینەبوو، ئێمەش، بەعسییەکانمان باش دەناسی و دەمانزانی، ئەوان بە فێڵ و تەڵەکە و لە تاو بێدەسەڵاتیی ئەو ڕۆژەی خۆیان، ئەو ئیمزایەیان خستووەتەسەری و، هەر لە یەکەمین ساتەوە، هەوڵی خەساندنی ئەو بەیانەیان دا و، بە زنجیرەیەك کەینوبەین، وەك داونانەوە بۆ کوشتنی **سەرۆك بارزانی و ئیدریسی کوڕی** و، گواستنەوەی کورد لە **کەرکووك و مووسڵ و دیالە و کووت و بەغدا** و، دەربەدەرکردنی فەیلییەکان و، پەلاماردانی نێوچەی ئێزیدییەکان و، کوشتنی سیاسەتکارانی کورد و، پەیمانبەستن لەگەڵ ڕژێمی سۆڤێت و دەمچەورکردنی فەرەنسا و ئەمریکا و ...هتد. ئەوجا، ئەگەر ئێمە درۆ لەگەڵ خۆمان و خەڵك نەکەین، دەبێ دان بەوەدا بنێین کە هەرەسهێنانی شۆرشی ئەیلوول لە بەهاری ساڵی ١٩٧٥ دا نەبوو، بەڵکو لە بەهاری ساڵی ١٩٧٠ دا دەستیپێکرد، واتە، لە ڕێککەوتنی زرکی یانزەی مارتی ١٩٧٠ وە، چۆنکە بەعسییەکان و سەرۆك بارزانی، هەردوولایان بەنابەدڵی و بەزۆرەملی، ئەو پەیماننامەیان ئیمزاکرد. ئەگەرنا، بارزانی، هەر لە ساڵی ١٩٦٣ وە باوەڕی بە بەعسییەکان نەبوو، ئەمەشی ڕەپوڕاست بە پەیامنێری ڕۆژنامەی Le Monde ی فەرەنسی گوتبوو. بەعسییەکانی ساڵی حەفتاش، هەر بەعسییەکانی ساڵی شەستوسێ بوون و، "دەرزیی مرۆڤدۆستییان" لە خۆیان نەدابوو.

ئەوجا ئێستە، بارودۆخێکی وەك یانزەی مارتی ١٩٧٠ هاتووەتە پێشەوە و،

هێندەك لە ئەندامانی "مجلس الحکم الانتقالي"، هیجان لە بەعسییەکان نەگەڕاوەتەوە، هەرچەندە هەلومەرجی ئێوخۆیی و نێوچەیی و جیهانی، لە هێندەك ڕووەوە، لەوەی سالی ١٩٧٠ ناچێ، بەلام ئەوەی کە لەم دواییەدا لەلایەن "مجلس الحکم الانتقالي"، بەوە بەنێوی "دەستووری کاتی"، یان "قانونی بەڕێوەبردنی دەولەتی عێراق لە سەردەمی گواستنەوەدا" دەرچوو، هەروەك بەیانەکەی ١١ی مارت، بنەکەی فشەلە و پشتنابەستریٚ پێی. لە "دەستووری کاتی" دا، هەروەك بەیانی ١١ی مارت، کێشەی **کەرکووك و مووسڵ و دیالە و کووت** نەبڕاوەتەوە و، سپێردراوە بەوکاتەی عێراق "سەروەرێتیی" دەکەوێتەوە دەست و، لە عێراقدا "پەرلەمانێکی نیشتمانی" هەلدەبژێردرێ کە زۆربەی زۆری عەرەب دەبێ. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کاتێك باسی چارەنووسی ئەم نێوچانەی کوردستان دەکرێ، کە لەشکری عێراق دامەزراوەتەوە و، بە تۆپ و فڕۆکەی جەنگی و چەندسەتهەزار سەربازێکەوە ڕەختکراوە و، میلیشیاکانی هەردوو حیزبەکە بەپێی دەستوورەکە، هەلوەشاونەتەوە. بێجگە لەمەش دەستووری کاتی، هەروەك بەیانەکەی ١١ی مارت، تەنێ **هەولێر و سلێمانی و دهۆك**، واتە ئەو نێوچانەی کە پێش ٢٠٠٤/١/١٩ بەدەست پارتی و یەکێتییەوە بووە، بە "هەرێمی کوردستان" نێو دەبا. ئەمەش هەر ئەو نێوچانەیە کە سەددام بە کوردستان نێوی دەبردن و کردبوونی بە "منطقة الحکم الذاتي". کورت و کرمانجی، سنووری کوردستان دیارینەکراوە و، گەلی کوردیش لە عێراقدا بە بەشێك دانەنراوە لە نەتەوەی کورد، کەچی گەلی عەرەب لە عێراقدا بەبەشێك دانراوە لە نەتەوەی عەرەب و، ئیسلامیش بووە بە ئاینی ڕەسمیی دەولەت و، سەرچاوەیەکی قانون و، بەیەك وشە نێوی **ئاینی ئێزدی و کاکەیی و مەندایی** نەهێنراوە و، هەر لە ئێستەشەوە دەستکراوە بەپەلاماردانی ئێزیدییەکان لە شەنگار و مووسڵ. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم دەستوورە ئاوا لەرزۆکە و، بنەکەی بۆشە و، تەنێ بۆ ماوەیەکی سنووردارە، واتە، تا "سەروەرێتی" دەکەوێتەوە دەست عێراق، کەچی ئەو شیعانەی ئیمزای ئەم دەستوورەیان کردووە، هێندە دەستەوەستان و ترسنۆك و بوودەلەن، ئەوەتا هێشتا مەرەکەبی ئیمزاکانیان هیشك نەبووەتەوە، کە بە خوتبەی ئێرانییەکی وەك سیستانی دیشکەمیان لێکرد و، کەوتنە ڕەخنەگرتن لێی. **نوێنەری**

**سیستانیش دەستوورەکەی بە "گاڵتەجاڕی" (مهزلە) دایە قەڵەم. (موفق الربیعی) دەفەرموێ: بڕگەی (ج) لەدەستوورەکەدا دەگۆڕدرێ و دەڕووخێنرێ** و، دەیەوێ لەباتی ئەوە، "گەرەنتی" بدات بە کورد، وادیارە، پێی وانییە کە **«درۆزن هەر جارێك ناشتا دەکا»**. پاش ئەم هەڵوێستەی شیعەکان، پێویستە کورد پێ لەسەر مافی سەربەخۆیی دابگرن و، ئەمەش یەکەنە بەڵگە بۆ پێداگرتن لەسەر گەرەنتییەکی نێونەتەوەیی.

**موقتەدا سەدریش لەولاوە گوتی، ئەم دەستووره وەك "پەیمانی بەلفۆر وایە". (پەیمانی بەلفۆر ئەو پەیمانە بوو کە وەزیری دەرەوەی ئەو سەردەمەی بەریتانیا، بەلفۆر، دای بە جوولەکەکان! بۆ ئەوەی دەوڵەتێکی جوو بۆخۆیان دروستبکەن).**

ئەوجا بزانن، ئەمانە کورد و ئیسرائیل وەك یەك تەماشا دەکەن. **کوردیش هیچ جۆرە گەرەنتییەکی لەلایەن هاوپەیمانانەوە بەرامبەر بەم هەموو مەترسییە نییە و، هەتا ئەوڕۆش سەرکردەکانی کورد، خودێ دەست بە پەلیانەوە بگرێ، دوو شاریان نەکردووە بەیەك و، هەموو حەفتەیەك دەڵێن "حەفتەکەی دی یەکدەگرنەوە"، ساڵ لە حەفتە بڕا و ئەم نانە بەو رۆنە.**

**تا ئێستە، چەند جارێك لە رۆژنامەی "میدیا" دا ئاماژەم بەوە کردووە کە سیستانی و خۆیی و، عەبدولعەزیز حەکیم و موفق ربیعی و چەلەبی و بحرالعلوم** و ئەندامە شیعەکانی دیکەی "المجلس الحکم الانتقالي"، هەموویان بەتەمای ئەوەن کە دەوڵەتێکی شیعەی وەك ئێران لەعێراقدا بنیاتبنێن. ئەوجا سیستانی، نێوبنێن "ئیمام" و "بەفەرمانی خودێ" ببنە میری سەربڕ. راستە سیستانی و بنەماڵەی خۆیی، لەگەڵ خومەینی دۆست نەبوون و، ئێستەش لەگەڵ خامنەیی نین، ئەمەش هەر لەبەر هۆیەکی کەسیی (شخصي) یە، ئەگەرنا، لە بیروباوەڕ و ئامانج و جۆری هەڵسوکەوتدا، کوتومت وەك خومەینی و خامنەیین، ئەگەرچی سیستانی، بوێری و جەربەزەیەتیی خومەینی تێدا نییە. ئەمریکاییەکان، جاران لە ناشێتیی خۆیان، پێیانوابوو دەتوانن "مەرجەعییەت" ێك بۆ شیعەکانی عێراق، لەڕێی سیستانییەوە دروستبکەن و، بیکەنە نەیاری رژێمی ئێران، بەڵام وا هوردەهوردە، هەستیان بەهەڵەی خۆیان کردووە. ماوەیەکە، رژێمی ترك و تورانییەکان پێوەندییان

لەگەڵ سیستانی و داروودەستەکەی گرتووە، بۆ ئەوەی بیانکەنە هەڤاڵبەندی خۆیان دژی کورد.

**کورد دەبوو هەرزوو ئەوە بزانن، خومەینی چەندی بۆ کورد پێبوو، سیستانیش هەرهێندەی پێیە بۆ کورد. لەبەر ئەوە زۆر بەلامەوە سەیرە کە سیاسەتکارێکی ناسراوی کورد، وەك مام جەلال تالەبانی، بە گۆڤاری ئەلمانی "دێر شپیگڵ" بڵێ: «ئێمە (کورد) و سیستانی لەهەموو روویەکەوە رێککەوتووین و سیستانی پیاوێکی مۆدێرات (معتدل) ە و، وەك خومەینی نییە، سیستانی، دان بە فیدەرالیزمدا دەنێ بۆ کورد و، سیستانی، حکوومەتی ئاینی ناوێ ...هتد»، ئەمە لەکاتێکدا هەر پاش چەند دەمژمێرێك دوای ئەوە، سیستانی ئەو قسەیە بەدرۆ بخاتەوە و بێژێ: "کە ئەو بەهیچ جۆرێك لەگەڵ مام جەلال باسی فیدەرالێتی نەکردووە و، بیروڕای وی بەرامبەر دوارۆژی عێراق دیارە.**

**لێرەدا ئەو پرسیارە دێتەگۆڕێ، ئەگەر سیستانی باسی فێدەرالیزمی لەگەڵ مام جەلال نەکردووە، بۆچی مام جەلال ئەو قسەیە دەکا و بەو شێوەیە پەسنی (مدح) سیستانی دەدا، خۆ ئەگەر مام جەلال ئەوەی لە سیستانی بیستووە، بۆچی وەرام ناداتەوە و بێدەنگ بووە؟؟؟؟ ئایا سیاسەتکارێکی کورد، بەتایبەتی لەم رەوشە ناسکەدا، نابێ قسەکانی خۆی تاوتوێ بکا؟**

داخی گران، دوو زلحیزبەکە دەیانەوێ بەهاشەوهووشە، وای ببەنە مێشکی خەڵکەوە کە "دەستووری کاتی"، سەرکەوتنێکی یەکجار گەورەی بەدیهێناوە بۆ کورد، بەلام بەدڵنیاییەوە دەبێژم، کە ئەوە خەون و خەیاڵە. ئەو "دەستوورە" دەستکردی مەجلیسێکە کە ئەندامەکانی، خۆیان باوەڕیان بەرەوایەتیی خۆیان نییە و، هەر رۆژەنارۆژێك، شیعەکان و سوونییەکانیشیان لەگەڵ، خۆپێشاندانێکی چڕوپڕ لەدژی ئەو دەستوورە دەخەنە سەرشەقامەکان. دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانیش، لەترسی ئەو دەستوورە، کەوتوونەتە کوشتن و بڕین و زیندانیکردنی کوردەکانی بندەستی خۆیان، وەك لەم رۆژانەدا، لە رۆژهەلاتی کوردستان و رۆژاوای کوردستان

روویدا، کە **رژێمی کوڕی حافز**، بەپێی بەرنامەیەکی ئامادەکراو، سەت کوردی کوشت و سەتان کوردیشی بریندار کرد، هەر لە خوتوخۆڕایی، کەچی دوو زلحیزبەکە، لەباتی ئەوەی تاوانبارێتیی ئەم رژێمە داگیرکەرە تێرۆریستە لەدژی کورد، بەئاشکرا بەپەند بکەن، داوای وتووێژ **(حوار)** دەکەن، وەك ئەوەی کورد تا ئێستە هەر خەریکی شەڕە قۆچەقانی بووبێ. و، داوای (حوار) ی نەکردبێ. بەراستی سەیرە! رژێمی سووریا دان بەبوونی کورددا نانێ، کەچی ئەمان دەفەرموون، با کێشەکە بە (حوار) ببڕێتەوە. ئەمەش خالأنەی دیوارەکەی مالی رەجەبە. رەجەب قسەخۆشێکی خەلکی سلێمانی بوو. دیواری مالەکەیان رووخابوو، ورگ و هۆڕی مالەکەیان کەوتبووە دەرەوە، کەچی باوکی پێی گوتبوو: "رۆلە رەجەب، بچۆ دەرگەی حەوشەکە دابخە، با دز نەیەتە سەرمان!!!".

هەر لەگەلْ ئەو کوشتارەی کە رژێمی عەرەبی سووریا لە کوردی رۆژاوای کرد، دەستبەجێ **«مجێوری دوو کەعبە»** پشتی رژێمی سووریای گرت و، **حوسنی مویارەکی دۆستی سەددام و دوژمنی کوردیش، بەپەلە روویکردە دیمەشق و، لایەنگریی خۆی بۆ کوڕی حافز دژ بە "ئاژاوەگێڕانی کورد" جەخت کرد.** ئەم حوسنی مویارەکە، هەر ئەو حوسنی مویارەکەیە کە بە دەمی خۆی گوتی: **" سالی ١٩٩١ جۆرج بوش (باوکم) رازیکرد کە لەشکر نەنێرێتە عێراق و سەددام نەخا". کەچی کاربەدەستانی "هەرێمی یەکنەگرتووی سێ ستان"، دەفەرموون حوسنی مویارەك و حافز ئەسەد دۆستی گەلی کوردن.**

**ئافەرین لە خوێندکارانی زانستگەی سەلاحەدین لە هەولێر و زانستگەی سلێمانی، کە بە خۆپێشاندانی جەماوەری، تووڕەیی رۆشنبیرانی کوردیان لەرژێمی دەستوەشێنی بەعسی سووری، خستە پێش چاوی جیهان.** لە ئەورووپاش گەلێك خۆپێشاندان لەدژی رژێمی سووریا سازکران، لە **برۆکسل و لە بەرلین و ستۆکهۆلم و نۆرویژ.**

**بەرێز جەوادی مەلا، سەرۆکی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان،** دەستبەجێ پەیامی گەیاندە **بوش و بلێر و کاك مەسعوود و مام جەلال** و، داوایکرد لێیان کە بەگورجی بکەونە کار و ئەم ئەنفالە لەدژی کوردی رۆژاوا بوەستێنن. هەروەها، لەگەلْ

هاوبیرەکانی لە ٣/١٤ ، لە لەندەن خۆپێشاندانێکی جەماوەریيان رێخست و ، چوونە بەردەم سەفارەتخانەی سووریا بۆ بێزاریدەربڕین بەرامبەر خوێنڕێژیی رژێمی سووریا ، بەڵام دوو زلحیزبەکە رێیاننەدا کە ئەندامەکانیان تێکەڵ بەو خۆپێشاندانە بن! وەك کێشەی کورد ، کێشەی ئەوان نەبێ. راستییەکەشی ئەوەیە، کێشەی کورد کێشەی ئەوان نییە، چۆنکە ئەگەر کێشەی کورد کێشەی وان بوایە، کاتێك کە ستاندار (محافظ) ی **حەسەکە،** بانگی لە عەرەبەکان کرد و گوتی: "ئەمشەو رێنەدەن بە کوردەکان بخەون، بچن بیانکوژن"، ئەمان بێدەنگ دانەدەنیشتن و، سەرکردەکانیان داوای "حوار" یان نەدەکرد ، بەڵکو رژێمی سووریایان تاوانیار دەکرد و، ئەو حەلە ئەو پرسیارەیان لە خۆیان دەکرد ، بۆچی رژێمێك کە نیوملیۆن کوردی بێ "جنسية" کردبێ و، بەهێندێکیان تەنێ پارچە کاغەزێکی دابێ لەجیاتی ناسنامە، ئەوەش تەنێ بۆ ئەوەی دەربخات کە «بێگانە» یە و، لە خاکی عەرەبدا دەژی و، بەهێندێکیشیان تەنانەت ئەو پارچە کاغەزەی نەدابێ و نێوی نابن "مکتوم"، واتە "لە هەموو مافێك بێبەری"، بەڵام هەر ئەم رژێمە تێرۆریستە دوژمن بە کوردە، پەساپۆرت بدا بەهێندەك کورد کە عێراقین و، رێبدا پێیان کە لە پێتەختەکەیدا "بیرۆ" یان هەبێ، تکایە ئەم مەتەڵەمان بۆ هەڵهێنن، ئەوا ئێمە سەرمان دەرناچێ لێی. ئایا " بانێکە و دوو هەوا ؟".

ئەمە لە باشوور، لە رۆژاوای کوردستانیش، کۆنە زورناژەنی رژێمی سۆڤێت حەمید دەروێش، دووجار، هەرجارە بۆ ماوەیەکی دووردرێژ، لەگەڵ یارمەتیدەرێکی ئاسایشی رامیاری لە جزیرە، لیوا محەمەد مەنسوورە کۆبووەوە و، پاش ئەوە راپەڕینی گەلێری خەڵکی رۆژاوای بە "ئاژاوە" (فتنە) دایە قەڵەم.

هەموو ئەو رووداوانە کە لەم دواییەدا ، بەسەر نێوچەکە و جیهاندا تێپەڕین، بەراشکاوی ئەوە دەگەیەنن کە بەرەی جەنگی دژ بە سەددام و هاوکارانی سەددام، رۆژ لەدوای رۆژ، تەنگتر دەبێتەوە. بۆنموونە: پووتین کە یەکێکە لە دۆستەکانی سەددام و دژ بە سیاسەتی بوش، ئەوا هەڵبژاردنی بردەوە و بەرێژەیەکی یەکجار بەرز و ، وەك سەرکۆماری رووسیا ، کورسییەکەی خۆی داکوتا . چەند رۆژێکیش بەرلەوەی کە لە ئیسپانیا هەڵبژاردنی پەرلەمانی بکرێ، کارێکی تێرۆریستانە روویدا کە پتر لە

سەت هاوولاتی ئیسپانیا هاتنەکوشتن، کە ئەمەش هیچ دوور نییە، بەپێی پیلانێکی نەخشەبۆکێشراو بووبێ و، کات و شوێنی بۆ دەستنیشانکرابێ، تاکو ڕێکخراوی "القاعدە" وەك دەستوەشێن دیاریبکرێ، بۆ ئەوەی گەلی ئیسپانیا گوناهی ئەو کارە بخاتە ملی حکوومەتی خۆسی ماریا ئەزنار و، بێژێ: "ئەگەر ئەزنار هەڤاڵبەندێتیی بوشی نەکردایە و، نەچوایە جەنگەوە لەدژی عێراق، ئەوا ئەم کارەساتە نەدەقەوما. ئەنجامی ئەوەش ئەوە بوو، کە ئەزنار لە هەڵبژاردندا دۆڕاندی و، پارتی گوایە "سویسالیست"، بە سەرۆکایەتیی خۆسێ لویس زاساباتیرۆ بردییەوە و، هەر دەستبەجێ داوای لە بوش و بلێر کرد کە "ڕەخنە لە خۆیان بگرن کە چوونەتە جەنگەوە دژی عێراق" و هەرلەو باسەشدا گوتی: "جەنگی عێراق مەرگەسات بو، هەڵەبوو، ئەمەش مانای وایە کە ئیسپانیا، کە هەڤاڵبەندێکی گرنگی ئەمریکا بوو، لە ئەمریکا دەبڕێ و دەچێتە بنەوباڵی فەرەنسای شیراك و ئەڵمانیای شرۆیدەر، کە شیراك و شرۆیدەر هۆی تێکدانی نێوانی ئەورووپا و ئەمریکا بوون، بەنێوی پاراستنی ئاشتییەوە، بەڵام ڕاستییەکەی بۆ پاراستنی ڕژێمی سەددام بوو. هیچ دووریش نییە کە ئەڵمانیا، ئەم تێرۆرەی کە لە ئیسپانیا ڕوویدا و، بوو بەهۆی خستنی حکوومەتی ئەزنار، بکا بە بیانوو و، هێزەکەی خۆی لە ئەفغانستان بکشێنێتەوە و، بەمەش خراپەیەکی دیکە بەرامبەر ئەمریکا بکا و، گوشار لەسەر تێرۆریستان کەمبکاتەوە. هەر ئەم بیانووش دەبێتە بەڵگەی هەموو ئەوانەی کە بەچەپی و سوسیال دێموکرات و کەسك نێویان ڕۆیوە لە ئەورووپا، بۆ لەقکردنی کورسییەکەی ژێر بوش و بلێر و، خۆشخزمەتییەك بە ڕژێمە تێرۆریستەکانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست.

شایانی باسە، گەلانی ئەورووپا، هەرچەند لەنێو هەر گەلێکیاندا، کەسانی مرۆڤدۆست و ڕۆشنبیر و چاکەخواز و لێبوردە هەن، بەگژ دیکتاتۆرێتی و زۆرداری و ملهوڕیدا دەچن، بەڵام زۆربەی گەلەکانیان، بەتایبەتی ڕاستەخەڵکەکەیان، هەر بیر لەخۆیان و ژیانی پڕ لە ئاسوودە و زگی تێری خۆیان دەکەنەوە و، سیاسەتکارەکانیشیان هەر خەریکی ئەوەن، بەهەر جۆرێك دەبێ، خەڵکەکە والێبکەن، کە پێی وابێ ئەمانە بۆ زگی تێری ئەوان هەوڵدەدەن، بەڵام کە هاتنە

سەرکار، هەموو بەڵێن و گفتەکانی خۆیانیان لەبیر دەچێتەوە. خەڵکی ئەورووپا، بەپێچەوانەی گەلانی موسڵمانەوە، "ئەوە دنیایی" نین بەڵکو "ئەمە دنیاین"، دەیانەوێ ئەو تەمەنە کورتەی کە هەیانە، بەخۆشی و بەتێر و تەسەلی و سەربەستی بیبەنەسەر. بەتەمای حۆری و مۆری بەهەشت نین و، شانازی ناکەن بەوەوە کە ئەوەندە و ئەوەندە شەهیدیان داوە. بەهەشت دەور ناگێڕێ لە ژیانیاندا، هێندەی پارە و ماڵی دنیا، لەبەر ئەوە، ئامادەی قوربانیدان نین و، کە زانییان کارێك بقەیە و مەترسی تێدایە بۆیان، لێی نێزیك نابنەوە.

دیارە ئەمّ دەنگدانەی خەڵکی ئیسپانیا دژی حکوومەتەکەیان، کردارێکی دێمۆکراتانە بوو، بەڵام ساویلکەیەتی و خۆپەرستی و کورتبینیی خەڵکەکەی پێشاندا و، ئەمەش بیانەوێ و نەیانەوێ، بوو بەهۆی زاتنانەبەر تێرۆریستان و، بۆیان دەرکەوت کە "تێرۆر کەڵکی هەیە"، هۆی ئەمەش ئەوەیە کە، زۆربەی ئەورووپاییەکان، بیروبۆچوونیان لەڕێی سیاسەتکاران و دەزگەی راگەیاندنی گشتییەوە چلوورە دەبەستێ، نەك لەڕووی لێهوردبوونەوەیەکی خۆیی و توێژینەوەی رووداوەکان و دەنگوباسەکان و بەراوردکردنیان لەگەڵ یەك و گەڕان بەدوای راستیدا. ئەگەرنا، ئیسپانییەکان دەبوو بیانزانیبا، کە کورد بەتەنێ سەتوپەنجا هەزار سەربازی هەیە و، پێویستی بە ١٣٠٠ سەربازی وان نییە.

ئەورووپاییەکان بەتایبەتی و، رۆژاوا بەگشتی و، زۆر بەتایبەتی، دەوڵەتە پیشەسازەکانیان، تا ئێستە توانیویانە، زۆر و کەم بەهۆی پێشکەوتنیانەوە لە بواری تەکنیك و زانست و، نەخاسمە دروستکردنی چەکی قورس و تێسرەوێندا، گەلانی دواکەوتوو لەباری تەکنیك و زانستەوە، بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە. بەڵام وادیارە لەم ساڵانەی دواییدا، کارکردی ئەو تەکنیك و زانستە بەرەو بێهێزی دەڕوا. چونکە هێندەك لەو دەوڵەتە دیکتاتۆرانەی کە خاوەن نەوت و گاز و مەڵبەندی ستراتیژی سوپایین، توانیویانە بەشێك لەو تەکنیك و زانستانە لە ئەورووپای پارەپەرست بکڕن و، وڵاتانی ئەورووپا بترسێنن پێی. لەهەمووشی سامناکتر بۆ رۆژاوا ئیدیۆلۆژیی تێرۆرە و، زۆر بەتایبەتی، تێرۆری خۆکوژیی گرێدراو بە باوەڕێکی ئاینییەوە، کە دیارە رۆژاوا نەخشەیەکی بەکاری بەرامبەر بەوە نییە. ئەمە لەکاتێکدا کە وڵاتە

ڕۆژاواییەکان لەم پەنجاساڵەی دوایىدا بووەنە لە خەڵکی موسڵمان و، ئەم موسڵمانانە توانیویانە فەرهەنگی خۆیان لەم وڵاتانەدا بپارێزن و، دەشیانەوێ فەرهەنگەکەیان بە فەرمی (ڕەسمی) دان بنرێ پێیدا، وەك ئەوەی ئاینی ئیسلام لە قوتابخانەکاندا بخوێنرێ و، ڕێبدرێ بە کچەکانیان بە لەچك و سەری داپۆشراوەوە بچنە قوتابخانە و دەزگە ڕەسمییەکان. گەلێك لە کاربەدەستانی دەوڵەتەکانی ڕۆژاوا، کە پێوەندیی بازرگانی و ئابووریی توندوتۆڵیان لەگەڵ دەوڵەتە موسڵمانەکان هەیە، سەریان لێشێواوە و کەوتوونەتە دووزمانی و، ناتوانن ڕێ لە فەرهەنگی موسڵمانان بگرن، نەك هەر لەبەر ئەوەی سیستەمەکانیان دێمۆکراتییە و، دەبێ ڕێ بەسەربەستیی باوەڕ و ئاین بدەن، بەڵکو لەترسی لەدەستچوونی بەرژەوەندیی مادیی خۆیان، تەنانەت جاری واش هەیە، دەکەونە ماستاوکردن و دەبێژن: "ئیسلام و دێمۆکراسی دژی یەك نین".ئەمەش خالآنەی ئەوەیە کە کاتی خۆی سەرکردەکانی حیزبی توودەی ئێران دەیانگوت: "ئیسلام و کۆمۆنیزم دژی یەك نین" و، دەیانگوت ئەوە نییە لە قورئاندا هاتووە"وامرهم شوری بینهم" مەبەست لە "شوری" یەکێتیی سۆڤێت" ە. (سەرنج: فارسەکان بە "یەکێتیی سۆڤێت" دەبێژن "اتحاد شوروی").

لەکۆتایی ئەم وتارەدا دەمەوێ بێژم، کە دواڕۆژێکی نادیار چاوەڕوانی نەتەوەی کورد دەکا، لەبەر ئەوە دەبێ خوێندکاران و مامۆستایان و ژنان و کرێکاران، دەستپێشکەری بکەن و، بینە پێشەنگی جەماوەری کوردستان و، ئەوە بخەنە بەرچاو کە ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١، جەماوەری باشوور کردیان و، ڕاپەڕینی بەهاری ٢٠٠٤ جەماوەری ڕۆژاوا کردیان، حیزبەکوردییەکان، ئەگەر ناتوانن، یان نایانەوێ بینە پێشەنگی جەماوەر، با هێندە دڵسۆزی و لەخۆبوردەیی پێشانبدەن کە بێلایەن بوەستن و، بەری لێشاوی جەماوەر نەگرن. خۆ ئەگەر بەریە جەماوەر بگرن، ئەوا دڵنیابن جەماوەر پشتیانتێدەکا. ئەوسا ئەزژی ناچار دەمێنم، ببم بە شاعیری دەرباری کورد و، ئەو هەڵبەستەی **جەواهیری** کە بۆ کوردستانی گوتووە و، دەبێژێ:

شعب دعائمه الجماجم والدم
تتحطم الدنيا ولايتحطم

بە هەڵوێستێکی لەسەر ئەو کێش و لەنگەرەوە وەڵام بدەمەوە، بەڵام جارێ چاوەڕوانم.

٢٠٠٤/٣/١٦

**"میدیا" ژمارە ١٥٨، ٢٠٠٤/٣/٢١**

**کاتنامەی ئەلێکترۆنی "نیشتمان" خاکەلێوەی ٢٠٠٤**

## سی حوزەیرانی ٢٠٠٤
## ڕۆژی ڕەشپۆشی و ماتەمینیی
## نەتەوەی کوردە

**ڕۆژی ٣٠ حوزەیران، بۆ نەتەوەی کورد و خەڵکی کوردستان، ڕۆژی ماتەمینیی گشتییە، ڕۆژی کولانەوە و هاتنەوەسوێی برینی سارێژنەبووی هەرەسهێنانی شانشینی باشوور و، کۆماری ڕۆژهەڵات و، شۆرشی ئەیلوول و، نووچدانی سەرهەڵدانی باکوورە. سی حوزەیران، ئەو ڕۆژە شوومە ڕەشەیە، کە سەروەرێتی و دەسەڵات، هێدی هێدی و بە خشکەیی، دەکەوێتەوە دەست ئەنفالکەرانی کورد و، کیمیابارانکەرانی کوردستان و، بە عەرەبکەرانی کەرکووك و مووسڵ و کووت و دیالە و، کۆچپێکەران و خوێنرێژانی هەزاران کوردی فەیلیی بەغدا. ڕۆژی سی حوزەیران، ڕۆژی گریان و قوڕپێوانە، بۆ گوڵی بابردووی هیوای کوردی قوربانیدەر و خاوەن شەهید و، بێوەژنی مێردکوژراو و، کچ و کوڕی باوك شوێنونکراو و، پیرەمێرد و پیرەژنی بێکەس و خێرنەدیو. ڕۆژی سی حوزەیران، دواڕۆژی سەربەخۆییی سێ پارێزگەکەی ژێردەسەڵاتی پارتی و یەکێتییە ... ئەو سەربەخۆییەی نرخی نەزانرا!**

ئەرێ ... خەونی ئەرخەوانیی کورد، لە نیسانی ٢٠٠٣ دا و، بۆ چوارەمین جار لەماوەی سەتسالی ڕابوردوودا، هاتەوەدی و، دەرفەتێکی واهەڵکەوت بۆی، کە زۆر بەدەگمەن و دانسقە بۆ نەتەوەیەکی ژێردەستەی وەك کورد هەڵدەکەوێ. کورد بوونە هەڤاڵبەندی گەورەترین هێزی جیهان... داودەزگەی فەرمانڕەوایەتیی ترسناکترین داگیرکەری کوردستان، لە بنج و بنەڕەتەوە هەڵتەکا. نافەکی دەوڵەت و لەشکر و پۆلیس و ئاسایشی بەعسی کوردکوژی تێرۆریست، بەبڕین چوو. سەددامی مرۆڤخۆری ترزل، بەوپەڕی سووکایەتی و ئەتکپێکرانەوە گیرا و زیندانیکرا. شانبەشانی ئەمانەش، نێوی کورد و کێشەی کورد، چوونە سەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامە و گۆڤارە بەنێوبانگەکانی جیهانەوە و، باسی کورد بوو بە وێردی زمانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان و، قسەی ڕۆژانەی منداڵان و چایخانان و کۆڵانان... ڕاستە

خەڵکەکەی جیهانیش، چاوەڕوانی ئەوەبوون کە کورد ئازایانە بڕیارێکی بنبڕیدەن و، ئەو سەربەخۆییەی کە، سەرەڕای هەموو کەموکورتییەکی بینراو نەبینراوی، دوانزە ساڵ بوو کورد، لەنێو تاقمێك دوژمنی دەستوەشێنی گورگڕەوشتدا، شانازییان پێوەدەکرد، بکەنە قەوارەیەکی دانپێدانراو و، خاك و زەوی و زارە دزراوەکەیان، لە دز و جەردەکان وەربگرنەوە و، بانگی سەربەخۆیی کوردستان بدەن....

**بەڵام داخی گران و هەزاران داخی گران، سەرکردەکانی دووزلهێزەکە، ئەو سەربەخۆییەیان کرد بە قوربانی فشەبرایەتی و یەکگرتنی، گوایە "ئارەزوومەندانە"ی کورد و عەرەب، بێ پرس و ڕاکردن بە کورد، فەرموویان: کورد بە دڵخوازی خۆی بەشداری لە دەوڵەتی عێراقدا دەکات.** دیارە ئەمەش هەڵوێستێکی نابەرپرسیارانەیە و، زۆر لەسەر کورد دەکەوێت و، کورد گەلێك مافی ڕەوای خۆی لەدەستدەچێ. سەیر ئەوەیە، لەمێژووی هەشتاساڵەی بەخوێنی کورد سۆری ئەم **"برایەتی و عێراقچێتی" یە، هێندە فێرنەبوون کە داگیرکەر نابێتە برا و، دوو نیشتمانی لەیەك جیاواز، لەسایی سێبەری گەلێکی سەردەستی خۆبەزلزاندا، نابنە یەك نیشتمان و، دەوڵەتی دەستکردیش کە ڕەشەگرانەتییەکەی گرت، ئەوا تەخت و بەختی لەیەك دەترازێ و، هەر پارچەی بەلایەکدا دەچێ. عێراقی دەستکردیش، پاش بوومەلەرزەکەی نیسان، پارچە پارچەبوو، کەچی ئەمان پارچەکەی کوردیان خستەوە سەر عێراق، چۆنکە پێیانوابوو، ئەگەر خۆیان بە عێراقی دایە قەڵەم، ئەوا "برا عەرەبەکانیان" ڕایەخی ئاورێشم ڕادەخەن بۆیان و، دەیانکەنە گەورە و دەمڕاستی خۆیان. پێیانوابوو، ئەگەر لە دەوڵەتی عێراقدا، چەند وەزیرێك و چەند گزیرێکیان هەبێ، ئەوا ئەمە "یەکسانی" یە و، کورد گەیشتووەتە "هاونیشتمانێتیی پلەیەك".**

هەزاران پاڕانەوە و لالانەوەی کەسانی وەك من، بەنیازی ئامۆژگاریی دڵسۆزانە، بۆ یەکخستنی هەردوو بەڕێوەبەرێتییەکە و، دامەزراندنی حکوومەتێکی یەکگرتووی کوردستانی، وەك گوێز بژمێردرێت بۆیان وابوو. ئێستەش و ئەوساش ڕازینەبوون بەوەی دوو شار ببەستن بەیەکەوە، هەر لەبەر ئەوەشبوو، ئەوەی کە پێیدەڵێن "هەرێم"، لەباری قانوونییەوە بوونی نییە و نابێ و، پەرلەمانەکەشیان هەشت ساڵە ڕەوایەتی نەماوە. ئەنجامی ئەم سیاسەتە چەوت و چەوێڵەش، دەستهەڵگرتن بوو لە کەرکووك و مووسڵ و شوێنە داگیرکراوەکانی دیکەی باشووری کوردستان و، ئیمزاکردنی

قانوونی فیدەراڵیزمی پارێزگەکان، بێ نێوبردنی نێوی کوردستان. ئەمە لەکاتێکدا کێشەی کەرکووك، هێندە سەخت و گران نەبوو کە بیێتە راوی کێوی رەش لێیان. هێندە بەس بوو، چەند ملیۆنێك دۆلار بدەن بەو عەرەبە هاوردانەی کە ئامادەن بگەرێنەوە شوێنی خۆیان و، چەند ملیۆنێکی دیکەش بخەنە خزمەت ئەو کەرکووکییە دەرکراوانەی کە سالآنی ساڵە، بەرەشورووتی و، بێ ئاوی نێو ماڵ و بێ کارەبا و بەزگی برسی، لەبن خێوەتدادەژین... ئەوجا ئەو عەرەبانەی کە بە پارە رازینەبوونایە، دەتوانرا هەر لەگەڵ هاتنە کەرکووکی چەکدارەکانی پارتی و یەکێتی، دەربکرێن و کەرکووکییە رەسەنەکان بخرێنەوە جێی خۆیان. بەلآم حیزبحیزبێنە و شەرە پەرۆی کەسك و زەرد، ئەو هەلەشی لەدەستدا!

خوێنەرەوەی رۆژنامەی **"میدیا"** و **گۆڤاری "کۆنگرە"** باش لەبیریانە کە لە چەند ساڵی رابوردوودا، گەلێك باسم بلآوکردەوە و، گەلێك بابەتی رامیاریم رۆشنکردەوە. لە یەکێك لەو وتارانەدا پەنجەم بۆ ئەوە راکێشابوو، کە ئەمریکا، وەك زلهێزێکی پلە یەك، خاوەنی بەرژەوەندیی سوپایی و رامیاری و ئابووری و ...هتد، دیارە پاش ئەو تەنگانەیەی تێیکەوتووە، لەوانەیە هێندەك هەڵوێستبگرێ کە دژی بەرژەوەندیی کورد بێ. ئەمەش ئەوەتە بەچاوی خۆمان دەبینین، بەلآم ئەمە مانای ئەوە نییە کە کورد دەستەووەستان دابنیشن و، بەهەموو جۆرە بەشێك رازی بن، نەخێر... کوردیش دەبێ سیاسەتی نەتەوەییی خۆی هەبێ و، رێنەدا کچی خۆی بکا بە قوربانیی کورِی ماڵەدراوسێ. کاربەدەستانی دووزلحیزبەکە پێیانوابوو، ئەگەر بێتو سەری خۆیان کزبکەن و بڵێن: "فەرموو، ئەوا لەو نێوچانەی کە ئێمە فەرمانرەواین، ئاسایش هەیە و تێرۆر زۆرکەمە"، ئەوا ئەمریکا مل بۆ هەموو داخوازییەکیان دەدا! بەلآم راستییەکەی، وەك چەندجار خستوومەتە بەرچاو، پێچەوانەکەی راستە، ئەگەر دووزلحیزبەکە رێیاندەدا بەجەماوەری کورد، بە سەتهەزاران بێنە سەرشەقامەکانی هەولێر و سلێمانی و کەرکووك و مووسڵ و بەغدا و، داوای سەربەخۆییی کوردستان و، ژیاندنەوەی "پەیمانی سێڤر" و مافی برِیاری چارەنووس و گشتپرسی بکەن و، دووزلحیزبەکە لەوە نەدەترسان کە پێیانبگوترێ: "فەرموون، ئێوە باسی فیدەرالیزم دکەن، کەچی کورد باسی سەربەخۆیی دەکەن". بەدڵنیاییەوە، ئەو حەلە ئەمریکاییەکان و عەرەبەکانیش لەگەڵ، هانایان دەبردە بەر دووزلحیزبەکە و، تکایان

دەکرد لێیان کە جەماوەری کورد بە "کۆنفیدەرالیزم" رازیبکەن و لەبیری سەربەخۆیی تەنازول بکەن. ئەگەر لە خۆپێشاندانێکی چەند سەتهەزارکەسی لە هەولێر، لەرۆژی هاتنی **"ئەخزەر ئیبراهیمی" دا هاواریاندەکرد، ئەخزەری بەعسی، بچۆ بۆلای سەددامی هاوڕێت، کوردستان بەجێبهێڵە!"، ئێستە کاروباری کورد بەجۆرێکی دیکە تەماشادەکرا. دوو زلحیزبەکە چاوەڕوانی ئەوە نەدەبوون، ئەخزەر پلەی سەرۆکوەزیریەك بەکورد ببەخشێ، کە نەیبەخشی و، دای بە کۆنەبەعسییەك. خۆ ئەگەر کوردێکیش بکرایە بە سەرۆکوەزیران کە نەکرا، یان کوردێك بکرێ بە سەرکۆمار، ئەوا ئەو کوردە سەرۆکوەزیر و سەرکۆماری دەوڵەتێکی عەرەبی دەبێ،** نەك کوردستانی. **رێراست ئەوەیە کە ئەم مانگەی بەدەستەوە ماوە، لەدەستنەدرێ. پێویستە دوو زلحیزبەکە لە حکوومەتی کاتی عێراقدا بەشدارینەکەن و، جەماوەری باشووری کوردستانیش لە هەڵبژاردنی سەرتاسەریی عێراقدا بەشدارینەکەن و، لەرێی خۆپێشاندانی گەورە گەورەوە، داوای گەرەنتی ئینتەرناسیۆنالی بکەن بۆ مافی جیابوونەوە لە عێراق، هەرکاتێك پەرلەمانێکی هەڵبژێردراوی کوردستان، بەزۆریەی سادەی دەنگەکانی (نیوە + یەك)، دەنگی بۆ جیابوونەوەدا.**

پێویستە هەموو لایەك ئەوە باش بزانن، کە ئەگەر کێشەی کورد و مافی کورد و سنووری باشووری کوردستان، بەشێوەی خۆڕسکی خۆی، نەچێتە ئەجندەی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە و، لەلایەن ئەمریکا و بەریتانیاوە، گەرەنتی پاراستنی ئەو مافە و ئەو سنوورە نەکرێ و، لە دەستووری بنچینەییی عێراقدا بە ئاشکرا نەنووسرێ، کە یەکگرتنی کوردستان لە گەڵ عێراق یەکگرتنێکە، هەرکاتێك پەرلەمانێکی کوردستانی، یان گشتپرسییەکی کوردستانی، بڕیاری جیابوونەوەی دا، جیاببێتەوە، ئەوا دەبێ هەر لە ئێستەوە «فاتێحا»ی مافی کورد، نەك هەر لە باشووری ولاتەکەی و لە عێراقدا، بەڵکو لە تەواوی کوردستان و خۆرهەلاتی ناڤینندا بخوێنین.

تاقیکردنەوەکانی نەتەوەی کورد و، خەڵکی کوردستان و هەموو جیهان، ئەوە دەگەیەنن، کە هیچ مافێك لەرێی بێدەنگی و سەری خۆکزکردن و رێزگرتن لە پێشێلکارانی ئەو مافە، نەهاتووەتەدەست و نایەتەدەست. لەبەر ئەوە، نەتەوەی کوردی مافخوراو، بێدەنگ دانانیشێ، بەلام با هەموو حیزبەکان و حیزبۆڵکەکانی

کوردستان و، لە پێش هەمووشیانەوە، دووزلحیزبەکە، کە دوانزەساڵ، کات و سەربەخۆییان هەبوو، کەچی نیوەی ئەوکاتەیان بە شەڕی خۆکوژی و، نیوەکەی دیکەشیان، بەدانە جیرێ لەیەکدی بردەسەر، وەکو دەمێك لەمەوبەر خستوومەتە بەرچاویان، ئیدی وەك جاری جاران، ناتوانن بە قالۆرە شکاوەوە بکەونە کەژ و کێو و سەرلەنوێ! "کورتانەکەی جەجاڵ" بە رەشورووتی کورد بدوورنەوە و، هەر دەمێکیش دەستیانڕۆیی، رێز بۆ جەماوەر دانەنێن. بزووتنەوەی ئەمجارە، تا ئەو هەندازەیەی ئەز بتوانم پێشبێنیبکەم، بەشێوەیەکی زۆرجیاواز لە شێوە باوەکان دەکرێ! ئەوجا ئەو بزووتنەوەیە بەچەشنی ئاژاوەیەکی رادیکاڵی پچڕپچڕ و هەرکەس بۆخۆیی دەبێ، یان لەجۆری بزووتنەوەیەکی بەرنامەداری رۆشنبیرانەدا دەبێ، ئەوە جارێ زووە بۆ هێنانەبەرچاوی، بەڵام بەدڵنیاییەوە دەبێژم کە "سەرۆك" و "رێبەر" دەوری فەرمانڕەواییان نابێ، چۆنکە ئەو دەمە نەریتی "سەرۆکایەتی" و "بنۆکایەتی" نرخی نامێنێ و دەرابەی دوکانی حیزبجیزبێنە و پیاوفەرمانی و ژندوژمنی، بەهۆی ساردی بازاڕەوە، بەرەو دادانەوە دەچێ. چینی خوێندەواری هوردەبۆرژاوی کوردیش، کە بووە بە ئەسپێی کراسەکۆنی کۆمەڵگەی کورد و، لە هەڵمەتەکاسەیی و ماستاوکردن و دووڕوویدا بەشی کەسی نەداوە، بەرەو نابووتی و ریسوایی دەڕوا.

رۆژنامەی "مسدیا" ژ ۱٦۳، ۲۰۰٤/٦/۱

کاتنامەی ئەلێکترۆنی "نیشتمان" پووشپەڕی ۲۰۰٤

## برایانی بەڕێز کاکە مەسعوود بارزانی و مام جەلال تاڵەبانی

سلاوێکی برایانەتان لێبێ و هیوام وایە تەندروست بن.

هۆی نووسینی ئەم چەند دێڕە بۆ بەڕێزتان، ئەو نامەیەیە کە لەڕۆژی ١/٦/ ٢٠٠٤، بە ئینگلیزی نووسیبووتان بۆ سەرکۆماری ئەمریکا، جۆرج دەبلیو بوش.

بەرلەهەموو شتێك دەمەوێ بێژم کە ئێمەی کورد، سەبارەت بەو هەلومەرجە لە سنووربەدەرە خراپەی کە تێیدا دەژین، ئەگەر هاتو نەمانویست، نیازی دڵی خۆمان بەڕاشکاوی، بە نەیاران و ناحەزان رابگەیەنین، یان ناچار بووین، هێندێك لە ئامانجەکانی خۆمان بشارینەوە لێیان، بۆ ئەوەی لە شەڕیان دووربین، بێگومان دەبێ لەنێو خۆماندا و لەگەڵ خۆمان راستگۆ و قسە لەڕووبین. دیارە قسەی هەق رەقە و، کورد جوانیانگوتووە "دۆست ئەوەیە دەتگرێنێ و، دوژمن ئەوەیە دەتکەنێنێ"، لەبەر ئەوە دەبێ ببوورن لێم، کە بەم وشە بێکراس و کەوایانەم، دڵتان ناخۆش دەکەم، چۆنکە ئەز، وەك برا و دۆستی ئێوە، بەپێویستی دەزانم، بێ لەڕوو بەرمایی، لەگەڵتان بدوێم.

براینە!

لە نامەکەتاندا، ناڕاستەوخۆ، واپێشاندەدەن، کە ئەمریکا ناڕەوایی کردووە بەرامبەر بە کورد، کە گوایە منەتی نەزانیوە لەوەی چەکداری کورد، شان بەشانی چەکداری ئەمریکا و هاوپەیمانانی، خوێنیان رژاوە لەپێناوی ئازادیی عێراقدا و، ئەمریکاییەکان پاداشی کوردیان زۆر بەخراپی داوەتەوە.

هەر لەوکاتەدا چاوەڕوانیی ئەوە دەکەن لە ئەمریکا، کە پلەی سەرۆکوەزیری، یان سەرکۆماریی عێراق، بۆ کورد مسۆگەر بکا و، لەباری ئابووریشەوە خۆتان بە "مافخوراو" دادەنێن لەچاو عەرەبەکاندا و، داوای پارەی زۆرتر دەکەن.

راستییەکەی، ئەم هەڵوێستەی بەڕێزتان، هەڵوێستێکی سادەکارانە و، هەڵپەی ناهومێدانەی لەکاروان بەجێماوانەیە و، لە مرۆڤی سیاسەتکار ناوەشێتەوە. ئەگەر چاوێکی بابەتانە و بەویژدانانە بە هەڵسوکەوت و کردەوەکانی خۆتاندا بخشێننەوە، بەتایبەتی لەسەردەمی دوانزەساڵەی

فەرمانڕەوایيتاندا لە "هەرێمی ئاسایش"، چ پێش و چ پاش رووخانی رژێمی سەددام، ئەوسا تێدەگەن کە گوناهی هەرەگەورەی لەدەستچوونی ئەو دەرفەتە مێژووییەی کە بۆ کورد هەڵکەوتبوو، دەکەوێتە ئەستۆی دژایەتیی توندوتیژ و رکەبەریی ناحەزانەتان بەرامبەر یەکدی، بەڵام هەرزانفرۆشی و خۆ بە کەمگرتنتان بەرامبەر داگیرکەران و دوژمنانی نەتەوەی کورد، ئەز، وەك شارەزایەکی سیاسەت و جۆری بیرکردنەوەی رۆژاواییەکان، ئەمە دەساڵ پترە، چ لەڕێی وتاری رۆژنامەوە و، چ لەڕێی وتووێژی رادیۆیی و تەلەفزیۆنییەوە و، چ لەڕێی نامەناردنەوە بۆتان و، چ لەڕێی پێوەندیی دوویەدووەوە لەگەڵتان، دەمویست کارێك بکەم، کە ئێوە لەپێناوی بەرژەوەندیی بەرزی نەتەوەی کورددا یەکبگرن و دەسکەوتی تەسکوتریسکی حیزبایەتی و بنەماڵەیی، بخەنە لاوە. ئەوەشم رۆنکردەوە بۆتان کە ئەمریکا برای باوکی کەس نییە، بەڵکو زلهێزێکی خاوەن بەرژەوەندییە و، بەپێی ئەو بەرژەوەندییە و، لەسنووری ئەو بەرژەوەندییەدا دەجووڵێتەوە و، هەڤاڵبەند و نەیار دەستنیشاندەکا.

ئەوەی راستی بێ، ئەمریکا لە چوارچێوەی ئەو سنوورەدا، گەلێك کاری باشی بۆ کورد و، بەتایبەتی بۆ هەردووکتان کردووە. ئەمریکا لە ١٩٩١ دوە تا کەوتنی سەددام، "هەرێمی نەفڕین"ی پاراست و، ئێوەش بە سەربەخۆیی فەرمانڕەوایيتان بەسەر سێ ستاندا کرد، بەڵام بیرتان لەدواڕۆژ نەکردەوە، بەڵکو نیوەی تەمەنی "هەرێمی ئاسایش" تان، بە شەڕی خۆکوژی بردەسەر. پاش ئەوە، ئەمریکا لە ١٩٩٨ دا، هەردووکتانی لەگەڵیەك ئاشتکردەوە، ئێوەش بەڵێنتاندا کە لەماوەی چەند مانگێکدا حکومەتێکی یەکگرتوو و، پەرلەمانێکی لە ئازادیدا هەڵبژێردراو بخەنە سەرپێ، کەچی تائەمڕۆ کە ئەوڕۆیە، ئەو بەڵێنەتان نەبردە سەر. پەرلەمانەکەتان رەوایەتی نەماوە و، کاتێکیش دوو بەڕێوەبەرێتی هەبێ، دیارە "هەرێم" لەباری قانونییەوە "بوون" (وجود)ی نابێ. لەگەڵ ئەمەشدا، کاتێك ترکەکان روویان لە ئەمریکا وەرگێڕا، ئەمریکا روویکردە ئێوە و، داوای پێکەوە هەڵمەتبردنە سەر کەرکووکی کرد لێتان، بەڵام ئەوە بوو ئێوە پێکەوە نەچوون، یەکێتی، چوار دەمژمێر

**لەپێش پارتییەوە چوو، و کەرکووکی کرد بەچوار کەرتەوە و، ئەوە بوو ئەو تالآن و بڕۆیی و ئۆتۆمۆبیل فڕاندن و ئاودیوکردنەش روویدا، کە کوردی سووککرد و،** بیانووشی دایە دەست داگیرکەری ترک، کە لە ئەمریکا، داوای چوونە دەرەوەی ئێوە لە کەرکووك بکەن و، ئێوەش لەباتی پێداگرتن و مانەوە و، دەرکردنی عەرەبە هاوردەکان و، نیشتەجێکردنی کوردە کەرکووکییە ئاوارەکان، لووس و باریك چەکدارەکانتان لە کەرکووك کێشایەوە و، **کەرکووکتان کردە شاری «برایەتی»، وەك ئەوەی شارەکانی دیکەی کوردستان، شاری دوژمنایەتی بووبن، نەك برایەتی. خۆ مام جەلال، هەرخۆی، چەند سەت پارچەزەویی لە سلێمانی و کۆیە بەخشی بە بەرەی ترکمانیی دسکەلای رژێمی ترك، کە هەتا ئەوڕۆ، دانێکی خێریان، نەك بە کورددا، بەڵکو بە ئێوەشدا نەناوە. هەر یەك دوو رۆژ دوای ئەو کارەساتەی کەرکووك، نامەیەکم نووسی بۆ کاك مەسعوود و، مەترسیی کشاندنەوەی هێزەکانی کوردم لە کەرکووك راگەیاندپێی. وەرامی کاك مەسعوود ئەوە بوو کە "ئەوان چی باش بێ بۆ کورد ئەوە دەکەن". بێگومان کشانەوەی هێزی کورد لە کەرکووك، هەڵەیەکی ستراتیژیی کوژەر بوو، چۆنکە کوردی کەرکووك بێ پشتیوان مانەوە. ئەمە لە کاتێکدا کە سەربازی ترك لەو رۆژەدا بەهیچ جۆرێك زاتی ئەوەیان نەدەکرد پەلاماری باشووری کوردستان بدەن. خۆ ئەگەر ئەوەیان بکردایە، ئەوا بەزیانی گەورەی رژێمی ترك تەواو دەبوو.**

گەورەترین هەڵەی ئێوە ئەوە بوو، بێ هیچ گەرەنتی و، بێ هیچ بەڵێن و پەیمانێکی ئەمریکا و بەریتانیا لەبارەی دوارۆژی باشووری کوردستانەوە، نەك هەر خۆتان بە عێراقی دایە قەڵەم، بەڵکو گوتتان کە گەلی کورد دەیەوێ لە سنووری عێراقدا بمێنێتەوە، ئەمە لە کاتێکدا کە ئێوە، رێی هیچ جۆرە گشتپرسییەکتان نەدا، تا بزانین خەڵکی باشووری کوردستان، چییان دەوێ و چییان ناوێ.

**لەلایەکی دیکەوە، هەوڵی ئەوەتاندەدا، لەکورد وا بگەیەنن کە سەرکردە عەرەبەکان و شیعەکان بە سیستەمی فێدەراڵی رازین. تەنانەت مام جەلال لە وتووێژێکدا لەگەڵ گۆڤاری ئەڵمانی "دێر شپیگل" گوتی: "سیستانی بە فێدەراڵیزم رازییە و پشتگیریی مافەکانی کورد دەکا و، مرۆڤێکی مۆدێرات**

(معتدل) ە و لە خومەینی ناچێ". کەچی رۆژێك دوای ئەوە، سیستانی ئەو قسانەی بەدرۆ ختسەوە. کە لە رۆژنامەی "میدیا" دا داوامکرد لە مام جەلال، راستی و ناڕاستی ئەو هەواڵە دەربخا. مام جەلال نێستە و ئەوساش پەنای بردە بەر بێدەنگی. وادیارە هۆشیار زێباریش، نەیویستووە لە مام جەلال دوابکەوێ، بۆیە لەبەردەم "کۆمەڵی ئاسایشی نێودەوڵەتان" دا گەلێك پەسنی (مدحی) سیستانی دا. هەقی خۆیەتی، وەزیری عێراقە!

برایینە!

وەك دەزانن، ئێوە دەوڵەتی عێراقتان سەرلەنوێ بنیاتنایەوە و، سەروەرێتیتان بۆ عێراق وەرگرتەوە و، کۆتاییتان هێنا بە سەربەخۆیی ماڵۆچکەکەی کورد. تەنانەت کە "کۆمەڵی ئاسایشی نێودەوڵەتان"، کە بەپێی بڕیاری ١٥٤٦ سەروەرێتی بۆ عێراق گەڕاندەوە، ئەمەش هەر بەهۆی هەوڵ و تەقەلای وەزیرەکەی ئێوەوە، کاك هۆشیار زێباری بوو، وەك بەرپرسیارە گەورەکانی ئەمریکا دانیانپێدانا (الشرق الاوسط ٢٠٠٤/٦/١٠). ئەمە بێنەوەی کە بڕیاری ١٥٤٦ی (ك. ئا. ند.) بەیەك وشە باسی کوردستان، یان کورد بکا. کەچی ئێستەش ئێوە ناتانەوێ بەخۆتانی بگرن و، بڕیارێکی بنبڕانە نادەن و، هەر دەتانەوێ کات ببەنەسەر. ئەگەرچی دەزانن، کار لەکار ترازاوە و، عێراق بووەتەوە دەوڵەت و، کوردیش کەمایەتییەکە لەنێو عێراقدا، کە بە دەوڵەتێکی عەرەبی دەناسرێ و، کێشەکەش لە کێشەی ئینتەرناسیۆنالییەوە، بووەتەوە بە کێشەیەکی نێوخۆیی و، ئێوەش لەمەولا وەك سەرۆك حیزب تەماشا دەکرێن، خۆشتان نامەکەتان بۆ بوش هەروەك سەرۆك حیزب ناردووە و، چەکدارەکانیشتان وەك میلیشیا تەماشا دەکرێن، چۆنکە چەکداری حیزبین، نەك لەشکری نەتەوەیەك و، رێ بە مانیان نادرێ، مەگەر ئەوەی ئێوە بچنەوە سەرشاخ!!! ئەرێ بە تەمان بچنەوە؟؟؟

برایینە!

ئەوجا، با بێینەسەر ئەو هوردە هەڕەشانەی کە دەیکەن و نایبەنە سەر و، بە قسەی

**سیستانی «هەڕەشەی ئێوە بۆ خۆکێشانەوە لە حکوومەتی عێراق، قسەیەکی کۆنە» (ڕۆژنامە عەرەبییەکانی ڕۆژی ٢٠٠٤/٦/١٠)، ئەگەر قسەکانی سیستانی بکەینە کوردی، دەبێ بێژین "هەڕەشەکەی ئێوە، چەمۆڵەی نێوگیرفانە"** و، لەمەوە، دەبێ خۆتان بزانن، ئەو سیستانییەی کە ئێوە چەندجار چوونە سلاوی، ڕێزی ئێوەی چەند لایە. بەلام با وادابنێین کە ئێوە ئەوڕۆ خۆتان دەکێشنە دواوە لە حکوومەت، ئەوجا چی؟ دەمێکە ئەو پەندە کوردییەم داوە بەڕووتاندا کە دەبێژێ **"ئەوەی بە کچێنی دەکرێ، بە بێوەژنی ناکرێ"**. خۆکێشانەوە، دەبوو پێش ڕاگەیاندنی حکوومەتی کاتی بوایە. ئێوە خۆتان دەکێشنەوە، ئەوسا حکوومەتی دانپێدانراوی عێراق، بە یارمەتی هەموولایەك، لە هەموو عێراقدا هەڵبژاردنێك سازدەکا و، ئەو حەلەش دڵنیابن کە جەماوەری کورد دەنگ بەئێوە نادا، **ئەو شایەر و کوڕی ڕۆژ و کۆنەجاش و خاوەن فایل و چڵکاوخۆر و گامەسلەك و خۆبژێن و کاسەلێسانەی کە ساڵانی ساڵە، بەلێشاو پارەی کورد دابەشدەکەن بەسەریاندا، پێش ئەوانی دیکە دەکەونە پەلاماردانتان.** خۆ ئەگەر بەربەرەکانێی حکوومەتی عێراق بکەن، دەبێ بزانن کە ئەوە جاری جاران نییە، چۆنکە نە جەماوەری کورد دەگاتە فریاتان و، نە سووریا و ئێران و دەوڵەتی ترك، ئەو دەمە بەهەموو لایەك لێتاندەدەن و، داگیرکەرانی کوردستانیش، ئەو ئاژاوەیە دەکەنە بیانوو بۆ کاولکردنی کوردستان و، دەربەڕاندنی کورد و ئەنفالێکی نوێ. خۆ ئەگەر لەنێو حکوومەتدا بمێننەوە، ئەوا متمانەی زۆربەی زۆری کورد دەدۆڕێنن، چۆنکە ڕژێمی نوێی عێراق، زۆر زەحمەتە مافێکی فیدراڵی وا بدا بە کورد، کە کورد دەیەوێ و، جەماوەری کورد، لەدەستدانی ئەو دەرفەتە گەورەیەی کە هەڵکەوتبوو بۆی، لەچارەی ئێوەی دەزانێ.

برایینە!

ڕێی ڕاست و دروست ئەوەیە، بە فەرمی و بێ پێچوپەنا، دان بنێن بە هەڵەی خۆتاندا و، وەك سیاسەتکارانێك کە بۆ ئامانجێك هەوڵتانداوە و سەرینەگرتووە، بێنە قسە و هەردوو بەڕێوەبەرێتییەکە بدەنە دەست ئەنجومەنێکی سەتکەسیی بێلایەن، کە سەرپەرشتیی هەڵبژاردنێکی ئازاد بکا، لەو ستانانەدا کە بەدەست کوردەوەیە و، لەو شوێنانەدا کە بەدەست کوردەوە نییە، بەلام کوردستانن و کورد دەتوانن نوێنەری

خۆیان هەڵبـژێرن. ئەوجا ئەو پەرلەمـانەی کـە دروستـدەبێ، بڕیاربدا لەسـەر ئەو هەنگاوانەی کە دەبێ بنرێن بۆ پاراستنی مافی کورد. ئێوە ئەگەر ئەم کارە بکەن و، ئەم هەنگاوە ئازایانە بنێن، رێزێکی زۆری نەتەوەی کورد بۆخۆتان دەپچڕن و، کورد لە دووبارەبوونەوەی شەڕی نێوخۆیی رزگار دەکەن، چۆنکە دڵنیابن کە مەنجەڵی خەموخەفەت و ناهومێدی کورد بەجۆرێ دەکوڵێ کە لێیدەڕژێ. تکای براتان ئەوەیە کە رێ بەو کوێرەوەری و کارەساتە ناهەموارانە نەدەن. مەبەستیشم لەم نامەیە بۆ ئێوە، تەنێ خزمەتی کوردە، ئەگەرنا خۆشتاندەزانن، کە ئەز نە بەتەمای پلەوپایە و، نە بەتەمای هیچ جۆرە دەسکەوتێکی تایبەتی و، نە چاوەڕوانی خێروبێری کەسم.

رێزوسڵاوم دووبارە دەکەمەوە...

براتان

جەمال نەبەز

٢٠٠٤/٦/١٠

رۆژنامەی "میدیا" ژ ١٦٤، ٢٠٠٤/٦/١٥

گۆڤاری "کۆنگرە" ژمارە ٣١ - جۆزەردانی ٢٠٠٤